محەمەد لوتفی جومعە

وەرگێڕانی : ڕەسووڵ بەختیار





# مێژووی فەیلەسووفانی ئیسلام

کیندی • فارابی • ئیبن سینا
ئیبن خەلدوون • ئیبن توفەیل
ئیبن باجە • ئیبن ڕووشد • غەزالی
ئیبن هەیسەم • ئیبن مەسکەویە

# مێژووی فەیلەسووفانی ئیسلام

کیندی-فارابی-ئیبن سینا-ئیبن خەلدوون
ئبن توفەیل-ئیبن باجە-ئیبن ڕووشد
غەزالی-ئیبن هەیسەم-ئیبن مەسکەویە

محەممەد لوتفی جومعە
وەرگێڕانی: ڕەسووڵ بەختیار

AWER
Nawandi Awer
ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٣٠٧

مێژووی فەیلەسووفانی ئیسلام

کیندی-فارابی-ئیبن سینا-ئیبن خەلدوون
ئین توفەیل-ئیبن باجە-ئیبن ڕووشد
غەزالی-ئیبن هەیسەم-ئیبن مەسکەویە
محەممەد لوتفی جومعە
وەرگێڕانی: ڕەسووڵ بەختیار
دەرهێنانی هونەری ناوەوە: لاوین خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
تیراژ : (١٠٠٠) دانە
نرخ: (١٢٠٠٠ ) دینار
قەبارە : ٢٤×١٧
لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٩٣)
ی ساڵی ٢٠١٦ی پێ دراوە.

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان: هەولێر-پشت باڕیزگا-بەرانبەر دەرگای قەڵات
ژمارەی موبایل 07504209495 07504242101
ئیمەیل Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک www.facebook.com/nawendi Awer

"ئەو وتارەم لەنێو ئەو کتێبەدا بۆ هەموو خەڵکی نییە، بەڵکوو بۆ ئەو پیاوەیە کە بەرانبەر هەزاران پیاوە، هەروا بەرامبەر بەدەیان هەزار پیاوە، ڕاستییەکەی بۆ ئەوە نییە هەموو خەڵك پەی پێ ببەن، بەڵکوو بۆ ئەو کەسەیە درکی پێ دەکات و تێی دەگات".

یاداشتەکانی ئیبن هەیسەم

لەساڵی ٤٣٠ك کۆچیدواییی کردووە

## پێشەکیی وەرگێڕ

فەلسەفە لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلام، وەك وشەیەك بە شێوەیەك سەیر دەکرا و لێکدەدرایەوە کە باوەڕداران بە لاڕێدا دەبات، بۆیە ئەوانەی سەرەتا لەو بوارەدا لەکاردابوون و خۆیان بەخوێندنەوەی فەلسەفە خەریك دەکرد، زۆرجار ڕووبەڕووی گوشار و ئەشکەنجە و ئازار و دوورخستنەوە دەبوونەوە. لەتەك ئەمەشدا زۆرێك لە پاZشا و خەلیفەکانی ئیسلام هانی ئەو بوارەیان دەدا، بەڵام ئەمە زۆری نەدەبرد لەلایەن چەندان کەسی دەربار و پیاوانی ئایینیی سەرزنشت دەکرا، بۆیە پاشا و خەلیفە و میرەکان هەرزوو بەزوویی بەپێی چەند بۆچوونێك ڕێگرییان لەو کەسانە دەکرد، بەڵام کاروانی فەلسەفە و هەودارانی هەر بەردەوام بوو.

بۆیە نەتەوەی ئیسلام چەندان فەیلەسووفی گەورە و مەزنی لێ هەڵکەوت سەرەڕایی هەموو ئێش و ئازار و دوورخستنەوەیەك فەلسەفەکەیان بە نەتەوەکەیان ناساند، زۆرجاریش میری ئیماندااران و خەلیفە لەتوڕەبوونێکدا هەرچی کتێبی ئەو زاتانە هەبوو فەرمانی سووتاندنی دەدا، بەو شێوەیە بۆ ماوەی چەند دەیەیەك فەلسەفە لەو

وڵاتانە کپ دەبووەوە و هیچ حوجرە و قوتابخانەیەك توێژینەوە و کتێبە فەلسەفییەکانی لەخۆ نەدەگرت.

وانەبێژەکانیش ئەو بۆچوونانەیان دووبارە دەکردە کە لەنێو کۆمەڵگە و شەرع و ئاییندا زۆر بە ڕووکەشی دەبیندرا، وەنەبێ فەلسەفە ڕێگرێك بێ لە ئایین و شەرع، بەڵکوو زۆربەی فەیلەسووفەکان هەردەم جەختیان لەوە کردووەتەوە کە فەلسەفە ڕێگەیەکی دیکەیە بۆ تێگەیشتن لە چەمکەکانی ئایین و شەرع، لەم نێوەندەشدا بۆ ماوەیەك ئەستێرەی درەوشاوەی فەلسەفە سەری هەڵدەدایەوە، تا ئەو کاتەی کەسانی دوور لەزانست بەهەلیان دەزانی تا بەڵێنی خۆیان بۆ میر و خەلیفە نوێ بکەنەوە، چەندان بۆچوونی دژ بەزانست و فەلسەفە دەخستە ڕوو، کە بەپێی قسەی ئەوان ئەوەی لەفەلسەفەدا بخوێنێ یان لێکدانەوەی و ئەرگۆمێنتی هەبێ ئەوا بە زەندیق دەژمێردرێ.

بەشێوەیەك دەیان پاساوی سەیر و سەمەرەیان دەهێنایەوە و میر و خەلیفەش باوەڕیان پێ هەبوو، بۆیە دووبارە لەسەردەمێکی دیکە فەیلەسووفێکی دیکە سەری هەڵدەدایەوە و دووبارە پیاچوونەوە بەفەلسەفەی دیرێنەکان دەکرایەوە، هەندێك لەو فەیلەسووفانە دەهات بۆچوون و فەلسەفەی دێرینی زیندوو دەکردەوە و بۆچوونی خۆشی سەبارەت بەو گوتارانە دەخستە ڕوو، هەندێکیان لەنێوەندی فەلسەفەی گریکەکان دەتوانەوە و هەندێکی دیکەش دەهات ئەو فەلسەفەی شی دەکردەوە کە لەتەك ئایینی ئیسلامدا دەگونجێ، بە شێوەیەك بەپێی عەقڵ و بەڵگە و لێکدانەوە باسەکانی دەخستە ڕوو.

مێژووی فەیلەسووفەکانی ئیسلام، لەکامە فەیلەسووفەوە دەست پێ بکەیت هەست بەوە دەکەی کە ویستوویەتی کۆمەڵگەکەی هەنگاوی بوێرانە بهاوێ بۆ زیاتر سەرخستنی زانست لەپێناو خۆشگوزەرانی کۆمەڵگەی ئیسلامی تا بتوانێ لە هەموو بوارەکان هاوشانی نەتەوەکانی دیکەی جیهان بێ، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆربەی نووسراو و کتێبەکانیان ونبوون، تەنهاش چەند بابەتێك ماوەتەوە تا توێژینەوەی لەسەر بکرێ.

دیارە ئەمەش وەك لەسەرەتا باسمان کرد زیاتر پەیوەست بووە بەسەردەم و عەقڵیەت و بیرکردنەوەی پاشا و خەلیفە و میرەکانەوە، ئەوەی زۆر سەیریشە زۆربەی توێژینەوە ئەرووپییەکان لەسەر داهێنانی فەیلەسووفەکانی ئیسلام قوتابخانەکانە فەلسەفییەکانیان بەرەو پێش بردووە و لەرێگەی فەیلەسووفەکانی ئیسلامەوە ئەرستۆ و ئەفلاتوونیان ناسیووە و دووبارە هاتوون باس و نووسینە فەلسەفەکانیان تاوتۆکردووە، ئەمەش بۆتە هۆیەك تا قوتابخانەیەکی مەزنی فەلسەفی دابمەزرێنن.

ئەم کتێبە تەواوی باس لە مێژووی فەیلەسووفەکانی ئیسلام دەکات، دیارە هەر فەیلەسووفێکیش خەسڵەتی جیایە لەوی دیکە و بۆچوونی جیایە لەویتر، بۆیە دەبێ زۆر بەئاگاییەوە بەنێوەندی دێڕەکاندا گوزەر بکەین و یەکە یەکە دێڕەکانیان دووبارە بکەینەوە تا نەکەوینە نێو هەڵەوە بەوەی ئەوان هەردەم لەدژی ئایینی ئیسلام بوون، بەڵکوو تەنها ویستوویانە کۆمەڵگە عەقڵانە بیر بکاتەوە و خۆی ڕزگار بکات

لەو شتانەی کە سەواون و ڕێگرن لەبەردەم پێشکەوتن و سەرکەوتن بەئاراستەی زانستدا.

لەلایەکی دیکەوە هەمووان دەزانن مەرج نییە ئەوەی مێژوو باسی لێوە کردبێ ڕاست بێ، یان هەموو دوور بێ لە ڕاستی، بەڵکوو خوێنەر خۆی دەتوانێ خۆی بکات بە ناوبژیوان لەبەردەم باسەکاندا تا چەند ئەو باس و خواسانە لەلا ڕاستە.

هەر چۆنێك بێ لەنێوەندی مێژووی ئیسلامدا ئەوانەی بە دوای فەلسەفە کەوتوون لە زۆر شوێندا تووشی نسکۆ بوونە، بەڵام وتار و گوتارەکانیان بە زیندووی ماوەتەوە و مرۆڤایەتی بەگشتی سوودی لێ بینیوە، ئێمەش لەو نێوەندەدا دەبێ سوودێکی ئەوتۆیی لێ وەربگرین تا خزمەت بە کۆمەڵگەکەمان بگەیەنین بە بێ ئەوەی تانەوتەشەر دژ بە بیروڕاکان بگەیەنین.

ڕەسووڵ بەختیار

هەولێر – کوردستان

٢٩-١-٢٠١٦

## دەستپێك و پێشەكی

### بەناوی خوا

### دروود لەسەر محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا، پەیامبەری مەزن.

بیرۆکەی نووسینی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ بیست ساڵی ڕابردوو، لەو کاتەی لە قوتابخانەی زانکۆیی لیۆن زانستم دەستەبەر دەکرد، لەو شارە جوانە و جێگەی دڵنیاییە، بەشێك لەسەرەتاکانی ئەو بەشانەمان تۆمار کرد، لەنێوەندی هەموو گەشتەکانمدا لەنێوان لیۆن و جنێف و و لەندەن و فیرنزە (فلۆرنسا) دەستنووسەکەی لەگەڵمدا بوو، کاتێك جەنگ هاتە کایەوە من لەتەك ئەو دوانزدە فەیلەسووفەدا بووم، هەندێك کات هیوادار بووم ڕووناکی ببینیێ، بەڵام دواتر پاڵم دەدایەوە و گوێم لەدەنگی مووشەکەکان بوو لە ئاسمان، تا ئەو کاتەی دەسەڵاتدارەکان خویان لەنێو پۆشاکی بوون و ماددییەت بینییەوە، بۆیە منیش نەمتوانی ئەو فەیلەسووفانە زیاتر بەند بکەم، خۆم بەو کاغەزانەوە خەریك کرد کە بەبۆچوونی من زنێرێکی بریسکەداری زێڕینە و گەردێکی ورد و هەڵمێکی مەزنی هەیە، بۆیە بەرەو ژیاندنەوەی هەر دوانزدە فەیلەسووفەکە هەنگاوم نا، هەر لەرۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا، بەشێوەیەك خستمەڕوو کەگونجاو بێ لەبەردەم خوێنەرانی ئەم رۆژگارە.

بەرەو پێشەوە کە هزرمەندان! گلەیی لەکەسێکی لاوازی وەك من مەکەن کە پەنای بردووەتە پێش ئێوە تا لە ئەشکەوتی دێریندا بچمە دەرەوە، ئێستا

ئێوە لەپاش ونبوون بەدەرکەوتنەوە، ئێوە لە جیهانێکی هێمندا بوون و هاتنە نێو جیهانی ژاوەژاو، چونکە زۆربەی کەسانی ئەم سەردەمە تا ئێستا ناتناسیّ، کاتێك ناو و نازناو و رەچەڵەکتان دەبیستن وەك ئەوەیە گوێیان لەشتێکی نویّ بیّ و گفتوگۆ دەکەن سەبارەت بە بوون و بەهای هزرەکانتان، زۆرێك لەبیرۆکەکاتان ڕەتدەکەنەوە کە لەشەو تاریکەکاندا نووسیووتانە، هەندێك هەن بەسەر سوڕمانەوە لێتان دەڕوانن کاتێك دەبینن ئەو فەیلەسووفە پێشکەوتوونانە هەن بەتایبەتی کاتێك لێکدانەوە و شیکردنەوەتان بۆ گەردوون کردووە، واتە لە پێش کانت و نیچە و شۆپنهاوەر و سبنسر و ستیوارت میل و ئۆگوست کۆمت و رینان شیکردنەوە و لێکدانەوەتان بۆ ڕووداوەکان کردووە.

هیچ کام لەو خوێنەرانە درك بەوە ناکەن کە بەهۆی ئەو فەیلەسووفانەوە هەر لە کیندی تا ئیبن ڕووشد نەبوایە هیچ کام لە فەیلەسووفە ئەورووپیەکان لەنێوەندی جیهانی بووندا نەدەبوون، ئەوان ئەو بلّیسەیان بەرزکردووەتەوە کە لەلایەن سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆوە بەرزکراوەتەوە، کە لەنێوەندی ئەشکەوتە دێرینەکاندا بوو و ئێوەش ئاگرتان لەویّ بەردا، تا بەبریسکەداری پێشکەشی فەیلەسووفەکانی ئەرووپای بکەن، ئێوەش پارێزەری ئەو بلّیسەیە بوون.

ئەم باسانەی ئێوە زانایانی ئەورووپای نەترساند بەتایبەتی دەیان نووسەر و مێژوونووسی ئەم کێشوەرە بەختیارە بەدوای شوێنەوارتان کەوتنە گەڕان تا هەواڵ و مێژوو و بیرۆکەکاتان تۆمار بکات کە مەزنترین زنجیرەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤایەتییە، بۆیە جەختیان لە پاراستنی دەستنووسەکانتان کردەوە و بەهایەکی زۆریان بۆ دانا و هەموو شتێکیان لەپێناوی ئێوە لەپارە و لەتەمەن بۆ ئێوە تەرخان کرد، تا دووبارە یادتان بکرێتەوە، چونکە سوودیان لیّ وەرگرتووە کاتێك بەدوای ئێوەدا گەڕاون و ئەزموونی ئێوەیان زانیووە!

هەروا ئەوانەی ئێوەیان رەت کردووەتەوە یان گومانێکیان هەیە لە بوونی

عەقڵدا ئەوا نەوەکانتان و میراتگرەکانتانن، بەڵام ئێوە کارێکی واتان کردووە خەڵك یادتان بکاتەوە و شکۆ بۆ کارەکانتان دابنێن، بەتایبەتی ئەوانەی بەزمانی عەرەبی دەخوێننەوە و تۆمارکراوەکانی ئێوەشی لە بەغدا دیمەشق و میسر و مەغریب و ئەندەلووس، بەڵام میراتگرەکان هیچ بەهایەك بۆ ئەو شوێنەوارە بەنرخە دانانێن:

بەڵام ئایا بەڕاستی باپیرانمان لەنێوەندی هزر و عەقڵدا هەن؟

ئایا باپیرانمان بەهایان بۆ بواری زانستی نوێ داناوە، بەڵام ئەی کوا کتێبەکانیان؟

بەهایان لەنێوەندی فەیلەسووفەکاندا لەکوێ دایە کاتێك تویژینەوە و وێنە و وتەکانیان دەبینین لەنێوەندی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو سێ پرسیارە ئەم کتێبەم نووسی، تا بەڵگەی ئەو کەسە پێشکەوتووانە بخەمە ڕوو و ڕاستییەکانیان دابنێم لە نێوەندی فەیلەسووفەکانی جیهان، تا هەموو لایەك بزانن ئینجا چ ئەوانەی لاسایی دەکەنەوە یان لەدڵە ڕاوکێدان کە مەدەنیەت لەپێش چواردە سەدە هاتووەتە کایەوە، تەنهاش مەدەنیەت جەنگ و تێشووی ماددیەت نییە، بەڵکوو مەدەنیەت بەمانای عەقڵ و زانستی هزری قووڵ دەگەیەنێت، ئەو مەدەنیەتەش لەناوەڕاستی بیاباندا هاتۆتە ئاراوە، تا کار گەیشتووەتە ئەوەی باڵەکانی لەنێوەندی چین و بەرەو ڕۆژهەڵات هەڵکشا ولەلایەکی دیکەوە بەرەو ئەورووپا و ئەفریقادا هەنگاوی نا، مەدەنیەت تەنها شمشێر و تۆپهاوێژی نەبووە، بەڵکوو مەدەنیەت و قەڵەم و پەڕاو و کتێب بووە.

بڕوای ئەو فەیلەسووفانە ڕێگری نەکردووە لە گەڕان و خوێندن بەدوای ڕاستییەکاندا، هەر ئەو بڕوایەش بوو بووە هۆی هەنگاو نان لەڕێڕەوی گەڕانە بەدوای هزری مرۆڤایەتی، هەموو ئەم فەیلەسووفانە ماڵ و تەمەنیان بۆ ئەو ڕاستییە ونبووە تەرخان کرد. ئەگەر ئەو ڕاستییە بوونی هەبێ، لەلایەکی

دیکەوە خاوەن شکۆ و تاجدارەکان هەرچی ماڵ و موڵکی خۆیان دابین کرد تا فەلسەفە لەنێوەندی وڵاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئیسلامیدا بدۆزنەوە، یەکەم کەسیش کە هەوڵیدا لەنێوەندی بیاباندا زانست و دانایی بێتە کایەوە، محەممەد د.خ بوو، کە هانی دانایی ئەو فەیلەسووفە و خەلیفە و پاشاکان و هاوەڵانیدا تا ڕێڕەوی دانایی بەرنەدەن.

بۆ نیشانەکردنی ئەم بابەتەش لەرۆژگارێکی نزیکدا کۆمەڵە کەسێك پەیدا بوون بەهەموو شێوەیەك دەیانویست هزری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی ناشیرین بکەن و تانە لە پیاوە مەزن و زانست و ئەدەبیاتەکانیان بدەن، تانە لە داناییان بدەن و هەرچی هەیە تێکی بدەن و بیرۆخێنن، ئەم تیمە هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوەبوو تا سەلەفی سالح لە ڕووی عەقڵ و هزر لەناو ببەن، دیارە ئەوان بەهۆی دەمارگیری و بەرژەوەندیی ماددی کارەکانیان دەکەن، چونکە ناکرێ ئەدیبێك یان زانایەك بەهای پێشینەی خۆی کەم کاتەوە، کە ڕوویەکی گەشاوەی ڕۆشنبیریی مرۆڤایەتی بوون؟ ئایا نووسەرێکی ئەورووپی هاتووە بەو شێوەیە پێشینان و پیاوانی زانست و فەلسەفەی کەم گرتبێت، تەنها لەبەر ئەوەی نەوەکان جیان، بەتایبەتی لەڕووی جیهانی ماددیدا؟

بەڵکوو کارەکە جیایە، چونکە دەبینین بلیمەتەکانی نووسین کار بۆ ئەوە دەکەن تا دێرینەکان بژێننەوە بۆ دووبارە کتێبەکانیان بڵاو بکەنەوە بەمەش هاتوون رازاندوویانەوە بە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە و بەیەکێك لە چاکەخوازانیان لەقەڵەم داوە، بەوەی فەزڵیان هەیە لە ژیانی هۆشیاری نوێدا، فەیلەسووفە ئەورووپییەکان بوونەتە ئایدیاڵێك بۆ ئەوانی دیکە تا لەو ڕێڕەوە زیاتر ڕووناکی و تیشك ببەخشێ، ئەوان بەردەوام یادی فەیلەسووفەکانی خۆیان دەکەنەوە و هەردەم نووسینەکانیان وا دەردەخەن کەبەشدارن لە شارستانەیەتی مرۆڤایەتی.

لەنێوەندی ئەمانەدا کەسانێك هەن خۆیان بە نوێخواز دەزانن و هەموو باسەکۆنەکان لادەبن بە بیانووی کۆنییان، هەروا هەموو شتە نوێیەکان دەپەرستن بە پاساوی نوێیان، بەڵام ئەوان ئەگەر عاقڵ بن ئەوە دەزانن ئەوەی کۆنی نەبێت نوێکاری نییە، چونکە شەرەف و شکۆداری دەگەڕێتەوە بۆ رەسەنایەتی، ئەوان چ پشتگیریەکیان هەیە ئەگەر نەزانن باپیران و نەتەوەکەیان چیان کردووە، هەر نەتەوەیەك رابردووی نەبێت ئەوا داهاتووشی نییە.

لێرەوە ئیسلام تەنها وەك ناوێك بەکارناهێنین وەك باوەڕێك، بەڵکوو بەمەدەنیەتێکی گشتگیری دادەنێین، کە دەوڵەمەندە بە ژیانی عەقڵی و رۆشنبیری ئەدەبی، لەسەر ئەو بنەمایەش فەیلەسووفە ئیسرائیلی و کریستیانەکان ئازاد و پەروەردە بوون لەباوەشی مەدەنیەتی ئیسلامیدا، چونکە دانایانی ئیسلام و ئەوانی دیکە هاوبەش بوون لەدانایی و سامان و عەقڵدا، لەسەر ئەو رێڕەوەش خەلیفەکانی عەباسی و ئەمەوی و فاتیمیەکان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا هەنگاویان نا، بۆ ئەمەش هەرچی هزرمەند و نووسەرێك کە ئیسلام نەبوون لەخۆیان نزیك کردەوە و گەورەترین پۆستیان لەدەوڵەتدا پێبەخشین، ئەو خەلیفە مەزنانە دەروون و کۆشکەکانیان واڵاکرد بۆ هەموو فەیلەسووفەکانی دیکەی ئایینەکان، کەچی لەزۆرێك لەئیمپراتۆر و پاشاکانی دیکە ئەو پیاوانەیان ئەشکەنجە دەدا و دەیانسووتاندن، بەتایبەتی ئەگەر یەکێك بهاتبووایە باسی لە بلیمەتی و هزر بکردبایە.

خوێنەر لەنێو ئەم کتێبەدا بەشێك دەبینی سەبارەت بە سۆفیگەری بەبۆنەی توێژینەوەکانی شێخ محێدینی کوڕی عەرەبی کە زۆرێك لە نووسەران نیگەرانی خۆیان دەردەخەن تا لەنێوەندی فەیلەسووفەکان دابندرێ، بەڵام ئەوان نیگەران نین کاتێك غەزالی دادەنێن وەك فەیلەسووف تەنها کاتێك هاتووە باسی لە فەلسەفە کردووە، هەندێك پێیانوایە ئیبن عەرەبی شیاوترە لە غەزالی کاتێك

وەك فەیلەسووف باسی لێوە دەکرێ، چونکە تەسەووف بەشێکە لەفەلسەفە و وێنای پلانێکە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی، خاوەنەکەشی بەدوای نهێنییەکانی ژیان و نهێنییەکانی گەردووندا دەگەڕێ، لێرەوەش بەهەموو مانایەك فەلسەفە جێگەی خۆی دەکاتەوە، لەتەك ئەوەی ئیبن عەرەبی هەموو توێژینەوەکانی زۆر بەوردی و بە قووڵی خستۆتە ڕوو، هەموو ژیانیشی لەپێناو مەبەستێك تەرخانکردووە و گەیشتۆتە بەرزترین لووتکە، چونکە ئەبو حامیدی غەزالی بە کتێبی (احیاء العلوم) ژایانناسی زانستەکان ناودار بووە، لەلایەکی دیکەوە هەندێك لە پسپۆڕان پێیانوایە بەپلە دوو دێ دوای کتێبی (فتوحات المکیە)ی ئیبن عەرەبی، محێیدین کەسایەتیەکی جیا بووە لە مێژووی تەسەووفی ئیسلامی نوێدا، چونکە ئەو ڕکابەری نەبوو لەنێو سوونەی عەرەب و تورك، هەروا لەنێوەندی ئەهلی ئیمامەی فارسەکانیشدا.

---

عەرەب و جوولەکە دوو لقن لەکێڵگەی سامیدا، هەردوو گەلیش ڕێککەوتوون لەسەر ڕەچەڵەك و مەدەنیەت لەڕووی مێژوویدا، هەردوو زمانی عەرەبی و عبری لەیەك بۆتەدان، بەڵام زمانی عەرەبی زیاتر بەرەو پێشەوە چوو کاتێك کەزاراوەی قورەیش توانی زاڵ بێ بەسەر هەموو لایەنەکانی هزر.
بەڵام جیاوازی لەنێوان شەریعەتی موسەوی و محەمەدی بەدەرکەوت کاتێك لەڕووی فەلەسەفییەوە توێژینەوەی لەسەر کرا، لەهەر سەردەمێکدا چەندان بلیمەتی ئیسرائیلی بەدەردەکەوتن و لەسەرووی گەلەکانەوە بوون، بەشێوەیەك سەر بە نیشتمانێك بوون، بەڵام بەبێ بڕوایی، لەم سەردەمەشدا زۆرێك لەبلیمەتەکانیان جێگەی خۆیان لەنێوەندی هزری جیهانیدا کردۆتەوە وەك کارل مارکس و ئەنیشتاین و بەرجەسۆن و دەیان زانای دیکە لە هزری مرۆڤایەتیدا هەردەم یادیان دەکرێتەوە.

داناپانی بەنی ئیسرائیل لە سەردەمەکانی سەرەتاییدا کاتێك بەدەرکەوتن زیاتر لەرووی هەرەشە و گورەشەو و فێرکردنی خوداییەکان و زیاتریش جەخت لەیەکتاپەرستی و خوداپەرستی و یەکبوونی هەموو کائینەکانە، زیاتریش توێژینەوەکانیان دەربارەی خودە، بەڵام نەیانتوانیوە پەی زیاتر بە ئەو خەسڵەتانە ببەن کە فەیلەسووفەکانی ئیسلام باسیان لێوە کردووە، بەو پێیەش باوەڕەکانیان زیاتر بڕوابوونی بە ڕەهای خوایە، بەبێ ئەوەی بە توێژینەوەیەکی زانستیانە و ڕێگەیەکی فەلەسەفی بێ، لەتەك ئەوەی سەرچاوەکانی زانستەکانی خودایی و دەروونی زیاتر لەنێوەندی کتێبەکانی هیندی و گریکەکاندا هەبوو، سوودێکی زۆری خستەوە بۆ ئەوان.

فەیلەسووفەکانی جوولەکە شتێکی وایان نەزانیوە سەبارەت بەزانستی لۆژیك، هیچ ڕێگەیەکی بەڵگەیی و لێکدانەوە و پاساویان نەگرتۆتە بەر، هیچ کاتێکیش پەنایان بۆ ئەو زانستانە نەدەبرد، زیاتریش پشت بە سرووش و بۆچوونەکان دەبەستن.

سەبارەت بە بیرۆلۆژی خێر و شەرف لە دانایی ئیسرائیلیدا ڕەنگی داوەتەوە و یەکێك لەفەیلەسووفەکانی جوولەکە دەڵێت "خودای گەورە تەنها خێری لێ دێتە کایەوە"، ئەمەشیان لەنێوەندی کتێبی پیرۆزدا سەلماندووە، سەبارەت بە شەڕیش باس لەوە دەکات تەنها لە دورستکراوی مرۆڤەکان، ئەمەش بەرهەمی ماددەیە لەسەر عەقڵ یان سەرکەوتنی بنەمای ماددەیە لەسەر عەقڵ، بۆ ئەمەش شەڕیان خستۆتە سەر مرۆڤ تا خۆیان لەو قسانە بپارێزن تا بڵێن مرۆڤ ئازادە لە هەڵسوکەوتەکانی، بەڵام دەبێ کارەکانی هاوڕێك بکات لەتەك بنەماکانی خێر نەوەك بنەمای مادیەت بەسەریدا زاڵ بێت، ئەگەر وانەبێ دەبێتە دیلی شەڕ کە بنەمایەکی ئازادانەیە کە ناسراوە بەناوی (Libre Arbitre)یان بنەمای سەرپشك کردن و هەڵبژاردن، بەو پێیەی مرۆڤ سەرپشکە و رایی نەکراوە، بەڵام بنەمای سەر پشك لەنێوەندی فەلسەفەی

نوێدا بەدەرنەکەوتووە، چونکە بیر و هزرە ئایینییەکان بە قووڵایی چووەتە نێو باوەڕی نەوەکاندا، لێرەوە جوولەکەکان زۆر خۆیان ماندوو نەکردووە، بەڵکوو تەنها پشتیان بە دەقەکانی کتێبی پیرۆز (تەورات) بەستووە، چونکە لەسەر زاری خوداوە بەراشکاوانە دەڵێت:"سەیرکە ئەو ڕۆژەمان بەرامبەرت کردووەتەوە لەژیانی خێردا، مردنیش شەڕە".

زۆربەی سەرچاوەکانیشان گەڕاندووتەوە بۆ دەروونی (سامی) کە ڕێنان زۆر بەراستی دەزانێ کاتێك مێژووی زمانی سامی لەکتێبێکیدا دەخاتە ڕوو.

دانایانی جوولەکە ناتواندرێ ناوی فەیلەسووفیان پێوە بلکێندرێ، ئەوان نزیك بوونەتەوە لە تیۆرە فەلسەفییەکان بەڵام هەموویان گەڕاندۆتەوە نێو بازنەی ئایین، هەموو بڕیارەکانیش دەگەڕێننەوە بۆ سەرووی درك پێکردنی مرۆڤ.

چەندان نموونە بۆ ئەمە لە نێوەندی گەڕان (سفر ئەیووب) دەبینین، کە لە ئەسفارەکانی سەردەمی کۆنە، ئەگەر دانایان کۆبوونەوە و توێژینەوەیان سەبارەت بە بابەتە خوداییەکان و چارەنووس کرد، ئەوا خودا لەنێوەندی زریانی ئەیووبدا بەدەردەکەوێ، ئەمەش کورتبینی درکپێکردنی مرۆڤایەتییە، کاتێك هەڵوەستە لەسەر نهێنییەکانی سروشت دەکرێ و پەردە لەسەر ڕووی ڕاستەقینە لادەبرێ، بەشێوەیەك هەموو شتێك دەگەڕێننەوە بۆ ئیرادەی خودا و هەموو لایەنەکانی فەلسەفەش دەگەڕێننەوە بۆ بڕواکان.

کاتێك جوولەکەکان تێکەڵبوون لەگەڵ بابلی و فارس و کلدانییەکان، هۆکارێك بوو تا کاریگەری لەسەر دانایی ئیسرائیلییەکان بێتە کایەوە، بەو پێیەی ئەو داگیرکەرانە هەموویان لەرەچەڵەکی (ئاری)ن.

فارسەکان باس لەیەکتاپەرستی دەکەن و خوا دەناسن و ڕقیان لە بێ باوەڕەکانە وەك چۆن لە کتێبی (زەند ئاڤێستا) خستوویانەتە ڕوو، لەگەڵ ئەوەی فارسەکان لە رەچەڵەکی ئارین، بەڵام ئاسیاییە بەو پێیەی لە ئاسیادا دەژین، ئاسیابوونیش زاڵبووە بەسەر ئاریبوونیان، هەروا ویستوویانە ڕووناکی

فەلسەفە ببەخشنە دانا ئیسرائیلییەکان، بۆیە لەدواتردا دەبینین کتێب و توێژینەوەکانیان خاڵییە لەتوێژینەوە تیۆرییەکان کە سەبارەت بەئەودیوو سروشت، ئەمەش دوای ئەوەی تێکەڵ بەفارسەکان بوون.

تا ئێستایش جوولەکەکان لەنێوەندی فەلسەفەدا چەقبەستوون و هەر لە نێوەندی بازنەی ئاییندا هێشتوویانەتەوە، بەڵام کاتێك یۆنانییەکان زاڵبوون بەسەر سووریادا و فەلسەفەکانیان بڵاوبووەوە، جوولەکەکان هەستیان بەوە کرد کە چۆن بتوانن وەڵاتەکەیان لەژێر چنگی دوژمنان دەربهێنن، بەڵام هەر نەیانتوانی زۆر راشکاوانە توێژینەوەکانیان بەهێز بکەن، دووبارە گەڕانەوە بۆ کتێبە پیرۆزەکان و شیکردنەوەکانیان بەپێی هەندێك لەبنەما ئەفلاتونییەکان بوو، کە بەشێوازێکی نوێ لەنێو ئەسکەندەریەدا گەشەی سەندبوو، بەڵام نەیانتوانی بیروبۆچوونی فیساگۆرس و ئەفلاتوون ببڕن و هەر لە نێوەندی ئەو بازنانە لێکدانەوەکانیان دەکرد.

هەندێك لەداناکانیان بەپێی بۆچوونی خۆیان کە بڕواکانی بەنی ئیسرائیل کاریگەری هەبووە لەسەر بیربۆچوونی گەورە فەیلەسووفەکان وەك فیساگۆرس و ئەفلاتون و ئەرستۆتالیس، بەپێی قسەی ئەوان ئەو فەیلەسووفە گریکیانە بەنێو وڵاتی بەنی ئیسرائیلدا تێپەڕیوون و لەوێشدا زانست و دانایییان لە زاناکانیان وەرگرتووە.

لەنێوەندی جوولەکەکان کۆمەڵێك هەبوون کە بەکۆمەڵە سۆفیگەرەکانی موسڵمانان دەچوون، ئەوان فەریسینەکان بوو کە رێبازەکان تەنها لەسەر شێوازی بنەماکانیان بەڕێوە دەچوو و هەموو وتەیەکیان کاری راستەقینەیان بۆ دەکرد، وەك پاکی و باوەڕداری. هەروا کۆمەڵەیەکی دیکە پەیدا بوون بەناوی سەدوقیە، بەڵام دواتر ئەو کۆمەڵەیە نەما بەهۆی ئەوەی ئەوە مرۆڤە دەچێتە نێوندی رەتکردنەوە هەروا گەیشتنە ئەو بۆچوونەی کە بنەماکانیان دژایەتی تیۆری دەستنیشانکردنە مرۆڤایەتیەکانە.

هەر لەنێوەندی توێژی سەدوقیە توێژێکی دیکە پەیدا بوون کە ناوی ئاسینیە بوو، فەلسەفەکەیان جۆرێك بوو لە سۆسیالیستی و بەپێی بنەماکانی خۆیان دەژیان وەك ئاڵوگۆڕکردنی خۆشەویستی لەنێو ئەندامان و چێژ وەرگرتن و زاڵبوون بەسەر ئارەزووەکان و دژایەتیکردنی دەوڵەمەند، تا ئێستاش لەسەر خاکی فەلەستین ئەو جۆرە کۆمەڵە ماوە هەروا لە پێش هاتنە کایەوە زایۆنزم ئێستا لەنێوەندی تیۆری "نیشتمانی نەتەوەیی" کارەکانیان دەکەن و بەپێی بنەماکانی ئەو کۆمەڵەیە زۆرێك لە مۆڵگەکانیان دامەزراندووە، ئێستا بەو ناوە نین بۆیە بەیەکجاری ناویان لەنێوەندی کتێبەکاندا رەش بووەتەوە.

جوولەکەکان لەسەردەمی رۆمان و سەدەکانی یەکەم رووبەڕووی توند و تیژیەکی زۆر بوونەوە بەتایبەتی لەسەدەی ئایینی ئەورووپیدا، ئەمەش وایکرد لەرووی هزرەوە بەرەو لاوازی بڕۆن، زیاتریش لەو سەردەمانەدا گفتوگۆی ئایینیان دەکرد تا هەر نەبێت لەو وڵاتانە بمێننەوە تووشی راودونان نەبنەوە لەپاش ئەوەی دەوڵەتەکەیان نەما و پایتەختەکەیان داگیرکرا، بۆیە دەبینین لەنێوەندی (مشنە و تەلموود) هیچ لایەنێکی فەلەسەفی باسی لێوە ناکرێ یان باسێك سەبارەت بە دیووی سروشت هەبێ.

تائێستاش جوولەکەکان وان لەرووی عەقڵییەوە تا ئەو کاتەی بەرەو وڵاتە عەرەبیەکان کۆچیان کرد و لە دوورگەی عەرەبیدا و لەسەردەمی جاهیلیدا مانەوە، بۆ ئەمەش هەواداریەك لەنێوان جوولەکە و هۆزە عەرەبیەکاندا پەیدا بوو، چونکە هەردوولایان لەرەگەزی سامی بوون و پەیوەندییەك لەنێوان زمانی عەرەبی و عیبری هەبوو کە لەیەك رەچەڵەکە.

لەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلامدا جوولەکەکان بارێکی گرانیان نەکەوتە سەرشان بەڵکوو گەشەیان سەند و کۆمەڵەیەك لەوان خۆیان سەرقاڵ کرد بە زانست و ئەدەب و بەپێیە ئەستێرەیان بەدەرکەوت لەسەرەتاکانی ئیسلام و زۆرێك

لەبلیمەتــەکانیان جێگــەی متمانــەی خەلیفــەکان بــوون وەك ســەعیدی کــوڕی یەعقووب فەیوومی و سامۆئیلی کوڕی حەفتی.

سەعیدی کوڕی یەعقووبی فەیوومی لـەنێو جوولەکـەکان نـاوی سـەعدیە کـوڕی یووسفی میسرییە، کە سـەرۆکی قوتابخانـەی (سـۆرا)ی نزیـك بەغـدا بـوو، ئـەو یەکەم کەس بوو بیروڕاکانی ئاییـنیی جوولەکەی بەزمانی عەرەبی خستە بەردەم جوولەکەکان، تـەوەری ئـەم کتێبـە وەك سـەرکەوتنێکی گـەورە بـوو زیـاتریش باسـەکانی سـەبارەت بـە بـاوەڕ و پشـکنینی ئـاییـنیی بـوون، چـونکە عـەقڵی راستەقینە تاکە رێگەیە تا خاوەنەکەی بەرەو راستییەکان ببات، کاتێك سروش درا بـە خـاوەن پەیامـەکان، شـیکردنەوەی سـروش لـەلای ئـەوان درکپێکردنـی راستییە بالاکانە بوو، بەڵام خۆ ئەگـەر تـەنها عـەقڵ کـاری لەسـەر کـرد، ئـەوا ماوەیەکی زۆری دەوێ تا بەتەواوی درکی پێ بکەیت و بگەیتە تەوەرەیەك.

ئێمە سەعیدی کوڕی یەعقووب بە یـەکێك لەفەیلەسـووفەکانی دونیـا دادەنـێین، بەڵام ئەو زۆر نەژیا تا گەشەی فەلسەفەی عەرەبی لە وڵاتی ئەندەلووس ببینێ، ئەمەش کاریگەری جوولەکەکانی ئیسپانیا بوو، ئەوان تۆڵـەیان لـە قوتابخانـەی (سۆرا) کردەوە و ناوەکـەیان گـۆڕی و کردیـان بـە قوتابخانەیـەکی دیکـە و لـە قورتووبە دایانمەزراند کە نیشتمانی ئیبن ڕووشـد بـوو، لەوێدا لەسـەر دەسـتی پیاوانی زانا، زانست و فەلسەفە و هونەرەکانی ئەدەبیان فێری خەڵکی دەکـرد، پێیانوابوو جوولەکەکانی رۆژهەڵات ئەو زانستەیان پەراوێز خستووە.

ئەو قوتابخانەیە لەقوورتووبـە بـە کردەیـی دامـەزرا و خوێنـدکارانیش لەهـەموو لایەکەوە چوون بۆ وەدەستهێنانی زانست و لێرەوەش زۆرێك لەبلیمـەتی تیـادا هەڵکەوت، کە دواتر هۆکارێك بوو بۆ دامەزراندنی فەلسـەفە، ئەمـەیش بەسـوود وەرگـرتن لـە فەلسـەفەی یۆنـانی. تـا ئێسـتایش زۆرێـك لەکتێبـەکانیان لـە کتێبخانـەکانی ئـەوروپادا هەیـە، دیـارە خەلیفـە عەبـدولڕەحمانی سـێیەمیش

هۆکارێك بوو بۆ زیاتر بەردەوامبوونی ئەو قوتابخانەیە و بەرزکردنەوەی شکۆکەی.

لە چەندان هزرمەند و بلیمەت لەنێوەندی ئەو قوتابخانەیە هاتنە ئارا، لەنێوەندی ئەم پەرتووکەش چەندان جار ناوی هاتووە، هەروا مامۆستای ئیسرائیلی (منك) کە ناوی مووسای کوڕی مەیموونە کە لەلای نووسەر فەرەنسییەکان بە میمونید ناسراوە و لەسەدەی پانزدەهەم ژیاوە، دیارە بلیمەتیشی دەگەڕێتەوە بۆ دانایانی عەرەب و ئیسلام، چونکە پێیان باشبوو تا کۆکراوەی فەلسەفەی ئەرستۆتالیس و شەریعەتی موسەوی لەیەکتر نزیك بکەنەوە لەتەك ئەوەی هەموو باسەکان لەژێر بنەمای عەقڵ و لۆژیکدابن. لێرەوە مەسیحییەکانی ئیسپانی ئەو دانا ئیسرائیلیەیان لەزۆر شوێندا ئەشکەنجەداوە، دیارە ئەمەش دوای ئەوەی دەوڵەتی ئیسلام لەو ناوچەیە نەما، بۆیە رووی کردە میسر لەو کاتەی کە سەلاحەدینی ئەیووبی لەسەر دەسەڵات بوو، ئەویش کردی بە پزیشکی تایبەتی خۆی، سەیریش نییە کە ئەو دانایە بە مووسا دووەم و ئەفلاتوونی جوولەکە ناوی دەبرا.

زۆربەی زانایانی رۆژهەڵاتناس ئایینی ئیسلام بە ئایینێکی مەدەنی لەقەڵەم دەدەن چونکە گەشەسەندنەکان هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە هاتە کایەوە و کاتێکیش ئەو گەشەسەندنە زیاتر بەرەو پێش چوو کە زۆرێك لەوڵاتانیان واڵاکرد، ئینجا چ گەلانی رۆژهەڵات بێ یان رۆژئاوا، تەنهاش کتێبێکی ئایینی نەبوو، بەڵکوو سەرچاوەیەك بوو بۆ زیاتر لە سێسەد زانستی شەرع و زمان و مێژوو و ئەدەب و سروشت و گەردوون و فەلسەفە و زۆرێك لەزانستەکانی دیکە کە سەرچاوەکەی قورئان بوو، زۆربەی ئەو زانستانەش لەنێوەندی قورئاندا هاتنە ئاراوە بەمەش دەڵێن: زانستی ئامرازەکان.

ئەو کتێبە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر هاوەڵانی چونکە پێکهاتەکەی شەریعە و یاسا و سیستەمە سیاسییەکان بوو، لەتەك ئەمەیشدا کتێبێکە باس لە ڕێنمایی و ژیانی داهاتوو دەکات.

زۆرێك لەدەقەکانی هانی هاوەڵانی دەدا تا داواکاری زانست و پیاچوونەوە و لێکدانەوە و بیرکردنەوە بێ لە دورستکەری زەوی و ئاسمان و سیستەمی هەسارە و ئەستێرە و جیاوازیی شەو و ڕۆژ و گۆڕانی با و سەیر و سەمەرەی دەریا و موجیزەی دورستکردنی مرۆڤ و پێشکەوتن و درکپێکردنی هەموو کائینێك و خستنە رووی درەخت و ئاژەڵ کە هەمووی بۆ خزمەتی مرۆڤ هاتوونەتە کایەوە، لەنێوەندی ئەو کتێبەدا باس لە ڕووداوە مێژووییەکان و مێژووی نەتەوە زیندوو و ونبووەکان دەکات، بۆیە ئەمە هۆیەك بوو تا هەستی نەتەوەکان بجووڵێت کە باوەڕیان بەو کتێبە هێنا.

لەنێوەندی ئەو ژیانە دەوڵەمەندەی زانست و هزر و لێکدانەوە و ململانێی مانەوەی کۆن و نوێدا فەلسەفەی ئیسلامی لەدایك بوو، جیاوازیی نێوان ئیسلام و یۆنیانیەکان پەیدا بوو، یۆنانییەکان لەنێوەندی فەلسەفەی مەسیحیەتدا پەیدا بوون، بەڵام ئەمە هۆیەك بوو تا فەلسەفەکەیان لەنێوبچێ چونکە بەرهەڵستیەکی گەورە لەنێوان باوەڕە نوێیەکەیان و فەلسەفەدا هەبوو، بەڵام عەرەب و ئیسلام هەر لەسەردەمی جاهیلەتیشدا هەر بەدوای خوێندن و بەدواداچوون هەنگاویان دەنا تا هۆکارێك بێ بۆ لەدایکبوونی فەلسەفە.

سەدەی یەکەم و سەدەی دووەم خۆی ئامادەکردن بوو، تا ئەو کاتەی سەردەمی عەباسی یەکەم هاتە کایەوە کە بەسەردەمی زێڕینی ئیسلام ناودەبرێ، ئەمەش بۆ ماوەی سەد ساڵی خایاند واتە لە ١٣٢ك-٢٣٢ك بوو، لەو سەردەمە زێڕینەی دەوڵەتی ئیسلامدا شکۆی مەدەنیەت و سەروەری هاتە کایەوە، هەر لەو سەد ساڵەدا زۆرێك لە زانستە ئیسلامییەکان دەرکەوتن، زۆربەی زانستەکانی بیانی وەرگێڕدرانو سەر زمانی عەرەبی، بەغدا لەو کاتەدا

وەك پاریسی سەردەمی لویسی چواردەم وابوو، کۆشك و تەلاری خەلیفەکان جمەی دەهات لە زانا و دانا و پزیشك و ئەدیب و شاعیران. سایەی عەباسییەکان بەسەر هەموو ولاتانی ئیسلامیدا هەبوو، ئەورووپا لەو کاتەدا واتە نیوەی کۆتاییی سەدەی حەوتەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەم لەنێوەندی نەزانی و درندەیی دابوو، هەتا مێژوونووسانی ئەورووپا ناو لەو سەدەیە دەنێن سەدەکانی تاریکی (The Dark Ages) .

گەشەسەندنی ئیسلام تەنها پەیوەست نەبوو بەو گەلانەی کە باوەڕیان هێنا بەڵکوو ئەو کات هەموو ڕۆژهەلات بەرەو گەشەسەندن هەنگاوی دەنا ئەمەش بووە هۆی بەشێکی گۆیی زەوی بەرەو جولان هەنگاو بنێ و نەوەکانیش تۆزی تەمبەڵیان لەسەر خۆیاندا تەکاند، بەمشێوەیە فارس و تورك و تەتار و هیندی تا دەگاتە چین و ژاپۆن هەموویان هەستانە سەرپێ بۆ چاکسازیی ئەدەبی، لەسەردەمی عەباسیدا بزافی ئیسلام جۆرێك لەبوومەلەرزەی لەهەندێك ناوچەدا هێنا کایەوە، هەتا ئێستاش مێژوونووسانی چینی باس لەوە دەکەن کە شاعیرە بەتواناکانیان لەنێوان سەدەی نۆیەم و دەیەمی زایینی پەیدابوون بەتایبەتی لەسەردەمی ئیمپراتۆر کوڕی ئاسمان (تنگ). ژاپۆنییەکانیش لەو سەدەیە زمانی ژاپۆنیان زیاتر ڕێکخست و لایەنەکانی ڕێکخستنی شێوازە کۆمەلایەتیەکان خستە سەر ئەستۆی خۆیان و لەمەشدا چەندان بلیمەتی هونەری هاتنە مەیدان کە زۆرێك لەوان لەشاعیر و ئەدیب و وێنەکێش بوون.

بەو شێوەیە ڕۆژهەلاتی خوارووو سەروو کاریگەر بوون بەو گەشەسەندنە، هۆیەك بوون تا دەنگدانەوەی ئەو پێشکەوتنە هەموو لایەك بگرێتەوە، وەك چۆن ئەورووپا لەسەدەی نۆزدەهەم بەرەو گەشەسەندن هەنگاوی نا بەمشێوەیەش ڕۆژهەلاتی خوارووو سەروو لەگەشەسەندن دابوو.

یەکێك لەجیاکاریەکانی سەدەی عەباسی ئەوە بوو کە خەلیفە و میرەکان سەرقاڵی زانست و ئەدەب و مێژوو بوون وەك مەنسوور و ڕەشید و مەئموون و

وەزیر و شاعیرەکانیان، بەوشێوەیە کتێبەکانی مێژوو و ئەدەب هەموو لایەکی تەنی بوو، هەروا ژیان بوو بوو بەشێك لە زانست و ئەدەب.
یەکێك لەشانازییەکانی ئەو سەردەمە بیروبۆچوونەکان ڕەها بوون و خۆیان پاراست لە کۆت و بەندی لاساییکردنەوە بەو شێوەیە چەندان بزاڤ و کۆمەڵە پەیدا بوون، هەروا لێبوردەیی ئایینی گەیشتبووە لووتکە کاتێك مەئموون لەتەك سەرکەوتنی موعتەزیلەکاندا بوو کە قورئان مەخلووقە، ئەم بیرۆکانە لەرووی ئایینیەوە رەهابوونی ئازادی بوون، بەشێوەیەك هیچ کەسێك بەهۆی باوەڕەکانی دژایەتی نەکرێ، وەك نموونە شەش برا دوانیان شیعە بوون و دوانیان مەرجیئە و دوانەکەی دیکە خەوارج بوون و هەمووشیان لەژێر یەك سابانیماڵەوە دابوون.
بەلام ئەو خەلیفانەی کە گرنگیان بە گواستنەوەی زانستی دەرەکی و بیانی دەدا وەك یۆنانی و فارسی و سریانی و هیندی، لەوانە مەنسوور گرنگی بە پزیشکی و گەردوون دەدا، رەشید گرنگی بە ماتماتیك دەدا ئەمەش لە کتێبی (مجستی) بەدەردەکەوێ، مەئموون زۆر گرنگی بە فەلسەفە و لۆژیك و زۆرێك لەزانستەکان دەدا، ئەو کتێبانەی کە لەو سەردەمەدا وەرگێڕدران بۆ زمانی عەرەبی، سەدان بوون و زۆربەشیان یۆنانی بوون وەك ئەمانەی خوارەوە:

٨- سەبارەت بە فەلسەفە و ئەدەبی ئەفلاتوون
١٩- سەبارەت فەلسەفە و لۆژیکی ئەرستۆ
١٠- سەبارەت بە پزیشکی بکرات
٤٨- لە پزیشکی گالینۆس
٢٠ - (زۆربەیان سەبارەت بە ماتماتیك و گەردوون)ی ئەکلیدس و ئەرخەمیدس و بەتلیمۆس و چەندان زانای دیکە.
٢٠- لە فارسییەوە سەبارەت لە مێژووی ئەدەب.

٣٠–لـەزمانی سانسـکریتی سـەبارەت بـە ماتماتیـك و پزیشـکی و گـەردوون و ئەدەب.

٢٠–لەسریانی و نەبەتی، سەبارەت بە جوتیاری و کشتوکاڵ و جادوو و تەلیسم.

٢٠– لەلاتینی و عیبری سەبارەت بەچەندان جۆری ئەدەب و هونەر.

هەروا ئەوانەی ئـەو زانسـتیانەیان لـە زمانـە بیانییەکانـەوە وەرگێڕاوەتـە سـەر عەرەبی ئەمانەن:

١–خانەوادەی بختیشوع کە کوڕەکانی گەرگیوسی کوڕی بختیشـۆعی سـریانی نەستووریيە، ئەو پزیشکی خەلیفە مەنسوور بوو.

٢–خانەوادەی حەنین لەرەچەڵەکی حـەنینی کـوڕی ئیسـحاقی عـەبادی شـێخی وەرگێڕەکان بوو، کە کریستانیەکانی حیرە بوو.

٣– حبیش ئەعسەمی دیمەشقی، خوارزای حەنین.

٤–قەستا کوڕی لۆق بەعلبەکی لەکریستیانەکانی شام.

٥– خانەوادەی ماسرجویە جوولەکەی سریانی .

٦– خانەوادەی سابتی حەرانی لە سائیبەکان بوو.

٧– ئەبووبشر مەتی کوڕی یوونس.

٨– یەحیای کوڕی عودەی

٩– ئەستیفان کوڕی باسیلی.

١٠– مووسای کوڕی خالد.

ئەمانە زانستەکانیان لە یۆنانی و سریانیەوە گواستەوە بۆ عەرەبی.

بەڵام ئەوانەی زانستیان لەفارسییەوە گواستەوە بۆ عەرەبی ئەمانە بوون:

١– ئیبن مقەففەع

٢– خانەوادەی نۆبخت، گەورەکەیان نۆبخت و فەزڵی کوڕی بوو.

٣– مووسا و یوسفی کوڕی خالد.

٤– عەلی کوڕی زیادی تمیمی.

٥- حەسەنی کوڕی سەهل.

٦- بەلازری ئەحمەدی کوڕی یەحیا.

٧- ئیسحاقی کوڕی یەزید.

ئەوانەی لەزمانی سنسکریتەوە زانستەکانیان گواستەوە بۆ عەرەبی ئەمانە بوون.

١-مکە هندی .

٢-ئیبن دەهنی هیندی

هەروا ئەوانەی لەزمانە بەتیەوە گواستەوە بۆ عەرەبی ئەمانە بوون:

١-ئیبن وەحشیە کە چەندان کتێبی وەرگێڕاوە، لەهەموویان گرنگتر (جوتیاری نەبتیەکان)

ئەوەی دەبیندرێ موسڵمانان لەسەردەمی خۆیاندا زۆربەی ئەو زانستانەی باو بوو گواستوویەتیانەوە بۆ سەر زمانی خۆیان، ئەمەش بەسەردەمی زێڕینی موسڵمانان دادەنرێ بەتایبەتی کاتێك زانستەکانی فەلسەفە و پزیشکی و گەردوون و ماتماتیك و ئەدەبیات وەرگێڕاوە، لەنێوەندی هەر یەك لەنەتەوەکان باشترین نووسەر و فەیلەسووفیان هەڵبژاردووە کە بەشێوەیەك جێپەنجەیان دیار بووە، لەبوارەکانی ئەدەب و فەلسەفە و هونەر، وەك لە یۆناندا ئەوانەیان هەڵبژاردووە کە بەهایان بۆ بابەتەکانیان داناوە لەرووی ئەدەب و فەلسەفەدا، ئەمەش لەبەر چەندان هۆکار کە لەوانەیە زۆر دوور و درێژ بێت لێرەش بوار نەبێ باسی لێوە بکەین، هەموو ئەمانەش لە کتێبی (الشهاب الراصد) باس لێوە کردووە، بەتایبەتی لە لاپەڕە ١٦٠، هەروا بەراوردیشی تیایە سەبارەت بە بەراوردی نێوان عەرەب و یۆنان و رۆمەکان.

دیارە ئەو نووسینانەی کە گوازراوەتەوە بۆ عەرەبی گەردێك بوو دواتر گەشەی کرد و باشترین دیاری بوو بۆ موسڵمانان و گەلانی دیکە و بووە بەشێك لە ژیاریان لەنێوەندی چواردە سەدە دوای ئەوەی ئیسلام بەدەرکەوت.

سەردەمی عەباسی یەکەم و سەردەمی فارس چاندنی تۆی زانست بوو، بۆیە لەسەردەمی دووەمدا دەست بە درووینەوەی کرا، هاوکات ئەوەی گرنگە ئەوانەی کاریان لە فەلسەفە وزانست لەسەردەمە یەکەمی عەباسیدا زۆربەیان ئەدیب و ئەهلی کتێب بوون، کە زۆربەیان موسڵمان نەبوون، دواتر موسڵمانان دەستیان بەکارکردن کرد، لەپێش هەموشیان یەعقووبی کوڕی ئیسحاق کیندی بوو، کە لەنێوەندی ئەم گەڕانەماندا دەستمان کردووە بەتوێژینەوە لەسەر ئەو، ئەویش لەنەوەکانی سەدەی سێیەمی کۆچییە.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە سەدەی دووەمی عەباسی سەدساڵی خایاند، وەك پێشتر لەچارەگە سێیەمی سەدەی سێیەمی کۆچیدا دەستی پێ کرد، ئەم دەستپێکردنەش لەچارەگی یەکەمی سەدەی چوارەم کۆتایی هات، هەروا سەدەی سێیەمی عەباسی مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٣٣٤–٤٧٤ك) کە سەدەی ئیبن سینا و ئیخوان سەفا و غەزالی بوو.

لەسەدەی چوارەمی عەباسیدا ئەو زانستە هاتووانە بەرەو وڵاتی ئەندەلووس هەنگاوی نا لەپاش ئەوەی نامەکانی ئیخوان سەفا ئاشکرا بوون لەپاش سەد ساڵ، بۆ ئەمەش چاکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەبی حەکەمی عەمری کوڕی عەبدولڕەحمانی کرمانی قورتوبی لەوکاتەی لەئەندەلوسەوە کۆچی کرد بۆ رۆژهەڵات، وەك داواکارێکی زانستی، کاتێك گەڕایەوە دانەیەك لەو نامانەی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو، ئەمەش وایکرد ئەندلووسییەکان پەیوەست بن بەفەلسەفەوە و خۆشیان بووێت و چەندان توێژینەوەیان لەو بوارە ئەنجامدا مەبەستی سەرەکیشمان ئیبن رووشدە، هەر لەو وڵاتەدا ئیبن باجە و ئیبن توفەیل و ئیبن رووشد و ئیبن خەلدوون بەدەرکەوتن لەتەك چەندان فەیلەسووف و دانا و پزیشك و ماتماتیکناس و گەردووونناس و کیمیاگەر ئەمانە لەو وڵاتە زۆر ناودار بوون.

بەڵام کاتێك دەوڵەتی ئیسلام لە ئەندەلووسدا کۆتایی هات، بەو شێوەیەش فەلسەفە کۆتایی هات، لەپاشانیشدا هیچ مەمالیکێکی ئیسلام لەوێدا دەسەڵاتیان نەگرتە دەست، فەلسەفەش بەو شێوە بە لەوڵاتانی ئیسلامیدا بوونی نەما، تا ئەو کاتەی محەمەد جەمالەدینی ئەفغانی بەدەرکەوت، لەکۆتایی سەدەی ڕابردوودا (سەدەی نۆزدە) کۆچیدوایی کردووە.

ئەوەی شیاوی باسە بەدەرکەوتنی فەلسەفە و گەشەکردنی زیاتر پەیوەست بووە بە هێزی ئایینی ئیسلام و چۆنیەتی فراوان بوون، کاتێکیش باوەڕە ئایینیەکان لاواز بوون، لاوازی بەتوێژینەوە عەقڵییەکان بیندراوە کە لەسەر ئەو باوەڕانە بنیاتنراون، ئایینی ئیسلام بەپێچەوانەی زۆربەی ئایینەکانی دیکە فەلسەفەی بەهێز تر دەکرد و پەرەی پێ دەدا، ئەمەش لەلایەن "رێنان"ەوە تێبینی کراوە. لەزۆربەی نووسینەکانیشی باسی لەوە کردووە کاتێك فەلسەفە دابەزیووە باڵی ئایینی بەهێز بووە، کاتێکیش فەلسەفە بەهێز دەبێ باوەڕە ئایینیەکان لە ئەورووپا بەرەو هەڵدێر هەنگاویان ناوە.

فەلسەفەی نوێی ئەورووپی ڕووناکی نەدیت تا سەدەی حەڤدەهەمی زایینی، ئەمەش لەپاش ئەوەی کۆت و بەندی مەسیحیەت بەرەو لەناوچوون ڕۆیشت و وێنای زوڵمیش ونبوو، بەشێوەیەك لەو سەردەمەدا بەهەموو شێوەیەك دەیانویست هزرمەندێکی ئازاد لەناو ببەن، بەتایبەتی ئەو ڕووداوەی لە ئیسپانیادا لەسەر دەستی دادگای تەفتیش هاتە ئاراوە، هەروا لە ئیتاڵیا دژ بە گالیلۆ و هاوشێوەکانی، هاوکات لە سویسرای پرۆتستانی، کاتێك "کالڤن"ی ناودار فەرمانیدا "میشێل سرڤیە" بسووتێنن و لەسێدارەی بدەن، ئەمەش لەپاش ئەشکەنجەدانێکی زۆر لەزیندان، تاوانەکەشی بەبۆچوونی کالڤن ئەوە بوو کە لەپێش "هارڤی" ئینگلیزی سووڕی خوێنی لە لەشی مرۆڤدا دۆزییەوە.

کالڤن گومانی لەوە بوو ئەمە پێچەوانەی ئایینە ناکرێ لێی ببورێ (!؟) نەوەکانی ئێستا هیچ شتێکی وا نابیننەوە دەربارەی ئەو کارە دڕاندانەی کالڤن

کردوویەتی، تەنهاش ئەوەندە نەبێت پەیکەرێکیان بۆ دروستکردووە لە مەرمەڕ لەگوندی "ئەنماس"ی دەروازەکانی جنێف، تیایدا زانای سروشتی مشێل سرفیە بەکۆت و زنجیر و جلوبەرگی زیندان راوەستاوە، کە بە هەموو شێوەیەك پەریشانە لەپاش ئەوەی زیندەوەر و ئەسپیّ لەشی داهەزراندووە !.

فەلسەفە لەدێرزەمانەوە پابەند بووە بەچەندان سیستەم کە ئەرستۆی مامۆستای یەکەم دایناوە، کە لۆژیك و ئاکار و ئالیهاتە، هەروا هەنگاوی دەنا تا ئەو کاتەی دیکارت بەدەرکەوت و بۆ ئەمەیش فەلسەفەی نوێی دامەزراند لەسەر بنەمای توێژینەوە لە رێگەی گریمانەیی تا دەگاتە راستی و یەقین، لەپاشاندا ئەم بنەمایە لەلای" هیۆم"ی ئینگلیزی و "کانت"ی ئەڵمانی و "سپینۆزا"ی هۆڵەندی پراکتیك کرا.

هەر لەسەدەی نۆزدەهەمەوە چەندان رەوتی نوێی فەلەسەفی لە ئەڵمانیا لەسەر دەستی "شۆپنهاوەر" هاتنە کایەوە، کە کاریگەر بوون بە"گۆتە"ی مامۆستا و هاوڕێی خانەوادەکەی بە "فریدریك نیچە" کۆتاییی هات، لە دواتردا لە فەڕەنسادا "برجسۆن" خاوەنی ئایدیای (الحدس) intuitionتا ئێستاش فەلسەفەی ئەورووپی نویّ لەو رادەیە وەستاوە تا ئەو کاتەی یەکێکی دیکە ئەمەی لیّ وەردەگریّ و بوارێکی نویّ دەدۆزێتەوە نەوەك وەك بیست ساڵی رابردوو (مەبەستی سەدەی نۆزدەهەمە) بەرەو رووخان بچیّ، کە هیوا و ئاواتەکان چووە نێوەندی هەست و ئارەزووی مرۆڤەکان بە شێوەك لەهیوا و ئاواتی سەروەریەوە بەرەو هیوای خۆشگوزەرانی هەنگاویان نا، دیارە هەموو هێز و توانایەکی مرۆڤ بەبەهرەی عەقڵێکی تەندروست بەرەو هزرێکی راستەقینە هەنگاو دەنیّ.

سەیریش نییە، کە ئێستا ئێمە لەسەدەی چواردەهەمی کۆچیداین کە هاوشێوەی گەشە و پەرەپێدانی ئەدەب و زانستەکانی ئەورووپاین، لەپاش ئەوەی تاریکی سەدەکانی ناوەڕاست ونبوو، بەشێوەیەك "مێژووی

فەیلەسووفەکانی ئیسلام" بڵاوبکەینەوە و لێرەوەش هەموو بنەماکانیان روونبکەینەوە تا هۆکارێك بۆ جووڵە و بزاڤەکان لەپاش ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژ خۆی نەتەکاندووە، ئەمەش هەر لەسەردەمی ئیبن رووشدەوە تا ئێستامان.

محەمەد لوتفی جومعە

"بیت یحیی و زکریا" عین شمس

بەیانی چوارشەممە ١٦ی زولقەعدەی ساڵی ١٣٤٥ك



وێنەی پێشەکی

دەستنووس و قەڵەمدان ئیمامی غەزالی

ئـەو قەڵەمدانـە کانزایـە گرانبەهایـە، لەنێوەنـدی ئەنتیکـەکانی خانـەی شوێنەواری عەرەبییە، پـارێزراوە لـە تۆمارێکدا بـەژمارە ٣٣٣١ کـە قەڵەمدانـە

کانزاییــە شــێوە چوارگۆشــەیە کــە لەهــەموو لایــەکی بــەزیوو نەخشــێندراو و نووسراوە، لەلایەکی دیکەوە بەشێکی نەخش و نیگارەکەی ونبووە و دیار نییــە ئەمەش دەقی ئەو نووسینەیە کەلەسەریەتی:

"گەنجینەی ئیمامی رەبانی مەزن و موفتی ئەو کۆمەڵانەی کە زمانیان بەراستی و هەق دەجوولێ و بلیمەتی جیهان و سوڵتانی زانایان...گەنجینــەی راســتەقینە باشــترین زانــا محیّــدین حجــەتی ئیســلام محەمــەد غــەزالی"، شــوێنی خاڵــەکان زۆریەیان دیار نییە.

ئەم شوێنەوارەش دیــاری خەواجــە کتیکــاس بازرگــانی شــوێنەوارە بــۆ خانــەی شوێنەواری عەرەبی، ئەمەش لەســەردەمی خوالێخۆشــبوو عــەلی بــەگ بەهجــەت لەســاڵی ١٩٠٦، وێنەگرتنەکــەش دەگەڕێتــەوە بــۆ مامۆســتا جاســتۆن فیبــت بەڕێوەبەری خانەی شوێنەواری عــەرەبی، ئەمــەش بــە ئامــادەبوونی مامۆســتا ئەداوارد لامبیر بلیۆن لەساڵی ١٩٠٩ و بــە ئامــادەبوونی حســێن راشــد ئەفەنــدی ئەمینداری خانەی شوێنەواری عەرەبی.



گۆڕی شێخ محیدین بن عەرەبی

گۆڕی شێخ محیدین بن عەرەبی لەساڵحییەی شاری دیمەشقی پایتەختی سووریایە، ئەم وێنەیەش لە کتێبی (استشهاد الحلاج) ماسنیۆن وەرگیراوە و لەلایەن زانای گەورەمان محەممەدی کوڕی عەلی سەرۆکی کۆڕی زانستی عەرەبی –دیمەشق پێشکەش کراوە.

## (١-كيندى)

ئەبو يوسف يەعقووبى كوڕى ئيسحاقى كيندى فەيلەسووفى عەرەب و ئيسلام و يەكێك لەنەوەى پاشاكانيەتى لە خانەوادەى كيندى و يەكێكە لە نەوەى ميرەكانى دوورگەى عەرەبى، هاوكات ئيسحاقى كوڕى سەباح لەكووفە مير بووە لە سێ سەردەمى خەليفە عەباسييەكان (مەهدى و هادى و رەشيد) و رەچەڵەكى باوك و باپيرانى دەگەڕێتەوە بۆ يەعريى كوڕى قەحتان، لەنێوانياندا ئەشعەتى كوڕى قەيس لەهاوەڵانى پەيامبەر بوو، لەپێشتردا پاشا بووە لەكيندە وەك چۆن باوكى مير و پاشا بووە، لەگەڵ ئەوەى باب و باپيرانى وەك مەعدى كرب پاشا بووە لە حەزرمۆت و مەشعەر و يەمامە و بەحرێن.

مێژوونووسان بەروارى لەدايكبوونى كيندى و كۆچيدوايى كيندى تۆمارنەكردووە، تەنها باسى ئەوەيان كردووە كە لەسەدەى سێيەمى كۆچى بووە، فلۆجل جەختى لەوە كردۆتەوە كيندى لە نيوەى يەكەمى سەدەى دەيەمى زاينيدا لەدايكبووە و لەپاش ساڵى ٨٦١ز كۆچيدوايى كردووە.

ئەمەو ناجى ئيتاڵى زانا كە يەكێكە لە مامۆستايانى فەلسەفە لەرۆما و زۆر گرنگى بە فەلسەفەى عەرەبى دەدا كە لەكۆتايى سەدەى نۆزدەهەم كۆچى دوايى كردووە و چەندان كتێبى بەلاتينى بڵاوكردۆتەوە، باس لەوە دەكات

کۆچی دوایی کیندی ساڵی ۲۵۸ کۆچی بەرامبەر ۸۷۳ زاالینییە، ئەوەش دەخاتە ڕوو کە لەساڵی ۱۹۸ك لەژیاندا بووە و ئەو کاتیش تەمەنی حەفتا ساڵ بووە.
سلێمانی کوڕی حەسان کە کوڕی جەلجەلی ئەندەلووسییە، باس لەوە دەکات کیندی خەڵکی بەسرا بووە و بەسردا کێڵگە و مێرگێکی هەبووە و دواتریش چووەتە بەغدا، لەقوتابخانەی ئەوێدا دەرچووە دوای ئەوەی لەقوتابخانەکانی بەسرا خوێندوویەتی، ئەو زانایایەك بوو لە بوارەکانی پزیشکی و فەلسەفە و زانستی بیرکاری و لۆژیك و نۆتە دانان و ئەندازیاری و ئەستێرەناسی، ئەوەش دەخرێتە ڕوو کە شارەزایی هەبووە لەزانستەکانی گریك و فارسەکان و لە دانایی هیندییەکان شارەزا بووە و هەروا گرنگی بەهەردوو زمانی ئەو سەردەمە داوە کە زمانی یۆنانی و سریانی، بۆیە مەئموون ئەو و چەندان دانا و زانای ڕاسپارد تا نووسینەکانی ئەرستۆ و فەیلەسووفەکانی یۆنان بگوازێتەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی.
سلێمانی کوڕی حەسان باس لەوە دەکاتە کە لەئیسلامدا تاکە کەس بووە وەك فەیلەسووف، مەبەستی لەوەش ئەوە بووە کە یەکەم فەیلەسووفی ئیسلامە، لەلایەکی دیکەوە کیندی هاوشێوەی ئەرستۆ بوو لە شیکردنەوەی کتێبە فەلسەفییەکاندا و شێوازەکەشی ساکار بووە تا زوو بیگەنێ، دیارە ئەمەش بەهۆی باڵا دەستی لە وەرگێڕاندا، ئەمەو شازان لەیاداشتەکانی سەبارەت ئەبی مەعشەر کە لەنێو میسرییەکاندا ناودار بوو بەتایبەتی لەڕووی ئەستێرەناسیەوە، لەوێدا باس لەوە دەکات کە چوار کەس لە توێژینەوەدا باڵادەستن یەکێك لەوانە یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کیندییە.
هاوکات هاوسەردەمەکانی ئێرەییان پێ بردووە وەك قازی ئەبوو قاسم و ساعدی کوڕی ئەحمەدی قورتوبی کە لەنێو کتێبەکەی (طبقات الامم) کاتێك

باس لە کتێبەکانی لۆژیکی کیندی دەکات دەڵێت "دووپرووپی خستۆتە ناو خەڵکییەوە بەشێوەیەکی گشتی، زۆر بە کەمی کارەکانی زانستین، چونکە هیچ جۆرە شیکردنەوەیەکی زانیاری تیادا نییە تەنها ئەوە نەبێ پووچەکانی بەراست زانیووە، سەبارەت بەکارەکانی پێکهاتە لە کتێبەکانی یەعقووب، باس لەوە دەکات تەنها بۆ پیشەکییە کۆنەکان دەگونجێ، لەوێدا دەتواندرێ ببێتە پێکهاتەیەك، ئەمەش کەمایەتی و کەمتەرخەمییە و هەروا زانیاری لەسەر نەبووە، بەڵام ئەو وای زانیوە شتێکی نوێی بۆ خەڵکی دۆزیوەتەوە بەتایبەتی لەوتارەکانی سەبارەت بەبوارەکانی زانستی بەگشتی، چەندان شوێنەواری خراپی تیادا بەدەردەکەوێ و دوورە لەهەموو بنەماکانی ڕاستی".

لێرەوەش دیارە ئەو قازییە قورتووبییە تەنها رقی لێی بووە، بەڵام ئەم بۆچوونە هەمان بۆچوونی زانایانی فەرەنجییەکان نەبووە سەبارەت بەکیندی، هاوکات گلیۆم کردانۆ کە لەساڵی ١٥٧٦ کۆچیدوایی کردووە ئەو بەیەکێك لەو دوانزدە بلیمەتەی دادەنێ کە شێوەیان لەزیرەکی نەبووە، پێش ئەوان تا سەدەی شانزدەهەمی زایینی زانای لەو شێوە بلیمەتە نەبووە، هەروا رۆجەر باکۆن کە قەشەیەکی ئینگلیزە و لەسەردەمی سێزدەهەم ژیاوە و یەکێك بووە لەناودارانی سەدەی سێزدەهەم باس لەوە دەکات کە "کیندی و حەسەنی کوڕی هەیسەم لەریزبەندی یەکەمن لەگەڵ بەتلیمۆس، زانای زانستی بینین بوون، ئەمەو بەشێك لەوتارەکانی بڵاوکراوەتەوە لەدەروازەی جیراردی کریمۆنا".

نووسینە فەلەسەفییەکانی کیندی و شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەکانی بۆ دانایی ئەرستۆ بۆ یەکەمجار بووە عەرەب و ئیسلام تۆماری کردووە، لەنێوەندی ئەمانەش باس لەو کتێبە دەکەین کە سەبارەت بە خستنە ڕووەکانی ماقووڵی ئەرستۆتالیسە، ئەمەو ئیبن ئەبی ئەسبیعە لە کتێبی طبقات الاطباء وتارێکی

نووسیووە سەبارەت بە بەو کتێبانەی ئەرستۆ تا سەرکەوتوو بووە تیایدا چۆن پێویستمان پێیەتی بۆ زانینی فەلسەفە بەتایبەتی بەشێوەیەکی رێك شتەکانی رێکخستووە، مەبەستی لەو کتێبەش ئەو وتارانە و وتانەیە کە بە وتارە درێژەکەی ناسراوە بەپێوەری زانستی، هەروا یەکێك لەکتێبەکانی ئەرستۆ ئەتلۆجیا سەبارەت وتەکانیەتی لەسەر خواوەندەکان وەك شیکردنەوەیەکی فارفۆیۆرسی وێنەییە، کە وەرگێڕانەکە بۆ زمانی عەرەبی لەلایەن عەبدولمسیح ئیبن عەبدوڵلا ناعمە حمسییە، بژاردە و چاککردنەوەکانی لەلایەن ئەحمەد کوڕی موعتەسەم بالله ئەبو یوسف یەعقووب کوڕی ئیسحاقی کیندییە و لەساڵی ١٨٨٢ لە بەرلین چاپ کرا.

لەسەرەتا باسمان لەوە کە کیندی لەپێشەنگی ئەوانە بوو کە ئەرستۆی شیکردووەتەوە، بەڵام لەپاش ئەویش ئیبن سینا باسی لێوە کردووە و سەرکەوتووتر بووە، ئەمەو ئیبن جەلجەل پێش ئەو فەیلەسووف لەنێو ئیسلامدا نەبوو (ئەمەش لەپاش کۆچیدوایی فارابی نووسراوە) بۆیە ئیبن سینا زۆر باشتر سەرکەوتوو بووە لە روونکردنەوەی ئەرستۆ.

بەڵام نووسینەکانی کیندی پەیوەست بووە بە زۆربەی زانستەکان، هەروا کتێبی سەبارەت بە فلەسەفە و زانستی سیاسی و ئاکار و ئەرسماتیکی و زانستی سوورەکان و میوزیك و گەردوون و جوگرافیا و ئەندازیاری و سیستەمی گەردوون و ئەستێرەناسی و پزیشکی دەروون و رەهەندەکانی تۆمارکردووە، ئەمەو لە "المساكن" وتارە مەزنەکەی نووسیوە، هەروا وتاری چوارەمی سەبارەت بە زانستی کانزاکان بووە کە تیایدا باسی خشڵ و هاوشێوەکانی و بەردە بەنرخەکان دەکات، هەروا وتارێکی دیکەی سەبارەت بەشووشە و چەندان جۆری ئاسن و شمشێرە، لەلایەکی دیکەوە کتێبێکی نووسیووە

سەبارەت بەکیمیا کە بەوتاری بۆن و جۆرەکانی دادەنرێ لەکیمیای بۆندا، هەروا کیمیاگەرەکانی ئاگادارکردووەتەوە نەوەك فریو بدرێن، هەروا وتارێکی سەبارەت بە سروشت و ئەو تەنانەی لەنێو ئاودان، لەتەك ئەوەی وتارێکی هەیە سەبارەت بە کاری ئاوێنەی شکاوەکانی باوەڕ، لەلایەکی دیکەوە چەندان کتێبی دەستنووسی هەیە لەکتێبخانەکانی ئەورووپا و بڕۆکلمان لە ناوەڕۆکەکەی باسی لێوە کردووە، ئەوەی سەیری نووسینەکانی کیندی بکات ئەوە دەبینێ کە لەنێوەندی عەقڵدا نەچۆتە دەرەوە، ئەمەو سنتلانا مامۆستای مێژووی فەلەسەفە لە زانکۆی میسری لە ساڵی ١٩١١ز باس لەوە دەکات "ئەو (بینۆناجی) کەپێشتر باسمان لێوە کردووە ئەوەی خستۆتە روو کە لەساڵی ١٨٩٧ پێنج وتاری فەلسەفی کیندی بڵاوکردۆتەوە کە سەبارەت بەبەهای عەقڵ بووە هەموو بابەتەکانیش بەلاتینی بڵاوکراوەتەوە".

لەنێو نووسینەکانی کیندی شتێك سەبارەت بە ئایین نییە، بەڵکوو ناودار بووە بەخستنە رووی بۆچوونەکانی لە کتێبی (واجب الوجود) ئەمەو توندڕەوەکانی سەردەمەکەی زۆر دژی وەستاونەتەوە، بەبۆچوونی ئەو وتارێکە سەبارەت بە یەکتاپەرستی، باس لەوە دەکەن کە عەبدولەتیفی بەغدادی یەکێك بووە لە پزیشکەکان و نووسەری کتێبی (اخبار مصر) و لەسەدەی دوانزدەهەم ژیاوە و یەکێك بووە لە فوقەها توندڕەوەکان وتارێکی سەبارەت بە کتێبەکەی کیندی نووسیوە، باسی لەوە کردووە ئەوەی نووسیویەتی کەموکورتیەکانی کیندی تەواوکردووە، لەلایەکی دیکەوە نووسەری کتێبی (المقاله الکندی) باسی لەوە کردووە کە کیندی یەکەم کەس بووە ڕووبەڕووی ئیسلام بۆتەوە، مەبەستی لەوەش بیدعەکارانە و هەر لەو نووسینەشدا باسی زۆرێك لە موعتەزیلەکان کردووە وەك واسڵی کوڕی عەتا لەسەرەتای سەدەی دووەم و عەمری کوڕی

عوبێد و نیزامی کە قوتابی ئیبن هەیسەم و جاحز بووە، ئەوانەی دژ بە کیندی بوون تەنها یەك رستەیان لێ وەرگرتووە و دژایەتیان کردووە کاتێك گوتوویەتی " خوا هەیە یان نا"، دیارە ئەمەش وتەیەکی ئەرستۆیە بەشاراوەیی بۆ ئەوانەی دان بە بوونی خوا نانێن و خەسڵەتە ڕەهاکان جیایە لە خود، هاوکات ئەرستۆ نکۆڵی لە خەسڵەتەکان دەکرد و دەیگوت ئەو و خودەکان یەك شتە ئەمەیش بە سانایی باس لە بوون و نەبوون دەکات.

لەتــەك ئــەوەی موعتەزیلــە و ســوننییەکان لەســەر گەوهــەری بابەتەکــە ڕێککەوتوون، موعتەزیلەکان دەڵێن "خودا زانایە لە بوونی و تواناداره لە خود و بوونیدا" واتە هەموو خەسڵەتەکانی دیارە، بەڵام ئەوانەی خەسڵەتی بۆ دادەنێن ئەوا جەماوەری موسڵمانانە و دەڵێن "خـوا زانایـە بەهـەموو زانسـتەکان بـە شێوازێك ناوی جیهانە و تواناداره لەهەموو شتێکدا" ئەم خەسڵەتانەش هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ خود، ئەگەر لەیەکتر جیا کرایـەوە ئـەوا موعتەزیلـە دووبارە بەرەو گومڕایی هەنگاو دەنێننەوە، موعتەزیلە لەکۆنەوە باس لەوە دەکـەن کـە سـێزدە جێگیرکـراو هـەن ( پێنجیـان نـا ئـەرێنین و یـەکێکیان دەروونییە و حەوتیشیان مانایە)، کاتێك لە یەکێك لە موعتەزیلەکان دەپرسی پێت دەڵێن خودا توانایەکی گەورەی لـەبن نـەهاتووی هەیـە ئەمـە لەسـەری ڕێککەوتوون و هەموو موسڵمانیش لە ناوەڕۆکی ئەم بابەتە ڕێککەوتوون.

یەکەم دوژمنی سەرەکی هاوسەردەمی کیندی ئەبو معشەر بوو، ئیبن نەدیمی بەغدادیی لەکتێبێکدا بەناوی "الفهرست" کە نووسەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئیبن ئەبی یەعقووب، باس لەوە دەکات "ئەبا مەعشەر، جەعفەری کوڕی محەمەد بەڵخی لەوانەیە کە هەردەم گفتوگۆ سەبارەت بەباتەکان دەکات کەماڵەکەی لەبەشـی ڕۆژئـاوای دەروازەی خوراسـانی بەغدایـە، ئـەو هـەردەم لەبـەردەم

خەڵکیدا باسی زانستی فەیلەسووفەکانی دەکرد، کاتێك کیندی ئەو شتەی لە ئەبوو مەعشەر بینی خۆی لێ لادا بۆیە خۆی زیاتر بە زانستی ماتماتیك و ئەندازیاری سەرقاڵ کرد، ئەو وتارانەش زیاتر لەبەرژەوەندی ئەبوو مەعشەر دابوو، بەڵام لەدواتردا لەهیچ کام لەزانستەکان سەرکەوتوو نەبوو، کەچی لە تەمەنی چلوحەوتساڵیدا فێری ئەستێرەناسی، دواتر بوو بە قوتابی کیندی لەپێشتریشدا گەورەترین دوژمنی بوو!

ئەبو جەعفەری کوڕی یوسف لەکتێبی (حسن العقبى) کە ئەبوو کامل شجاعی کوڕی ئەلحاسب دەگێڕێتەوە کە "لەسەردەمی متوەکلدا دوو کوڕی خراپی هەبوو بەناوی محەمەد و ئەحمەد کە کوڕەکانی مووسای کوڕی شاکرە، ئەو دوو برایە فریوو و ئازاری ئەو کەسانەیان دەدا کە دەیانویست بەدوای زانستدا بکەون یان زانیاری بوێ، هەردەمیش لەلای متوەکل کێشەیەکیان بۆی دورست دەکرد، کاتێك بەهەموو شێوەیەك کەشەکەیان بۆ ڕەخسا کێشەیەکیان بۆ دورست کرد، ئەمەش وایکرد خەلیفە بانگی بکات و داوای لێ بکات هەموو نهێنیەکانی باس بکات، دواتر هەموو کتێبەکانی لێ وەرگرت و لە گەنجینەیەك داینا کە دواتر ناونرا بە گەنجینەی کیندی.

باسیش لەوە دەکرێ کە هەردوو برا هەر یەك لەو برایانە بەجیا کاریان بۆ متوەکل دەکرد و هەموو ئەوانەیان تووشی کێشە دەکرد تا بەهەر شێوەیەك پارە و پوول وەربگرن لە متوەکل، لەدواتردا کارەکەیان ئاشکرا بوو کاتێك زێی ناسراو بەجەعفەریان هەڵدەکەنی بەتایبەتی کاتێك هەڵکەندنەکەیان خستە ئەستۆی ئەندازیارێکی ناسراو، بەڵام ئەوان دەیانویست کارەکە رابگرن، زۆرێك لەپارەی متوەکلیشیان خوارد، بۆیە کاتێك ئەمەیان بەمتوەکل گوت، خەلیفە سوێندی خوارد لەسەر زێیە لەداریان بدا، بەڵام لەدواتردا لەلای سەندی کوڕی

عەلی پاڕانەوە، کە پێشتر هەموو شتێکی خراپیان لەلای متوەکل باس کردووە، کاتێك سەند ئەمەی باس کرد لەلای متوەکل ئەویش لەوەڵامدا گوتی "ئەوان هەموو کێشەیەك دەنێنەوە تا نێوانی من و کیندی دوروست بکەن و دوژمنایەتی بهێننە کایەوە و لەیەکترمان دوور بخەنەوە، تەنهاش ئەو کاتە لێتان دەبوورم کە کتێبەکانی کیندی بگەڕێتەوە" لەپاشاندا محەممەدی کوڕی مووسا هەموو کتێبەکانی گەڕاندەوە، لێرەوەش بە متوەکلیان گوت ئەوان هەڵەیان نەکردووە تا ڕزگار بن لەو سزایە، هاوکات دوای دوو مانگ متوەکل کۆچدوایی کرد پێش ئەوەی ئاو بخرێتە نێو زێیەکەوە.

زۆربەی ئەوانەی توێژینەوە لەسەر داناکان دەکەن و باس لەهەندێك لەوتەکانیان بۆ زیاتر نزیککردنەوەی لە بۆچوونەکانیان بەکاری دەهێنن، زۆرجاریش بەناوی هەندێك لەئەدیبەکان دەنووسرێ، زۆرجار هەندێك وتەم خوێندۆتەوە بەناوی سوکراتەوە لکێندراوە، دەبینی لەلایەکی دیکەوە بەناوی کۆنفۆشیوس و لوقمان و چەندان کەسی دیکەیە، لەتەك شتی دیکەی ورد بەمشێوەیە دەبیندرێ.

وتە و وشەکانی کیندی بۆ دووبەش دابەش دەکرێن، کە پەخشان و شیعرن، پەخشانەکانی لەسێ لایەندا خۆی دەبینێتەوە یەکەم ئامۆژگاری بۆ پزیشك و دووەمیان هەوڵدان بۆ ساکاری و سێیەمیشیان ئاگادار بوون لە نزیکەکان، سەبارت بەو حەوت بەیت لەشیعر باسکراوە کە لەلایەن عەسکەری لە کتێبی (حکم و الامثال) گێڕدراوەتەوە کە ئەمەی خوارەوەیە:

اناف الذنابی علی الاروٴس    فغمض جفونك او نكس
وضائل سوادك واقبض یدیك    وفی عقر بیتك فاستجلس
وعند ملیكك فابغ العلـــوّ    و بالوحدة الیوم فاستأنس
فان الغنی فی قلوب الرجال    وان التعزز بالأنفس
وكائن تری من أخی عسرة    غنیّ وذی ثروة مفلس
ومن قائم شخصهُ میت    علی أنهُ بعدُ لم یرمس
فان تطعم النفس ما تشتهی    تقیك جمیع الذی تحتسی

بە واتایەی ئەگەر گوناهكاری ئەوا چاوەكانت دابخە لەنێو ماڵەكەتدا دەست لەسەر چاوەكانت دابنێ، لەلایەكی دیكەوە باس لەوە دەكات كە دەوڵەمەندی تەنها لە دڵدایە و دەتوانی دەروونت ئاسوودە بكەیت، لەلایەك دەروون چی پێ بەخشی هیچ كاتێك تێر نابێت.

هەروا كاتێك ئەو بەیتانە دەخوێنیـەوە دەبینـی فەیلەسـووف لـەچ دۆخێكـی دەروونیدایە كە زۆر كۆنترە لە شۆپنهاوەر، لەتەك ئەوەی پەرۆشی بەشێكە لەهەمیشەیی داناییەكان، وەك چۆن زیلر لە كتێبی مێژووی فەیلەسووفەكانی یۆنان نیشانەیەكە لەو نەتەوانەی هزرمەندن.

كیندی لە وەسیەتەكەیدا گوتوویەتی "خودای گەورە تاكە چارەسەرە و هیچ دەروونێكیش قەرەبوو ناكرێتەوە" هەروا گوتوویەتی خوای گـەورە هۆكـاری هەموو داودەرمانێكە، هەروا ئاگادارمان دەكاتەوە كـە خـوا هۆكـار نییـە بـۆ مردنمان، واتە لەو دونیا دەژیینەوە"، خوا لێ خۆشبوو كەسێكی چاكەخواز بوو، ئامۆژگاریەكانی بۆ هەموو سەردەمەكان دەگونجێ!

"ئەوەی عاقڵ بێ پێیوایە زانستێك لەسەرووی زانستی ئەوەوە هەیە، بۆیە بەدڵفراوانی هەموو بابەتەکان وەردەگرێ، بەڵام نەزان پێیواە گەیشتۆتە لووتکە"، ئەم وتەیە لە کتێبی پێشەکیەکانی ئیبن بەختویە وەرگیراوە.

کیندی وەسیەت بۆ کوڕەکەی دەکات و دەڵێت "کوڕم باوك گەورەیە و برا ڕێگریت بۆ دادەنێ، مام خەمە، خاڵیش قوڕساییە و کوڕیش پەرۆشییە و نزیکەکانیش دووپشکن.

هەروا لەنێو وەسیەتەکەیدا بە کوڕەکەی دەڵێت" ئەگەر بڵێیت نەخێر ئەوا ناخۆشییەکان لادەچن و ئەگەر بڵێیت بەڵێ نیعمەتەکان ون دەبن، گوێگرتن لەگۆرانی دەیخاتە سەما، ئەو کات پارە پەیدا دەکات و خەرجی دەکات و بەرەو خراپەکاری دەڕوات، لەپاشاندا دەمرێ".

"دینارێك خۆشەویستە ئەگەر خەرجت کرد دەمرێ! درهەمیش زیندانی کراوە، هەر کاتێك دەرتهێنا ئەوا ڕادەکا! خەڵك گاڵتە دەکەن، بۆیە سەبارەت بەوان بزانە، بەڵام نهێنی خۆت بپارێزە، هەر کەسێك بە درۆ سوێندی خوارد ئەوا تووشی بەڵایەکت دەکات".

## ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بەکیندی

(١)

هیچ ئەدەبێك لەزمانی عەرەبی پاراو و دەوڵەمەند تر و قووڵ نییە، هەروا بەرامی زۆرە، بەڵام بەداخەوە ئەویندارانی و شارەزوومەندان و ئەوانەی تیایدا کار دەکەن سوودیان زۆر کەمە بۆ خوێندکارەکانیان، لەوانەیە خوێنەران پێیان سەیر بێت، بەڵام ئەو سەرسوڕمانییە نامێنێ کاتێك دەبینن نووسەرێك چەند ڕۆژێك کار و گەڕان لەسەر بەشێك دەکات، ئەو سەدلاپەڕە دەخوێنێتەوە تا دوو دێڕ بنووسێ

یان دوودێڕ بدۆزێتەوە، دیارە پشوو درێژیش یەکێك لەبەهرەکانی خوا کە داویەتییە مرۆڤ، چونکە سەرەتایەکە تا کۆششی زۆر بکات، زۆرێکیش لە نووسەران خۆیان دوور خستۆتەوە لە نووسین بە ئارەزووی خۆیان، بەلام نموونەی جاحز زۆر دەگمەنن، هەندێك هەن دێن ئینسکلۆپیدیایەکان بۆ هونەر و ئەدەبیەکان و زانستی ڕووەك و ئاژەڵ و ئەستێرەناسی تەرخان کردووە، بەبێ ئەوەی لەهیچ دەروازەیەك پەنا ببەنە بەر ڕێزمانەکانی زمان.

هاوکات ئەوانەی بەڵێنیان بە خۆیان داوە تا کاتەکانیان تەرخان بکەن بۆ توێژینەوە لەسەر فەیلەسووف و شاعیران، بەلام هیچ کاتێك باس لەئاکار و ژیان و دۆخی دەروونی و شێوازەکانیان ناکەن، وەك چۆن یۆنانی و ئەورووپییەکان ئێستا وا دەکەن، هەندێك تەنها باس لەچەند نووسینێکیان دەکەن و ڕۆژی لەدایکبوون و کۆچیدوایەکەی دەنووسێ و لەتوێژینەوەکەی تەنها چەند باسێك دەخاتە ڕوو، وەك کاتێك دەبینی باس لە موتەنەبی دەکرێ تەنها لەوکاتەدا بەدەردەکەوێ کە مەدح و سەنای سەیفی دەولەی کردووە و بەشێوەی هیجا شیعرەکانی دەخرێنە ڕوو، بەلام لەشوێنێکی وێرانەدا کوژرا، سەبارەت بە ژیاننامەی شتێکی وا نابیندرێ تەنها ئەو وتارەی نەبێ کە لەڕوونکردنەوەی دیوانی ئەو شاعیرە مەزنە باسی لێوە کراوە، ئەو ڕوونکردنەوەیەش لەدوو بەشدا باس لە شیکردنەوەی بەیتەشیعرەکانی دەکات، دیارە ئەمەش لەڕووی ڕێزمانییەوە باسی لێوە دەکرێ.

هەروا مێژوونووسان سەبارەت بە ئیبن تیمیە دەڵێن: یەکێکە لەمەزنترین موجتەهید و چاکەخوازەکان، ئەویش وەك مارتین لۆسیرۆس و کالڤین لە ڕۆژئاوا لەشوێنێکی زۆر نالەباردا مرد.

هەموو ئەوانە دەیانەوێ لاپەڕەیەکی راستەقینە بنووسن، ئەگەر تووشی هەر ناخۆشی و ماندوبوونێکیش ببنەوە، لەلایەکی دیکەوەش پرۆفیسۆر سانتیلانا مامۆستای مێژووی رەوەتە فەلسەفییەکان لەزانکۆی میسریدا و لەساڵی ۱۹۱۱ کاتێك باسی لە هەندێك تویژینەوە کرد کە سەبارەتی بە فەیلەسووفەکانی ئیسلامی نووسراوە زۆرجار ناتوانێت دوو دێڕ لەلای خۆتدا تۆمار بکەی لەگەڵ ئەوەی توێژینەوەکە چەندان لاپەڕەی بەخۆیەوە گرتووە واتە شتێکی وای تیا نییە سوودی هەبێ، هەروا مامۆستا ئەدوارد لامپێز کە مامۆستای مافەکان بوو لە قوتابخانەی زانکۆی لیۆن باس لەوە دەکات کە گۆلد زیهرا یەکێکە لەزانا رۆژهەڵاتناسەکان ماوەی دە ساڵ خەریکی نووسینی کتێبی سوونەتی محەمەدی بوو، چونکە هەموو ماددە و سەرچاوەکان لەبەردەست نەبوون و پەرش و بڵاو بوون، چونکە زۆر بەزەحمەت مێژوو و گێرانەوە و سەرچاوەکانی بەدەست دەگەیشت.

(۲)

دەشێ بە تەواوی باس لەهەموو لایەنەکانی کیندی بکەین تا راستییەکان وەك خۆیان بەدەر بخەین، چونکە هیچ وتار و باسێکی سەبارەت بەخۆی نەنووسیوە، مێژوونووسانیش تەنها هەندێك شتی پڕوپووچیان سەبارەت بەو گوتووە، بەڵام هەندێك لەنووسین و وتە و دۆخی سەردەمەکەی کە تیایدا ژیاوە باسی لێوە کردووە، ئەمەش بەشێکە لەوەی تابزانین کاروباری چۆن بەڕیوەچووە.

ئەوەی دەتواندرێ بگوترێ کە کیندی تەمەنێکی دریژی هەبووە، بەشێوەیەکی دیکە هاوشانی تەواوەتی سەدەی نۆیەمی زایینی بووە، واتە سەدەی سێیەمی کۆچی، ئەم زانیاریەش دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو زانای رۆژئاوایی فلوجل و ناجی، هاوکات مێژوونووسانی ئیسلامیش لەپێش هەموویانەوە مەسعوودی باسی لەکاتی لەدایکبوون و مردنی نەکردووە، بەڵکوو تەنها باس لەوە دەکات کە لەدەرباری متوەکلدا بووە، بەڵام ئەوە وەك زۆربەی زانایانی دیکە گوشەگیر بووە.

بە پێی وتەی ئەو دوو زانایە رۆژئاواییە کیندی نزیکەی حەفتا ساڵ ژیاوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ژیانی راستە ڕێ بووە، وەك کەسێکی بە توانا دەرکەوتووە.

بەپێی وتەی مێژوونووسان ئەو لەنێوەندی باوەشی خەلیفەکانی عەباسیدا پەروەردە بووە و باوکی لەسەردەمی سێ خەلیفەدا میری کوفە بووە، کاتێك یەعقووب لە دایکبوو ئەویان بردە کۆشکی خەلیفەکان، کیندیش وەك باوکی لەسەردەمی سێ خەلیفەدا ژیاوە، کە مەئموون و موعتەسەم و متەوەکل بووە، لەوێشەوە کیندی هەنگاوەکانی ناوە تا هەنگاوی زانایاتی بنێ، هاوکات مەئموون باشترین خەلیفەی عەباسی بوو، کە لەلای دانایان گرنگ بوو، لە ڕوویەکەوە کەسێکی دڵفراوان و کەمتر توندو تیژی دەنواند.

لەو سەردەمەدا زۆرێك لەزانستەکانی یۆنانی و سریانییان وەرگێڕا بۆ سەر زمانی عەرەبی، بەمەیش خەلیفەکان زیاتر لە پێشبینیە گەردوونیەکانیان دەزانی، ئەمەش وەك خزمەتێك بوو بۆ ئەوان بەبێ ئەوەی کاری فاڵگرتنەوە بکەن، چونکە ئەو کاتیش خەڵك ڕقی لەو شێوە فاڵگرتنەوەیە بوو، لەم بارەیەوەش باسێکی دوور و درێژ هەیە لەگەڵ ئیبن مەعشەر، ئەمەو ئەبوو یوسف ژیانێکی

ئاراحی لەنێوەندی دیوەخانەکانی حکوومەتی عەباسیدا بەڕێ کرد، چ لەسەردەمی مەئموونیان موعتەسەم، بۆیە خۆی سەرقاڵ کرد بە فەلسەفەی ئەرستۆ، لەپاش ڕوونکردنەوەی چەندان وتاری لەسەر نووسیوە، هەموو لایەنەکانی فەلسەفەی گریکی بەردەستی ڕوونکردۆتەوە بەمەش بیری زیاتر زاخاو کردووە بەو زانیاریانە، ئەمەو سەدەی سێیەمی کۆچی زۆرێك لەدانایانی موعتەزیلە لەگۆڕەپانەکەدا بوون، بەڵام بەگومڕایی لە قەڵەم دران وەك نیزام و جاحز و واسڵی کوڕی عەتا و چەندانی دیکە بە تایبەتی ئەوانەی لە کتێبی (الملل والنحل) ناویان هاتووە. جیاکردنەوەی کۆمەڵەکانی شەهرستانی و بەغدادی، کیندی هیچ پەیوەندیەکی بەوانەوە نەبووە و هیچ بیروبۆچوونیکی ئەوان کاریگەری لەسەری نەبووە، بۆیە تەنها ئەو بیروبۆچوونانەی تۆمار کردووە کە تیشکی ڕووناکییان دەبەخشی و خزمەتێکیان پێشکەش دەکات. بۆیە لەلای خەلیفە متوەکلدا سکاڵایان دژی تۆمار کرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دەست بەسەر کتێبەکانیدا بگیرێت.

(٣)

لەگەڵ ئەوەی کیندی زانستەکەی مەزن و دەوڵەمەندی بابەتەکانی و فراوانی بلیمەتی، پێش هەموو فەیلەسووف و زانایانی عەرەب و ئیسلام توێژینەوەی لەسەر ئەرستۆ کردووە و کتیبەکانی وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی، تەنها بلیمەتێك نەبوو بەمانا ڕاستەقینەکەی سەرەڕایی ئەوەی گلیۆم کردانۆ باسی لێوە کردووە، چونکە ئەو هەمان بنەمای فەلسەفی تایبەتی کیندی نەبوو، بەڵام بەچاکترین شێوە باسی لە گشتگیری زانست و کتێبەکانی دەکا بەتایبەتی کاتێك کیندی قسەی هەیە لەسەر فیساگۆرس و ئەرستۆ، ئەو زانایەکی

هەمەلایەنە بووە و تا ئەو کاتیش مرۆڤایەتی ژیرێکی وای بەخۆیەوە نەبینی بوو، هەروا ئەو وەك زانایەك پێگەکەی دانەبەزیوە بۆ زانا مامناوەندییەکان، چونکە لەزۆر ڕووەوە زانا بوو، وەك: ماتماتیك و پزیشکی و ئەفسانە و ئەستێرەناسی.

هەروا کاری لەسەر کیمیا کردووە تا زێڕی دەستبکەوێ، دیارە ئەمەش بەمانای ئەوە بووە عەقڵ و پارە وتەمەنی لەم باسەدا سەرفکردووە، واتە لەپێش ئیبن سیناوە ئەم کارەی تاقیکردۆتەوە، چونکە ئیبن سینا کتێبەکانی سەبارەت بەکیمیاگەری بوو، لەلایەکی دیکەوە کاتێك عەبدول لەتیفی بەغدادی کاتێك باس لە ئیبن سینا دەکات هیچ بەهایەك بۆ ئیبن سینا ناهێڵێتەوە، چونکە ئەو کاری کیمیاگەری دەکرد بۆ زێڕ دورستکردن لەگەڵ سوودێکی زۆری لێ بینیوە، بەڵام بەهۆی ئارەزووە نالەبارەکانی ئەوی، قسەی بێ بەهایانەی کردووە، عەبدول لەتیف یەکێکە لە پزیشکەکانی عەرەب و لەکۆتایی سەدەی شەشەمدا ژیاوە، کتێبێکی نووسیوە وەڵامی کیندی داوەتەوە بە تایبەتی لەڕووی یەکتاپەرستیەوە، لەگەڵ ئەوەی کیندی کەسێکی باوەڕدار بوو، لەو پیاوە ڕیشدارە کە هانی ئیسلام و موسڵمانانیدا تا کتێبخانەی ئەسکەندرییە بسووتێنن (سەیری کورتەیەك لەمێژووی میسر بکە کە لە ئۆکسفۆرد لەساڵی ۱۸۰۰ز چاپ بووە و لەلاپەڕە ۱۱٤دا) کە تیایدا باس لەکیندی دەکات و هەموو بیروبۆچوونەکانی زانایانی وەفرەنج ڕەت دەکاتەوە کە سەبارەت بەعەرەب و ئیسلام نووسیویانە.

وەك لەزاری ئیبن ئەبی ئەسبەعیە وتراوە کە چەندان وتە و وتاری بەهێزی هەیە، ئەو کەسێکی ناودارە لەمێژوونووسین باسی ڕەزیلی دەکات، لەوێدا باس لەزانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەکات بۆ ئەمەش باس لەمێژوو و دانسەقە

دەکات و لێرەوەش نزینیتی ئینگلیزی لەکتێبی "بلیمەتی و شێتیدا"، دەڵێت "رەزیلی زانایان یەکێکە لە نەخۆشیی دەروونی، لە تەکیدا گەورە بووە"، هەروا سەبارەت بە گۆشەگیری کیندی و دوورکەوتنەوە لەخەڵك بەهۆی ئەوەوەیە کە چەندان جار تووشی نسکۆ بووەتەوە، کە متوەکل هۆکار بووە، ئەوە جگە لەوەی چەندان جار تووشی ئازار و ئەشکەنجە بووەتەوە.

نووسینەکانی کیندی کە تا ئێستا لە جیهانی ئەدەبدا بوونی هەیە چ چاپکراو بێ یان دەستنووسە

پێرستی کتێبەکانی کیندی بەم شێوەیەیە:

| کتێب | ١١ | ماتماتیك | کتێب | ٢٢ | فەلسەفە |
|---|---|---|---|---|---|
| کتێب | ٢٣ | ئەندازیاری | کتێب | ١٩ | ئەستێرەناسی |
| کتێب | ٢٢ | پزیشکی | کتێب | ١٦ | گەردوون |
| کتێب | ١٢ | سیاسەت | کتێب | ١٧ | گفتوگۆ |
| کتێب | ٣٣ | سروشتییەکان | کتێب | ١٤ | ڕووداوەکان |
| کتێب | ٩ | لۆژیك | کتێب | ٨ | گەردیلەکان |
| کتێب | ١٠ | ئەحکامەکان | کتێب | ٧ | مۆزیك |
| | | رەهەندەکان | کتێب | ٥ | دەروونی |
| کتێب | ٢٣١ | کۆی گشتی | کتێب | ٥ | پێشکەوتنی زانستی |

هەروا ئەو کتێبانەی دیکەی کیندی هەشتن کە ئەمانەی خوارەوەیە:

١-کتێبێك سەبارەت بە ئیلاهیاتی ئەرستۆ و یان قسەکردن سەبارەت بە خواوەند، کە لەیۆنانییەوە وەرگێڕدراوە و دەستنووسێکی لە کتێبخانەی بەرلیندا هەیە.

٢–وتارێك سەبارەت بە میوزیك.

٣–وتارێك سەبارەت بەهێزی دەرمان و پێكهاتەكان لە كتێبخانەی منشنە و وەرگێڕدراوەتە سەر لاتینی و چاپكراوە.

٤–كێشـەی ڕەنگـی لازووردی كـە لەكەشـدا دەبینـدرێ، كـە لەكتێبخانـەی ئۆكسفۆردایە.

٥–(ذات الشعبتين) كە ئامرازێكی گەردووناسیتە لە لیدنە.

٦–هەڵبژاردەكانی ڕۆژانە.

٧–وتاری گۆڕانەكان لە ئەسكۆریال و چەندانی دیكە.

## (٢-فارابی)

ئەبو نەسری محەمەد کوڕی محەمەدی کوڕی ئۆزلغی کوڕی تەرخان و دەگەڕێتەوە سەر رەچەڵەکی قازی ناودار ئۆزلغ، باوکیشی محەمەدی کوڕی ئۆزلغە کوڕی تەرخان ئەو سەرکردەیەکی سوپا بوو، لەرەچەڵەکیشدا فارسە، خەڵکی ناوچەی وسیجی هەرێمی فارابە و ئەو ناوچەیەش لەخوراساندا تورك تیایدا نیشتەجێیە، تا ئێستاش مێژوونووسان ئەوەندە سەبارەت بەرەچەڵەکیان تۆمار کردووە و جەختیش لەوەدەکەنەوە کە ناوچەکەی لەپشت زێیەکەوەیە. فارابیش وەك زۆربەی فەیلەسووفەکانی دیکە نازاندرێ لەچ بەرواردێك لەدایك بووە، ئەو لەتەمەنی هەشتای ساڵیدا کۆچیدوایی کردووە، واتە لە ڕەجەبی ٣٣٩ك-دیسەمبەری ٩٥٠ز، بۆ ئەمەش ساڵی لەدایکبوونی دانراوە بە بەرواری ٢٦٠ك ئەمەش لەوانەیە دوور نەبێ لەراستییەوە.

### مێژووی ژیانی

بۆرۆکەر لە مێژووی فەیلەسووفەکان کە لیۆنی ئەفریکی وەرگرتووە لەبەشی سێیەمدا و لەلاپەڕە ٧١-٧٣ باسی زۆر شتی فارابی دەکات، بەڵام زۆربەیان

گومانی لەسەرە، هەندێکیشی بۆیان هەڵبەستووە، هاوکات ئیبن ئەبوو ئەسبەعی لە (عیون الانباء) لە بەرگی ٢ و لا ١٣٤ باس لەوە دەکات کە فارابی لەبووستانێکی دیمەشقدا چاودێری ناعورێکی دەکرد، ئەو هەردەم خۆی سەرقاڵ دەکرد بە فەلسەوە و ئەو کەسێکی هەژار بوو لەشەواندا لەتەک پاسەوانی ئەو شوێنە لەبەر رووناکی چرایەکدا بوون، بەڵام دواتر فارابی لەنێو خەڵکیدا ناسرا لەگەڵ ئەوەی ئەو باسانە کەموکورتی نییە بۆ ئەو زانایە، واتە وەك کلیانتی فەیلەسووف ئاودێری بێستانەکانی دەکرد لەدەوروبەری ئەسینادا، هەروا سبینوزا بەهۆی کاری چاککردنەوەی کاتژمێر بژێوی رۆژانەی خۆی بەرێوە دەبرد، بەمشێوەیە ژیانی هەر دانایەك بۆ ئەو کاتە دەگەرێتەوە کە تیایدا بووە.

## مێژوویەك کە جێگەی باوەرە

ئەوەی بەراستی زانراوە سەبارەت بەژیانی فارابی گوتراوە لە منداڵییەوە لەشوێنی لەدایکبوونیەوە رۆیشتووە بۆ بەغدا کە مەڵبەندی شارستانیەت و زانستە لە سەردەمی عەباسییەکاندا، دواتر پەیوەندی کردووە بە دەست و پێوەندی میر سەیفدینی میری حەلەب، ئەو خودی خۆی رێزی لە موتەنەبی گرتووە، موتەنەبی یەکێکە لەهاوسەردەمی فارابی و لەنێوەندی شیعرەکانی زۆرێك لەدانایی دەبینی، لەپاشاندا لەتەك خۆیدا لەکۆشك و دەربارەکەی بووە، دواتر لەکۆشك هاتۆتە دەرەوە و وەك دانایەك ژیاوە تا ئەو کاتەی کۆچیدوایی کردووە، بەڵام شتێکی دیکە سەبارەت بەبوارەکانی کەسی ئەو نازانین، واتە وەك ژیانی فەیلەسووفەکانی یۆنان و ئەورووپا هەموو شتێکی تۆمار نەکراوە، شتێکی زۆریش گرنگ نییە کارە تایبەتیەکانی دانایان بزانین.

لەبەغداوە بەرەو حەلەب رۆیشتووە بەهۆی جوانی و سروشتی ئەو ولاتە چووە و دواتریش لەحەلەبەوە چۆتە دیمەشق، کاتێکیش کە کۆچیدوایی سەیفی دەولەت بە جلوبەرگی سۆفییەوە خۆی رازاندبووەوە (ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە فارابی لەکۆتایی رۆژانی ژیانی جلوبەرگی سۆفی دەپۆشی)، لەسەر گۆرەکەی باسی لە دانایی فارابی کرد، سەبارەت بەم باسە ئیبن ئەبی ئەسبەعیە دەگێرێتەوە کە "سەیفی دەولەت لەتەك پانزدە پیاوی دەرباری نوێژی جەنازەی کردووە"، هەندێك مێژوونووسی دیکەش باس لەوە دەکەن کە ساڵێك پێش مردنی چووەتە میسر، بەلام ئەم بۆچوونە نەچەسپاوە.

## رەوشت و ئاکاری

کەسێکی پاك و دەروون پاك بوو و باوەری بەهەموو ئەو شتانە بوو کە رۆژانە لەژیانی دەهاتە ئارا و دەیکردن، هەنگاوەکانی ئەو هەنگاوی دانایان بوو و کەسێکی هێمن و لەسەر خۆ بوو و زیاتریش خەریکی فەلسەفە بووە و هەردەم لەشتەکان رادەما و بیری دەکردەوە، کاتێك لەتەك سەیفی دەولەت بوو، رۆژانە چوار درهەمی وەردەگرت و دەیزانی ئەمە پێویستی رۆژانەیە و زیاتر خەرج ناکرێ و ئەوەندە پێویستە بۆ ژیان، ئەو مالی نەبوو، شەوانەش دەچووە لای پاسەوانەکان تا بە رووناکیی چراکانیان لاپەرەکان بخوێنێتەوە (جمال الدين القفطى لا ١٨٨)، فارابی لەنێوەندی دەولەتی عەقلێ پاشایەك بوو، چونکە دەیزانی لەجیهانی ماددیەتدا بەرەو هەلدێر دەروا.

## خوێندنی

مێژوونووسەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە فارابی لەسەر دەستی مامۆستایەکی کریستیانی بەناوی یوحەنای کوڕی حیلان فێر بووە و خوێندویەتی، ئەم مامۆستایەش زانستی لەگەڵ ئیبراهیم مروزی وەرگرتووە لەسەر دەستی پیاوێك کە خەڵکی مروە، مێژوو ناوی ئەو پیاوەی تۆمار نەکردووە، هەروا فارابی لەسەر دەستی یوحەناوە دەرچووە و خوێندنی تەواو کردووە هاوکات ئەبوو بەشیری مەتی لەسەر دەستی ئیبراهیم مروزی دەرچووە و زانستی وەرگرتووە.

ئەبووبەشیر یەکێك بوو لەوانەی کاری لەسەر وەرگێڕانی کتێبەکانی ئەرستۆ کردووە و ئەو هاوسەردەمی فارابی بووە، بەڵام باس و وتارەکانی فارابی بە متمانەتر بوون.

سیجستانی (قوتابی یەحیای کوڕی عودەیی) لەهەندێك لە نووسین و وەڵامەکانی باس لەوە دەکات کە یەحیای کوڕی عودەی قوتابی فارابی بووە و جەختی لەوە کردووەتەوە کە "مەتی ئەبوو بەشیر لەسەر دەستی مامۆستایەکی مەسیحی فیساگۆرس خوێندووە و هەروا کاتیگۆریاس (وتەکان)ی و یارامینیاس (دەربڕینەکان)ی لەسەر دەستی مامۆستایەك بەناوی رۆبیل خوێندووە، هەروا کتێبی پێوەرەکانی لەسەر دەستی عەلی کوڕی یەحیای مروزی خوێندووە و هەموو ئەو کتێبانەش لە نووسینی ئەرستۆ بووە.

بەمەش لەوە تێدەگەین هەموو ئەو مامۆستایانە ئەو کتێبانەیان دەخوێندەوە، وەك گوتمان ئەبووبشیر هاوسەردەمی فارابی بووە، گومانی تیا نییە زانستی لەوان وەرگرتووە، هەروای فارابیش بڕوای بەتەنها مامۆستایەك نەبووە، باسیش لەوە دەکرێ کە هەردەم لەتەك ئەبوو بەکری کوڕی سیراج کۆدەبووە و لەوێدا ڕێزمان و نەحویان دەخوێند و سیراجیش باسی لە لۆژیك دەکرد، ئەوەش

دەخەنە روو کە زۆر کارا بووە لە زانستەکانی ماتماتیك و هەروا زۆر بەهێز بووە لەپیشەی پزیشکی و بوارەکانی گشتی، بەڵام هیچ کاتێك وەك پیشە کارەکەی نەکردووە، لەقازی ساعدەوە دەگێڕنەوە کە رێڕەی زمانەکانی زانیووە کە خۆی لە حەفتازمان دەنوێنێ، هاوکات فارابی عەرەبی و فارسی و تووركی زانیوە، هەروا یۆنانی و سریانی زانیوە، ئەم پێنج زمانەش بۆ سەردەمەکەی زۆر باش بووە.

## پایەی لەفەلسەفەدا

دانایانی عەرەب و موسڵمانان لەسەدەی سێیەمی کۆچیدا جیاکاری کەوتە نێوانیان و بۆ ئەمەش دابەشبوون بەسەر دوو کۆمەڵەدا:
یەکەمیان کۆمەڵەی موتەکەلیمەکان بوو کە کیندی هۆکارێکی سەرەکی بوو تا سەرەتایەکی پتەوی هەبێ کە زیاتر پابەند بوون بە ئیلاهیات و ئەو دیو سروشت و سەرەتا لەم ڕووە بەدەرکەوت، لەدواتردا لێیان جیا بوونەوە و ڕێڕەوی فیساگۆرس گرتووە، هاوکات وازی لەمەش هێنا و پەیوەست بوو بە ئەرستۆ لەپاش ئەوەی هەموو وێناکانی بنەمای ئەفلاتوونی نوێ بوو (نیوپلاتونیزم) ئەم کۆمەڵەیە شتەکانی بەبێ بنەماکانی لەڕووی مانا و گیان و بیرۆکەکەی شی دەکردەوە: لەوێدا خوا وا وەسف ناکات کە دانایی بێ لەدورستکردن یان بەکێشە و چارەسەر و گرفتی یەکەم، بەڵکوو وەك ئەرکێکە لەبووندا، بوونی هەر شتێکیش بەپێی خۆی پێوەری بۆ دادەنرێ، بۆیە هەوڵ دەدەن یەکەمجار ئەوە بسەلمێنن.
فارابی سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە بوو و تاکە کەس بوو لەو بارەیەوە جێگەی متمانە بوو (سەیری نیکۆلسن بکە :مێژووی ئەدەبی عەرەبی.

کۆمەڵەی دووەم فەیلەسووفەکانی سروشت بوو سەرەتای دەرکەوتنیان لە بەحران و بەسرا بوو و کورتەی توێژینەوەکانیان لەسەر دیاردە سروشتییە ماددییە هەستیارەکان بوو، وەك نەخشەڕێژی وڵاتان و دۆخی گەلان، دواتر کەمێك هەڵکشان، بەڵام تویژینەوەکانیان نەدەگەیشتە جیهانی هەست، لەپاشاندا زیاتر بەرەو بابەتە ئیلاهاتیەکان هەنگاوی نا لەگەڕان بەدوای گیان و هێزی خودایی کە کێشە و مەبەستی یەکەمیان ناساند یان بەدروستکەری دانا و دانایی لە بوونەوەرەکانی لەقەڵەمیان دا.

ئەو کات ئەبوبەکر محەمەدی کوڕی زەکریا رازی سەرۆکی بوو، لەلایەن ئیبن ئەبی سەبیعە لەلاپەرە ٣٠٩ لەبەرگی یەکەمدا باسی لێوە کردووە، ئەو فەیلەسووفێکی سروشتی بوو لەتەك ئەوەی پزیشکێکی کارا بوو.

جیاوازیی لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەیە هەبوو، ئەمەو کۆمەڵەی دووەم رازی سەرۆکیان بوو و بەدوای ئەو شتانە دەگەڕان، کە وەك دیاردەیەك لەپێش چاوان بێ ببیندرێ و کاریگەری لەسەر ئەو شتانە هەیە کە بوونیان نییە.

بەڵام کۆمەڵەی یەکەم کۆمەڵەی موتەکەلیمەکان بوو کەسەرۆکەکەی فارابی بوو و شتەکانی بەپێوەری بوونی دەپێوا تا ئەوە لەبووندا بسەلمێنێ، هاوکات فارابی سەرکردەی گەورەترین کۆمەڵەی فەلسەفی بوو لەسەردەمی خۆیدا.

## چاکەکاریەکانی لەسەر فەلسەفەی ئەرستۆ

لە ئەبونەسریان پرسی "کێ زاناترە، تۆ یان ئەرستۆ؟" ئەویش لەوەڵامدا گوتی "ئەگەر لێی تێگەیشتبام ئەوا دەبوومە گەورەترین قوتابی ئەو" هەروا گوتی "چل جار گوێم لێ بووە، بەڵام دووبارە دەبێ سەبارەت بەزانستەکەی بزانم"، قەفتی باس لەوە دەکات کە فارابی فەزڵی هەیە لەسەر چۆنیەتی خستنە ڕووی

کتێبەکانی ئەرستۆ و هەروەها کورتکردنەوەی کتێبەکانی پێش ئەوەی وەریانگێڕێت بۆ عەرەبی و شییان بکاتەوە، هەروا فەزڵی هەیە لەوانە گوتنەوە، دوایی زۆرێك لەقوتابییان هەمان یاسا و رێسای ئەویان گرتە بەر، ئەوەش دەخاتە روو کە کتێبەکانی ئەرستۆ بۆ زۆربەی زمانەکانی کۆن و نوێی ئەورووپی وەرگێڕدراون و فارابیش هاوشانی ئەوان کتێبەکانی وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی، بەو شێوەیە:

١–هەشت کتێبی لۆژیك کە ئەمانەن : کاتگۆریاس (وتەکان) لۆژیکی (هونەری شی کردنەوە)، یەکەم لێکدانەوەی "پێوەر"، دووەم لێکدانەوە "بەڵگە و ئەرگۆمینیت" و گفتوگۆی سەفسەتە و رەوانبێژی و شیعر.

ئەو کتێبانە کە فارفۆریۆس دایناون، لە داناکانی ئەسکەندەریە و قوتابی پۆنتێن لە پێشەکی ئیساگۆ باس کراون.

٢–هەشت کتێب سەبارەت بە سروشت کە ئەمانەن: سروشت، کتێبی ئاسمان و جیهان و لەدایکبوون و گەندەڵی و زانستی کەش یان کەشناسی و دەروونزانی و هەست و هەستپێکراو، کتێبی رووەك ، ئاژەڵ و هەرسێ کتێبی ئەو دیوسروشت و ئاکار و سیاسەت.

کتێبی ئاکار یان سرەوشت لەلایەن ئەحمەد لوتفی سەید بەڕێوەبەری زانکۆی میسری لەفەرەنسیەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

فارابی زۆر بە وردی خوێندوویەتی و ئەمەش هەمان رێڕەوی دانایانی پێشتر بووە، بۆیە فارابیی پێی باشتر بووە نکۆڵی لەمە نەکرێ، بۆیە سەیر نییە ناوی نراوە دووەم مامۆستا و ئێمەش ناوی دەنێین ئەرستۆتاڵیسی ئیسلام و عەرەب.

## باڵا دەستی لە لۆژیکدا

قازی ساعد لە کتێبەکەی چینی نەتەوەکان باس لەوە دەکات کە فارابی " لەپێش هەموو فەیلەسووفەکان باڵا دەست بووە لە لۆژیك و هانی داون تا بەدواداچوون بکەن، بۆیە هەموو لایەنە تارماییەکانی دەرخستون و هەرچی نهێنیە دەخاتە ڕوو، تا هەموو لایەك بەشێوەیەکی گونجاو تێی بگەن بەتایبەتی ئەو کتێبانەی کە راستەقینەن و خویندنەوەیان بە دەربڕینی جوان نووسراون و هێمایان تێدایە، کە ئەمەش لەلای کیندی پشتگوێ خراوە زیاتریش سەبارەت بە پیشەگەری شیکردنەوە و وێناکان، هاوکات هەر پێنج وتەکەی روونکردەوە و هەموو لایەنەکانی سوودمەندی روونکردەوە و هەروا چۆنیەتی بەکارهێنان و ئاساندنی وێنەی پێوەر لەهەر ماددەیەکدا، بەمەش کتێبەکانی لەهەموو روویەکەوە بەرەو چاکەکاری بووە"، وتەی ساعد.

هۆکاری بلیمەتی فارابیش دەگەڕێتەوە بۆ توێژینەوەکانی، ئەو تەنها بە شیکردنەوە نەوەستاوە، بەڵکوو پەیوەستی کردووە بەرێگەکانی هزر هەروا پەیوەستبوونی بە رێزمان و توێژینەوەی بە تیۆری زانیارییەوە، ڕێزمان مەبەستی لەزمانی عەرەبییە، لۆژیکیش بۆ زیاتر ئاسانکردنی هەموو زمانەکانی دیکەیە، ئەمەش هۆیەك بوو تا بەپلەبەندی بەرەو لۆژیك هەنگاو بنێ، تا شێوەیەك لە ڕستە و پێکهاتە و وتاردا بهێنێتە کایەوە لێرەوەش ئەم ڕوونکردنەوەیە بەکورتی دەخەینە روو:

فارابی لۆژیکی دابەش کردووە بۆ دوو بەش، کە بینین و راستییە، لەنێوەندی بینیەکانی چەندان بیرۆکە و پێناسەی خستووەتە ڕوو، لەنێوەندی راستی و متمانەشدا چەندان ئاماژە و بۆچوونی هێناوەتە ئارا، بەشێوەیەك راستییەکان درۆ و راستی بەخۆیەوە ناگرێ، ئەمەیش دەکەوێتە نێوەندی شێوە

دەروونییەکانەوە، وەك ئەو وێنەیەی کە لە هەستی منداڵێکەوە هاتۆتەکایەوە شتێکی پێویستە بۆ واقیع و ئەو شتانەی کە پیویستە بکرێ، ئەم شتانەیش هۆیەکە تا عەقڵی مرۆڤ تیایدا کارا بێت، بەڵام ناکرێ ڕوونکردنەوەی سەبارەت پێشکەش بکرێ: چونکە لێرەدا تەنها بلیمەتی و سەرکەوتن لەنێوەندی وێنە و بیرۆکەکان چەندان بۆچوون دەخاتە ڕوو، بەڵام بۆچوونەکان لەوانەیە درۆ بن یان ڕاستی، بۆ ئەوەی هەڵوەستەیش بکەین لەسەر بنەڕەتییەکانی بۆچوون بۆیە دەبێ ئاماژە و ڕاستی و هەل بەشێوەیەکی ڕوون خۆی بینێتە پیش و ڕاستەوخۆ بێ و پێویستی بە جەختکردنەوە نەبێ، وەك بلیمەتیبوون و خستنەڕووی بلیمەتی لە ماتماتیکدا، لەتەك ئەوەی سەرەتایەکی تەواو بێ لە هێنانە کایەوە ئەدەب و خستنە ڕووی بۆچوونەکان سەبارەت بە ئەو دیو سروشت، واتە لە زانیاریەکی چەسپێندراوە بۆ زانینی ونبووەکان و ئەو شتانەی کە جێگەی گومانن.

## ئەو کتێبانەی کە هەن بە زمانی عەرەبی

١-گونجاندن لەنێوان بۆچوونەکانی هەردوو دانا ئەفلاتوون و ئەرستۆ لەمیسردا چاپ بووە.

٢-خوێندنەوەیەك بۆ ئەرستۆ، چاپ بووە.

٣-فصوص المسائل-چاپ بووە.

٤-وتارێك سەبارەت بە لۆژیك لەنێوەندی یەقیندا، دەستنووسە و لەئەورووپایە.

٥-وتارێك سەبارەت بە پێوان، چەند بەشێکە بۆ هێنانەکایەوەی لۆژیك، پێنج بەشی دەستنووسە.

٦-وتارێك سەبارەت بە پایە و بەهای ڕووح، دەستنووسە.

ئەم وتارەش لەلایەن ئیبن ئەبی ئەسبەعیە جەختی لێوە کراوەتەوە، فارابی لەوێدا بوونی رووحی وەك ناوەڕۆکێکی سانا خستووەتە ڕوو، وەك وێنەیەکە کە بەئاسانی دەتوانیت تێی بگەیت بەبێ ئەوەی پەنا ببرێتە بەر ماددە کە چەندان دیاردە و کاری هەیە:

لەلایەکی دیکەوە جگە لەو شەش کتێبە، ئەوا دوانزدە کتێبی دیکەی هەیە سەبارەت بە لۆژیك و کە لە ئەورووپادا پەرش بوون، هەندێکیان وەرگێڕدراون بۆ لاتینی و عیبری، زۆربەشیان لە ئەسکۆریالە، هەندێك لەوەرگێڕانە لاتینیەکانی لە بوندقیەدایە، ئەوە جگە لەهەشت نووسینی دیکەی سەبارەت بە سیاسەت و ئەدەب بەم شێوەیەی خوارەوە:

١-بنەمای بۆچوونەکانی شارە نموونەییەکە (لەساڵی ١٨٩٥ لەلیدن چاپ بووە).

٢-ئاماری زانستەکان، دەستنووسە لەئەسکۆریال، بەلاتینی و عیبری وەرگێڕدراوە.

٣-سیاسەتی مەدەنیەت (بیروت ١٩٠٢).

٤-نۆ کتێب سەبارەت بە ماتماتیك و کیمیا و میوزیك کە لەکتێبخانەکانی ئەورووپا و ئەستانە بڵاوبوونەتەوە، لەتەك وەرگێڕانی بۆ لاتینی و عیبری.

٥-نۆ کتێبی دیکە سەبارەت بە چەندان بابەتی هەمەجۆر.

## پۆلێنکردنی نووسینەکانی بە پێی جۆرەکەی

ناتواندرێ نووسین و دانانەکانی فارابی بەپێی بەروار و ڕێکەوتنەکان ڕێکبخرێن، بەڵام دەکرێ ڕێکبخرێن بەپێی جۆری، بەشێوەیەك نووسینەکانی سەبارەت بە زانستی کەلام و بنەماکانی فەلسەفەی سروشتی لەوانەیە لەزووەوە دانرابێ واتە

لە تەمەنێکی بچووک ئەمەش بەهۆی خۆشەویستی دانایی لەنێو خەڵکدیدا، هاوکات نووسینە بەبەهاکانی ئەوەی سەبارەت بە فەلسەفەی ئەرستۆیە کە بەمامۆستای یەکەم دادەنرێ، باس لەوە دەکرێ کە فارابی تیۆر و نووسینەکانی ئەرستۆی بە ئارەزووی خۆی نەنووسیون بەتایبەتی ئەوانەی گەیشتوونەتە دەستی ئێمە، هەموو نووسینەکانی لەلاپەڕە ١٨٢ی قفتیەوە تۆمارکراوەن. هەروا لە چینی پزیشکەکانی ئیبن ئەبو ئەسبەعیە و لەبەرگی ٢ و لاپەڕە ١٣٨ تۆمارکراون. لەتەك ئەمانەشدا حەڤدە وتار و ڕوونکردنەوەمان سەیر کردووە، هەموو کتێبەکانیشی لەکتێبەکانی ئیبن سینا باسی لێوە کراوە.

لەنو کتیبانەی کە لکێندراوە بەو کتێبی ئاماری زانستەکانە بە کتێبێکی مەزن ئەژمار دەکرێ و ئیبن ساعد باسی لێوە دەکات کە "کتێبێکی مەزنە سەبارەت بە ئاماری زانستەکان و شێوەیەك بۆ پێناسەی هەموو شتەکان، تا ئێستا کەسی دیکە وەك ئەو باسی نەکردووە، بۆیە نابێ هیچ خوێندکارێك پەراوێزی بخات و بەبێ ئەوەی نەیخوێنێتەوە".

دانەیەك لەو کتێبە لە کتێبخانەی ئەسکۆریالی مەدریدی وڵاتی ئیسپانیا بەرچاوت دەکەوێ، لەنێوەندی کتێبخانەکەدا بە ئینسکلۆپیدیای زانستەکان وەسف کراوە، بەڵام ئەم وەسفە زیادە چونکە مەبەستی لەوە ئەگەر بەپێی سەردەم سەیری بکەین وەك دائیرەی مەعاریفە وەك چۆن ئەحمەد تەیموور پاشاش کتێبێکی لەم بارەیەوە هەیە.

"منك"ی فەیلەسووف پێی وایە ئەو وتارەی کە لکێندراوە بە فارابییەوە و لەپاشان وەرگێڕدراوەتە سەر لاتینی بەناوی "کورتەیەك سەبارەت بە هەموو زانستەکان" توێژینەوەیەکی کورتە سەبارەت بە ئاماری زانستەکان کە دانەیەکی لە کتێبخانەی "دی رۆس"ی بارمی ئیتاڵیایە، هەروا دانەیەکی تەواو و

تەواوکاری لەدەستنووسە لاتینیەکان لە کتێبخانەی نیشتمانی پاریسە بە ژمارەی ٦٤٤٩ی کۆمەڵەی ١٤٣ب پاشکۆی لاتینی.

ئەم وتارە دابەشکراوە بۆ پێنج دەروازە، یەکەمیان سەبارەت بە زانستەکانی زمان، دووەمیان دەربارەی لۆژیکە و سێیەمیش سەبارەت بەماتماتیک و چوارەمی لەمەڕ سروشتە، پێنجەمیش دەربارەی هونەرەکانی مەدەنیەتە.

فارابی هەموو زانستەکانی خستۆتە روو کە ئەو دەروازانە دەگرێتەوە لەتەک پێناسەکردنیان بەروونکردنەوەیەکی کورتیش سەبارەت بەهەر هونەرێك.

لەنێوەندی کتێبەکانیشی شتە فەلسەفیەکانی ئەفلاتوون و فەلسەفەی ئەرستۆ و شیکردنەوەی هەندێك لەو بابەتانەی کە ئەو دوو دانایە خستوتیانەتە روو، هاوکات ناوەڕۆکی ئەو دوو کتێبە نەگەیشتووەتە دەستمان، تەنها ئەوە نەبێ کە ئیبن ئەبو ئەسبەعیە و قەفتی باسیان کردووە، پێدەچێ ئەوەی ئەوان تۆماریان کردووە کردوویانەتە سێ بەش یەکەمیان پێشەکییە، کە بریتییە لە ڕوونکردنەوەی لقەکانی زانستی فەلسەفە و پەیوەندییان بەسروشت و رێکخستنی بە پێی پێویست تا بەشێوەیەکی رەوان تێی بگەین.

بەشی دووەم بریتییە لە روونکردنەوەی فەلسەفەی ئەفلاتوون و کتێبەکانی، بەشی سێیەمیش شیکردنەوەیەکی ئاسان بۆ فەلسەفەی ئەرستۆ لەگەڵ کورتەیەك سەبارەت بەهەر یەك لەکتێبەکانی و مەبەستی بنەڕەتی دانانی ئەو کتێبانە.

زانایانی عەرەب سەبارەت بەم کتێبە دەڵێن "خوێندکاران دەبێ هەڵوەستە بکەن سەبارەت بەهەموو ماناکانی نێو کتێبەکانی ئەرستۆ زیاتریش سەبارەت بە پێوان". ئیبن ئەبی ئەسبەعیە سەبارەت بەم کتێبە دەڵێت "کتێبی شتەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆ داهێنانی پێوە دیارە، بەتایبەتی لەرووی فەلسەفە و

بەدواداچوون بۆ هونەرەکانی دانایی و باشترین پەنا و ڕێگە ڕووناککەرەوەیە تا بزانی چی خستووەتە ڕوو، نهێنی زانستەکانی تیایە و بەرهەمی هەمووی وەك زانستێك دەبینی، لەوێدا بۆت دەردەکەوێ کەچۆن پلە بەپلە پێشکەوتووە، دواتر دەستی بە فەلسەفەی ئەفلاتوون کردووە و لەوێدا نووسینەکانی خستووەتە ڕوو، لەدوای ئەمەش دەستی کردووە بە فەلسەفەی ئەرستۆتالیس، پێشەکیەکی بەهێزی هەیە و بەپلەبەندیش پەیوەستی کردووە بە فەلسەفەوە، دواتر وەسفی هەموو شتەکانی کردووە بەپێی نووسینی لۆژیکی و سروشتی کتێب لەدوای کتێب توێژینەوەی دەربارەی کردووە، تا دەگەینە ئەو ڕایەی ئەو کتێبەی گەیشتۆتە دەستی ئێمە یەکەم زانستی ئیلاهیاتە کە ئاماژەیە بە زانستی سروشتی، لەوێدا هەموو مانا هاوبەشەکانی زانستەکان پێناسە دەکات و مانا تایبەتیەکانیش پۆلین دەکات، واتە دەبێ ماناکانی کاتیگۆریاس بزانیت وەك سەرەتایەکی بابەتیانە بۆ هەموو زانستەکان"-ئەمە قسەی ئیبن ئەبی ئەسبەعیبەیە.

هەروا لەنێوەندی کتێبەکانی ئەدەبیدا (السيرة الفاضلة) هەروا کتێبێکی سیاسی سەبارەت بە "سیاسەتی مەدەنیەت"، کەچی مێژوونووسان باس لەوە دەکەن کە فارابی تێگەیشتنێکی وای نەبووە وەك چۆن ئەرستۆ تێی گەیشتووە، کە پەیوەستی کردووە بەشەش کۆلەگەی ڕووت، هەموو ئەو کۆلەگە چرانەش دەمانگەیەنێتە زانستێك، لەم بارەیەوەش دەقی وتەکانی قەفتی بوونی هەیە و دەڵێت :

"کتێبی زانستی ئیلاهیات و زانستی مەدەنیەت دوو کتێبی دانسقەن: یەکەمیان ناسراوە بە سیاسەتی مەدەنیەت و ئەو دووەمیان ناسراوە بە (السيرة الفاضلة). لەوێدا چەندان ڕستەی مەزن دەبینین لە زانستی ئیلاهیات، بێگومان

بەپێی ڕەوتی ئەرستۆتالیس لەنێوەنجی هەر شەش بنەما رووحانییەکان، کە چ پەیوەستیەکی هەیە بە دیاردە لەشییەکان و گەیاندنی بە دانایی، لەوێدا ریزبەندی داناوە بۆ مرۆڤ لەنێوەندی هێزی دەروونی و جیاوازیی لەنێوان سروش و فەلسەفە، هەروا وەسفی شارە نموونەییەکانی نا نموونەکانی کردووە، بە تاییەتی کاتێك شار و مەدەنیەت دەکەوێتە نێوان پاشایەتی و باس و خواسەکانی پەیامبەرەکان.

"هەموو توخم و پێکهاتەکانی سروشتی مرۆڤایەتی و خەسڵەتی دەروونی لەنێوان ڕەوتەکانی سروش و دانایی و وەسفی دەستە رێکخراو و کۆمەڵە نارێکخراوەکان و دەرکەوتنی پێویستیەکانی مەدەنیەت تا حکومەتێکی سیاسی تا دەگاتە شەریعەتی ئایینی"، ئەمەش کورتەیەك بوو کە لە (عیون الانباء)ی ئیبن ئەبی ئەسبەعییە خراوەتە روو، بێگومان مەبەستیان کتێبی سیاسەتی مەدەنیەت و کتێبی شاری نموونەیی، فارابی هەردەم دوو ناوی داناوە لەهەندێك نووسینیدا، هاوکات کتێبی سیاسی هەمان کتێبی بوونە (الموجودات).

بەڵام بنەمای بوونگەرایی لەلای ئەو لەسەر شەش کۆڵەکە دامەزراوە یان دەتوانی ناوی بنێین شەش بنەما رووحییەکە، کە ئەمانەن:

١-بنەمای خودایی یان هۆکاری یەکەم، تاکە و واتە تاکە و تەنهایە و چەندانی دیکە نییە.

٢-هۆکارە لاوەکییەکان یان عەقڵی تەنە ئاسمانییەکان.

٣-عەقڵی کارا.

٤- دەروون.

٥- وێنە.

٦-ماددەی مەعنەوی.

بنەمای یەکەم بە تەنها ڕەهایە، هەروا سێ بنەماکەی دی تەنها تەنێکن و هیچ پەیوەندیەکی بە تەنەکانی دیکەوە نییە، بەڵام هەرسێکیان پەیوەستن بەتەنەکانی ئاسمان و تەنەکانیش شەش جۆرن. تەنەکانی بازنە گەردوونیەکان و ئاژەڵ و عاقڵ و ئاژەڵی بێ عەقڵ و ڕووەك و کانزاکان، کە پاشکۆی چوار توخمن، کۆی هەموو ئەمانەش بوونە.

فارابی بەشێوەیەکی ئاسان باس لەو شەش بنەمایە دەکات، تا ئەو کاتەی مرۆڤ گەیشتە ئەو ڕادەیە و پشکنینی بۆ سیستەمی کۆمەڵە مرۆڤایەتییەکان کرد و مەبەستیشی لەمە بوونی مرۆڤە کە نزیك و دوورە لەکامڵبوون، واتە کۆتایی هەموو بوونێکە، باسیش لەوە دەکات کە مرۆڤ ناگاتە کامڵبوونی تەواو، بەڵام دەکرێ زۆر ژیر بێ و توانایان هەیە بەعەقڵ کاریگەریەکی کارایان هەبێ.

## پلەی تەواو لەکامڵبوون

پێویستە عەقڵی کارا هەموو شتێك بۆ مرۆڤ ساکار بکات، عەقڵیش لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازی هەیە (وەکچۆن خەسڵەتی سروشتی و لەشی جیایە)، هەموو ئەمانەش وەك ئامادەکاریەك بۆ زیاتر زانین، ئەوانەی کە هەنگاوی یەکەمیان ناوە و توانیویانە بەو عەقڵە کارایە کاریگەریان هەبێ و بگەنە پلەکانی کامڵبوون، بۆیە دەبێ بزانن پلەی کامڵبوون مانای چییە بەمەش بگەنە هەموو مەبەستەکانیان لە زانست و هەموو کارەکانیان ڕایی بکەن تا ئەو کاتەی پاشای عەقڵ بن، ئەمەش پلەیەکی پاشترە لەو عەقڵەی کە سوودی لێ وەردەگرن، ئەگەر گەیشتنە ئەو پلەیە واتە عەقڵی کارا ئەوا ئامادەگیان هەیە تا بەهرەکانیان بخەنە ڕوو، ئەگەر مرۆڤ گەیشتە ئەو پلەیە باس لەوە دەکرێ گەیشتۆتە پلەی سروشی خوادایی ئەمەش تەنها لە پەیامبەرەکاندا بەدی

دەکرێ، هیچ کاتێکیش مرۆڤ ناگاتە ئەو پلەیە تەنها ئەو کاتە نەبێ کە هەموو پەردەکانی نێوان عەقڵ و خودی خوێدا لەنێو ماڵدا لابرد، ئەمەش تاکە حاڵەتێکە کە فارابی دانی پێدا دەنێت کە سروشە، بۆیە زۆرێك لە موتەکەلیمەکان ڕووبەڕووی بوونەوە و جیاواز بوون لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەواندا.

## نەمریی دەروون و خود

فارابی باس لەوە دەکات کە خۆشگوزەرانی خەڵکی شار زۆر جیایە ئەوا جۆرێك لە کامڵبوونیان بەخۆیانەوە گرتووە بەتایبەتی لەژیانی کۆمەڵایەتیدا، کە پەیوەستە بەپلەی خۆشی کە پێویستە پێی بگەین، ئەگەر توانییان ماددەکان لەیەکتر جیا بکەنەوە لەتەك پەیوەندیەکانی تەنەکان ئەوا دەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن لەهەموو کارەساتەکان، کە دەیەوێ ڕووبەڕوویان ببێتەوە واتە ناکرێ لە وەسفی جووڵە و هێمنی، واتە ئەمە جیهانێکی غەیب نییە، کاتێك کە خود گفتوگۆ لەسەر تەنەکان دەکات ناکرێ بەقورسی باس لەوە بکەین، کە هزر پەیوەندی بە بوونەوە نییە، ناکرێ بڵێین تەن و لەشەکانیش پەیوەندی پێوە نییە، کاتێك ئەو تەن و لەشانە بەرەو عەدەم چوون و خودی خۆیان لەزۆر تەنی خراپ پاراستووە، وەك چۆن باب و باپیران خۆیان لەنێوەندی عەدەمدا نواندووە، بەڵام لەدواتردا هەموو ئەو خودانە ئاوێتەی یەکتر دەبن، بەبەرجەستەبوونیشی خۆشگوزەرانی دێتە ئارا.

ئەگەر خودەکان ڕۆژانە بەرەو خۆشگوزەرانی هەنگاویان نا و دووبارە بووە ئەوا خۆشی و خۆشگوزەرانی کۆتایی نییە، زیاتریش ئەو خۆشییە بۆ چەندان نەوە دەگوزارێتەوە بەو واتایەی عەقڵی کارا دەتوانێ هەموو کار و مەبەستەکان

راپەڕێنێ، ئەمەش کورتەی بۆچوونەکانی شارە نموونەییەکەیە، لێرەوەش فارابی بۆچوونی وایە دان بە نەمریی دەروون دانانێ، تەنها لەژیانی دونیایدا پلەی عەقڵی بەرەو کامڵبوون هەنگاو بێ و ئەو عەقڵەی سوومەند بێ لە بنەماکانی ئیبن باجە و ئیبن رووشد گەیشتوونەتە ئەو رادە و بۆچوونە .

کتێبی شاری نموونەیی لە میسردا چاپ بووە، لەلایەن شێخ مستەفا قەبانی دیمەشقی کە لەساڵی ١٩١٤ لە سوودان کۆچیدوایی کردووە.

## بۆچوونی ئبن توفەیل سەبارەت بە خود

هەروا ئیبن توفەیل یەکێکە لەفەیلەسووفەکانی ئیسلام و گرنگی بە نووسینەکانی فارابی نادات کاتێك باس لەو دیوسروشت دەکات و دەڵێت: "هەموو ئەو شتانەی کە ئەبو نەسر تۆماری کردوون سەبارەت بە لۆژیك و هەموو ئەو کتێبانەی کە گەیشتوونەتە دەستی ئێمە لەنێوەندی دانایی راستەقینەدا دەبینی بۆچوونی زۆر لێك جیایی تیایە، هەروا ئیبن توفەیل ئاماژە بەو گومانەی ئەبو نەسری فارابی دەکات کاتێك کە باس لە نەمریی دەروون و خود دەکات، باسیش لەوە دەکات کە فارابی لە کتێبی (كتاب الملة الفاضلة) تیشك دەخاتە سەر ئەوەی خودە پیسەکان لەدوای مردندا هەردەم لە ئەشکەنجەدا دەمێننەوە، هەروا ئەو خودە پیسانە بەنەمری نامێننەوە و تەنها دەروونە کامڵبووەکان بە نەمریی دەمێننەوە".

هاوکات ئەو کتێبەی لەنێوەندی دەروونە دووڕوو و خراپکارەکان هەردەم ڕووبەڕووی مانای خێر دەبنەوە و هەوڵ نادەن لەدوای مردن بگەنە پلەی کامڵبوون، چونکە ناتوانێ کاروانەکە تەواو بکات، بەڵام خودە نەزانەکان کە

نەگەیشتوونەتە بەهای ژیانی دونیایی نەیانزانیوە لە ژیاندا کارێکی خێر بکەن، بەمەش دەچنەوە نێوەندی عەدەم ڕەها.

(ئیسحاقی کوڕی لەتیف و ئیبن فلیکیرە ئەمەیان تۆمارکردووە)

ئیبن توفەیل دەڵێت :"ئەبا نەسری فارابی لە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی کتێبی ئاکار و ڕەوشتی ئەرستۆ باس لەوە دەکات کە بەرزترین بەها مرۆڤ پێی بگات خێرە لە دونیادا، ئەوەی سەبارەت بەبوونی دەگوترێ وەك قسە سەیر و سەمەرەکانی پیاوە پیرەکانە.

ئیبن ڕووشد ئاماژەی بەو برگەیە کردووە کاتێك باس لە پەیوەندیی عەقڵی ماددی و عەقڵی کارا دەکات و باسیش لەوە دەکات کاتێك مرۆڤ کامڵ دەبێ ئەو کاتیش دەگاتە ئاستی هەموو زانستە عەقڵییەکان، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئیبن ڕووشد لەم بارەیەوە لەپاش ئەوەی هەمووی خستنە ڕوو فەیلەسووفەکان تا بکرێ عەقڵەکان یەك بخرێ و دەڵێت :"ئەم بەرهەڵستیانە وای لە ئەبوو نەسر کرد تا ڕوونکردنەوە سەبارەت بە ئاکار و ڕەوشتی ئەرستۆ بکات کە تیایدا دەڵێت مرۆڤ ناتوانێ بگاتە پلەی بەهای کامڵبوون بەپێی زانستە عەقڵیەکان، هەروا بۆ هاوەڵانی ئەوەی خستووەتە ڕوو کە گەیشتنی مرۆڤ بۆ حاڵەتی بەها و جەوهەری تاك تەنها قسە سەیر و سەمەرەکانی پیرەکانە، چونکە ئەوەی لەدایك ببێ دواتر بمرێ سیفەتی نەمریی پێوە نالکێت، ئەمەیش قسەی ئیبن ڕووشدە (ئیبن ڕووشد بۆ رینان)، ئەم کورتەیەش بۆ فارابی گەورەترین زەرەری بە فارابیدا و وای لێ کرد بیر لەهەندێك بیروبۆچوونی توندڕەوەکان بکاتەوە کاتێك باسیان لەتەناسووخ دەکرد، ئەمەش تۆمەتێکە بە خراپی لە کتێبی شار خراوەتە پاڵی لا ٩٥ لە میسردا چاپ کراوە "ئەگەر کۆمەڵێك هەنگاویان نا، بەو هەنگاوەش خەڵکێکی دیکە خۆشگوزەران بوون و هەمان کاریان کرد، چونکە

فارابی لە کۆی قسەکانی نکۆڵی لەتەناسووخ کرد، پێی وایە ئەمە پراکتیك نابێ لەنێوەندی زنجیرەی بیروبۆچوونەکانیدا و لەگەڵ بیروبۆچوونی ئەرستۆش ناگونجێ، ئەمەش تەنها فریوێکی ئەفلاتوونیە کە دانایەکی یۆنانی سوودی لەکتێبەکانی میسری وەرگرتووە.

## فارابی و نەمری

هیچ سەیر نییە فارابی بەهەموو شێوەیەك نەمریی دەروون رەت بکاتەوە وەك چۆن ئایینییەکانیش جەخت لەوە دەکەنەوە کە دەروونی مرۆڤایەتی هیچ پەیوەندیەکی بە عەقڵی کاراوە نییە تەنها چەندان وێنەی بوون نەبێ کە دورست دەبێ و لەدواتریشدا ون دەبێ و پەیوەستیش نییە بە کارە ماقووڵە ڕووتەکان، نەوەك لەنێوەندی جیاکاریەکان جیاوازیی دیکە بێتە کایەوە، ئەمەش بۆچوونی ئیبن رووشدە کاتێك ئەبوو نەسر گۆمانی لەسەر هەبوو، دواتر ئەو گۆمانانەیان خستنە سەر، ئەستۆی ئیبن رووشد بۆیە لە قوورتووبە ئەشکەنجەیاندا و خستیانە زیندانەوە.

لەنێوەندی کتێبی شاری نموونەیی و ئایدیاڵ و چاکەخوازیدا دەبینی بۆچوونی هەردوو دانا ئەفلاتوونی خواوەندی و ئەرستۆتالیس، فارابی لەپیشەکییدا دەڵێت:

"کاتێك بینیم خەڵکی ئەو سەردەمە ململانێیان کرد و لەنێوەندی ڕووداوەکاندا وایان دانا کە لەنێوان هەردوو دانادا جیاوازیەك هەیە بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانیان، کە یەکەم دانا هۆکاری بوون و دەروون و عاقڵبوون بەشێوەی کارەکان دەخاتە ڕوو و دەیگەڕێنێتەوە کە بواری مەدەنیەت و دورستکراو و

لۆژیك هۆكارێك بووە، تا من ئەو وتارە بنووسم بۆچوونەكانیان لەیەك بۆتەدا كۆبكەمەوە، (مەبەستی ئەفلاتوون و ئەرستۆیە)".

دواتر فارابی هەڵساوە بەپێی رێنوێنییەكانی ئەفلاتوونی نوێ هەنگاوی ناوە، (نیوپلاتومیزم) هەردوو دانا لەیەكتر نزیك دەكاتەوە، هەروا ناتوانێ رێگە لەبۆچوونی وئیلاهیاتی ئەرستۆ بگرێ، یاخود واز لە باوەڕی ئیسلامی بهێنێت. ئەوەی ئەو وتارە بە ڕوونیی بخوێنێتەوە دەبینی كە مەبەستێكی ئایینی لە پشتەوەیە، تەنهاش مەبەستی ئەوە نەبووە كە پشكنین لە بۆچوونی هەردوو دانادا بكات، هەروا مەبەستیەتی تا شی كردنەوەیەك بكات دژایەتی شیكردنەوەكانی ئایینیی ئیسلام نەبێ، بۆیە جیاكاری نێوانی هەردوو دانا پەراوێز كردووە، بەڵام ئەوەشی لەبیر نەكردووە كە جیاوازی لەنێوانیاندا بە ڕوونیی دەبیندرێ چ لەرێگەی قسەكردن و شێوەی بینینان لەمەڕ بابەتەكاندا، بەڵام توانیویەتی هەردووكیان لەیەكتر كۆبكاتەوە، هەروا ئەو وتارەشی نەگەیشتووەتە ئەو رادەیەی كە خۆی مەبەستی بووە، بە تایبەتی كاتێك سەیری وتاری (تهافت الفلاسفه) دەكەین كە لەلایەن غەزالییەوە نووسراوە، بۆیە لەكتێبێكیدا بەناوی (المضنون به علی غیر اهله) باس لەو بابەتانە دەكات.

ئەم كتێبە لەساڵی ١٦٣٨ز بەلاتینی لەپاریس بڵاوبووەوە، لەوێدا هەموو دابەشكردنەكان دانراون لەرووی دابەشكردنی عەقڵ و عەقڵی ماقووڵ و یەكەی عەقڵە كاراكان لەنێویان عەقڵی ئیلاهیات كە بەردەوام كارایە، بەو پێیە ئەبونەسری فارابی لەو كتێبەدا بۆ وشەی عەقڵ شەش مانای پێ بەخشیووە:

یەكەم: مانا ناشیرینەكان كە خەڵكی گشتی دەیبێژن، وەك مرۆڤێكی عاقڵ سەیر دەكرێ.

دووەم: ئەو مانایانەی کە موتەکەلیمەکان مەبەستیانە عەقلّ رەتی دەکاتەوە.
سێیەم: ئەو مانایەی کە ئەرستۆ وەسفی دەکات جیاکاریی لەنێوان راستی و بەرهەلّستیی هەیە، ئەمەش لەکتێبی ئەرگۆمینت باسی دەکات.
چوارەم: ئەوەی کە ئەرستۆ باسی کردووە لەکتێبی شەشەم سەبارەت بە ئاکار مەبەستی عەقڵە کە جیاکاریی لەنێوان خێر و شەڕ دەکات، لەتەك مرۆڤدا زیاد دەبێ بە درێژایی تەمەن لەتەکیدا دەبێ.
پێنجەم: ئەو باسانایە کە ئەرستۆ لە کتێبی دەروونـدا خسـتویەتیە ڕوو کـە دابەشی کردووە بەسەر عەقڵی هێز و عەقڵی کار و عەقڵی بەسوود و عـەقڵی کارا.
شەشەم: ئەو عەقڵەیە کە ئەرستۆ باسی کردووە لە وتاری شەشەمدا لە کتێبی دەرووندا ئەویش عەقڵی کارایە.

## فارابی و ئیلاهیات

هەموو بوونەکان بەپێی بینینی فارابی یان ئەوەتا پێویستە یان دەکرێ هەبن، بەلاّم سێیەم خاڵیش هەیە بۆ ئەو دووانە واتە دەکرێ گریمانەیەك هەبێت بۆ ئەو بوونە و زنجیرەیەك هۆکار کۆتایی بۆ نییە بۆیە دەبێ باوەڕ بەبوونی بوونێك دابنێین کە بوونی هەیە لەسروشـتدا بـەبێ هـۆ و هـەڵگری گـەورەترین پلـەی کامڵبوونە و دەوڵەمەندە بە راستی ئەزەلی هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا دانایەت و بەو پێیەی عەقڵێکی رەهایە و بیر و بۆچـوونێکی راسـتەقینەیە بـۆ خێـر و جوانی (قسەکردن لەسەر ئەرك و بوون لا ٦١ و ئەوانی دیکە لەشاری ئایـداڵ و نموونەیی و چاکە خوازدا)، هەروا نابێ هیچ بەڵگەیەك بهێنینەوە لە بوونی ئەو زاتە، چونکە ئەو راستی و ئەرگۆمێنتە و هۆکاری یەکەمە بۆ هەموو شتەکان و

لەنێوەندی ئەودا هەموو ڕاستی و ڕاستەقینەکان کۆ دەبێتەوە ، ئەو تەواوکەری هەموو کائیناتێکە و بوونی ئەو چەندانی دیکەی نییە ئەویش (خودا)یە، کە کە یەکەم نموونە و وێنەیە بۆ گشتگیری دووەم کە رووح و مەخلووقە وەك یەکەم گەورەیی هەموو تەنەکانی ئاسمانی دەرەکی دەجووڵێنێ، لەپاش ئەو رووحەش تیشکەکان، هەندێك رووح دێنە ئاراوە کە هەشت تەنن و لەیەك بۆتەدان ئەگەریش جیا بن لەیەکتر، ئەو دورستکەری تەنە ئاسمانییەکان، هەروا نۆ تەنی ئاسمانی ناونراوە فەلەکی سەروو کە پلەی دووەمە بۆ بوون، هەروا لەپلەی سێیەمدا عەقڵی کارا هەیە لە مرۆڤایەتیدا کە ناسراوە رووحی پیرۆز، کە ئاسمان و زەوی بە یەکتر دەگەیەنێ، هاوکات لەپلەی چوارەمدا بوونی دەروونی مرۆڤ خۆی دێنێتە پێش، واتە دوانەیی عەقڵ دەروون لەیەك یەکەی بنەڕەتدا نامێننەوە، بەڵام جیاکاریی دەبێ کاتێك بەنی ئادەمەکان زۆر بوون، شێوە و ماددەش پلەی پێنجەم و شەشەمە لێرەوەش دەروازەی پلە رووحیەکان دادەخرێن.

لەنێوەندی ئەو شەش پلەیەدا، سێ پلەی یەکەمە رووحەکانن، بەڵام سێیەکەی دی دەروون و شێوە و ماددەیە لەشێوەی ئاژەڵ و رووەك و کانزا و هەموو بابەتە سەرەتاییەکان.

ئیلاهیاتی فارابی لە قووڵایی بۆچوونەکانی ئەرستۆوە وەرگیراوە، کە بەشێوەیەکی لۆژیکی نووسراوە وەك وتەی بوونی یەکەم هۆکاریی یەکەمە بۆ بوونی هەموو شتێك، ئەو بوونە کۆنترین بوونە کە ناکرێ جەوهەر و وێنەکەی تەڵخ بکرێ، کە لەلای ئەرستۆدا بە بوون و عەدەم لێك دراوەتەوە، هیچیشیان تەواوکاری یەکەم نابن ئەگەر جوولەی مانگ وەك هەسارەیەك نەبێ، ئەمەو ئیلاهیاتی ئەرستۆ لەلایەن کیندیەوە وەرگێڕدراوتە سەر زمانی عەرەبی.

## دابەشبوونی هێزی دەروونی

هێزە دەروونییەکان لەلای فارابی پلەبەند کراوە، ئەمەو هێزی خواروو ماددەیەکە بۆ هێزی سەروو، سەرووش وێنەی خوارەوە، بەهای ئەو هێزانەش هەمووی هزرە کە ماددی نییە و وێنەیەکە بۆ هەموو وێنەکانی پێشتر و بۆ بەرزکردنەوەی بوونە یەکلاکەرەوەکانی هزر، بەهۆی بینین و نواندن، هەر هێزێکشدا هێزی دەروون توانا و هەوڵەکانە.

هەر تیۆرێکیش روویەك هەیە جیای بکاتەوە لەکاتی کاردا، بۆیە ناکرێ ئارەزوو جیا بکرێتەوە لە درکپێکردنی هەست و دەروون، کە قبووڵی دەکات یان ڕەتی دەکاتەوە بەهۆی هەستەوەرەکان.

هەروا هزر بڕیاردەری نێوان خێر و شەڕە بۆ هەر ئیرادەیەك هۆکاری خۆی دێنێتە پێش، بۆ ئەوەی هونەر و زانستەکان بهێنێتە کایەوە، هەر درکپێکردن و هزرێکیش پێویستە هەوڵ و توانای لەتەکدا بێت تا بگەینە ئەنجامێکی پێویست وەکچۆن گەرمی لە ئاگرەوە پەیدا دەبێ، دەروونیش تەواوکەری لەشە، ئەوەی تەواوکەری دەروونیشە عەقڵە و عەقڵیش واتە مرۆڤ.

بوونی عەقڵ لەگیانی منداڵێکدا لەدواتردا دەیکاتە عاقڵێکی کارا بەهۆی درکپێکردنی شێوە تەنەکان ئەمەش بەئەزموون لەرێگەی هەستەوەر و هێزی نواندن و وێنەگرتن.

ئەنجامی هەموو تاقیکردنەوە و ئەزموونەکان تەنها کاری مرۆڤ نییە بەڵکوو ئەمە ئەنجامی کاری گیان و رووحە کە لەسەرووی مرۆڤە، زانستی مرۆڤ لەسەرووی خۆیەوە بۆی دێ و زانستێك نییە خۆی بەدەستی هێنابێ بەهۆی توانای عەقڵی

بەڵکوو ئەم عەقڵە لەلایەن خواداوە بۆی هاتووە وەك هۆكارێك بۆ فەرمانەكانی (رەوتی پێشزانی).

## فەلسەفەی ئاكار

ئاكار بەبۆچوونی ئەو لەسەر بنەمای شێوازەكەیەتی، كە هەندێكجار لەتەك ئەفلاتوون هاوڕایە و هەندێكجاریش لەتەك ئەرستۆدا ئەمەش بەهۆی پاكی دەروونە كە بەهۆی هەڵسوكەوتەكانی بەدەستی هێناوە و پێچەوانەی خەڵكی ئایینییە كە دەڵێن ئاكار و رەوشت لەنێوەندی زانستە شەرعییەكانەوە سەرچاوەی گرتووە، هەروا هاوولاتی لەهەموو روویەكەوە ئەوە دەسەلمێنێ كە تەنها عەقڵە شتەكان لەیەكتر جیا دەكاتەوە لەنێوەندی خێر و شەڕدا، عەقڵی بەهرەمەندی هەر مرۆڤێك هۆكارێكە بۆ بەدەستگەیشتنی شێوازی باڵا لەتەك ئەوەی زانست گەورەترین چاكە بۆ گوتنی خێر، ئەمەیش پراكتیك دەبێ لەگەڵ رێبازی ئەفلاتووندا كە پێی وایە زانیاری سەرچاوەی چاكەكارییە.

ئەوانەی كە وەك ئەو هەڵوەستە لەسەر بنەماكان دەكەن ئەرستۆ و نووسینەكانیەتی كە هەمان شێواز ناگرێتە بەر، چونكە هەندێك جار كەسێكی نەزان شێوازێك دەگرێتەبەر لەكەسی زانیار و چاكەكار زیاتر دەزانێ، ئەگەر نا نازاندرێ جیاكاریەكانی نێوان كاری چاكەكار و زانیارێك هێزی جیاكەرەوە چۆن بكرێتە بەڵگە بۆی، ئەو دەڵێت دەروون بەسروشتی خۆی چەندان ئارەزوو لەخۆ دەگرێ دركپێكردنی بەپێی شێوەی بینیەتی، وەك مرۆڤێك دەبینی وەك هەر ئاژەڵێك هەڵسوكەوت دەكات، بەڵام جیاكردنەوەی ئەمە بەعەقڵی مرۆڤ دەكرێ كاتێك بەئازادی بژاردەكانت خستە بەردەمی بەپێی ئارەزوو و عەقڵی پرسیار دەكات، ئەمەش هۆیەكە بۆ جیاكردنەوە.

## فارابی و میوزیك

فـارابی لەتــەك زانســتدا جـۆش و خرۆشــی هــەبووە بـۆ میۆزیـك، لـە ڕووی مێژوویشەوە باس لەوە دەکرێ کە سەیفی دەوڵە زۆر کاریگەربووە بووە بـە گۆرانی و میوزیك، بۆیە زۆر کەسی راسپاردووە ئامێرەکانی گۆرانی و میوزیك دورست بکەن و بنەما بۆ ئاواز و گۆرانی دابنـێن، لـە ئـیبن ئەبـە ئەسـبەعیە دەگێڕنەوە کە ئامێرێك دورستکراوە کاتێك ئەو ئامێرەیان لێداوە گوێگر ئـەو هەست بەهەڵچوون دەکا لەدەروونەوە پێدەکەنێ و لەتەك ئەمەشدا دەیگرێنێ، هەندێك پێیان وایە ئەو ئامێرە (قانوون) بووە، کە ئێستا لای ئێمە ناسراوە، لەم ڕووەوەش فارابی دوو کتێبی میۆزیکی نووسیوون، یەکەمیان ڕوونکردنەوەی تیۆرەکانی زانستی میۆزیکە، ئەمەش لەلایەن کۆرسجارتنی گەڕیدەی ڕۆژهەلاتی پشکێندراوە و جەختی لەسەر کراوەتەوە.

ئـەبو نەسـری فـارابی لەپێشـەکی کتێبەکەیـدا دەڵێـت "رێگەیـەکی تایبـەتی گرتووەتــە بــەر و لاســایی کەســی نەکردووەتــەوە"، لەپاشــاندا سروشــتی دەنگەکانی لێك جیا کردووەتەوە و هەڵوەستـەی لەسـەر چـین و جۆرەکـانی میۆزیك و کێش و لەرینەکانی کردووەتەوە.

باسیش لەوە دەکرێ کە کتێبێکی دیکەی داناوە کە تایبەت بووە بە ڕێگـەی میۆزیکژەنە کۆنەکان، دانەیەکی ئەم کتێبەش لەئەسکۆریال پارێزراوە، هاوکات فارابی لەوێدا بۆچوونی دێرین و نوێکاریەکانی زانایانی میۆزیکی لێکداوەتەوە و هەموو هەڵەکانیشی چاککردووەنەتەوە، ئەو بۆشایەشی پڕ کردووەتەوە کـە پێشتر کاریان لەسەر نەکردووە.

کاتێك باس لە زانستە سروشتیەکان دەکرێ، ئەوا لەلای فارابی میوزیك جێگەی خۆی هەبووە، بەڵام ئەمکارە لەلای فیساگۆرس و قوتابیەکانی بە بۆشایی ماوەتەوە، ئەمەش وەك کارێك بۆ زانینی دەنگی هەسارەکان و ئاوازە ئاسمانییەکان، هەر لەوێدا کاریگەریی شەپۆلەکانی هەوای روونکردووەتەوە لەسەر ژێیەکان، دیارە ئەمەش بەهۆی ئەزموونی لەو کارە، لەدواتردا چەندان دەنگی دەستنیشان کردوون کە لەلای گوێگر خۆشبوون، بەگشتی "زانست و پیشەی میوزیك و کارکردن لەسەری گەیشتنە مەبەست و ئامانجی خۆی و بەشێوەیەك توانییان کاری لەسەر بکەن" (قازی ساعد).

## شێوازی نووسینی

شێوازی نووسینی بەعەرەبی زۆر ورد بوو، لەگەڵ ئەوەی بە ڕەچەڵەك فارس بووە، باس لەوە دەکەن زۆر ئارەزووی لە زاراوەکان بووە و هەندێك جاریش لەڕووی مانا فەلسەفییەکانەوە باسەکانی فراوان دەکرد، بەتایبەتی ئەو باسانەی پێویستییان بە دیاریکردن و دامەزراندن بوو و هەر مانایەکی بە زاراوەیەك لێك دەدایەوە، ئەمەیش تا مانای خۆیان هەبێت.

لێرەوەش بەکورتی باس لەشێوازی نووسینی دەکەین.

سەبارەت بەناوی فەلسەفە:

"ناوی یان زاراوەی فەلسەفە یۆنانییە و هاتۆتە ناو زمانی عەرەبی، هەر یەك لەسەر ئەو رەوتە هەنگاو بنێ پێیدەڵێن فەیلەسووف بەو مانایەی دانا بێ، فەیلەسووف لە فەلسەفەوە وەرگیراوە کە لەبنەڕەتدا فیلسوفۆس هاتووە، ئەمەش بە گۆڕانی یەکە و ناو و شیکردنەوەکان گۆڕاوە بەو مانایەی دانا و کاریگەرە لەسەر دانایی، کە تەمەن و ژیانی لەسەر دانایی دادەنێ".

لەڕووی مێژووییەوە دەرکەوتنی فەلسەفە بەو شێوەیە بووە: "فەلسەفە لەسەردەمی پاشاکانی یۆنانی بەدەرکەوت ئەمەش لەپاش مردنی ئەرستۆتالیس لە ئەسکەندەریە، کاتێك کە مرد زانست و فێرکاری لەدۆخی خۆیدا مایەوە، چونکە هەر سێزدە پاشای لەدوای یەك لەسەردەمی پاشایەتیەکەیاندا هەر یەك و مامۆستای فەلسەفەیان هەبوو کە تا ئەو کاتە دوانزدە فەیلەسووف بوو، یەکێکیان ناسراوە بە باندرۆنیکۆس، تا ئەو دوانزدەهەمین پاشا کە لەسەر تەخت بوو بەڵام ئۆگستۆس پاشای رۆم بەسەریدا سەرکەوت، پاشا دەستی بەسەر هەموو کۆگای کتێبدا گرت، لەوێدا دانەیەکی لەنووسینی ئەرستۆتالیسی بەرچاو کەوت، کە لەسەردەمی ئەو و سەردەمی تاوفرستس دانەی لەسەر گیرابووەوە، لەوکاتەدا فەرمانی دەکرد کتێبەکانی ئەرستۆ و خوێندکارەکانی بۆ دووبارە بنووسرێنەوە و وێنەیەکی لەسەر بگیرێتەوە، خوێندن و فێرکردنیش لەسەر پەیڕەوی ئەو نووسینانە بێت و واز لەهەموو شێوازێکی دیکە بهێندرێ، فەرمان بە ئەندرۆنیکۆس کرا ئەو کارە رێك بخات و هەر یەکەو دانەیەکی لێ بنووسرێتەوە یان لەسەری بگیرێتەوە و هەر خۆشی بیباتە رۆم و دانەی ئەسڵیش لەشوێنی خۆیدا بمینێتەوە لە ئەسکەندریە بۆ خوێندن، هەروا فەرمانی پێ کرد مامۆستایەکی وەك خۆی لەجێگەی خۆی دابنێ تا لەئەسکەندریە وانە بڵێتەوە، خۆشی بەرەو رۆم هەنگاو بنێ؛ لێرەوەش خوێندن گرنگیەکی ئەوتۆی پێ درا، تا ئەو کاتەی نەسرانییەکان هاتنە کایەوە بەمەیش خوێندن لە رۆم پوچەڵکرایەوە، تەنهاش لە ئەسکەندریە مایەوە، تا ئەو کاتە پاشای نەسرانییەکان کۆبوونەوەی لەگەڵ قەشە و ئەساقیفەکان کرد و لەوێدا راوێژیان لەسەر ئەو خوێندنە کرد، باس لەوە کرا کە ئەو کتێبانە زیاتر کتێبی لۆژیکن شێوازێکن لەبوونگەرایی، ئەوانیش پێیان وابوو ئەو کتێبانە زیانی زۆریان هەیە،

بۆیە تەنها بە ڕووکەشی مایەوە ئەوی دیکەیان تەنها لێی دوور دەکەوتنەوە، لەپاش ماوەیەکی دوور و درێژ ئیسلام هات دووبارە خوێندن گوازرایەوە بۆ ئەسکەندەریە و دواتریش گوازرایەوە بۆ ئەنتاکیە، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی تەنها مامۆستایەك مایەوە و دوو کەسی دیکەشی فێرکرد و ئەوانیش کتێبەکانیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرت کە یەکێکیان خەڵکی حەڕان بوو، ئەوی دیکەیان خەڵکی مرو بوو، کاتێك پیاوەکەی خەڵکی مرو گەڕایەوە دوو کەسی دیکەی فێرکرد کە یەکێکیان ئیبراهیم مرووزی بوو ئەوی دیکەیان یوحەنای کوڕی حیلان بوو، هاوکات حەڕانی ئیسرائیل ئەسقەف و قویری فێرکرد و بەرەو بەغدا ڕۆیشتن، لەوێدا ئیبراهیم خۆی بەئایینەوە خەریك کرد و قویری خەریکی فێرکردن بوو، بەڵام یوحەنای کوڕی حیلان ئەویش خەریکی ئاین بوو، لەلایەکی دیکەوە ئیبراهیم مرووزی لەبەغدا مایەوە لەوێدا مەتی کوڕی یۆنانی فێر کرد، ئەو کاتیش هەموو بابەتەکان زیاتر پەیوەست بوون بە شێوازەکانی بوونگەرایی".

**( ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بە فەلسەفەی فارابی )**

**کورتەیەك لەدەقەکانی**

**١-ژیان و ئاکاری**

فارابی کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو و هەردەم سەرقاڵی فەلسەفە و لێکدانەوە بوو، لەلایەن ئەو میرانەوە پارێزراو بوو، کە پێشتر هانای بۆ بردبوون، لەدوارۆژەکانی ژیانیشی بوو بە کەسێکی سۆفی.

باوکی سەرکردەیەکی فارسی بوو، هەروا ئەو لەیەکێك لە قەڵاکانی فاراب لە وڵاتی تورکستان لەدایکبووە، زانستی لەبەغدا لەسەر دەستی زانایەکی

مەسیحیی وەرگرتووە کە ناوی یوحەنای کوڕی جیلان بووە، ئەو زانستانەی وەریگرتووە زیاتر ئەدەب و ماتماتیك و زمانەکان بووە، بەتایبەتیش زمانەکانی عـەرەبی و تـوورکی و فارسـی دەزانـی، ئەمـەش لەنێوەنـدی نووسـینەکانی بەدەردەکەوێت، لەسەردەمی خۆیدا ئەو وەك شارەزایەك بەزمانی سەر زەوی ناودار بوو، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی وا نەبووە کە حەفتا زمان بزانێ.

تەمەنێکی زۆر لە شاری بەغدا ژیاوە و خەریکی زانست بووە، لەپاشاندا بەهۆی پشێوییە سیاسییەکان چووەتە حەلەب، لەوێدا لـەدەرباری مـیر سـەیفەدینی دەوڵەت دانیشـتووە، بـەڵام لـەکۆتایی ژیانیـدا دوور کەوتۆتـەوە لـەمیرەکان لەگۆشەیەکدا ژیـاوە، لەدیمەشـق کۆچـیدوایی کـردووە، دوای ئـەوەی خـۆی ئامادەکردووە بۆ گەڕانێك، ئەمەش لەمانگی دیسەمبەری ساڵی ٩٥٠ز بـووە، باسیش لەوە دەکرێ کە میر و کوڕەکـەی جلوبـەرگی سـۆفیانیان پۆشـیوە، ئەمـەیش وەك رێزلێنانێـك بـۆ ئـەو، دەشـگوترێت لەتەمـەنی هەشـتا سـاڵیدا کۆچیدوایی کردووە، هاوکـات باسـیش لـەوە دەکـرێ کـە هـاوڕێی زانسـتیی ئەبووبیشر مەتی بووە کە دە ساڵ لەپێش خۆیدا کۆچیدوایی کردووە، بەڵام ئـەبوو زەکـەریای یـەحیای کـوڕی عـودەیی خوێنـدکاری، لەسـاڵی ٩٧١ز کۆچیدوایی کردووە، ئەویش لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا مردووە.

گرنگترین نووسینەکانی تایبەت بوون بە فەلسەفەی ئەرستۆ و روونکردنەوە و شیکردنەوەی، یەکێك لەنووسینەکانی کتێبی کۆکبوون لەنێوان هەردوو دانا: ئەفلاتوون و ئەرستۆ. هـەوڵی داوە کۆکییـەك بدۆزێتـەوە لـەنێوان بۆچـوونی هەردوو دانا، لەلایەك و تەبابوونی لەتەك بیروڕاکانی ئیسلام، ئەو پێیوایە کێشە و جیاوازیی لەنێوان هـەردوو دانـادا، تـەنها بـەهۆی چـۆنیەتی بیرکردنـەوە و چـۆنیەتی نووسـین بـووە، جگـە لـەو هۆکارانـەی پەیوەسـتن بـە بابەتـە

زانستییەکان، بەڵام فێرکارە حیکمەتدۆستەکانیان، لە ڕووی فەلسەفییەوە کۆکن. فارابی پێی وابووە کە دەروونپاکی هۆکارێکە بۆ فەلسەفە، ئەو هەموو کاتێك پێی باشبوو ڕاستی بگوترێ ئەگەر ئەو ڕاستییە جیاش بێ لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەرستۆ، ئەو بوارانەی پێیەوە سەرقاڵ بووە لۆژیك و ئەو دیوسروشت و ئەخلاق و سیاسەت بووە.

٢-قسەکردن لەسەر لۆژیکی فارابی

فارابی لۆژیك دابەش دەکاتە سەر دوو بەش کە بینین و ڕاستییەکانە، لەنێوەندی بینیندا چەندان بیرۆکە و پێناسەی بۆ داناوە، لەنێوەندی ڕاستییەکانیشدا ئاماژە و بۆچوونی هەبووە، بینین ڕاستی و درۆی تیادا نییە. فارابی پێیوایە ئەو بوارانەی دەچنە نێوەندی بیرۆکەکان ساناترین شێوەکانی دەروونین، هەروا ئەو بیرۆکانەی کە لەناخی مرۆڤدا چێندراون هەر لەسەرەتاوە شتێکەلێکی پێویستن و لەواقیع نزیکن، هەروا ئەو کارانەی کەعەقڵی مرۆڤ بۆی بۆی دەچێت، ناتواندرێ بۆ بەرامبەرەکەی ڕوون بکاتەوە، تا ئەو کاتەی بە ڕوونیی بەدەر دەکەوێت. بۆیە بۆ کۆکبوون لەنێوان بینین و بیرۆکەکان بۆچوونەکان دێنە ئاراوە، بۆچوونەکانیش لەوانەیە درۆ بن یان ڕاست! بۆ ئەوەی بنەمایەکی پتەو بۆ بۆچوونەکان بهێنینە ئاراوە، دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ پرۆسەی ئاماژە و ڕاستی و هەندێك گریمانەیی درکپێکردنی ماقووڵ، ئەمەش زۆر ڕوونە و پێویستی بە جەختکردنەوە و سەلماندن نییە، بەهۆی هەندێك سەرەتای ئەو دیوسروشت و ئەدەبیات.

بۆ تیۆری ڕاستی کە لەمەوە بەرەو چەسپاندن و دیار هەنگاو دەنێین بەتایبەتی بۆ زانیاریەك کە هەوڵی بوێ، ئەمەش خودی لۆژیکە بەپێی بۆچوونی فارابی.

٣-ئیلاهیات (ئەو دیوسروشت)

هەر بوونێك بەپێی ڕوانینی فارابی پێویستە یان دەکرێ هەبێ، خالّی سێیەمیش نییە بۆ ئەو دووانە، چونکە دەکرێ گریمان دابندرێ بۆ بوونی. بەهۆی زنجیرەیەك هۆکار کە کۆتاییان نییە، بۆیە دەبێ باوەڕ بەوە بێنین، کە بوونی هەموو بوونەوەرێك، بە سروشتی خۆی بوونی هەیە، بەبێ ئەوەی هۆکار هەبێت. هەروا خاوەنی بەرزترین پلەی کامڵبوون لە ڕاستییەکی هەتا هەتاییە، تەنها ئەو ناگۆڕێ و ئاڵوگۆڕ ناکرێ. زۆر بە فراوانی بیری لە خێر و جوانی کردووەتەوە، ناکرێ هیچ بەڵگەیەك بهێندرێتەوە لە بوونی، چونکە ئەو ڕاستی و بەڵگە و ئەرکۆمێنتە و ئەو هۆکاری یەکەمە بۆ هەموو شتێك لەویدا هەموو ڕاستی و ڕاستەقینەکان کۆدەبنەوە. لەبەر ئەوەی تەواوکاری هەموو بوونەوەرەکانە، ئەو بوونی یەکەمی ڕاستەقینەیە و پێی دەڵێین خودا.

لەوەوە وێنەکان پەرشوبڵاو دەبنەوە بۆ (هەمووی دووەم) یان ڕووح و مەخلوقی یەکەم، کە هەموو تەنە ئاسمانییەدەرەکییەکان دەجووڵێنێ، لەم ڕووحەوەش چەندان گیانی دیکە تیشك دەدەنەوە، کە هەشت تەنەکەیە هەر یەکێکیان یەکەیەکە لەنێو جۆرە تەواوکارییەکانی، خودا دروستکەری هەموو تەنە ئاسمانییەکانە، کە ناونراوە گەردوونی ئاسمانی، کە پلەی دووەمە لەبوون، لە پلەی سێیەمدا عەقڵی کارابوونی هەیە کە ناونراوە بە ڕووحی پیرۆز، کە ئاسمان بەزەوی دەگەیەنێت، لەپلەی چوارەمدا دەروونی مرۆڤایەتی بوونی هەیە، ئەمەش جۆرا و جۆرە بە بوونی زۆر بوونی بەنی ئادەم یان مرۆڤەکان، لەدوای

ئەویش شێوە و ماددەکە پلەی پێنجەم و شەشەمە و بەویش هەموو پلە رووحییەکان دادەخرێن.
بەهۆی هەر شەش پلە، سێ پلەی سەرەتا خودی گیانەکانە، بەڵام سێ پلەکەی دیکە دەروون و شێوە و ماددەیە. ئەگەر تەنیش نەبێ، پەیوەندیی بە لەشی مرۆڤەوە هەیە، هەروا تەنەکان لە خەیاڵی رووح و گیانەدا شەش پلەن: تەنە ئاسمانییەکان و ئاژەڵ و ڕووەك و کانزا و لەشە سەرەتاییەکانە.

٤- دابەشبوونی هێزە دەروونییەکان یان بسیکۆلۆژیا

هێزە دەروونییەکان لەلای فارابی پلەبەند کراون، ئەمەو هێزی خوارو ماددەیەکە بۆ هێزی سەروو، سەرووش وێنەی خوارەوە، بەهای ئەو هێزانەش هەمووی هزرە، کە ماددی نییە و وێنەیەکە بۆ هەموو وێنەکانی پێشتر.
ژیانی دەروونی لەهەستەوە بەرز دەبێتەوە، تا هەست بەشتەکان بکات دواتر بەرەو هزر هەنگاو دەنێت بۆ بەرزکردنەوەی بوونە یەکلاکەرەوەکانی هزر.
ئەمەیش بەهۆی بینین و نواندن، لە هەر هێزێکشدا هێزی دەروون توانا و هەوڵەکانە، هەر تیۆرێکیش رووپەك هەیە جیای بکاتەوە لەکاتی کاردا، بۆیە ناکرێ ئارەزوو جیا بکرێتەوە لە درکپێکردنی هەست و دەروون کە قبووڵی دەکات یان رەتی دەکاتەوە بەهۆی هەستەوەرەکان.
هەروا هزر بڕیاردەری نێوان خێر و شەڕە بۆ هەر ئیرادەیەك هۆکاری خۆی دێنێتە پێش، بۆ ئەوەی هونەر و زانستەکان بهێنێتە کایەوە.
هەر درکپێکردن و هزرێکیش پێویستە هەوڵ و توانای لەتەکدا بێت تا بگەینە ئەنجامێکی پێویست وەك چۆن گەرمی لە ئاگرەوە پەیدا دەبێ، دەروونیش تەواوکەری لەشە، ئەوەی تەواوکەری دەروونیشە عەقڵە ، عەقڵیش واتە مرۆڤ.

بوونی عەقڵ لەگیانی منداڵێکدا لەدواتردا دەیکاتە عاقڵێکی کارا بەهۆی درکپێکردنی شێوە تەنەکان ئەمەش بەئەزموون لەڕێگەی هەستەوەر و هێزی نواندن و وێنەگرتن.

ئەنجامی هەموو تاقیکردنەوە و ئەزموونەکان تەنها کاری مرۆڤ نییە، بەڵکوو ئەمە ئەنجامی کاری گیانە کە لەسەرووی مرۆڤە، زانستی مرۆڤ، لەسەرووی خۆیەوە بۆی دێ و زانستێك نییە خۆی بەدەستی هێنابێ بەهۆی توانای عەقڵیی، بەڵکوو ئەم عەقڵە لەلایەن خواداوە بۆی هاتووە وەك هۆکارێك بۆ فەرمانەکانی خودا، نەك وەك هۆکارێك لە کاری مرۆڤەکان.

٥-بۆچوونی سەبارەت بە ئاکار و رەوشت

ئاکار بەبۆچوونی ئەو لەسەر بنەمای شێوازەکەیەتی، کە هەندێکجار لەتەك ئەفلاتوون هاوڕایە و هەندێکجاریش لەتەك ئەرستۆدا ئەمەش بەهۆی پاکی دەروونە کە بەهۆی هەڵسوکەوتەکانی بەدەستی هێناوە و پێچەوانەی خەڵکی ئایینییە، کە دەڵێن ئاکار و رەوشت لەنێوەندی زانستە شەرعییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، هەروا لەهەموو ڕوویەکەوە ئەوە دەسەلمێنێ، کە تەنها عەقڵە شتەکان لەیەکتر جیا دەکاتەوە ئەمەیش لەنێوەندی خێر و شەڕدا، نەخاسمە زانست و زانیاری گەورەترین چاکەخوازییە، زۆر بە ڕوونیش لەسەر نووسین و لۆژیك و بنەمای ئەرستۆ هەڵوەستە دەکات.

ئەوانەی کە وەك ئەو هەڵوەستە لەسەر بنەماکان دەکەن ئەرستۆ و نووسینەکانیەتی، کە هەمان شێواز ناگرێتە بەر، چونکە هەندێکجار کەسێکی نەزان شێوازێك دەگرێتەبەر، لەکەسی زانیار و چاکەکار زیاتر دەزانێ، ئەگەر نا نازاندرێ جیاکاریەکانی نێوان کاری چاکەکار و زانیارێك هێزی جیاکەرەوە،

چۆن بکرێتە بەڵگە بۆی، ئەو دەڵێت دەروون بە سروشتی خۆی چەندان ئارەزووی لەلا دێتە کایەوە، نەك وەك ئاژەڵ، چونکە مرۆڤ تەنها خۆیەتی ئازادە لەبژاردەکاندا.

٦–سیاسەتی فارابی

نموونەی باڵا بۆ حکومەت لەلای فارابی دەبێ دەسەڵاتدار فەیلەسووف بێت، ئەگەر خەڵك جەمبوون بە مەبەستی کۆبوونەوە، خۆیان دەخە ژێرپکێفی کەسێك بۆ ئەوەی حکومەت بنوێنێ.

باشترین حکومەتیش پەیوەندار نییە بە دەستەیەکی ئایینیی، بەو واتایەی حکومەت زاڵ بێت بەسەر بوارەکانی ئایینی و دونیایی (سەیری بۆچوونەکانی کتێبی شاری نموونەیی بکە).

فەلسەفەی فارابی، ڕەوحانییەکی تەواوە. ئەو ژیانی لەژێر سایەی پاشای عەقڵدا بوو، لەنێوەندی ژیانی مادديدا دەسووڕایەوە، فەلسەفەکەی هیچی پێنەدەبەخشی، ئەگەر داواکاری هەستەوەرەکان نەبوایە.

٧–قوتابییەکانی

قوتابییەکانی زۆر بوون، وەك: زەکرەیا یەحیای کوڕی عودەیی، کە مەسیحیەکی یەعقووبی بوو، ئەو ناودار بوو بە وەرگێڕانی نووسینەکانی ئەرستۆ، هەروا ئەبو سلێمان محەمەد کوڕی تاهیری سجستانی زانستی لێ وەرگرتووە، کە زانایانی سەردەمەکەی لێ کۆبوونەتەوە، بەتایبەتی لەنیوەی کۆتایی سەدەی دەیەم لەشاری بەغدا. فارابی لەگەڵ قوتابی و خوێندکارەکانی کۆششێکی زۆر کرد، تا گەیشتنە زانستی کەلام، بەمەش کۆتاییان پێهێنا، وەك چۆن ئیخوان سەفا بە فەلسەفەی سۆفیگەریی گەیشتن.

٨-وتەکان سەبارەت لە بەشەکانی دەروونی مرۆڤایەتی و هێزی

مرۆڤ سەرەتا لەنێوەندی کاردانەوە و ڕووداوەکان دەگاتە هێز، لەدواتردا ئەو هێزەی زۆر بەرروونی هەستی پێ دەکات، وەك: گەرمی و ساردی و هەموو شتەکانی دیکە، هەروا هەستی بۆن و بەرام، لەتەك هێزەکانی دەنگ، هەموو ئەو ڕەنگانەی بەچاو دەی بینێت، هەموو ئەمانە لەتەك هەستەوەرەکاندا دێتە کایەوە و ململانێ لەگەڵ هەموو ئەو شتانەش دەکات، کە هەستی پێ دەکات، یان ئەوەتا ئارەزووی لێیەتی، یان ڕقی لێ هەڵدەستێ، لەپاشاندا هێزێکی دیکە هەیە هەستی پێ دەکات، ئەویش ئەو وێنانەیە، کە دەبێتە مایەی سەرنجڕاکێشیی هەستەوەرەکانی، هێزێکی گریمانەییە و ئاوێتەی هەستەکان دەبێت. لەنێوەندی ئەم پێکهاتە و ئاوێتەبوونانە هەندێکیان بەچاك دەزاندرێت، بەڵام هەندێکی دیکەیان درۆینانەیە و لەتەك ئەمانەشدا هەندێك لەو هەستانە ڕاستگۆیانەیە، لەدواتردا هێزێکی گوتن و قسەکردن دێتە ئارا، کە دەکرێ زۆربەیان ماقووڵ بن و جوان و ناشیرینی پێ لێك جیا دەکرێتەوە و هەندێکی دیکە دەبێتە بەشێك لەزانستەکان و پیشەگەری و ئەویش بەپێی ماقووڵبوونیەتی بەو پێیەی عەقڵە، بەمەش هێزێکی سەرەکی لەخۆ دەگرێ و لەزۆر بواردا خزمەتت دەگەیەنێت.

ئەم هێزە سەرەکیەش لەدەمەوە دەست پێ دەکات تا هەموو ئەندامەکانی لەش، هەر ئەندامێکیش بەپێی پێویست خزمەت بەئەندامەکانی دیکە دەکات، دیارە هێزی سەرەکی سەرچاوەیەکە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش و بەو پێیەش کارەکانی دەجووڵێنێ، بێگومان مەبەستی سەرەکیی دڵ دەپێکێ، وەك چۆن گەدە و جەرگ هۆکاری خۆیان هەیە.

ئەو ئەندامانەی کە خزمەت پێشکەش دەکەن، خزمەت بەهەموو ئەندامەکانی دیکە دەکەن، وەك جەرگ ئەندامێکە شایە و شای هەیە و شاکەشی دڵە، بەڵام شای گورچیلە و زراو و چەند ئەندامێکی دیکەیە، میزڕەڕ خزمەت بە گورچیلە دەکات و گورچیلەش خزمەت بە جەرگ و خوێن دەکات، ئەویش لەخزمەت گورچیلە دایە، بەمشێوەیە هەر یەکە و جۆرە بوونێکیان هەیە.

هێزی هەست، شایەکی هەیە و ڕەنگدانەوەی هەیە کە پێنج هەستەوەرەکەیە، کە لەلای هەمووان باوە و دابەشیوە بە چاو و گوێ و ئەوانی دیکە، هەر یەك لەو پێنجە هەستێکی تایبەت دەبەخشێت، سەرەکییەکەشی هەمووی لەدەوری ئەودا کۆدەبنەوە، هەر پێنج هەستەوەرەکەش، بەشێوەیەك لەشێوەکان لەنێوەندی لەش و وڵاتدا کاری خۆی دەکات و مێژوو تۆمار دەکات.

سەرەکییەکە شایە، کە هەموو لایەك لەسەری کۆدەبنەوە کە بووەتە جێگەی تۆمارەسەرەکییەکان، ئەویش لەدڵەوە سەرچاوە دەگرێت.

هێزی گریمانەیی ئەویش دۆخەکەی پەیوەندار و دابەشبووە بەسەر هەموو ئەندامەکان و سەرچاوەکەی لەدڵەوە دەبێ کە هەموو هەستەوەرەکان لەبۆتەیەکدا جێگیر دەکات، ئەو لەیەکیان جیا دەکاتەوە و هەمووشیان بەیەکتر دەبەستێتەوە، لەهەندێکیان ڕەزامەندی دەردەبڕێ، بەڵام لەهەندێکی دیکەدا پێچەوانەی هەستەوەرە.

بەڵام هێزی گوتن و قسەکردن لەهەموو لایەکەوە خزمەت دەکرێ و سەرۆکایەتیی هەموو هێزە گریمانەیەکان دەکات، هەر ڕەگەزێکیش سەرۆك و سەرکردەی هەیە و یەکێکیان بەسەر ئەویدا زاڵە، هەموو ئەمانەش سەرچاوەیەکە بۆ هێزە گریمانەییەکان و سەرچاوەی هێزی هەستەوەرەکانە لەتەك هەموو ئەو هێزە هەستەوەرانەی کە پێشبڕکێ لەگەڵ یەکتردا دەکەن کە

هەندێکیان جێگەی حەز و ئارەزووە و هەندێکی دیکە رقت لێیەتی، بەم پێیەش ئیرادە رۆڵی خۆی دەبینێت کە پەیوەندارە بە درکپێکردن یان هەست، بەڵام گریمانەیی و هێزی گوتن و قسەکردن دەبێ زاڵبوونەکەی بە هەند وەربگیرێت یان وازی لێ بهێندرێ.

پێشبڕکێ و ململانێ هۆیەکە بۆ گەیشتن بەزانستێك یان ئەوەتا دەبێتە هۆی هاتنە کایەوەی کارێك، بەڵام هەموو لەش لەتەك هەموو ئەو هێزانەیە، کە سەرچاوەکان بەخۆیەوە دەگرن، هەندێك ئەندامیش بۆ ئەوە دانراون کە جۆرێك لەفەرمان و کارەکانی ئەنجام بدەن، وەك ئێسك. هەر ئاژەڵێك کاری خۆی دەکات، بەڵام دەست و پێ بە پابەندبوونەوە لەکار دایە.

هەموو ئەو هێزە جەستەییانە و ئەوانی دیکە، کە خزمەت بە ئەندامەکانی دیکە دەکەن لەدڵەوە سەرچاوە دەگرن، ئەویش لەوانەیە پەیوەست بێ بە هێزی گوتن و قسەکردن لەوانەشە گریمانەیی و پەیوەند بێ بەهەستەوەر، ئەو کارانەی دیکەی دەیکەیت، لەوانەیە پەیوەندی بەهێزی دیکەوە هەبێ، وەك ئارەزووت لەشتێك، ئەمەش هێزی هزریی و بینین و لێکدانەوە و ئاسانکردن بێ.

ئەگەر پێشبڕکێ و ململانێیەکان زانینی شتێك بوو، ئەوا هەستەکان درکی پێ دەکەن بەشێوەیەکی پێکهاتەیی دێتە ئارا، وەك شتێك حەزمان لێیە ببینین، سەرەتای پێڵوەکانمان بەرز دەکەینەوە و چاومان بەرەو ئەو شتە دەڕوا، کە ئارەزوومانە ببینین، ئەگەر خودی خۆشمان ویستمان پەردەیەك دوورست بکەین، ئەوا هۆکاری لەشە، هەر لەخودی خۆی هەستەکانی دەجوڵێت، ئەمەش لەنێوەندی هەموو هەستەوەرەکاندا، گریمانەیی بینین لەهەر روویەکی دیکەشدا دەیبینین و وای دادەنێن کە بینیومانە.

هاوکات هەندێك هێزێکی گریمانەیی هەستکردن بەهەر شتێکە، وەك هەستکردن و گریمانەیی بە شتێکی ترس، لێرەوە هێزی گوتن و قسەکردنی وەڵامی دەداتەوە، ئەمەش فەرمانی هێزی گوتن و قسەکردنە، هێزێکی دەروونییە.

٩-گوتن لەنێوەندی هێزی گوتن و قسەکردن چۆن عەقڵ پێباشە و هۆکارەکەی چییە

ئەمەش لەنێوەندی ئەو وێنایە دەمێنێتەوە کە وێنەکان پۆلین دەکات، ئەوانەی کە ماقووڵیشن هێزی قسەکردن دەهێنێتە کایەوە، ماقووڵ بوونیش لەناوەڕۆکەکەی عەقڵە بەکار، ئەمەش دوورە لەمادده بەتایبەتی ئەو شتانەی دوورە لە ناوەرۆك وەك بەرد و ڕووەك.

بە گشتی هەموو شتێکی لەش و نێو لەش ماددەیە، خودی ماددەش هەموو شتێکە، کە بەکردەوە ماقووڵ و ناماقووڵ نییە، لەنێوەندی مرۆڤدا، ماددەش بۆ ئەوە ئامادەکراوە، کە وێنەی ماقووڵێك وەربگرێ، دەشکرێ ببێتە شتێکی ماقووڵ بەکار و فەرمانەکانی و لەدواتردا دەیگوازێتەوە بۆ هێز و دەشکرێ ببێتە عەقڵ، ئەگەر ئەمە ڕوویدا واتە لەهێزێکەوە دەبێتە هێزی کردەوە، واتە عەقڵ عەقڵێکی هیولانی پێدەبەخشێ، وەك هێزی وەرگرتنی عەقڵێك کاتێك تیشکی خۆر کاریگەر دەبێ لەسەر بینین، چونکە بینین هێز و پایەیەکە لەنێوەندی ماددەدا، کە بینین هێزێکە بۆ هێزی ڕەنگەکان، چاویش هێزێکە ڕەنگەکان لەیەکتر جیا دەکاتەوە.

هێزی بینین تەنها لەچاوەکان بەس نییە بۆ ئەوەی هێزی بینینی هەبێ، چونکە خۆر تیشکێك دەبەخشێ بەچاوان و چەندان ڕەنگی پێ دەبەخشێ، لەنێوەندی ئەو ڕەنگانەوە ئەو هەستەمانی پێدەبەخشرێ تای لێکیان جیا بکەینەوە،

بینیی شتەکان بەهۆی تیشك و رووناکییەکانەوە دێتە ئاراوە، بەمەش پایەیەك بۆ ئەو ڕەنگ و تیشکە دادەنێ، عەقڵیشی لێرەدا هۆکاری وێنای شتەکانە لەنێوەندی عەقڵی هیولانی و ئەو شتانەی کە ماقووڵن بەهێزی ماقووڵ دەبیندرێ، ئەمەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ عەقڵمان.
ئەم عەقڵە جیاوازیی هەیە لەگەڵ عەقڵی هیولانی هەمان کاردانەوەی خۆرە لەگەڵ بینین، بۆیە ناونراوە عەقڵی کارا، ڕیزبەندیی لەنێوەندی شتەکان جیایە، کە باس کراوە بەبێ هۆ، بەڵام یەکەمە لە ڕیزبەندیی دەیەم، عەقڵی هیولانی ناودەنرێ بە عەقڵی جیاکراوە.
کاتێك هێزی قسەکردن و عەقڵی کارا هاتنەکایەوە بۆ دانانی شتێك بەهەمان تیشك ئەو کاتە هەستیاری دێتە کایەوە، بەمەش هێزی گومانـاوی ماقووڵ دەبێت، لەهێزی قسەکردن، کە بۆ هەموو خەڵکی هاوبەشە: وەك : گشت مەزنترە لەبەشێك، گشت پێوەرە یەکسانی شتەکان و ماقووڵییەکانی یەکەم هاوشانە بۆ سێ پۆلێنکردنی ئەندازیاری زانستی، پۆلێنکردنی سەرەتاکان هەمووان هەڵوەستەی بەرامبەر دەکەین وەك جوان و ناشیرین، هەورا پۆلێنکردنە سەرەتایەکان دەتواندرێ بۆ بوونەکان بەکار دێ مەرج نییە مرۆڤ بیزانێت، وەك: ئاسمانەکان، ئەمەش بۆ هۆکاری یەکەم و هەموو بنەماکان دەگەڕێتەوە و دەبێ ئەم بنەمایانەش لەئارادا بن.

١٠-قسەکردن لەسەر جیاوازی لەنێوان ئیرادە و هەڵبژاردن و خۆشگوزەرانی
کاتێك ئەو ماقووڵبوونانە لە مرۆڤ دێتەکایەوە، بێگومان لێکدانەوە و بۆچوونمان دەبێت بۆ ئاسانکاریی ئارەزوومان دەجوڵێت ئینجا چ بۆ خۆشییەکان یان ڕقلێبوونەوە و هەموو ئەمانەش بەدرکپێکردن دەیخەینە ڕوو، هەموو ئەو هەست

و گۆمانە ناوێکی گشتی هەیە کە ئیرادەیە، ئەگەر لە رستەیەکدا خستمانە ڕوو ناوی دەنرێ هەڵبژاردن، ئەمەش لەمرۆڤدا بەدەر دەکەوێت، مرۆڤیش بۆ ئەوە بەکاری دەهێنێ تا تەواوکاریەکانی خۆیی تەمام بکات.

ئەمەش خۆشی و خۆشگوزەرانییە، وەك ئەوەی دەرووونی مرۆڤ بەرەو کامڵبوون دەڕوات و پێویستیی بەماددە نابێت، بەشێوەیەك لەنێوەندی هەموو تەنەکاندا شتەکان خودی خۆی هەنگاو دەنێت، هەر بەو شێوەیەش دەمینێتەوە، بەبێ ئەوەی لەنێوەندی عەقڵی کارادا بێت.

کاتێك باس لەفەرمانەکان دەکەینەوە هەندێکیان هزریە و هەندێکی دیکەش فرمانی لەشە، بەڵام هیچ کامیان لەسەر فەرمانێك ڕێك نەکەوتووە، بەڵك تەنها چەند کردەوە و فرمانێکە لەشتێکەوە دێتە ئارا، بەڵام دیاریکراوە.

هەموو کردەوە ئیرادییەکان ڕێگری ناکەن لەخۆشگوزەرانیی، چونکە خۆشگوزەرانی شتێکی داواکراوە بۆ خود، داوا ناکرێ بەڵکوو لەکاتێکدا دێتە ئارا و هیچ کاتێکیش مرۆڤ لەخۆشگوزەرانیی بەمەزنتر نازانێ.

هەموو فەرمان و کردەوەکان هۆیکن بۆ فەرمانی خۆشگوزەرانی، کە کردەوەی جوانن، لەتەك هەموو شتەکاندا دەبێ کردەوەی چاکەکاری بێتە کایەوە، دیارە هەموو ئەمانەش بۆ خودی مرۆڤەکەیە لەکۆتاییشدا لە پێناو خۆشییە.

هەموو ئەو کردەوە و فەرمانانەی کە ڕێگرە لە خۆشی و خۆشگوزەرانی، هۆکارەکانی شەڕ و کردەوە خراپەکانە دیارە هەموو ئەو کردەوانەش کاری نابەجێ و هیچ و پووچە.

هەموو هێزەکانی مرۆڤیش بۆ خزمەتکردنی لەشە، واتە هەست و نەست و گومان بۆ خزمەتی لەشە، دواتر خزمەت بە هێزی قسەکردن دەکات، دیارە خزمەتی سیانەی لەش دەگەڕێتەوە بۆ خزمەتی هێزی قسەکردن و قسەکردنیش

تیۆری و پراکتیکی هەیە : پرۆسەکەش بۆ خزمەتی تیۆرە و تیۆریش خزمەت بەهیچ ناگەیەنێت، بەڵکوو بەرەو خۆشگوزەرانیت دەبات و هەموو ئەمانەش پەیوەستە بەهێزی ململانێیەکان، ململانێش خزمەت بە هەست و گومان و قسەکردن دەکات و هێزە خزمەتکارە درکپێکراوەکان ناتوانن خزمەت بە کار بگەیەنێت، تەنها پەیوەستە بەهێزی ململانێیەوە.

بۆیە بینین و گومان و هەست بەس نین، بەڵکوو هەموو ئەمانە پەیوەستن بە ئیرادە، چونکە ئیرادە ململانێ لەتەك هێزی پێشبڕکێ دەکات تا ئەو کاتەی درکی پێدەکات، کاتێك زانیارییت لەسەر هێزی تیۆرەکان لەلا هاتە ئارا، خۆشی و مەبەستەکانی چەکەرەی کرد ئەوکات بەرەو قبوولکردنی گومانەکان دێتە ئارا، هەستەکانیش لەسەر ئەو ئاراستەیە بەشێوەیەك هێزە ململانێیەکان ئەو کردەوانە ئەنجام دەدەن، لەدێریندا، فەرمان و کارەکانی مرۆڤ هەمووی بەرەو ڕووی خێر بوون، بەڵام ئەگەر خۆشی نەبینی ئەوا نەگەیشتووەتە مەبەستی خۆی، بەڵکوو مەبەستەکە ڕێڕەوێکی دیکە وەردەگرێت، بە پێچەوانەوەی ئەمەش، ئەوا کردەوە و فەرمانی مرۆڤ جوان نابێ.

١١–سەبارەت بە سروش و بینینی فریشتەکان

هەموو ئەو هێز و گومانانەی لەمرۆڤدا هەن، هێزی تەواوکار نین، هەموو ئەو شتانەی کە لەدەوروبەرماندان ناتوانین دەست بەسەر هەموویدا بگرین، هێزی قسەکردنیش بۆ ئەوە هاتووتە کایەوە تا شتەکان لەخۆ بگرێت، ئەمە لەکاتی بەئاگابوون هاوکات لەکاتی خەوتنیشدا.

عەقڵی کارا لە پشت ئەمەوەیە، بەشێوەیەك هەموو هەستیارەکان دیارە دەگوازرێنەوە، هێزی گومان وێنا دەکرێ، هێزی بینین لێرەدا وەك ئەوە بێ لە

هەوادا شت ببینیٚ، هەموو ئەمانەش بەهێزی چاو دێتە ئارا، هێزی گومـان و هەستکردن پەیوەندارە بەیەکەوە، چونکە هەستەکان دەیگەیەنێتە جوانی و کاملبوون، باسیش لەوە دەکات کە خوای مەزن، هێزێکی گەورەیە و جێگەی سەرسوورمانە، چونکە هەموو شتێك دەبینیٚ، کاتێکیش مرۆڤ هێزی بیـنین و گومانەکان گەیشتنە کاملبوون زۆرێك لە گەردیلەکانی ئێستا و داهاتوو لەوانەیە ببینیٚ. هەروا هەست بە زۆرێك لەشتە هەستیارەکان بکات کە تا ئێستا هەستی پێنەکراوە، هەموو ئەمانەش پەیوەندیی بەپێشبینی شـتەکانەوە هەیـە، کـە لەرێگەی خوداوە دەیبینیٚ، ئەمەش گەورەترین ریزبەندی هێزی گومان و بینینە و گەورەترین هێزە کە مرۆڤ پێی دەگات.

هەندێکی هەروا دەبنینیٚ و هەندێکی دیکەش لەکاتی خەوتنیدا، ئەوەی گومان دەکات ئەو هەموو شتانەی بینیوە ئەوا بەچاوەکانی نەی بینیوە، بەو واتایەی لە رێگەی دڵیانەو چەندان وشە و رستە و نهێنی و هێما دەبینن، دواتـر هـەر ئەوانە جیاکاریەکی گەورە دەبینن:

هەندێك قبووڵی زۆر شت دەکات کە لەبەئاگاییەوە بینوویەتی، بەپێچەوانەوەش هەیە ئەم شتانە قبووڵ ناکات، هەندێك هەن شتەکان لە خەوتندا دەبینن، بەلاّم لەکاتی بەئاگاییەوە دوای بیرکردنەوە ئەو شتە قبووڵ ناکەن، لەتەك هـەموو ئەمانەشدا یەکێك شتێك دەبینیٚ، ئەوی دیکە شتێکی دیکە، مرۆڤەکان لەنێوان قبووڵکردن و ناقبووڵکردندا دەمێننەوە، دیارە هەموو ئەمانەش هێـزێکن بـۆ گوتار و قسەکردن.

بەهۆی نیشانە و کردەوەکان و پێچەوانەبوون و تێکچوونی سـەلیقەکان ئـەوا زۆرێك لەشتەکان عەقڵی کارا قبووڵی ناکـات، هەنـدێکیان لـە بەئاگاییـەوە و

هەندێکی دیکە لەکاتی خەوتندا، هەندێك ڕۆژگارێك لەخەیاڵیان دەبینن و هەندێکی دیکە سەردەمێك لەلای ون دەبێ.
مرۆڤ ڕووبەڕووی زۆر شت دەبێتەوە لەژیانیدا، زۆرجاریش سەلیقەی بەم شتانە تێکدەچێت، بۆیە لەنێوەندی مێشکیدا هەندێك تارمایی گوماناوی دەبینێ، کە لەبنەچەدا نییە، وەك قسەکردن و ڕۆیشتن بەشێوەی شێت و شێوەکانی دیکەی.

١٢–سەبارەت بە پێویستی مرۆڤ بۆ کۆبوونەوە و هەرەوەزیی
هەرکەسێك دەبینی پێویستی بەشتێکە تا ئەو کاتەی کامڵ دەبێت، دەبینێ ناتوانێ هەموو شتەکان بە تەنها بکات و پێویستی بەخەڵکانی دیکەیە بۆ ئەوەی پێویستییەکانی راپەڕێنێت. دیارە هەر تاکێکیش لەنێوەندی کۆمەڵگەوە هاتووەتە ئاراوە، بۆیە مرۆڤ ناتوانێت بگاتە کامڵبوون و پێویستی بە کەس نەبێت، ئەمەش سروشتییە، تەنهاش بەکۆبوونەوەی کۆمەڵەکان و هەرەوەزی و هاوکاریکردنی یەکتری نەبێت ناکرێت، چونکە هەر تاکێك پێویستی بەکەسانی دیکەیە بۆ هاوکاریکردن، بۆیە لەسەر زەویدا دەبینی زۆرێك لەمرۆڤەکان کۆبوونەوە ئەنجام دەدەن هەندێکیان کامڵبووە و هەندێکیان ناکامڵن، هەردوو ڕووش دابەش دەبێنە سەر سێ چین: باڵا ، مامناوەند، بچووك.
کۆبوونەوە مەزنەکان لەسەر هەموو ڕووی زەویدا هەن، مامناوەندیش پەیوەستە بە کۆبوونەوەی نەتەوە، کەبەشێکە لەکۆیی زەوی ، کۆبوونەوەی بچووکیش بەشێك لە دانیشتووانی نەتەوەیە.
کۆبوونەوەی ناکامڵبووش ئەمانەن: کۆبوونەوەی خەڵکی گوند و کۆبوونەوەی خەڵکی گەڕەك، یان کۆبوونەوە لەڕێگە و ماڵەوەدا، لەهەمووشیان بچووکتر ماڵ

و گەڕەگ و ڕێگەیە چونکە هەموویان خەڵکی یەك شارن، ئەوە گوندە سەر بەو شارەیە و لەخزمەت شاردایە و لە ڕێگەش بەشێکە لە گەڕەك و ماڵەوەش بەشێکە لە ڕێگە، هەروا شاریش بەشێکە لەدانیشتووانی نەتەوە، نەتەوەیش بەشێکە لەهەموو گۆی زەوی.

باشترین شتیش بۆ خێر و کامڵبوون لەشارە و لەنێوەندی کۆبوونەوەکانیەتی، دیارە بەدەستگەیشتنی خێریش بە کۆبوونەوە و هەرەوەزیکردنی یەکتر دەبێ بۆ وەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی، کە پێی دەڵێن کۆبوونەوەی نموونەیی و چاکەکار، نەتەوەش کۆبوونەوە بۆ ئەوە دەکات تا نەتەوە بەرەو خۆشگوزەرانیی هەنگاو بنێت، بۆ وەستهێنانی پێویستەکانیش لەشاردا کە بووە شێوەیەك و دوورکەوتنەوە لەخراپەکاریی، ئەوا ئەو شارە بەرەو خۆشگووەرانیی هەنگاو دەنێ.

ئەو شارەی کۆبوونەوەی تیادا ئەنجامدرا، بۆ ئەوەی خۆشگوزەرانیی بەخۆیەوە ببینێ، لەراستیدا ئەو شارە شاری چاکەکار و نموونەییە، بۆیە کۆبوونەوەی چاکەکار و نموونەیی تیادا ساز دەکرێت، بەڵام ئەو کاتە شار خۆشی بەخۆیەوە دەبینێ، کە نەتەوەکە چاکەکار بوو بەشێوەیەك نەتەوە کۆبوونەوە و هەرەوەزی دەکەن، بۆ گەیشتن بە خۆشگوزەرانی، هاوکات شاری چاکەکار و نموونەیی وەك لەشێکی تەندروست وایە، کە هەموو لایەك هەرەوەزی و هاوکاری یەکتر دەکەن، بۆ ژیانێك تا هەموو شتەکان پارێزراو بن.

لەشساغ و تەندروست بە هەموو رەگەزەکانی بەهێزە، کە تیایدا ئەندامێکی تیادا سەرەکییە و هەموو ئەندامەکانی دیکەش نزیك دەبنەوە لێی. دیارە هەر ئەندامێکیش هێزێکە بەپێی پێویستەکانی خۆی کار دەکات تا مەبەستە سەرەکییەکانی بپێکێ، هەروا ئەندامەکانی دیکە بەپێی ئاماژە و سەرنجەکانی

سەرەکی لەکاردا دەبن، ئەم ئەندامانەس لەریزبەندی دووەمدان، هەموو ئەو ئەندامانەش کارەکانیان دەکەن بەپێی مەبەستی ئەوانەی لە ریزبەندی دووەمدان، بەبێ ئەوانەش کارێکی دیکە ناکرێ، تا خەڵکی دیکە بەکارەکانی خۆیان هەڵسن، بەمشێوەیە هەموو بەشەکانی شار بەپێی کار و فەرمانەکانیان و بەپێی مەبەستیان و ئەوانەی خزمەت دەکەن یان نایکەن، ئەوا لەخوارەوەی ریزبەندییەکەدان.

بەلام ئەندامە سروشتیەکان و بەشەکانی شار ئەگەر سروشتی بن، ئەوا هەموو کارەکان بە شێوەیەکی سروشتی نین، بەڵکوو بە ئیرادە کارەکانیان دەکەم، بۆیە دەستە و لایەنەکانی دیکە سروشتی نین بەڵکوو بەشێویەکە خۆیان دورستیان کردووە، لەکاتێکدا مرۆڤەکان لەبنەڕەتدا بەرەچەڵەك خەڵکی ئەو شارە نین و بەشێك نین لەو شارە، بەڵکوو ئەمە بەو واتایە دێ کە مرۆڤەکان کارەکان بۆ یەکتری بەرەو چاکسازیی دەبەن و هاوکاریی یەکتر دەکەن و تەنها ئەو شارە بۆ ئەوان نییە، بەڵکوو بۆ هەمووان و بۆ نەتەوە و مرۆڤایەتییە، کە تیایدا چەندان پشەسازی و پیشەیەی لێ دێتە ئاراوە، هەموو ئەمانەش بە ئەندامەکانی لەش دەچن، کە تیایدا بەشەکانی شار دەکەینە دەستە و دەزگای کارگێڕیی ئیرادە.

١٣- سەبارەت بە ئەندامی سەرەکی

وەك چۆن ئەندامی سەرەکی لە لەشدایە، بێگومان ئەو تەواوکەری هەموو ئەندامەکانە و هەموو ئەندامەکانی دیکە هاوبەشن لەگەڵیدا و لەتەك ئەویشدا چەندان ئەندامی سەرەکی دیکە هەن، بەلام سەرۆکایەتیەکەی وەك سەرۆکایەتی یەکەم نییە، کە سەرۆکایەتی هەموو لایەنەکان دەکات، ئەمەش وەك سەرۆکی

شارکە تەواوکەری بەشەکانی شارە، هەرکاتێکیش کەسانی دیکە بەشدارییان کرد ئەوا باشتر کارەکان بەڕێوە دەچن، ئەوانیش سەرۆکی چەند ئەندامێکی دیکە و خەڵکانی دیکەن، وەك چۆن دڵ هۆکاری یەکەمە بۆ هەموو ئەندامەکانی دیکە، بەو شێوەیەش هێز و ریزبەندیەك رێك دەخات، هەر کاتێکیش ئەندامێك بەرەو خراپی رۆیی، ئەوا کارەکانیش بەرەو خراپیی دەڕۆن. سەرۆکی شار پێویستە ئەو لەریزبەندی یەکەم بێ و ئەویش هۆکار بێ لەهاتنەکایەوە شار و بەشەکانی، هەروا بابەتە کارگێڕییەکان، کە چەند بەشێکن دەبێ ئەو ریزبەندی بکات، هەر کاتێك بەشێك کارەکانی بەجوانی نەکرد وەك ئەوەیە بەشەکانی دیکەش بەرەو تێکچوون هەنگاو بنێن، هاوکات ئەندامەکانی دیکەش لە ئەندامی سەرەکی نزیك دەبنەوە، بەشێوەی کاری سروشتی، کاتێکیش ئەندامەکان کاری باش و باشتر دەکەن، بەو شێوەیە لەسەرۆك نزیك دەبنەوە بەو شێوەیەش بەشەکانی دیکە کارەکانیان جوانتر دەکەن.

کار و کردەوەی رێکوپێك و عەقڵانی بابەتەکان بەرەو یەکلاکردنەوە دەبەن، بەو شێوەیە کارە مەزنەکان وەك کاری میزڕەوە لەبەشی خوارەوەی لەش، کاتێکیش کارەکان بە زانیاریی بەڕێوە چوون، بەرەو ئاسانکاریی هەنگاو دەنێن. بەو شێوەیەش لەشاردا هەموو شتەکان دەبێ رێکخراو بن، چونکە سەرۆك حاڵەتێکە لەکۆی گشتی ئەندامەکانی دیکە، هەروا حاڵەتێکە لە بوون وەك چۆن هەموو بوونەکانی دیکەش جێگەی خۆیان گرتووە، وەك پاشای شاری نموونەییە، هاوکات دەبێتە ماددەیە لەتەنەکانی ئاسمان، تەنی هیولانییە. ئەویش بە پیچی ریزبەندییەکەیە و بەپێی مەبەستی سەرووتر هەنگاو دەنێت، هەموو شتەکانیش یەك لەدوای یەکن، وەك سێ ریزبەندی لەنێوان یەکەم و دووەمدا هۆکارە.

بەڵام ئەم ریزبەندییە لەبنەڕەتدا بۆ مەبەستی یەکەمە، هەر کاتێك لایەنەکانی دیکە وەك بەشی یەکەم لەکاردا بن، ئەوا ئەو بەشە مەبەستی خۆی پێکاوە، بەڵام ئەگەر بەپێی ئارەزووی یەکەم هەنگاو نەنرێ ئەوا پێشبینی دەکرێ یەکەم کارەکانی نەپێکێت، بۆیە هەموو هەوڵەکان بۆ ئەوەیە چۆن سەرۆك و یەکەم ریزبەندییەکەی داناوە، دەبێ مەبەستی خۆی بپێکێت، سەرۆکی شاریش مەرج نییە هەموومان لەسەری کۆك بین، چونکە سەرۆکایەتیی بە دوو شت دێتە ئاراوە: یەکەمیان لەوانەیە بە میرات بێ و بۆیی ئامادە کرابێت، دووەمیش پەیوەستە بەدەستە و دەزگە کارگێڕییەکان.

ئەو سەرۆکایەتیەی کە بەمیرات بۆی ماوەتەوە و بۆیی ئامادەکراوە مەرج نییە هەموو شێوە پیشەسازییەك بزانێ، بەڵکوو زۆربەی پیشەگەران لەخزمەتی ئەودان، باشترین میراتیش خزمەت و رازەیە کاتێك پێشەگەرێك پیشەگەرێکی دیکە خزمەت دەکات و فێری هەموو بنەماکانی پیشەکەی دەکات ئەو مرۆڤەش مەرج نییە سەرۆکی هەبێت، بەڵکوو لەڕووی هزرییەوە کامڵبووە بەشێوەیەك هێزی گومان و درکپێکردنی گەیشتۆتە کامڵبوون، ئەمە هێزەش لەکاتی بە ئاگاییەوەیە، بەڵام لەکاتی خەوتندا عەقڵی کارا خۆی دەدوێنێ، بە شێوەیەك هەموو ماقووڵییەکان دەدوێنێ، بەو شێوەیە عەقڵ بە ماقوولیەت دەگات.

هەر مرۆڤێکیش عەقڵی کارا بوو، بە ماقووڵ چ بەشێوەیەکی پراکتیکی دەبێتە عەقڵ و بەپراکتیك ماقووڵە بەو شێوەیە ماقووڵەکان لەسەرووی عەقڵەوە دەبێ، باشترین نزیکردنەوە لە عەقڵی کارا ناونراوە عەقڵی سوود وەرگرتوو ئەمەش دەچێتە نێوان عەقڵی هەڵچوو لەنێوەندی عەقڵی کارا، عەقڵی سوود وەرگرتووش وەك ماددە وایە، چونکە بابەتی عەقڵی کارا و هێزی قسەکردن وەك دەستیەکی سروشتییە کە ماددەیەکی دانراوە بۆ عەقڵ.

یەکەم بەهاش کە مرۆڤ پێی بگات بەشێوەیەکی سروشتی بێت و خۆی ئامادە بکات تا عەقڵ بەکردەیی پەیڕەو بکرێ ئەمەش لەنێوان هەمووان هاوبەشە لەتەك عەقڵی کارا، کە دوو شێوەیە: عەقڵی بەکردەیی هەبێ، هەروا عەقڵ سوودیش وەربگرێ، ئەوەی بگاتە ئەو ڕادەیە دەگاتە بەرزترین ریزبەندی مرۆڤایەتی، بە شێوەیەك کەسایەتیی سروشتی لە ماددە و وێنە پێکهاتووە.

کاتێك ئەو مرۆڤە وێنایەکی مرۆڤایەتی بوو، ئەوا عەقڵی هەڵچوو هاتووەتە کایەوە لەتەك ئەمەشدا تەنها یەك پلەی ماوە بگاتە عەقڵی کارا، هەڵچوو ماددەیەکی بەسوودە بۆ ماددەی عەقڵی کارا کە هەردووکیان تیۆری و پراکتیکیە لەسەرووی ئەمەوەش هێزی درکپێکردنە بەو شێوەیە خودای گەورە عەقڵی کارای پێ دەبەخشێ، لەپاشاندا بەهۆی عەقڵی هەڵچوو لەوانەیە ببێتە دانا و فەیلەسووف و هۆکارێکە تا گەردیلەی ئیلاهیاتمان پێ رابگەیەنێ.

ئەم مرۆڤە کامڵبووە لە ڕیزبەندی مرۆڤایەتیدا و لەبەرزترین پلەکانی خۆشیدا و دەبێتە کەسێکی کامڵبوو و یەککگرتووی عەقڵی کارا، بەو شێوەیەی کە پێشتر باسمان لێوە کردووە.

ئەو مرۆڤەش هەڵوەستە دەکات بەرامبەر هەر کردەوەیەك تا بگاتە پلەی خۆشی، ئەمەش یەکەم مەرجی سەرەکییە، بەو شێوەیە هێزی قسەکردن و گوتنی بەهێز دەبێ لە ڕووی درك پێ کردنەوە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ ڕێنماییکردن بەرەو خۆشبەختی و ئەو کارانەی کە دەبێتە هۆیەك بۆ بەختیاریی، ئەمەش سەلماندنێکە بۆ دەستپێکردن بەکاری گەردیلەیی و بەشبەش کردن.

١٤-سەبارەت هێز و بەشەكانی و چۆنیەتی بوونی بە یەك بەش

تەنێكی موگناتیشی نیمچە ماددەیەكە بۆ هێز و هەستی سەرەكی، هەستیش وێنەیەكی موگناتیسیە، هەستی سەرەكیش نیمچە ماددەیەكە بۆ قسەكردنی سەرەكی، هەروا قسەكردنیش وێنەیەكە لەمێشك، نابێتە ماددەیە بۆ هێزەكانی دیكە لەوێنەكەدا وێنەكانی دیكە پێشكەش دەكەی و پێشبڕكێ و ململانێ سەر بە هەستی سەرەكی و گۆمان و مێشك و قسەكردنە، كاتێك كە ئاگر كرایەوە بێگومان دەبێ گەرمیی هەبێت، دڵ ئەندامێكی سەرەكییە، كە هیچ كام لەئەندامەكانی لەش سەرۆكایەتی ناكات، لەدواتردا مێشك و مۆخ دێن ئەوانیش ئەندامی سەرەكین، سەرۆكایەتیەكەی وەك ئەوەی یەكەم نییە، بەڵكوو دووەم سەرۆكایەتیە: چونكە ئەویش سەرۆكایەتی هەموو ئەندامەكان دەكات هەروا خزمەت بەدڵ دەگەیەنێت و خزمەت بەهەموو ئەندامەكانی دیكە دەگەیەنێت بەپێی ئەوەی دڵ مەبەستیەتی، وەك خاوەن ماڵ سەرەتا خزمەتی ئەو مرۆڤە دەكات، كە خاوەنیەتی دواتر خزمەت بەهەموو ئەوانی دیكە دەگەیەنێت كە لەو خانووەدان، بەڵام ئەو خانووە بە پێی رۆژگار مرۆڤەكان دەگۆڕێت، هاوكات ئەو گۆڕانەش بەدەست سەرۆك نییە، چونكە تەنها لەخزمەت دڵدایە.

بۆیە دڵ گەرمییەكی هەیە لەنێوەندی هەموو ئەندامەكانی دیكە كاریگەریی هەیە، بەشێوەیەك ئاژەڵیش دڵی هەیە، بەڵام دڵی مرۆڤ بەهۆی گەرمی و كاریگەریەكانی رێنوێنی دەداتە هەموو ئەندامەكان زۆرجاریش كارەكان تەواو نەبوونە بۆیە زۆر شت نەگەیشتۆتە مۆخ تا ئەو كاتەی گونجاو دەبێ، ئەمەش یەكێكە لەكارەكانی مۆخ لەم رێگەیەوەش خزمەت بە ئەنجامەكانی دیكە دەگەیەنێت، دەماریش لێرە كاریگەریی خۆی هەیە، كە دووبەشە یەكەمیان وەك ئامێر وایە بۆ خزمەتی هێزی سەرەكی، هەستە كە لەدڵدایە تا هەر یەك لەو

ئەندامانە هەستی پێ دەکات، خاڵەکی دیکە ئامێری ئەندامەکانە کە خزمەت بەهێزی ململانێ و پێشبڕکێ دەدات، تا جوولەیەکی بە ئاگا بکات.
مۆخ خزمەت بە دڵ دەگەیەنێ، هەست و دەمارەکان تا هێور دەبێتەوە هەروا خزمەتەکەی بۆ ئەوەیە تا جوولەیەکی بەئاگا بنوێنێ تا هەموو ئەندامەکانی دیکەش هەمان هێزی بەئاگا بنوێنن چونکە زۆربەی دەمار و ماسوولکەکان سەرچاوەکەیان لە مۆخەوەیە زۆربەشیان تا دەگەنە شوێنی خۆی چەندان هێزی گومانـاوی دورست دەکەن، بۆ ئەمەش کاتی قسەکردن ئەو کاتە دێتەکایەوە کە گەرمی دڵ بە پێی پێوەرەکان بێ و هەموو شتەکان ئەزبەر بکات و یادی شتەکان بکاتەوە.
مۆخ خزمەت بە دڵ دەگەنێت تا پلەی گەرمیەکەی هاوشان بێ لەگەڵ هەموو گۆمانەکان کە تێپەڕ دەبێ تا هەموو شتەکان بەیەکسانی بەبیرت بهێنێتەوە، واتە لەبەشی سێیەمدا بۆ ئەزبەرکردن و یادکردنەوەیە، بۆیە لێرەوە دڵ بەهۆی پلەی گەرمیەکەی هێزێکی زۆری هەیە و هەموو ئەندامەکانی دیکە پڕ دەکات تا هەست و دەرمارەکان جووڵە بکەن، بە شێوەیەك مۆخ هەموو ئەو شتانە هەڵدەگرێ کە دڵ دەیەوێ هێزی جووڵەی تیادا ئەنجام بدات، کاتێکیش کە دڵ بەرەو وشکبوون دەڕوا کاریگەری دەبێ لەسەر مۆخ، بۆیە نەبوونی شێداری لەناو دەمارەکان هێزە دەروونیەکانیش کەم دەکاتەوە، بەمەش بەبوونی شێداری و بوونی شلەیەك پێویستبوونی دەمارەکانە، ئەگەر وانەبێ کاریگەریی دەبێ لەسەر مۆخ هەرچۆنێك بێت ئەو شێداری و شلەیە پێویستیەکی هەنووکەییە بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش بەتایبەتی دەمار و مۆخ و بڕبڕەی پشت، مۆخ و جەرگ و ئەندامەکانی دیکە هەر یەکە و کارێك دەکەن و لێکیش جیان، بەڵام زۆر پێویستە هەر هەموویان بەیەکەوە بەستراببێتەوە وەك

پەیوەندی دەمار و مۆخ لەلایەکی دیکەوە هێزەکانی خزمەت کردن وەك دەم و قورگ و گورچیلە و جەرگ و زراو و ئەوانی دیکە بەهەر شێوەیەك بێت کاری خۆیـان دەکـەن و کاریگـەرییان هەیـە لەسـەر دەروون هـەروا پێویسـتە پەیوەندیەکی لەشیان لەتەك یەکدا هەبێ، هەر هەموویان دەگەڕێنەوە سەر دڵ و مۆخ، ئینجا ئەمە زراو بێ یان جەرگ.

ئەندامەکانی دروستکردن لەدوای هەموانەوە کاری خۆیان دەکەن، تا لەڕووی لەشەوە ئاگادار دەکرێتەوە وەك گەرمی یادکردنەوە، بەشێوەیەك وێنەکە لە ڕووی ماددیەوە جووڵە دەکات تا دەگاتە ئەوەی وێنەیـەکی تـەواو دروست دەکات بۆ جووڵە کردن، لەلایەکی دیکەوە سـەبارەت بـە مـێ و نێـر لـەڕووی ماددیەوە کاتێك نزیك یەك دەبن و لەیەکتر دەئاڵێن وێنەیەك دەهێننە کایەوە، بۆ ئەوەی خوێنی زیاتر بێت هەموو ئەو خوێنەش لـە ئەندامـەکانی مرۆڤـەوە دەتکێ، وێنەی هەر ئەندامێکش وێنەی مرۆڤە ئەو خوێنەی دەچێتە نێو ڕەحم ماددەیەکی مرۆڤە بۆیە ئەو داینەمۆی ئەو ماددەیەیە کە وێنەکەی تیادا دێتە ئاراوە.

بەشێوەیەك ئەو ماددەیە وەك شیر وایە کـە سـپێرمی پـێ دەڵـێن کـە دواتـر مەلۆتکەی لێ دێتەکایـەوە وەك ئـەوە بـێ لەدەفرێکـدا شـیر برژێنـی بـۆ نێـو دەفرێکـی دیکـە، بـەڵام لەنێوەنـدی ڕەحمـدا ئاوێتـە دەبـێ، بۆیـە دەبینـی ئارەقەیەك لەژێر پێستدا هۆیەکە بۆ زیاتر ئاوێتە بوون، خوێنیش لەوێدا بنەمای هێزت پێدەبەخشێ، لەو کاتەی ئەندامەکانی دیکە ئامادەبوونیان هەیە.

وێنەی هەر ئەندامێك و وێنەی هەمووی لەش و ئـامێرە بەردەوامـەکان کـاری خۆیان دەکەن، وەك پزیشك دەتوانێ بەچەندان ڕێگە چارەسەرت بکات وەك دەرمـان و ئـامێر، دەبینـی کارەکـانی پزیشـك جـۆرێك لـە تەندروسـتیت پـێ

دەبەخشێ، بەڵام دەبینی دەرمان بەبێ ئەوەی پزیشك هەبێ ئەوا کاری خۆی دەکات، بەڵام ئەو دەرمانە دەبێتە داینەمۆیی جووڵە لە لەشدا و جووڵە بە لەشی تەندروست و ساغ دەکات، سپێرم کە دەچێتە نێو رەحم لەوێنەی ئاژەڵێکە و دەچێتە نێو ئەندامەکانی مێینە لەنێوەندی ئەو ئەندامە دروستکەرانەش دەبنە هۆی جووڵەی پیاوانە.

هەردوو هێز واتە هێزی پیاوانە و مێینانە دوو شتی لێك جیان، بەڵام لەوێدا بەنزیکبوونەوە بەرجەستە و ئاوێتەی یەکتر دەبن وەك ئەوەی لەیەك کەسدا هاتبێتە ئارا، وەك زۆربەی ڕووەکەکان ماددەیەك دەردەن بۆ ونکردنی وێنەی پێشووتر و ئامادەبوون بۆ وێنەیەکی نوێ و جووڵەیەك بەوێنەکە دەهێننە کایەوە.

دیارە هەر هەموو ئەمانە پەیوەندییان بەدڵەوە هەیە، بەڵام دەکرێ ئەمەش لە ئاژەڵەکاندا بێنەکایەوە بەهۆی هێزی ئەندامی مێینە و نێرینە، لەنێو هێلکەدانی هەموو تۆخم و ڕەگەزەکاندا بوونی هەیە بەشێوەیەك ئەو شێدارییە ئەگەر نەگاتە شوێنی خۆی ئەوا کارەکە ئەنجامی نابێت.

بەڵام لەنێوەندی مرۆڤدا شتی وا نییە چونکە هەردوو هێزەکە لە مرۆڤدا جیایە و هەموو ئەندامەکانی دیکەی مرۆڤ تیایدا هاوبەشە، هەروا ئەندامی نێرینە گەرمترە و هەموو جووڵەکان شتێکی دەروونی دەهێنێتە کایەوە، چونکە هێزەکە زۆر توندە واتە نێرینەی پیاو، بەڵام مێینە کەمێك لاوازترە.

لەتەك ئەمەشدا لەنێو هێلکەدانی مێینەدا زۆر ئەندام هەن لەوەی نێرینە نزیکن واتە نزیکبوونەوەیەك لەهەموو ڕوویەکەوە دەهێنێتە کایەوە، دووبارە ئەمە لەوێنەی مرۆڤ دەهێننە کایەوە، دیارە هێزی هەست و گومان و قسەکردن لەیەکتر جیا دەبنەوە و دەکەونە دەرەوەی وێنە هەستییەکان ئەمەش بۆ ئەو

ڕەگەزانەی هەر پێنج هەستیان هەیە، کاتێک باس لە هەست و نەست و درکپێکردنیش دەکەین زۆر جار لەوانەیە ڕاست بێت یان درۆ چونکە بەپێی پۆلین و پێکهاتەکان وێنەی جیا جیا بۆ یەکتر دروست دەکەن.

## ٣- ئیبن سینا

ئەبوو عەلی حسێنی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سینایە، کە ناسراوە بە شێخی سەروەر، بەناوبانگترین پزیشکی ئیسلامە و گەورەترین فەیلەسووفەیەتی، لەبنەچەدا فارسە، لەیەکێك لەشارەکانی ئەو دیو زێووە لەدایك بووە.

باوکی خەڵکی بلخ بوو و لەپاشان نیشتەجێی بۆخاریی بووە ئەمەش لە سەردەمی نوحی کوڕی مەنسوور کە یەکێکە لە میرەکانی خانەوادەی سامانییەکانە. عەبدوڵلا لەگەڵ ئافرەتێکی ئافشنا خێزانی پێکەوە نا و عەلی لەدایك بوو، ئافشنا شارێکی بچووکە لەنزیك خرمیتان، عەلی لەمانگە سەفەری ٣٧٠ك بەرامبەر ساڵی ٩٨٠ز لەدایك بووە، لەپاش لەدایکبوونی و لەپاش چەند ساڵێك باوکی گەڕایەوە بوخاری، خۆیی پەروەردەی کرد و گرنگی پێدا.

ئیبن سینا سەبارەت بە پەروەردەکرنی، باس لەوە دەکات کە لەتەمەنی دە ساڵیدا قورئانی خوێندووە و زانستە ئایینەکانی فێربووە، وەك بنەماکانی شەریعەت و رێزمان، ئەو کات خەڵك سەریان سووڕمابوو بە ئەزبەرکردن و زیرەکیی ئەو، هەر لەو کاتەدا باوکی میوانداری زانایەکی دەکرد بەناوی

عەبدوڵڵا ناتیلی بۆیە پەروەردەکردن و زانستەکانی خستە سەر ئەستۆی ئەو زانایە تا لە هەموو ڕوویەکەوە بتوانێ پێی بگەن، بەڵام قوتابیەکە لە مامۆستاکەی زیرەکتر بوو بۆیە دواتر تەنها بەخۆی دەیخوێند و چووە نێوەندی خوێندنی ماتماتیک و سروشت و لۆژیک و ئەو دیوسروشتەوە، لەپاشاندا خوێندنی پزیشکی دەست پێ کرد، ئەمەش لەسەر دەستی مامۆستایەکی کریستیانی، بەناوی: عیسای کوڕی یەحیا.

هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە شانزدە و حەڤدە ساڵان لە هەموو لایەکەوە ناوی دەرکرد، ئەمەش وای کرد نوحی کوڕی مەنسوور بانگهێشتی بکات تا نۆرینگەکەی بەڕێوە ببات، خۆشی نەخۆشیەکی هەبوو و چاودێری میری دەکرد، کاتێك میری چارەسەرکرد میر زانی زۆرێك لە فرتوفێڵەکانی پزیشکی زانی، بەڵام ئیبن سینا لەچارەسەرکردنی سەرکەوتوو بوو، لەمەوەیش میر هەموو گەنجینەکانی کتێبی بۆ کردەوە، بەمەیش پزیشکی دانا باشترین ڕێگەی خۆی دۆزیەوە بۆ چوونە نێو زانستەوە، کە لەنێوەند ئەو گەنجینانە چەندان کانی سازگار هەبوو.

لەڕووداوێکدا گەنجینەی کتێبەکان سووتا، لەمەوەش ئیبن سینا تۆمەتبار کرا، بەوەش تاوانباریان کرد کە تەنها خودی خۆی دەیەوێ لەو کتێبانە زانست وەربگرێ و کەسی دیکە نزیك نەبێتەوە!

زۆریشی نەبرد میر نوح کۆچیدوایی کرد واتە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٣٨٧ك کە بەرامبەر ٩٩٧ز، بەمردنی ئەو میرەش ئەستێرەی ئەو خانەوادەیە ونبوو.

باوکی کۆچیدواییی کرد، ئەو کاتەش تەمەنی بیست و دوو ساڵ بوو، لەو سەردەمەش چەندان کاری دەوڵەتی لەسەر شان بوو کاتێك تەواوی دەکرد و لەکاتی پشوودانداا دەگەڕایەوە سەر کتێب نووسینەکانی خۆی دەنووسی و

دەینارد بۆ زۆربەی پیاوە گەورە و ماقووڵەکان، کاتێك باوکی ئەستێرەی ونبوو زۆربەی کارەکان کەوتنە سەر ئەستۆیی و لەبوخاریدا رۆیشت ئەوێی جێ هێشت چووە گرگان و چەند شارێکی خوارزم و خوراسان و داخستان کە دەکەونە سەر دەریای قەزوێن، لەو وڵاتانە تووشی نەخۆشیەکی ئیسك بوو، بۆیە گەڕایەوە گرگان و لەوێدا پیاوێکی گەورەی ناسی کە ناوی ئەبوو محەممەدی شیرازی بوو، ئەویش ماڵەکی خۆی پێبەخشی لەجیاتی ئەوەی وانە بە خوێندکاران دەڵێتەوە، لەوێوە ئیبن سینا کتێبی یاسا-قانونی پزیشکی دانا، ئەم نووسینەیش وای کرد ناوی هەر بەنەمریی بهێڵێتەوە و بەمەیش ناوبانگی گەورەی دەکرد لە ئەورووپا، بۆیە قانوونی ئیبن سینا بنەمای زانستەپزیشکییەکان بووە لەلای داواکارانی ئەو زانستە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك.

ئەو کەسێك بوو لەنێوەندی سیاسیدا کێشە و گرفتی دەنایەوە، بۆیە زوو زوو وڵاتی خۆی جێ دەهێشت، کاتێك دۆخەکە هێمن بووەوە شەمسەدینی دەوڵەت میری هەمەدان کردی بەوەزیر، بەڵام وەزارەت و سەربازەکان رازی نەبوون بەکارەکانی بۆیە بەدیلیان گرت، ئەمەش وایکرد شەمسی دەوڵەت تورە بێ و ئیبن سینای رزگار کرد، لەپاش هەوڵێکی زۆر، ماوەیەکی زۆر ئیبن سینا لەپێش چاوان ونبوو، دواتر گەڕایەوە نێو دەست و پێوەندەکانی میر، میر لەو رۆژگارەدا تووشی نەخۆشی هەناو بوو بوو، بۆیە لەوێدا دەستی بە نووسینی کتێبی چارەسەر (شیفا)کرد.

ئەو، لەهەر رۆژگار و سەکردەمێکدا چەندان خوێندکار لەژێر دەستی وانەی فەلسەفە و پزیشکی دەخوێند، باسیش لەوە دەکرێ، کە ئیبن سینا ئارەزووی بەخواردنی بەتام و لەزەت دەکرد لەتەك ئەوەشدا حەزی بەوە بوو هەردەم لە ئاهەنگ و رابواردندا بێ، ئەمەو هەموو شەوێك دوایی کۆتاییهێنانی وانە، بانگی

ئەو ژەنیارانەی دەکرد کە هەردەم ئامەنگیان بۆ ڕێك دەخست و لەتەك ئەمەشدا چەند خواردنی بەتامی لە ڕۆخ خۆیدا دادەنا، شەوانەش لەتەك خۆشەویستان و هاوڕێیەکانی کاتێکی خۆشیان بەسەر دەبرد.

کاتێك شەمسی دەوڵەت کۆچیدواییی کرد، کوڕەکەی بوو بەمیر، بەڵام میری نوێ زۆر ئیبن سینای لەلا گرنگ نەبوو، بۆ ئەمەش ئیبن سینای شێخی سەرۆك و نووسەری دەوڵەت، بە هەموو شێوەیەك دژی وەستاوە لەژێرەوەش لەگەڵ عەلای دەوڵەت، میری ئەسبەهان، ڕێکەوت بوو تا جۆرێك لەکودەتا بکات، بەڵام زۆری نەبرد ئەمە ئاشکرا بوو، لە سزای ئەمەشدا لە قەڵادا بەندیان کرد، لەپاش چەندساڵێك رایکرد و چووە ئەسبەهان لەمەوەش عەلای دەوڵەت پێشوازیەکی گەرمی لێ کرد، هاوکات میر لەهەموو سەفەرێکدا لەتەك خۆیدا دایدەنا، دوایی ماوەیەك بەهۆی ماندووبوونی لەکار و شەوانی خۆشییەکانی، تووشی نەخۆشی بوو، نەخۆشییەکەشی دابوویە هەناوی، ئەویش دەرمانێکی کاریگەری خوراد، بەڵام نەخۆشیەکەی توندتر بوو، کاتێکیش ئازارکەی گەیشتە لووتکە، عەلائەدین بردیە هەمەدان.

کاتێك ئیبن سینا بینی دوا کاتیەتی تۆبەیەکی تەواوی کرد، بەشێوەیەکی زۆر ڕاستگۆیانە تۆبەی کرد بەرامبەر خوای گەورە، ئەمەو لە مانگی رەمەزانی پیرۆزی ساڵی ٤٢٨ك بەرامبەر ١٠٣٧ز لەتەمەنی پەنجا و حەفت ساڵیدا کۆچیدوایی کرد، لەکاتێکدا قوتابیەکی گرگانی کە بە وەرگێڕانەکەی ناسراوە بەناوی (جورجوروس) ئەمەی نووسیوە، ئەمەو نووسینەکانی وەرگێڕاوە بۆ زمانی لاتینی و چەندان کتێبی ئیبن سینای لە ئەورووپا بڵاوکردوونەتەوە.

ئیبن سینا یەکێك بوو لە بلیمەت و نووسەرەکان، بەتایبەتی کاتێك چەند پۆستێکی گەورەی وەردەگرت پیاوانی گەورەی بۆ وڵاتەکەی رادەکێشا،

سەبارەت بەجەنگ و فیتنە و پشێویەکان چەندان کتێبی دانا، تەنها یەکێك لەو کتێبانە بەسە بۆ ئەوەی شکۆی بالآ بێ، یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی رۆژهەلآت، زیاتر لەسەد کتێبی نووسیون لەنێوەندی خوێندنەوەیدا هەست بەبلیمەتی دەکەیت و زانیار بووە لەنێوەندی زۆربەی زانستەکانی سەردەمی خۆیدا، زۆربەی کتێب و نووسینەکانیشی تا ئێستا پارێزراون و کتێبە مەزنەکانیشی بریتین لە یاسا-قانوونی پزیشکی و چارەسەر-شفا، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی لاتینی و چەندان جاریش چاپکراوە و بلآوکراوەتەوە، لێرەوە بە کورتی باس لەکتێبی شیفا دەکەین.

کتێبی چارەسەر (شیفا)، یەکێکە لە ئینسکلۆپێدیاکانی زانست و بازنەکانی زانیاری، کە خۆی لە هەشتا بەرگ دەدات، هەموو دانەکانی لە کتێبخانەی قوتابخانەی زانکۆیی ئۆکسفۆرد و فریاکەوتن (النجدە) پوختەی و کورتکراوەی چارەسەرە ئیبن سینا ئەمەی بۆ رەزامەندی هەندێك لە هاوڕێیە خۆشەویستەکانی داناوە، ئەمەو دانە عەرەبیەکەی لەپاش یاساکەی لەرۆما لەساڵی ١٥٩٣ز چاپکراوە کە خۆی لەبەشدا دەنواند، کە لۆژیك و سروشت و ئەو دیوسروشت، هەروا هیچ بەشێکی باس لە زانستی ماتماتیك ناکات کە نووسەر لە سەرەتای کتێبەکەیدا باسی لێوە کردووە، بەلآم وەك پێویستیەك لەنێوەندی زانستی ئەو دیوسروشت و زانستی سروشیدا باسی لێوە کردووە ئەمەو هەردوو کتێبەکە بۆ چەند جارێك بەزمانی لاتینی چاپکراون، لەنێو ئەمانەشدا ئینسکلۆپیدیایەك کە لەساڵی ١٤٩٥ز لە بوندقیە چاپکراوە، کە لەمانە پێکهاتووە:

١-لۆژیك

٢-سروشتیەکان (کورتکراوەتەوە لە کتێبی چارەسەر-شیفا)

٣-ژیان و جیهان

٤-ڕووح

٥-ژیانی ئاژەڵ

٦-سەبارەت بەعەقڵ

٧-فەلسەفەی فارابی سەبارەت بەعەقڵ

٨-فەلسەفەی یەکەم

لەلایەکی دیکەوە "نافیە" لۆژیکی ئیبن سینای وەرگێڕاوەتە سەر فەرەنسی و لەساڵی ١٦٥٨ز لەپاریس بڵاوکراوەتەوە، هەروا سمولدرز ئەرجۆزەی زانا لۆژیکی ئیبن سینا لە کتێبی "کۆمەڵەیێك لە فەلسەفەی عەرەبی "بڵاوکردۆتەوە.

سەبارەت بە فەلسەفەی ئیبن سینا وەك پێویستییەك وەك فەلسەفەی ئەوانی دیکەیە کە لە هەوادارانی ئەرستۆیە، لەوە گەڕێ چی تیایە-جگە لە بنەماکانی مامۆستای گریکی- وەك دانایان و فەیلەسوفەکانی موسڵمانانی دیکە.

ئیبن توفەیل لە کتێبی "حی بن یقظان" باس لەوە دەکات کە ئیبن سینا لە پێشەکی کتێبی چارەسەردا بۆچوونی وایە کە راستییەکان لەڕووی پۆلێنکردنەوە نین، بەڵکوو لە کتێبی دانایی رۆژهەڵاتی هەموو شتەکان دەخرێتە ڕوو، بەڵام ئەو کتێبە نەگەیشتووەتە دەستمان، ئەوەی باسکراوە زیاتر باس لەبوونگەرایی دەکات لەسەر شێوازی رۆژهەڵاتی، بەڵام چەند کتێبێکی دیکەمان کەوتووەتە دەست کە سەربەخۆیانە هزرەکان دەخاتە ڕوو، بەڵام من پێموایە زۆر پشتی بەنووسینەکانی فارابی بەستووە، ئەوەی کە ئیبنسینا بخوێنێتەوە ئەوە دەبینێ کە پەیوەستبوونێك و ئارەزوویەك لەلای ئەو بیرمەندە هەیە تا هەموو زانستە فەلسەفییەکان بە یەکتر ببەستێتەوە و بە وردی بەشێوازێکی یەك لەدوای یەك وزنجیرەیی باسی لە زانستەکان کردووە. سەیری کتێبی (الملل

و النحل للشهرستانی) بکە کە بەعەرەبی نووسراوە لەنێوان لاپەڕەکانی ٣٤٨و٤٢٩).

ئەمەو زانستەکانی چارەسەر-الشفاء- کردۆتە سێ بەش:

١-زانستە باڵاکان باس لەو شتانە دەکەن کە هیچ پەیوەندیەکییان بە ماددەوە نییە ئەمەش دانایی یەکەمە بۆ ئەو شتانەی لەو دیوشروشتن.

٢-زانستەکانی دونیا کە تایبەتن بە ماددەوە کە سروشت و ئەوانەی پەیوەستن بەسروشتەوە زانستی تایبەتن، واتە هەموو ئەو شتانەی کە گرفتەکان دیاردەن.

٣-ئەو زانستانەی کە هەندێکجار پەیوەستە بە ئەو دیوو سروشت و هەندێجاریش باس لە ماددە دەکات کە ماتماتیك بەخۆیەوە دەگرێ، هەروا باس لە زانستی ژمێریاری دەکات ... لەتەك زانستی ئەندازیاری کە تایبەتە بە بوون، بەبێ ئەوەی پەیوەندی بە ماددەوە هەبێ و پەیوەست نییە بە هەستەوە.

بەڵام میوزیك و هونەری ئامێرەکان و زانستی بینین پەیوەندیەکانیان لەیەکتر نزیکن، ئەمەش بەهۆی پەیوەستبوونیان بە سروشتەوە، بۆیە دۆخەکان ئاوێتەی هەموو چینەکان لەنێوەندی زانستی سروشتی بوون.

هاوکات ئیبن سینا بەشیوەیەکی زۆر سوودی لە ئەرستۆ وەرگرتووە، بەڵام لەنێوەندی نووسینەکانی ئیبن سینا ئەوە دەرکەوتووە کە قوتابی سەرکەوتووتر بووە لە مامۆستا بە تایبەتیی لە پشکنینی زانستییدا.

ئەرستۆ فەلسەفەی تیۆریی دابەش کردووە بۆ سێ بەش: ماتماتیك و سروشت و زانستی لاهوت. بەو شێوەیە ماتماتیکی کردووەتە فەلسەفە و لەنێوەندی ماتماتیکدا چەند هونەرێکی هێناوەتە کایەوە کە دوورە لە ماددە (جووڵەی نییە و جیایە لە ماددە، هەروا باسی لە چەند زانستێکی دیکە کردووە، وەك

گەردوون و زانستی بینین و هونەری گەدجاندن کە پەیوەستی کردووە بە سروشت، بەڵام بەشێوەیەکی ورد نەبوو.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن سینا دەستەوەستان نەوەستاوە بۆ دابەشکردنی زانستەکان، ئەمەش تیۆرەکانی فەلسەفی دەگرێتەوە، بەڵکوو هەموو ئەو شتانەی کە باسی لێوە دەکات وەك هەموو فەیلەسووفەکانی دیکە خستوویەتیە ڕوو، هەروا هەر کائینێکی کردووەتە سێ بەش، لەو بەشانەش باسی لەو گیانەوەرانە کردووە کە دەژین و دەمرن، جگە لە هۆکاری یەکەم کە بازنە و گەردوونەکانە، هەروا ئەو عەقڵانەی کە کائینن و بوون و یەکبوون رووحەکە پەیوەندی بە هۆکاری یەکەمەوە هەیە، لەبەشی سێیەمدا باس لە خودا دەکا، هاوکات باس لەو ئەرکانە دەکات لەوێدا ئیبن سینا ئەوە دەخاتە ڕوو کە خودا تاکە و تەنها خودی ئەو بوون و یەکبوونی ڕووحی هەیە، بەڵام سەبارەت بە کائینەکانی دیکە، وەك ڕووداوێك وایە کە ڕووداوەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێنێ.

ئیبن رووشد بەرهەڵستی ئەو دابەشکردنەی کردووە و ئەمەش لەزۆربەی نووسینەکانی بەدەر دەکەوێ، بەڵام ئەو وتارانەی تەنها بەزمانی عیبری هەیە و لەکتێبخانەی نیشتمانی لە پاریس پارێزراوە، ئیبن رووشد سەبارەت بەمە دەڵێ ئەو شتانەی کە ناکرێ دەرەکی بن ناتواندرێ لەخودی خۆیاندا، تەنها ئەوە نەبێ هۆکارەکان دەرەکیەکانیان بەرەو هەڵدێر برد، ئەمەش مەحاڵە چونکە ئەوەی ئیبن سینا باسی لێوە کردووە ئەوە تەنها خودایە کە هۆکاری هەموو شتێکە، ئەویش بەهیچ شێوەیەك بەرەو هەڵدێر ناڕوات، هاوکات ئیبن رووشد بەتوندی وەڵامی ئیبن سینا دەداتەوە کاتێك دەڵێت بوونەکان تەنها ڕێگرن لە راستیی شتەکان.

باسیش لەوە دەکات کە ئیبن سینا تێکەڵی کردووە لەنێوان یەکە بەشەکراوەکان و یەکە ڕەهاکان کە رووح و شتەکانە. یەك نابێتە چەند ژمارەیەك "واتە رووح" هەروا ئیبن رووشد جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئیبن سینا لەژێر کاریگەری موتەکەلیمەکانە کە پێیانوایە زەوی و گەردوون هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە کائینـاتێکی تیایە و ئەمانەش دەکرێ گۆڕانکارییـان بەسەردا بێ، بەڵام ئیبن سینا لەوان سەرکەوتووترە لە جیاکردنەوەی شتەکان لەنێوان مومکینەکان و ئەرك بۆ سەلماندنی بوونی کائینێکی رووحی (هیولانی).
کاتێك ئیبن رووشد بەدەرکەوت هەڵەکانی ئیبن سینا خرایە روو لەرووی دابەشەکردنەکانی ئیبن رووشد دەڵێت" لەم سەردەمەدا بینیمان زۆرێك لەهەوادارانی ئیبن سینا بە ئارەزووی خۆیان شیکردنەوەی بابەتەکان دەکەن، هەروا دەڵێن ئیبن سینا نەیگوتووە کە بوونی ماددەی جیاکەرەوە نییە، دیارە ئەمەش لەوە سەرچاوەی گرتووە کاتێك بەدوای روونکردنەوەکانی ئیبن سینا کەوتوون کە باسی لەچەندان بابەت کردووە سەبارەت بە بوون ، ئەمەش بنەمای فەلسەفەکەیەتی کە بووەتە بنەمایەك بۆ کتێبی دانایی رۆژهەڵاتی، دیارە ئەو ناوەشی لە رۆژهەڵاتیەکان وەرگرتووە کە تیایدا خودا و بازنە ئاسمانییەکانیان (گەردوون) وەك یەك سەیر کردووە ، ئەمەش بۆچوونی تەواوی ئیبن سینایە". هەموو ئەو قسانە ئیبن رووشد ئاراستەی ئیبن سینای دەکات.
بۆچوونی یەکەی بوون (خودا) بەبۆچوون و نووسینی رۆژهەڵاتیەکان هیچ کاریگەریەکی بەجێ نەهێشت، لەلایەکی دیکەوەش ئەوە دەخرێتە روو کە ئیبن سینا ئاستەنگی دروست نەکردووە بۆ موتەکەلیمەکان هەروا بەبێ نیگەرانی لەتەك فەیلەسوفەکان گوتوویەتی کە جیهان تا هەتا هەتایە بوونی هەیە،

ئەمەش جیا لەگەڵ ئەزلیەتی خودا بەپێی هیچ هۆیەك نییە، بەڵكوو خودا ئەزلییە و تا هەتایە.

ئیبن سینا و زۆرێك لەفەیلەسووفەكانی دیكە باس لەوە دەكەن ئەو یەكە ڕەهایە كاریگەرییەكی راستەوخۆی نییە، هەروا دەڵێت "بەڵگە و ئەرگۆمێنت جەختیان لەوە كردۆتەوە كە خودا وەك كائینێك خودی خۆیەتی ئەو یەكە لەنێوەندی هەموو سیفەتەكانی، ئەم سیفەتانەش تەنها لەلای ئەوە، ئەگەر ئەو سیفەتانە لەدوو كائین هەبێ ئەوا ئەو كاتە دەڵێن رووح دەكرێ ببێتە دوو بەش، بەلام ئێمە ئەو راستیەمان ڕوونكردووەتەوە"، (سەیری كتێبی ئەو دیوسروشت بكە كە ئیبن سینا لەبەشی نۆیەم و شەهرستانی لە لاپەڕە ٩٣٠ و غەزالیش لە مقاصد الفلاسفه نووسیویانە).

دەڵێن: ئەگەر قسەكانی ئیبن سینا راست بن بەوەی هەموو شتەكان لەلایەن كائینێكی ئەزلییەوە دەرناچن، لێرەوە چۆن بتوانین دڵی هەموو جیهان بكەینەوە كە دەڵێت خودا كۆمەڵێك كائینە، بەلام بۆ وەلامی ئیبن سینا ئەوا دەڵێین ئیبن سینا وای دەرخستووە كە بازنەی گەردوون هەر لەژێر دەستی خودا بووە، ئەمەش شتێكی زانراوە، بەلام ئەوان دەڵێن عەقڵی بازنە گەردوونییەكان هۆكارێكن بۆ جووڵەی بازنەی دووەم، بەلام ئیبن رووشد باس لەوە دەكات ئەم بۆچوونانە هەڵەیە چونكە عەقڵ و ماقووڵییە هەر یەكە لەكاتێكدا دەڵێن كە زۆر جیایە لە مادده، هەروا ئیبن رووشد باس لەوە دەكات كە ئەم بۆچوونە بۆچوونی ئەرستۆ نییە، بەلام فارابی و ئیبن سینا و هەندێك لە داناكان سوودیان لە دانایە دێرینەكان كردووە كە گوتوویانە كە خێر و شەڕ تایبەتە، بەلام كارەسات و دژ بە یەكەكان لەیەك هۆكارەوە سەرچاوە ناگرێ.

ئەگەر هەموو شتەکانمان گشتگیر کرد تا بنەمایەکی یەك لایەنە بهێنینە کایەوە ئەو کاریگەری تاك لێرەوە بەدەردەکەوێ، بۆ ئەمەش ئیبن رووشد باس لەوە دەکات کە هەڵەیان کرد کاتێك ئەم وتەیان پەیوەست کرد بە ئەرستۆوە، لەوانەیە لە تێنەگەیشتن بوو بێ لەماناکان، لەکاتێکدا دانایەکان وەسفی گەردوونیان کرد بەوەی یەکەیەکە یان کۆمەڵێکە لەنێو یەکەیەکدا، بەڵام هۆکارەکە بۆ یەك هاتنە ئارا دەخاتە ڕوو.

میمونید بەبێ دڵە ڕاوکێ جەخت لەوە دەکات کە بۆچوونەکانی ئیبن سینا لە بۆچوونەکانی ئەرستۆیی مامۆستاوە سەرچاوەی گرتووە، بەشێوەیەك مەبەستەکانی پێکاوە (سەیری کتێبی ڕێبەری حەیران بکە لە نووسینی میمونیدە—بەشی دووەم و دەروازەی بیست و دوو) دیارە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش لە قوتابخانەکانی مەسیحیش لەنێوەندی سەدەکانی ناوەڕاستدا هاتۆتە کایەوە، لەکاتێکدا ئەلبەرتی گەورە بۆ ئەم مەبەستە بیرۆکەکانی خستە سەر ئەستۆی ئەرستۆ و هەموو قوتابیەکانی، تەنها دانایەك نەبێ باس لەوە کرد، کە بەدەرچوونی دوو شت لەیەکەیەکی ساکارە کە ماددەیە بەشێوەیەکی گشتی لەتەك شێوەی گشتی.

ئیبن سینا وەك زۆربەی فەیلەسووفەکانی دیکە هەمان بۆچوونی لەلا هەبوو کە زانستەکان پەیوەندییان بەخواداوە هەیە واتە بوونە گشتییەکان نەك بە شتە تایبەتیەکان، ڕووداوەکانیش بە ڕێکەوت دێنە ئاراوە، بەهۆی دەروونەکانیش بازنەکانی زانست پەیوەندییان بە گەردیلەکانەوە هەیە، بۆیە بە هەوڵی ئەو دەروونانە زانستی خودا پەیوەندی بە بوونەوەرەکانی سەر زەوی دەکات، گریمانی ئیبن سینا لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە بازنە تایبەتییەکان هەموو شتێك دەگرنە خۆ و هیچ لەمپەرێك لەپێشیان نییە، هەروا زانست بەڕێکەوت و

ڕووداوەکان نایەتە ئارا، بەڵام زانست وەك ئەو وێنەیە وایە کە هێدی هێدی هەموو وێناکانی ڕوون دەبێتەوە تا دەگاتە هۆکاری چارەسەری تا دەگاتە هۆکاری یەکەم، ئیبن ڕووشدیش ئەوەی بۆ سەلماندووین کە ئەو مەبەستە تایبەتە بە ئیبنە سینا بۆیە ئیبن ڕووشد وەڵامی داوەتەوە.

ئیبن ڕووشد دەڵێت خەیاڵ پشت بەهەستەوەرەکان دەبەستێ، هەروا خەیاڵ پەیوەست نییە بەتەنە ئاسمانییە، بۆیە ناتوانین خەیاڵ بگەڕێنینەوە سەر ئەو تەنانە، بەڵام دەکرێ درك بە تەنە ئاسمانیەکان ببەین، ئەم درکپێکردنەش وەك سروشتی درکپێکردنە وەك نووسین و وێنەرکردن یان پەیکەرێکە دەمانەوێ بەدیاری بخەین واتە لەهزرەوە بۆ بوون.

بەڵام ئەو درکپێکردن و خەیاڵە مەبەستی سەرەکیی خستنەڕوویەکی گشتی یان جۆرییە، بۆیە ئەگەر گوتمان تەنە ئاسمانییەکان خەیاڵن ئەوا ئەو خەیاڵە پەیوەندیی بە بوونەکان نییە کە لەسەر زەویدا هەیە، پێشتریش ئەمەمان ڕوونکردۆتەوە، ئەوەی ئیبن سینا پێداگریی لەسەر دەکات نزیکردنەوەی هۆکاری یەکەمە لەتەك بوونەکانی سەر زەوی، لێرەوە هەوڵی ئەوەی داوە زنجیرەیەکی یەك لەدوای یەك بێ بەهۆی پەیوەندی هێزی ڕەها بۆ سەر هەموو بوونەکان، ئەوەش ناشاردرێتەوە کە ئیبن سینا بێلایەنانە بێ لەتەك بۆچوونەکانی ئەرستۆ، بەڵام ئیبن ڕووشد پێچەوانەی ئەو نایەوێ دەسەڵاتی ئەرستۆی فەلسەفی و بیروبۆچوونی هەوادرانی بەسەر خۆیدا بچەسپێنێ، بۆیە گرنگیەکی وای نەداوە بەو بۆچوونانەی تایبەتن بە ئیبن سینا لەڕووی تیۆریەوە، بۆیە تەنها بەو ناودار بووە، بەڵام تیۆری دەروون لەلای ئیبن سینا زۆر بەوردی چارەسەرکراوە زۆر بەبابەتیانە دابەشکردنەکانی بەهرە دەروونیەکان و عەقڵی کاریگەری ئەرستۆیی لێداوەتەوە، هەروا بۆ بۆچوونەکان

و تیۆر و تیبنییەکانی ئەرستۆ بەهەند وەرگرتووە و بەهای پێ بەخشیوە، لەمەوەش زۆرێك لەدانایانی موسڵمان هەمان رێچکەیان گرتووەتە بەر، ئەو دابەشکردنە پێوەریەش لەلایەن ئیبن سیناوە دانراوە بەمشێوەیە:

١-خاسیەتەکانی دیاردە یان پێنج هەستەوەرەکە

٢-خاسیەتەکانی ناوەوە

٣-خاسیەتەکانی جووڵە

٤- خاسیەتەکانی عەقڵ.

هەر خاسیەتێکیشی کردووەتە چەند بەشێك، ئەمە و هێزی خەیاڵی لەبەشی سێیەمی دەروازەی دووەم باس کردووە، لەتەك ئەوەی ئاژەڵ دانایە، ئەوا مرۆڤ بە هێزی هزر و لێکدانەوە کارەکانی کردووە، چونکە خەیاڵ ئەوەت پێ رادەگەینێ، کە پێویستە دایك ئاگاداری بێچووەکانی بێت لەترسی گورگ.

فەیلەسووفەکانی دیکەی پێش ئیبن سینا تێکەڵییەك لەنێوان ئەو هێزە و هێزی خەیاڵیان دەکرد، بەڵام خەسڵەتەکان لەلای ئیبن سینا سەبارەت بە خاسیەتەکانی دەروون بۆ هەر سێ لایەنی مۆخ دەگەڕێنەوە.

هەروا پەیوەندی عەقڵی کاریگەر بە دەروونی مرۆڤایەتی لێرەوە ئیبن سینا هەوڵی نەداوە بۆچوونی خۆی بسەلمێنێ وەك هەموو داناکانی دیکە، ئەو دەروونە بەهایە تا ئێستا لەلایەن مرۆڤایەتییەوە نەخراوەتە ڕوو، ئامۆژگاری دەروونەکان دەکات تا هەوڵ بدەن، بەڵام پێی باشە ماددە نەبێتە بەربەستێك و دەروونی خۆی پاك بکاتەوە تا ببێتە جێگەی ڕێزی خودا (سەیری کتێبی ئەو دیوسروشت بکە -کتێبی نۆیەم بەشی حەفتەم).

ئیبن سینا دەڵێت "بەڵام دەروونی عاقڵ هەردوو رووەکەی راستەقینەی نادیارە و چارەنووسەکەشی زانایەکی راستەقینەیە کە وێنەکانی بوون ساکار دەکات،

پلەبەندیی دەکات، بۆیە خێری گشتی هەموو شتە گشتییەکان دەگرێتەوە کە بنەمای یەکەمی گەردوونە، دواتر ماددەکانی رووحی بالآ دێنە ئارا، لەتەك ئەو دەروونانەی کە پەیوەستن بە لەش و تەنە بەهاکان کە چەندان خەسڵەت و جووڵەیان هەیە، لەمەوەش بەرەو زانایەکی عاقڵمەند هەنگاو دەنرێ، وەك هەر زانایەکی دیکە زانیاری لەسەر زۆربەی شتەکان هەیە، وەك جوانیەکی تەواو و خێری تەواو و شکۆی بالآ لەمەوەش پەیوەندی بەماددەوە دەکا، بەڵام ئێمە مادام لەسەر جیهانی زەویدان و لەنێوەندی ئەو لەشانە جاین ئەوا ناگەڕێن بۆ خۆشگوزەرانیەکی تەواو و هەستیش بەوە ناکەین کە بتوانین بەدەستی بێنین، دەشکرێ ئێمە واز لەهەموو پشێویەك و فتنیەك بێنین ئەو کات خۆشی و خۆشگوزەرانی هۆیەك بێ بۆ جیهان بۆیە هەموو کارەکان تەنها بەچاکەکاری دێنە کایەوە"، لەشوێنێکی دیکە دەڵێت "پیاوانێك هەن کە سروشتیان پاکە و لەدەروونیان پاکی جێگەی خۆی گرتووە و بەو پێوەرەش هەنگاو دەنێن، ئەمەش پەیوەستە بە یاساکانی جیهانێکی عاقڵ، لێرەوەش سروش و عەقڵی کاریگەر بەدەست دێنن، لەهەندێك پیاویشدا پێویست ناکات پەیوەندیی بە عەقڵی کاریگەرەوە بکەن چونکە ئەوانە هەموو شتێك دەزانن بەبێ واسیتەکاری، ئەوانە خاوەن عەقڵی پیرۆزن، ئەم عەقڵەیش بۆ بەها و شکۆدارەکانە هەموو ئادەمیزادێك ناتوانێ بەدەستی بێنێت". (سەیری شهرستانی لا ٤٢٨ دانەیەکی ئەڵمانی بەشی ٢٠ لا ٣٢٢-٣٢١ دوا شیکردنەوەی سروشتی ئیبن سینا).

خوێنەر ئەوە دەبینێ لەنێوەندەکانی وتەکانی ئیبن سینا کاتێك باس لە عەقڵی پیرۆز دەکات مەبەستی لە پەیامبەرەکانە کە سرووشی خوداییان بۆی دێتە خوارەوە، بەڵام دان بەوە دادەنێ کە دەروونی مرۆڤایەتی عەقڵی یەکەمە و

پەیوەندیەکی سروشتییە، چونکە مرۆڤ پێویستی بە عەقڵی وەرگیراوە لەرێگەی وانەوە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە شەریعەتەکانی ئاسمان و یاسا دەبیەکان شوێنێکی فراوانی گرتووە لە بنەماکانی ئیبن سینا و زۆریش دوورە لە دیاردە و بنەما ئازادە پێچەوانەکانی ئایین، کە لەلای خۆی شیکردووەتەوە و ئیبن رووشدیش قسەی لەسەر کردووە، بۆیە دەبینین رەخنەی زۆری لێ گرتووە کاتێك باس لە عەقڵ دەکات، ئیبن سینا سەبارەت بە مانەوەی یەکەی دەروونی مرۆڤ کەماددەیەکی جیایە لە لەش، ئەم ماددەیەش خودی خۆی دەپارێزێ، بەڵام پەیوەست نییە بە شوێن و زەمەنێکەوە (سەیری رێبەری الحیران بکە بەشی ١ لا ٤٣٣ تێبینی ٢).

لەهەر لقێکی لقەکانی زانستی فەلسەفی ئیبن سینا چەندان بۆچوونی نوێی هێناوەتە کایەوە و بەمەش شتێکی نوێی بەخشیووە بە ئەرستۆ، بەڵام ئەم فەلسەفەیە لەکۆی گشتیدا نەگۆڕاوە لەتەك ئەوەی ئیبن سینا گۆڕانێکی گەورەی کردووە.

بەشێوەیەکی گشتی ئیبن سینا لەمەڕ بەشەکانی فەلسەفەی ئەرستۆ شێوازێکی نوێی پێ بەخشیووە و بەزنجیرەیەکی پتەو باسی لێوە کردووە و چوارچێوەکەی فراوان کردووە بە رێبازی ئەفلاتوونی نوێ (نیوپلاتونیزم).

گومانی تیا نییە یەکێکە لەگەورە مامۆستاکانی فەلسەفەی ئەرستۆ لە سەدەکانی ناوەڕاست، لەتەك ئەوەی بەشێوەیەکی لەبار لەتەك بنەماکانی ئیسلامدا بووە، بۆیە گۆرانکاریەکی ئەوتۆیی نەکردووە لە کۆی گشتی فەلسەفەی ئەرستۆ کە ناکرێ بیگونجێنی لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا، گومانیشی تیا نییە لە کتێبی (تهافت الفلاسفه) ئەو مەبەستەی خستووەتە ڕوو.

**(ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بە ئیبن سینا)**

بەكورتی باسی ژیانی ئیبن سینامان كرد كە ناسراوە بە شێخی سەروەر، باسمان لەهەندێك بواری ئاسایی كرد، كە ئاماژەیەكە بۆ ژیانی ئاسایی ئەو پیاوە، لەلایەكی دیكەوە مێژوونووسان سەریان لەژیانی ئیبن سینا دەرناچێت لەهەندێك ڕووەوە بەتایبەتی سەبارەت بە زانست و دەروون و ئاكارەكەی، هەندێك لە هەڵوێستەكانی كە ئەبوو عوبێد جرجانی دەیگێڕێتەوە كە هاوڕێیەكی نزیكی بووە بەتەواوی نەهاتووەتە سەر ژیان و ئاكاری، بەڵام توێژەر و وردبین لەو بوارەدا لەپاش هەوڵێكی زۆر دەگاتە ئەو بۆچوونەی كە ئیبن سینا هەر لەمنداڵییەوە كەسێك بووە لەبۆچوونەكانیدا سەربەخۆ بووە و لەنێوەندی ئەو خانەوادەیەش پەروەردە بووە، كە بتوانێ سەربەخۆبوونی خۆی بپارێزێ، ئەمەش گەوهەرێكە لە ئاكار و ڕەوشتی پیاوان.

باس لەوە دەكرێ كە باوك و براكەی لەئیسماعیلیەكان بوونە، لەڕێگەی ئەوانەی گوێی لەقسەكانیان بووە سەبارەت بە عەقڵ و دەروون، بەڵام بەهۆی بۆچوونی و سەربەخۆ بوونی لەو بوارەدا هیچ كات لەتەك بۆچوونەكانی باوك و براكەیدا نەبووە، ئەم سەربەخۆبوونەش بووەتە بەڵگەیەك تا ببێتە هێزێك بۆ هزری، هەروا ئەوە دەردەكەوێ كە ئیبن سینا كەسێك بووە شكۆ و بەهای خۆی زانیووە و بەهۆی زانستەكانیشی خۆی لە نموونەی باڵا نزیك كردۆتەوە ئەمەش بەهۆی شێوازی داهێنەرانەی قسە كردنی سەبارەت بە زانست و خود، بەپێی مێژوو ئەوەش دەردەكەوێ ئەو وەك بلیمەتێك توانای ئەوەی هەبووە زانستەكان و هەڵچنێ و باس و خواسە زانستیەكان بكات شەنوكەو بكات، عەقڵ و بیركردنەوەشی هۆیەك بوو بۆ هێنانەكایەوەی فەلسەفە، هەروا زۆربەی ئەو

گەل و نەتەوە و فەیلەسووفانەی لە پێش ئەودا هەنگاویان ناوە، دیارە ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆریان کێشاوە، ئەمەش وایکرد ئیبن سینا هەموو ئەمانە لەبۆتەیەکدا بەرجەستە بکات، بۆیە لەکاتی گەنجیدا توانیویەتی زۆربەی زانستەکان لەخۆی بگرێ و کاری لەسەر بکات، ئەو شتێکی نوێی نەگوتووە، بەڵام بەهۆی وردبینی و زیرەکی لەو بوارەدا توانیویەتی بەشێوەیەکی دیکە دایڕێژێ و بەجوانترین شێوە بیخاتە ڕوو.

ئەوەی کە پشتگیری لەقسەکانمان دەکات ئەوەیە کە عەقڵی ئیبن سینا توانیویەتی فەلسەفە بهێنێتە ئاراوە، وەك بوونەوەرێك، پرۆسەی عەقڵگەرایی لەلای ئەودا زۆر ئاسان بووە، لە کاتێکدا کە توانیویەتی بچێتە نێوەندی زۆربەی زانستەکان، لەلای ئەو نووسین و پۆلێنکردن بەئاسانترین شێوە بووە، چونکە لە پێشتردا دانایان نەیانتوانیوە لەبابەتەکانیان ورد ببنەوە و بەدرێژیی باسی لێوە بکەن، بۆیە دەبینی کاتێك شتێکیان نووسیووە دواتر وازیان لێهێناوە و نەهاتوون بەشێوەیەکی لەبار ڕێکی بخەن، بەڵام ئیبن سینا لەم ڕێگەیەوە بەهۆی دانایی هەموو بابەتەکانی ساغکردووەتەوە و لەزۆربەی ڕووەکانیش چاکی کردووەتەوە، ئەمەش لەنێوەندی نووسینەکانی ئیبن سینا دەبینین کە چ بەهایەکی بەنووسینەکانی داوە، هەندێك لەنووسینەکانی لەسەرەتای تەمەنی گەنجەنیەتیدا بوون، پەنجاو سێساڵ یان پەنجاو هەشت ساڵ ژیاوە.

یەکێك لەخەسڵەتەکانی ئیبن سینا ئەوە بووە کە کار زۆر ئەنجام بدات بەشێوەیەکی ئاسان تا بەشێوەیەکی لەبار بابەتەکانی تەواو بکات، لێرەوەش بەگوتەی فەیلەسووفی ئەڵمانی دەچێ، لێرەوە دەبینی گوتە ڕۆمانی "فوست"ی لە دوو بەرگدا نووسی لەنێوان بەرگی یەکەم و بەرگی دووەم شەست ساڵی پێ چووە، هەروا ئیبن سینا بەشی یەکەمی کتێبی چارەسەر-

شیفای لەسەردەمی میر شەمسی دەوڵەتدا نووسیوە، بەڵام لەسەردەمی میرعەلا تەواوی کردووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕەزامەند بووە لەسەر ئەو نووسینانەی کە لەسەردەمی گەنجەتیدا نووسیون ئەو کاتەی کە چووەتە نێو ساڵەوە، وەك چۆن کۆتە و کتێبەکەی بە ناوی فۆست هەروا کتێبی چارەسەری ئیبن سینا هەمان دانایی بەخشیوە.

سەبارەت باوەڕداریی ئیبن سینا چەندان دەق خراوەتە ڕوو کە جێگەی گومانن و لەزارەکانەوە وەرگیراوە، بەڵام گێڕانەوە ڕاستەقینەکان زیاتر لەلای جرجانی و چەند کەسێکی دیکەیە، باس لەوە دەکرێ کاتێك ئیبن سینا تووشی کێشەیەك بوایە ڕووی لەمزگەوت دەکرد و لەوێدا نوێژی کردووە تا کارەکانی لەبەردەم ئاسان بێت و نزای خوێندووە تا کارەکانی بەجوانترین شێوە ئەنجام بدرێ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سۆزی ئایینی هەبووە، لەڕاستیشدا باوەڕداریی بەشێك بووە لە بلیمەتی، بڕوابوونی بەبوونی خودا (الواجب الوجود) یەکێك لەهۆکارە بەهێزەکانی دەرکەوتنی بلیمەتی ئەو بووە.

سەبارەت بە گێڕانەوەکانی جرجانی باس لەوە دەکرێ کە ئیبن سینا کەسێکی بەهێز بووە، بەهۆی ئەو بەهێزییە لەکەسایەتیەکەی سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، کە دەبینی هەوڵەکانی جێگەی سەرنجن، یەکێك بووە دەیویست هەموو کێشەو گرفتەکان چارەسەر بکات بەپێی هەوڵەکانی خۆی، ئەو ڕاستکۆیانە کاری دەکرد، ئەم خەسڵەتانەش هۆیەك بوون بۆ توێژینەوە، لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ هاتنە ئارای "فرۆید"وەك زانایەکی گەورە لەبواری سێکیس و بەهرە عەقڵیەکان، دەستکرا بە توێژینەوەی سۆز لەلای بلیمەتەکان، تا زۆرێك لەشاراوەکان و نهێنی ژیانیان بەدەربخرێ، ئەم شتانەش وەك نیگایەکە بۆ مێژووی فەیلەسووفەکان و بووەتە کارێك ئەو تۆ لەنێوەندی

بۆچوونەکانی زانایانی دەروونناسی تا لێکدانەوە لە بەهرەکان بکرێ ئەم توێژینەوەیەش ئێستا بووەتە زانستێك بەناوی (PSYCHOANALYSE).



ئەو خانووەی کە غەزالی کتێبی "ژیاندنەوەی زانستەکانی ئایین-احیاء علوم الدین)ی تیادا نووسی کە دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵاتی گومبەتی قودسی پیرۆز، لەلای ڕاستەوە ئیسحاق دەروێش حسێنی بەگ وەستاوە کە پشکێنەری مەعاریفی ئەهلی فەڵەستین بووە، لەلای ڕاستەوەش فەیلەسووف و شاعیری گەورە ئەمین ریحانی وەستاوە، هەر ئەویش ئەو وێنەیەی پێشکەش کردووین.

## (٤-غەزالی)

ئەبوو حامید محەممەد کوڕی محەممەد غەزالی، لەنێو خەڵکیدا بەناوی غەزال ناسرابوو، گەورەترین زانایانی زانستی کەلامە لەسەردەمی خۆیدا و یەکێکە لەئیمامەکانی مەزهەبی شافیعی، لەساڵی ٤٥٠ك بەرامبەر بە ١٠٥٨ز لەتووس لەدایکبووە کە یەکێکە لەشارەکانی خوراسان، دواتر بۆ وەدەستهێنانی زانست چووتە نیساپوور، ئەو هەر لەمنداڵییەوە ئاماژە و نیشانەی زیرەکی و ژیریی لێ بەدەرکەوتووە و یەکێك بووە لەوانەی لەرووی زانستییەوە لەسەردەمی خۆیدا دەگمەن بووە، لەرووی زانستی کەلامە زانسێکی فراوانی هەبووە و هەڵوەستەی کردووە لەسەر هونەرەکانی فەلەسەفە، بەهۆی ئەوەی نیزامی پاشا کە وەزیری سولتانی پاشای شای سەلجۆق ئارەزووی لەو زانستە هەبووە، بۆیە کارگێڕیی قوتابخانەی نیزامی کە لەبەغدا دایمەزراندووە خستیە ژێر دەستی.

ئەو کات غەزالی لەتەمەنی سی و سێ ساڵیدا بووە و لەنێو زاناکانی ئەو سەردەمە بەهایەکی گەورەی هەبووە، لەپاش چەند ساڵێك قوتابخانەی نیزامی جێهێشت و بەرەو مەککە رۆیشت تا ئەرکی حەج بەجێبهێنێ، کاتێك ئەو ئەرکە

پیرۆزەی بەجێهێنا، چەندان وانەی لە مزگەوتەکانی دیمەشق و قودس و ئەسکەندەریە گوتووە، کاتێك لە ئەسکەندریە بوو ویستی بچێتە مەغریب تا خۆی پێشکەش بە یووسفی کوڕی تاشفین بکات کە میری مەراکش بوو و یەکێك بوو لە میرەکانی مورابیتەکان، بەڵام لەو سەروبەندەدا یوسف کۆچیدوایی کرد، بۆیە ئەمجارەیان غەزالی بڕیاریدا بگەڕێتەوە شارەکەی تووس، وازی لەژیانی هزرمەندیی هێنا، وەك سۆفیگەرێك ژیا و دەستی بە نووسینی کتێب کرد، مەبەستیشی ئەوەبوو ئایینی ئیسلام وەك بەبەهاترین و شکۆدارترین ئایین بخاتە ڕوو لەنێوەندی ئایینەکانی دیکە و فەلسەفەوە، بۆیە ناویان نای حوجەتی ئیسلام و زینەدین، هاوکات کتێبەکانی بەناوی ژاپانەوەی زانستەکانی ئایین هۆیەك بوو بۆ ناوداری، کە کتێبێکە باس لە زانستی کەلام و ئەدەبیاتەکانی دەکات و دابەشی کردووە بۆ چوار بەش: یەکەمیان ڕێوڕەسم و ئاهەنگە ئایینییەکان و دووەمیان سەبارەت بە یاسا تایبەتیەکانی ژیانی دونیاییە، سێیەمیشیان ئەوانەی بەرەو هەڵدێرن، چوارەمیشان سەبارەت خراپی و چاکەکارییە.

لەپاشاندا وازی لەنووسین هێنا و گەڕایەوە نیساپوور تا قوتابخانەیەکی نیزامی بەڕێوە ببات، لەپاشاندا گەڕایەوە تووس و داڵدەیەکی (تەکیەیەك)ی بۆ سۆفییەکان دامەزراند، ئەو ژیانەی کە مابیوو بۆ پەرستنی خودا و لێکدانەوە و رامان تەرخانی کرد و ئەمەو لەساڵی ٥٠٥ك بەرامبەر ١١١١ز کۆچیدوایی کرد. لەلایەکی دیکەوە زانیاری لەسەر ژیانی، "موسیودی هامیر" لەپێشی کتێبەکەی بەناوی (ایها الولد) کە لەئەڵمانییەوە وەرگێڕدراوتە سەر عەرەبی، هاوکات ئەم کتێبە باس لە ئاکار و رەوشت دەکات لەنێو کتێبەکانی غەزالی، ئەوەی ئێمەش لەلامان گرنگە مێژووی ژیانی هزری غەزالییە، لەرووی توێژینەوە و ئەو پلەیەی

کە لەنێوەندی فەیلەسووفەکانی ئیسلام وەریگرتووە، هەروا کاریگەریی لەسەر فەلسەفەی سەردەمی خۆیدا، لەتەك شیکردنەوەی هەموو مەبەستەکانی کتێبی (المنقذ من الضلال) کە تیایدا راستییەکانی بوونی خستۆتە ڕوو، لەتەك ئەوەی مسیو پالیا و مسیو شمولدرز لەوتارێك بەناوی "بنەماکانی فەلسەفە لەلای عەرەب" خستوویانەتە روو، هەروا شمولدرز دەقی باسەکەی غەزالی بە فەرەنسی بڵاوکردووەتەوە، بەڵام چەند هەڵەیەکی تیایە.

ئەم وتارەش لەشێوەی چەند وەڵامێکە کە هاوڕێیەکی چەند پرسیارێکی لێ کردووە سەبارەت بەقوڕسی لێکدانەوەی بنەماکانی فەلسەفە جۆراوجۆرەکان، تا هەڵە و راست لەیەکتر جیا بکرێتەوە، ئەو خاڵانەشی خستووەتە ڕوو کە ماوەی بیست ساڵ هەوڵی ئەوەی داوە تا راستییەکان روون بکاتەوە، لەپاشاندا بنەماکانی فەلسەفەی ئایینی و دانایی خوێندووە، هەروا هەموو گومانەکانی لێکداوەتەوە و توێژینەوەی لەسەر کردووە، تا لەنێوەندی ئاڵۆزی هەست و نەست دەریچێ کە زۆر جار لەتەك عەقڵدا نییە، لەلایەکی دیکەوە عەقڵ تەنها بەس نییە بۆ رازیکردنی غەزالی، چونکە شتێکی وانییە تا بنەماکانی بەراست وەربگیرێ، واتە ئەوەی پێمانوایە راستە لەنێوان هەست و عەقڵدا پەیوەست نییە بە کاتی ئێستامان، وەك ئەوەی ئێستا ئێمە لەخەو هەڵساوین، چونکە نازانین رووداوەکان بەپێی عەقڵ راستی خۆیان بەدەردەخەن، بەڵام ئەمە وەك خەون وایە و هیچ راستییەك بەخۆیەوە ناگرێ، بۆیە غەزالی خۆی لە کۆتوبەندەکان رزگار کردووە، ئەمەش بەهێزی عەقڵگەرایی نەبووە، بەڵکوو بەهۆی گەڕان بووە تا راستییەکان بدۆزێتەوە، هەموو ئەوانەی بەراستمان زانیوون سەبارەت بەعەقڵ، ئەوا غەزالی بەهۆی قووڵبوونەوەی لە بنەماکانی موتەکەلیم و باتینی و فەیلەسووفەکانی سۆفیگەرییەوە بوو، تەنها خۆی

لەنێوەندی سۆفیگەری و راماندا دۆزیەوە کە لەلای سۆفییەکانەوە جێگەی سەرنجە، لەتەك ئەوەی غەزالی کاریگەریەکی ئەوتۆیی نەبووە لەسەر بنەماکانی سۆفیگەریی، بەلام کاریگەریەکی مەزنی هەیە لەمێژووی فەلسەفەی ئیسلامیدا، سەرەرایی ئەوەی مەبەست و کۆت و بەندەکانی بەشێوەیەکی رەها لە کتێبەکانی بەدەرنەکەوتووە، بەشێوەیەك خەنجەرێکی ئاراستەی بنەماکانی فەلسەفە کردووە.

لەنێوەندی نووسینەکانی غەزالی وەك مسیۆ هامیر باسی لێوە کردووە دوو کتێبی هەیە کە شایانی خوێندنەوەن وەك کتێبی "مەبەستەکانی فەلسەفە-مقاصد الفلسفە" و "تهافت الفلاسفە"، ئەمەو کتێبی (مقاصد-مەبەست) پوختەیەکی زانستە فەلسەفیەکانە کە تیایدا نووسەر زانستی لۆژیك و ئەو دیوسروشت و سروشتییەکانی روونکردووتەوە، لەنێوەندی شیکردنەوەکانی لە ئەرستۆ دوورنەکەوتۆتەوە وەك چۆن فارابی و ئیبن سینا باسیان کردووە، ئەم کتێبەش لەکۆتایی سەدەی دوانزەدا وەرگێردراوەتە سەر زمانی لاتینی، ئەمەش بەهۆی "برتۆس لینتنشتین دی کۆلۆنی" لەژێر ناوی "لۆژیکی عەرەب و دانایی غەزالی".

کاتێك لە کتێبی مقاصد بۆچوونی غەزالی دەخوێنیەوە پێت سەیر دەبێ چۆن بنەماکانی فەلسەفە روونده‌کاتەوە و بەرەو هەڵدێری دەبات ئەمەش لەکتێبی تهافت بە روونی دەبیندرێ ئەمەو مسیۆ ریتر لە کتێبی CESCHICHTE DER PHILOSOPHIE مێژووی فەیلەسووفەکان لەبەرگی ٨ و لاپەرە ٥٩ باس لەوە دەکات کە غەزالی کتێبی مەقاصیدی نووسیووە بەلام تا ئەو کاتە لەژێر بنەماکانی ئەرستۆدابووە، بەلام غەزالی لەو کتێبەیدا باسی لەهەڵدێرانی بنەماکان نەکردووە لەتەك ئەمەدا روونکردنەوەیەکی تێروتەسەلی خستووەتە

روو، هەموو ئەمانەش بەشێوەیەکی دەستنووس لە چاپی ڤینسیا-بوندقیەی زمانی لاتینی بە تەواوی نەخراوەتە ڕوو کە لەکتێبخانەی سۆربۆندا پارێزراوە، لەوێدا غەزالی لە پێشەکی روونکردنەوەکەیدا کە بەرامبەر بیانووی فەیلەسووفەکان دەڵێت " براکەم پرسیاری ئەوەم لێدەکەی کە کتێبێکی تەواو دابنێم تا وەڵامی فەیلەسووفەکان بدەمەوە و لەوێدا باس لەهەڵەکانی نێو بنەماکانیان بکەم، ئەمە دەمانخاتە هەڵەوە، سەیرە ئەگەر پێشتر لەبنەماکانیان نەزانم بەتەواوی، بۆیە کاتێک ئارەزوو دەکەین هەڵەکانیان بزانین دەبێ هەڵوەستە بکەین لەسەر هەندێك لەبۆچوونەکانیان نەوەك خۆمان بکەوینە هەڵەوە و ئەمەش دەبێتە کارێکی کوێرانە، بۆیە پێم باشبوو پێش ئەوەی بەرامبەر بۆچوونەکانی فەیلەسووفەکان ببمەوە کتێبێك دابنێم سەبارەت بە زانستی لۆژیکی و سروشتی و ئیلاهیات، بەبێ ئەوەی هەڵە و راستییان جیا بکەمەوە، چونکە بنەماکانیان مەبەستمە بۆ روونکردنەوەی ئەنجامی قسەکانیان بەبێ ئەوەی قسەی زیاتری لەسەر بێژین کە هیچ پەیوەندیەکی بەتوێژینەوەکە نییە، بەڵام چەند بنەماکیان ڕووندەکەمەوە ئەمەش بەخستنە رووی بەڵگەکان، مەبەستی ئەم کتێبەیش خستنەڕووی مەبەستی فەیلەسووفەکانە بۆیە ئەو ناوەم هەڵبژاردووە".

لەلایەکی دیکەوە غەزالی باس لەوە دەکات کە زانستەکانی ئیلاهیات لەلایەك دادەنێم تا هەموو لایەك کۆك بن لەسەر تەندروستی بنەماکانیان ئەمەش پێویستی بەرەتکردنەوە نییە لەرووی بنەماوە.

وەك لۆژیك لەرووی گشتییەوە راست و چەوتی تیادا دەگمەنە، بەڵام لەڕووی سروشتزانییەوە لەراستیدا راست و پووچی تیادا ئاوێتە بووە.

ئەمەو لەكۆتایی كتێبە رەسەنەكە كە بەعەرەبی و دوو دانەی بەعیبری نووسراوە تیایدا هاتووە :" ئێمە ویستمان باس لە زانستە لۆژیكی و ئیلاهیاتیەكانیان بكەن بەبێ ئەوەی خۆمان سەرقاڵ بكەین بە جیاكردنەوەی راستی و پووچی، لەدوای ئەو كتێبەش كتێبی ورێنەی "فەیلەسووفەكان–تهافت الفلاسفه" دەكەینەوە تا لەوێدا بە بەڵگە و ئەرگۆمێنت پووچییەكان بخەینە پوو".

ئەم روونكردنەوەیەش جێگەی سەرسوڕمان نییە بۆ شیكردنەوەی بنەماكانی فەلسەفە لەكتێبی مەبەستەكان–المقاصد، بەڵام كتێبی تهافت–ورێنەكان كە غەزالی نووسیوویەتی دەیەوێ هەموو وێناكانی فەیلەسووفەكان رەت بكاتەوە، بە رەخنەیەكی گشتی هەموو لایەنەكان دەخاتە روو و هەموو ئەو پێچەوانانەش دەخاتە روو كە پێچەوانەی عەقڵن، ئەم دەقەش كۆتاییی كتێبی ورینەكان–تهافتە "ئەگەر پێیان راگەیاندین كە رەخنەكانمان هیچ گومانێكی تێدا نییە، دەڵێین كە رەخنە هەموو ئەرگۆمێنت و بەڵگەكان روونەكاتەوە كە راستە و چیی پووچە، ئەگەر بابەتە قورس بوو دەتوانین بەچەند رەخنە و بەرهەڵستیەك چارەسەر بكەین كە ئەو كتێبە باسی لێوە دەكات، لێرەوە هەموو بنەماكانیان روون بكەینەوە و لەبەرامبەری هەموو بەڵگە و ئەرگۆمێنتەكان دەهێنینە ئارا، مەبەستیشمان ئەو بەڵگانە نییە كە لەسەر رووداوەكانی جیهان دەوەستن و نامانەوێ ئەو باسە بخەینە پێش، لەو كاتەی باس لە ماددە دەكرێ، لەپاش كۆتاییهێنان بەو وتارە چەند وتارێكی دیكە دەنووسین بۆ سەلماندنی بۆچوونی راستەقینە كە بۆ خستنە رووی راستییەكانە، مەبەستیشمان لەو كتێبە بە هەڵدێربردنی پووچییەكانە".

لێرەوە غەزالی ڕەخنە لە بۆچوونی فەیلەسووفەکان دەگرێ کاتێك ڕێگرن لەدانایی لەنێوەندی ئاییندا، تا بۆیان بسەلمێنین ئەوەی دەیڵێن و پێچەوانەی بنەماکانی ئایینە، لەبنەڕەتدا هیچ بنەمایەکی نییە.

لەپاشاندا باسی لەچوار بنەمایەکە کردووە بۆ نووسینی ئەو کتێبە لەپاش پێشەکیش غەزالی باس لەبیانووەکانی فەیلەسووفەکان کردووە ئەمەش لە نێوەندی بیست خاڵدا، شانزدە خاڵی سەبارەت بە ئیلاهیاتە و چوار خاڵیشی سەبارەت بە سروشتزانییە.

گرنگترین هۆکارەکانیشی لەو بەشەدا پەیوەستە بە هۆکارەکانە، پوختەی قسەکانیشی لەو دەروازەدا بۆ دوو مەبەست دەگەڕێنەوە: یەکەمیان ئەگەر دوو شت کۆك بوون و هیچ بەڵگە و ئەرگۆمێنتێکی تەواو لەبەردەستدا نەبوو کە یەکەم گرفتێکە بۆ دووەم.

دووەمیان: گریمان ئەگەر تەندروستی کاردانەوەی هەندێك دۆخ (کارێك پەیوەست بوون بە کارێکی دیکە) بەپێی یاسای سروشتی ئەوا هیچ کاریگەرییەك نایەتە کایەوە ئەگەر شتەکان هاوشێوەش بن، وەك پەمۆ بەکاری خودا شێوەکەی وایە ئەگەر ئاگر بگرێ ئەوا هەمووی دەسووتێ، بەدەربڕینێکی دیکە کە فەیلەسووفەکان ناویان ناوە بنەمایەك بۆ گرفت، ئەو بەپێی کاری خودا دەبێ ئێمەش قبووڵی دەکەین وەك واقیع، چونکە خوای گەورە و میهرەبان زانستی هەیە سەبارەت بەچارەنووسی شتەکان و فێری کردووین، کارەکە وایە چونکە یاسای سروشتی چەسپاوە و خوداش هەموو کارەکانی لەدەستدایە.

ئێمەش دەڵێین کە هەندێك فەیلەسووف وەك ئیبن رووشد کە ڕەخنەی لەغەزالی گرتووە و جەختی لەوە کردووەتەوە کە غەزالی لەخستنە ڕووی قسەکانی دڵسۆز

نەبووە، ئەمەش ململانێی نێوان فەیلەسووفەکانە، باسی لە زۆرێك لە خاڵەکان کردووە، بەڵام ویستوویەتی تانە بدات تا ئەهلی سوونەت زیاتر متمانەی پێ بکەن، مووسای کوڕی ناربۆن باس لەوە دەکات لەپاش ئەوەی ئیبن رووشد لەسەرەتادا باسی لە لە لێکدانەوەکانی مەبەستەکان -مقاصد کردووە، لەپاشاندا غەزالی هاتووە تهافت -وڕێنەی نووسیوە، وتارێکی بچووك تەنها چەند کەسێك زانیوویانە کە روونکردنەوەیەکی رەخنە ئامێزە لەمەڕ بنەماکانی فەلسەفی، ئەم نامیلکەیەش ناسراوە بە "وتارێکە ئەبو حامد دایناوە لەپاش وڕێنە -تهافت تا لەوێدا بیری دانایان روون بکاتەوە و چەند مەبەست و سەرنجێکی تیایە، بۆ کەسی ژیر، ئاماژەیەك بەسە".

لەنێوەندی ئەم کتێبەدا چەندان توێژینەوەی تیایە، بەڵام زمانەکەی زۆر قورسە و خەڵك بەگشتی تێی ناگات، لەسەرەتای ئەو وتارەدا باس لە بازنەکانی باڵا دەکا لەتەك جووڵە و دەرووندا، لەپاشاندا باس لە داینەمۆی یەکەم دەکات کە بەشێکە لەخەسڵەتەکانی، لەپاشاندا باس لەدەروون دەکات، دیارە ئەم وتارەیش بۆ ناشیرینکردنی فەلسەفە نییە وەك لە وڕێنە- تهافت باسی لێوە کردووە بەڵکوو ئەرگۆمێنینتێکە بۆ هەندێك لە دانایان نەك موتەکەلیمەکان، بە بیانووی عەقڵی کاروباری ئیلاهیات دەسەلمێنێ، بەڵام لە تهافت رووبەڕووی بووەتەوە، ئەو لەو وتارەدا لەتەك فەیلەسووفەکان باس لەوە دەکات کە زەمان و شوێنەکان ئەزەلین، بەڵام جەختیش لەوە دەکاتەوە کە نابێ دەروونە بەهێزەکان و عەقڵە تەندروستەکان سەیری بکەن، وەك چۆن پەیامبەر دروودی خوای لەسەر بێ دەفەرمووێ "بەپێی عەقڵ و تێگەیشتنی خەڵکی بۆیان بدوێن".

ئیبن توفەیڵ لەگەڵ ئەوەی ڕێزێکی زۆری بۆ غەزالی هەبووە باس لەپشێویی و دڵەڕاوکێ دەروونی لەبنەماکانی غەزالی دەکات، (لە کتێبی حی کوڕی یەقزان وەرگێراوە لاپەڕە ١٩-٢١)، سەرەتایەك بۆ "کتێبەکانی ئیمام غەزالی....هتد".

لەپاشاندا ئیبن توفەیڵ بەکورتی باسی لە کتێبەکانی غەزالی کردووە پێیوایە ئەو کتێبی باتینی نووسیوە، تەنهاش کۆمەڵێك کەس ئەو کتێبانە دەخوێننەوە کە لێوەی نزیکن، ئەم کتێبە هیچ گرنگیەکی نییە لە کتێبخانەکانی ئەندەلووس، بەڵام گرنگترین کتێبی (المضنون) کە لەتەك چوار وتاری دیکەی غەزالییە لە کتێبخانەی پاریس پارێزراوە (لەپێشتردا ناوی کتێبخانەی ئیمپراتوریەت بووە) کە لەژێر تۆمار و ژمارە ٨٤٤ دانەیەکی دەستنووسە و هاوکات شمۆلدرز لە وتارەکەیدا لە لاپەڕە ٢١٣ پەراوێزێکی بۆ نووسیوە و لەوێدا ئەوەی دەرخستووە کە غەزالی لەگەڵ فەیلەسووفەکانی جیهان ڕێکەوتووە و وەك ئەوانە باس لە خود و گرفتەکان دەکات، هەروا لەرووی ناوەڕۆك و بەشبەشکراوەکان شتەکان دەخاتە روو و پێی وایە هیچ سیفەتێکیان نییە، بەڵام هەندێك لەنووسەران کە ئەو کتێبە بە کتێبی غەزالی دەزانن پێیان وایە ئەو وەك ئیمامێکی ئیسلام باسەکانی خستوونە روو (سەیری ناوەڕۆکی حاجی خەلیفە بکە کە مسۆ فاجل لەبەرگی ٥ و لاپەڕە ٥٩٠ باسی کردووە).

بەکورتی غەزالی بنەمایەکی تایبەت بەخۆی هەبووە و تەنهاش بە سەرنجڕاکێشان و رامان گەیاندویەتیە ئەو رادەیە کە لەکۆتایدا بۆتە بەشێك لە سۆفییەکان و وتاری سۆفیگەری کردووەتە بەشێك لەژیانی، بەڵام بەهۆی سەرنجڕاکێشی فەلسەفەوە نەبووە، هەروا غەزالی زۆر گرنگی بەکار دەدات، ئەمەش لە کتێبی (ایها الولد) بەڕوونیی بەدەرکەوتووە کە بەرهەمی کار زانستە، هەروا یەکێك لە کتێبە گرنگەکانی سەبارەت بە رەوشت و ئاکارە، لەلایەکی

دیکەوە کتێبی (میزان الاعمال)ەکەی شیکردنەوەیەکی عیبری بۆ کراوە و لەساڵی ١٨٣٩ لە لیبزیج چاپکراوە و لەلایەن ئیبراهیمی کوڕی حسد ئای ئیسرائیلی ئەندەلووسی لەعەرەبییەوە وەریگێڕاوە.

گرنگی غەزالی لەلای فەرنجیەکان و کاتێك باس لە فەلسەفە دەکەن زانایانیان ئەوە دەخەنە روو کە تانەی لە فەلسەفەی رۆژهەلات داوە، ئەگەر ئیبن رووشدیش نەبوایە بەوشێوەیە تانەی لەرۆژئاواش دەدا بەلآم ئیبن رووشد چەند سەدەیەك توانی رۆژئاوا بپارێزێ.

## (روونکردنەوەیەك سەبارەت بە غەزالی)

### (١)

بێگومان ئەم فەیلەسووفە دانایە یەکێکە لەمەزنترین ناودارانی ئیسلام و یەکێکە لە ئیمامەکانی توێژینەوە و سەرنجدان لە زانستەکانی دونیا و ئایین، لەلایەن زۆرێك لە مێژوونووسانی فەلسەفە و ئەدەب بەیەکێك لە تروسکە و بلیمەتەکان دەژمێردرێ، یەکێکە لەوانەی سەدەی پێنجەمی کۆچیی روون کردەوە لەپاش کۆتاییهاتنی سەردەمی یەکەم، هەروا چارەنووس بوو کە ئەو یەکێك بوو لەوانەی کە نووسەری پێشینە چاکەکان بوو بۆیە ناویان نا حوجەتول ئیسلام، بەلآم سەبارەت بەناوەکەی کە غەزالییە هاوسەردەمەکانی چەندان ناوی دیکەیان بۆ داناوە ئەمەش لە (شذرات الذهب)ی شەمسەدین زەهەبی و (طبقات الشافعية)ی عەبدولڕەحیمی سەنەوی باسیان لێوە کردووە، سەبارەت بە توند و ناسکی پیتی (ز) وەك خباز تا لەونێوەندە پیتی زا ناسکتر بکرێ، لەلایەکی دیکەوە باوکی غەزالی سووفی دەچنی واتە (یغزل) ئەم

نازناوەشی لەباوکییەوە بۆ ماوەتەوە، بەلام هەندێك دەڵێن ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ گوند و ناوچەی غەزالە کەناوچەیەکە لەدەوروبەری شارۆچکەی تووس، ئێمەش لەتەك بۆچوونی سەمعانین بۆ سووککردنەوەی پیتی (ز).

هەرچۆنێك بێت ئەگەر باوکی سووفی چنیەوە و دواتر لە دوکانە بچووکەکەی فرۆشتوویەتی، زۆری نەبردووە کۆچیدوایی کردووە ئەمەشی بۆ محەممەدی کوڕی بەجێهێشتووە کە ئەبوو حامدە، ئەو کات ئەو منداڵ بووە، لەلایەکی دیکەوە وەسیەتی کردووە بۆ یەکێك لەهاوڕێیە سۆفییەکانی تا ئاگاداری کوڕەکەی بێ ئەویش لەهەموو روویەکەوە پەروەردەی کردووە و فێری زانستی کردووە، چارەنووسیش وای لەغەزالی کرد ولات جێبهێڵێ و سەفەر بکات وەك داواکارێکی زانست و فەیلەسووف و دانا و پەیامبەرەکان، ئەمانەش تەنها خەمی ولاتیان لەدڵدا دەمێنێتەوە، غەزالی وەك رووناکبیرێکی سەردەمی خۆی، توانی بخوێنێ و بنووسێ و سوود بەخەڵك بگەیەنێ کاتێك مامۆستا بوو، ئەو کاتیش لەبەهاری تەمەنیدا بوو، کە لەزۆر رووەوە بە ئیبن سینا دەچێ.

(٢)

وەك خوێندمانەوە فەیلەسووفەکان وەك کندی و فارابی و ئیبن سینا پەیوەندیان بە خەلیفە و وەزیرەکانەوە هەبووە، ئەمەش وەك هەوڵێك تا بیروڕاکانیان لەو رێگەیەوە بلاوبکەنەوە، لێرەوەش دەبینین ژیانی غەزالی هاوشێوەی ئەو فەیلەسووفانەیە کاتێك پەیوەندیی بە نیزامی پاشا کرد و لەژێر سێبەری خانەوادەی سەلجووقییەکان ژیاوە، چونکە فەلسەفە گوناهەکەی سەرەتا دەبوایە لەژێر ساباتی هێزی دەوڵەتدا بێت، وەك چۆن ئەرستۆتالیسی یۆنانی و مامۆستای یەکەم لەژێر سێبەری فلیپیسی مەکدۆنی و ئەسکەندەری کوڕی دەژیا، هەروا ڤۆلتێر لە دەرباری فریدریکی گەورە دەژیا، گۆتەی مەزنی

ئەڵمانی تەنها بەکارەکەی دەیتوانی دانایی خۆی بەرەو پێش ببات، هەروا سپینۆزا کە هەموو تەمەنی لە پیشەسازی کاتژمێر و نووسیندا بەڕێوە برد، بەڵام حاڵەتی دووەم فەیلەسووفێکە کە پێی دەبەخشن ئەوەك خۆی پەیدای بکات، لەلایەکی دیکەوە هەندێك هەن میراتیان بۆ ماوەتەوە وەك ئارسۆرشۆپنهۆر، هاوکات جۆن ستیوارت میل بە بەرهەمی نووسینەکانی دەژیا، مەبەستیش لەمە زۆربەی دانایە مەزنەکان هەژار بوونە و بەهۆی بەرهەمی بیریان بە نووسین و وانەگوتنەوە ژیاون، ئەمەش وەك فریدریك نیچە و برگسۆن و چەندانی دیکە.

(٣)

لەنێوەندی کتێبەکانی ئەبوو حامدی غەزالی کتێبی (المضنون به على غير اهله) کە ئەفرەنجیەکان وای دەبینن کە دانپیانانی غەزالی وەك دانپیانانی جان جاك رۆسۆیە، بەڵام لەناوەڕۆکدا جیاوازیەك هەیە، ئەمەو جان جاك رۆسۆ دانپیانانەکانی گشتگیرن لەژیانی ماددی و مەعنەوی و عەقلی، بەڵام شێخ غەزالی ئەو دانپیانانەی تەنها پەیوەستکردووە بە ژیانی عەقلی و دڵەوە، ئەمەش وتارێکە کە بۆ یەکێکی ناردووە و لەوێدا باس لەوە دەکات کە وەك برای وایە و لەسەرەتادا دەڵێت "براکەم داوات لێ کردووم کە مەبەست و نهێنیەکانی زانستت بۆ باس بکەم، لێرەوە باس لە پوختەیەك لەهێنانە کایەوە راستیت بۆ دەکەم لەنێوان پشێویەکانی کۆمەڵەکان لەرێڕەو و رێگەکان، بەڵام من لەنێوەندی قسەکانم لاسایی ناکەمەوە، بەڵکوو بەبینینێکی دیکە سەیری دەکەم، هەروا لەحاڵی دووەمدا باس لەوانە دەکەم کە فێر نەبوونە و درك بە راستییەکان ناکەن لە شێوەی ئیمام، لەحاڵی سێیەمدا رێگەکانی بەفەلسەفە بوون و رێگەی سۆفیگەریم گرتووە، بۆیە هیچ کاتێك سڵ ناکەمەوە لەپشکنینی

پرتە و بۆڵەکانی خەڵکی کاتێك باس لە راستی دەکەن، بەهۆی زۆربوونی خوێندکارانەوە وازم لە بەغدا نەهێناوە، بەڵکوو دوای ماوەیەکی زۆر گەڕامەوە نیساپور".

ئەوەی لێرەدا دەبینرێ غەزالی ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆری بینیووە لەبەدەستهێنانی راستییەکان، ئەو رقی لە فەلسەفە بووەتەوە و بەوەش رازی بووە تا رێگەی سۆفیگەری بگرێتە بەر و پێیوایە ئەوەش کلیلی ژیانی عەقڵگەراییتی، هەروا پێدەچێ ئەو کات غەزالی لەکاتی گەنجیەتیدا بووە و تەمەنی نەگەیشتۆتە بیست ساڵی، تا ئەو کاتەی گەیشتۆتە پەنجا ساڵ واتە پێنج ساڵ لەپاش مردنی، چونکە ئەو لەدەیەی شەشەمدا کۆچیدوایی کردووە، دەیەوێ هەموو نهێنینەکان بە ئازادیەکی رەها تا رەوایی و ناڕەوایی، لەلایەکی دیکەوە خوێندنەوەی فەلسەفە کۆ بکاتەوە تا رەگەزەکانی فەلسەفە دەربخا، ئەو زۆر بەڕوونی لەگفتوگۆکانیدا بەدەردەکەوێ، هاوکات سۆفی جەخت لە نهێنیەکانی سۆفیگەری دەکاتەوە، لەتەك ئەمەشدا کەسی گومڕا دەیەوێ بەهەر شێوەیەك زەندیق و گومڕایی خۆی بخاتە ڕوو.

(٤)

ئەم شێوەیە ئازادییە لە توێژینەوە و خوێندنەوە دڵفراوانی و شکۆداری ئەو دەردەخا وەك چۆن "فانت" لەکتێبی "رەخنەی عەقڵی راست و عەقڵی رەها"، هاوکات غەزالی وەك زانایەك زۆر تێنوویی رەوایی کارەکان بووە ئەمەش لەتەمەنی گەنجیەتیەوە بووەتە بەشێك لەژیانی تا ئەو کاتەی پیر بووە، هەروا ئەو فەیلەسووفە هەموو پەیوەستبوونەکانی لاسایی شکاندووە بەتایبەتی ئەو بڕوایانەی کە میراتن، بۆیە زانستی بەکارهێناوە تا رەوایی و راستییەکان دەربخات وەك زانست جەختی لەوە کردووەتەوە کە ژمارە دە لە سێ زۆرترە،

بەڵام کاتێك گوتیان سێ زۆرترە ئەوا دەبێ بەبەڵگەوە ئەوە بسەلمێنیت، بۆیە زانست دەبێ هیچ گومانێك لەلات نەهێڵێ ئەم بێگومانیەش زانستێکی یەقینییە، هەر زانستێکیش دڵنیایی لەگەڵ نەبێ ئەوا زانست نییە.

(٥)

ئەوەی سەیرە ئەم فەیلەسووفە رێڕەوی فەلسەفەی هەستیاری گرتۆتە بەر، ئەمەش لەپێش داڤید هیۆم ئینگلیزەوە بووە، زیاتر لە شەش و حەوت سەدە، هەروا داڤید هیۆم هۆیەك بووە لەپەرەپێدانی هزری "ئەمانۆئیل کانت"ی ئەڵمانی، لەنێوەندی کتێبەکەیدا باس لەوە دەکات کە ئەو هەڵیساندووە لەخەوەکەی، ئەگەر ویستمان پێوەری عەقڵی غەزالی بناسین لەنێوەندی ئەو فەیلەسووفە ئەورووپیانە، بەڵام غەزالی لەنێوەندی زانستەکاندا پشکنینی کردووە بۆیە خۆی وابینیوە کە زانایە و لەهەموو رووەکانی هەست و پێویستەکان دەبینێ ئەو دەڵێت "کاتێك بێ ئومێد دەبین پێویست ناکات گرفتەکانی دیکە بهێنینە ناوەوە ئەمەش هەست و پێویستەکانە، بۆیە دەبێ هەموو رووەکانی یەکلاکەینەوە تا متمانەمان بە هەستەوە هەبێ بەپێی کارە لاساییەکان.

(٦)

کاتێك گەیشتە نێوەندی فەلسەفەوە جەختی لەوە کردووەتەوە کە گومڕا و فەیلەسووفە دێرینەکان و خۆیان بە دورستکەری شتەکان داناوە و وای دادەنێن کە جیهان وەك پێشتر نەماوە و کەسیش دروستی نەکردووە، ئاژەڵیش لە دڵۆپەیەك نییە و دڵۆپەش لە ئاژەڵ نییە و چەندان شتی دیکەش.

نیـوەی دووەم سروشتناسـەکان ئەوانـە توێژینـەوەکانیان زیـاتر لـەجیهانی سروشتیدا کە پەیوەستە بە سەرسوڕهێنەری ئاژەڵ و رووەك و زیـاتریش لـە زانستی توێکاری ئەندامەکانی ئاژەڵیان کۆڵیوەتەوە و پێیانوایە کـە دەروون دەمرێ و نازیێتەوە و ناگەڕێتەوە و ئینکاریان لە بەهەشت و ئاگر کـردووە و زیاتریش روویان لە ئارەزوو و خۆشیدا گەڕاون کە چەند ساتێکە، غەزالی بەوانە دەڵـێن ئەمانـە زۆر دواکـەتوون وەك سـوکرات کـە مامۆسـتای ئەفلاتوونـە و ئەفلاتوون مامۆستای ئەرستۆتالیسە و ئەرستۆتالیسە کە لۆژیکی رێکخستووە و هەموو زانست و مەی بۆیان داناوە وئەوەشی پۆلین کردووە بۆ دووبەش کـە گومڕ و سروشتناسەکانە، غەزالی دەیەوێ هەموو کارە ئابڕووبەرەکانیان بخاتە روو، لەکاتێکدا ئەرستۆتالیس وەڵامی ئەفلاتوون و سوکراتی داوەتەوە ئەویش وەڵامی زۆربەی گومڕاکانی داوەتەوە.

ئەوەی سەیرە ئیمام غەزالی لەگەڵ ئەوەی دانی بەوە ناوە کە فەیلەسووفەکانی گریك رۆڵێکی ئەوتۆیان هەیە بەتایبەتیش ئەرستۆ، کەچی لەهەموو روویەکەوە گلەیی لە فەیلەسووفەکانی ئیسلام دەکات و باس لە ئیبن سینا و فارابی دەکات و چونکە هیچ کام لە فەیلەسووفەکانی ئیسلام وەك ئەرستۆ نین، بـەڵام ئـەم قسانە پێش بەدەرکەوتنی ئیبن رووشدە، ئەگەر غەزالی درکی بەوە بکردابووایە ئەوا چاکەکانیان وا بەسەرسوڕمانی سەیر نەکرد و گرنگیەکی ئەوتۆیی پێدەدا بۆ پێشکەوتن.

(٧)

کاتێك غەزالی سەرقاڵی زانستەکانی فەلسەفە بوو، لـەپێش ئەمـەش زۆربـەی کارەکانی گەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە زۆرێـك لەقسـەکانی سـاختەن وەك چـۆن شاعیران لەنێوەندی قسەکانیان ساختەیی و بێ بڕوایی بەدەردەکەوێ، دواتر

ڕێبازی کارەکەی گۆڕی ڕێبازی فێرکردن و خێزان هەنگاوی نا گەیشتە ئەو بۆچوونانەی کە ئەمانوئیل کانت پێیگەیشتووە بەوەی عەقڵ هەموو شتێك نییە بۆ گەیشتن بە هەموو داواکاریەکان، لێرەوە ئەگەر وابێ هەموو گرفتەکان چارەسەر دەبێ، بەو بڕوایە تۆیەش قوناغی دووەم لە لە عەقڵی غەزالی دێتەکایەوە، ئەمەو قۆناغی یەکەم لاساییکردنەوە بوو و دووەمیش توێژینەوە لە قسە و وتەی موتەکەلیم و فەیلەسووفەکان، هاوکات توێژینەوەی لەبارە ئەو کۆمەڵانە کرد کە بوونەتە قوتابخانەی فێرکاری، لەسەرەتادا هەموو کتێبەکانیانی کۆکردەوە وەك چۆن سەبارەت بە کتێبە فەلسەفیەکانیش هەمان کردەوەی ئەنجامدا، لێرەوە هەموو وشە و رستە و قسەکانیان ریزبەندی کرد تا بەراوردی بکات، وەڵامی زۆرێك لەوتەکانیانی دایەوە تا وایلێهات خەڵکانێك لەسەردەمی خۆیدا وەك زانایان ڕووبەڕووی بوونەوە کە پێوەری داناوە بۆ کەمکردنەوەیان، باسی ئەوەیان کرد هەموو ئەو شتانەی کە نووسیویانە بۆ فێرکردنە بۆیە ناتواندرێ پشتگیری لە غەزالی و بەراوردەکانی بکرێ کە بە ئەنجامێك گەیشتووە.

(٨)

ئەم بەرهەڵستکارییە لەنێوەندی زنایانی ئیسلام نوێ نییە، هاوکات ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەڵامی حارسی محاسبی دایەوە کاتێك کتێبێکی سەبارەت بە موعتەزیلە نووسی، کەچی حارس لەوەڵامدا گوتی ڕەتکردنەوەی بودعە ئەرکە، لەوەڵامدا ئیبن حەنبەل پێی گوت "بەڵێ وەك ئەوان قسەت کردووە بۆیە وەڵامم دایەوە، بۆیە کاتێك وەك ئەوان قسەت کرد دەبێ تێبگەی و ئاوڕ لە وەڵام نەدەیتەوە، تا ئەو کاتەی بنەچەکەی تێدەگەی".

ئەوەی ئیبن حەنبەل باسی لێوە کردووە راست و رەوایە، بەڵام ئەوانەی هەمان رووخساریان هەیە لەبیروبۆچووندا بەهیچ شێوەیەك بڵاونابێتەوە و ناودار نابن، بۆیە کاتێك وەڵامیان دەدەیەوە وەك ئەرکێك وایە، چونکە نابێ بەگریمان کاریکرێ بۆیە کاتێك گومان دەکەین دەبێ راستی و رەوایەکەش بەدەربخرێ.
لەمەوەش بەدەردەکەوێ تەنها لەرووی فێرکاریەوە و لەلایەن خۆیەوە ئەو رەتکردنەوەیە نەهاتۆتە ئاراوە بەڵکوو هۆکارێکی سیاسی لەپشت ئەو وەڵامانەدا هەبووە، چونکە کاتێك ئەو کۆمەڵەیە ناویان بڵاوبۆوە رووبەرووی ئیمام بوونەوە سەبارەت بەمانا و چەمکەکان، هاوکات پێدەچێ خەلیفە ترسی لەبڵاوبوونەوەی ئەو کۆمەڵە هەبوو، بۆیە غەزالی راسپارد تا وەڵامی ئەو کۆمەڵەیە بداتەوە و غەزالیش سەبارەت بەو راسپاردەیە چەند وتەیەکی هەیە ئەمەش دەقەکەیەتی "لەپاش ئەوەی کارەکە بوو بەباسێك فەرمانێکی توند لەلایەن خەلافەوە دەرچوو تا پۆلینی کتێبەکەیان و راستی مەزهەبەکەیان بزاندرێ، بۆیە نەمتوانی بێدەنگ بم کە ئەمە لەدەروونمدا لە کۆمەڵەی باتن دەرچووە، چونکە قسەی ئەوان زۆر بەجوانی دەخرایە روو، بەڵام مەزهەبی فێرکردن تێکەڵەیەك بوو لەسیاسەت و شەریعە و کەمێك فەلسەفەی تیادا بوو تا برەو بدەن بە مەزهەبەکەیان و دانایی پێبەخشن، زۆرێك لەوتەکانی فیساگۆریان هێناوەتەوە، ئەم توێژینەوانەش بۆنی فەلسەفەی لێدەهات چونکە ئەوانەی خۆیان بەو کۆمەڵەیە دەزانی کەوتبوونە نێوەندی چەند گرفتێك خۆیان تێپنەدەگەیشتن و دواتریش خستیانە بەردەم ئیمام تا بەهەر شێوەیەك بێ لایەك لەم بابەتانە بکاتەوە، بەڵام تەنها تەمەنی خۆیان لەم بابەتە بەهەدەر برد.

(٩)

هەچۆنێك بێ لەکۆتاییی توێژینەوەکەیدا غەزالی ئەوەی دەرخستووە ئەمە ڕێگەیەکە بۆ سۆفیگەری، بۆیە بەهۆی هەوڵەکانی ڕەزامەندیان دەربڕی، لێرەوەش هەموو گرفتەکانی پاك بوونەوەی ڕەوشت و سیفەتە پیسیەکانیان بۆ روون بووەوە تا بگەنە ئەوەی لەدڵیان تەنها خودا بمێنێ، چونکە زانست ئاسانترە لە کارکردن، لێرەوەش دەستی کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانیان وەك کتیبەکانی ئەبوو تالیبی مەککی و حارس محاسبی و جونەید و شەبلی و بوستامی... لێرەوە غەزالی هەموو شتەکانیان بە خوێندنەوە و گوێگرتن لەلای خۆی داینا، تا گەیشتە ئەو بۆچوونەی کە ناتوانن هەموو شتێك بەفێر بوون بزانن ئینجا چ لەرووی سەلیقە و سیفاتەکانیان، چونکە جیاوازیەکان لەنێوان کاتێك شتێك دەزانێ دەبێ تا چ بڕێك ئەو زانیاریانە رەوا و تەندروستن و لێی تێر دەبێ، لەتەك ئەوەی راستیەکانی بزانێ، بەلام برسی و سەرخۆش بێت. هەموو تویژەرەکانیش ئەوە دەزانن، کە ئەو کۆمەڵەیە لەنێوەندی حاڵەتەکانن نەك قسەکردن.

(١٠)

لەوەوە بۆمان دەرکەوتووە، کە غەزالی سەرسامە بە موجیزەی دڵ، چونکە دڵ هیچ ئەرگۆمێنت و ئامرازێکی ناوێ تا بگاتە زانستێکی یەقینی، لێرەوە وازی لە سۆفیگەری هێنا و ئەو زانستانەی پێگەیشت تا پشکنین لەنێو زانستەکانی بکات بە تایبەتی کاتێك ڕێڕەوی زانستی عەقلی و شەرعی کە باوەڕی بەوەیە کە خودا و پەیامبەر و ڕۆژی دوایی هەن، هیچ شتێك لەجیاتی ئەوە نییە کاتێك دەڵێت دە سێیە، تەنها بە هۆکار و بەراوردکردن دەبێ بگەیتە ئەو بۆچوونە، ئەمەش بەهۆی تەمەن و چاکەکارەییەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندیەکی پتەوی

لەتەك ئەزموونددا هەیە، دەبێ لەدونیادا کاری چاکەت ئەنجام دابێ و تەنها بەئارەزووی خۆت کردەوەکانت ئەنجام نەدابێ، کاتێك دڵت دەیەوێ خۆشی و خۆشگوزەرانی ببینێ ئەوا بە ئیرەیی و خۆ بەگەورە زانین بەرەو ماڵی ئەمری هەنگاو دەنێیت، لەکاتێکدا بڕوایەکی تەواوت بەخودا هەبێ، هەروا نابێ بیانوی بە سەرقاڵی و پارەداری بێنییەوە.

(١١)

کاتێك ئەو گرفتانە خرانە پێش غەزالی ئەو لەوپەڕی شکۆیی دابوو هەروا دانایەکی دونیایی بوو کە لەهەموو روویەکەوە چاوەکان لەسەری بوون، کاتێك لەبواری فێرکردن و وانە گوتنەوەدا بوو زیاتر ناوی بڵاوبووەوە و ناودار بوو، ئەو بیری لەوە نەکردبووەوە تا لەبەغدا دەربچێ تا ئەو کاتەی بۆ ماوەی شەش مانگ هەر لە رەجەبی ٤٨٨ك تا کۆتایی ئەو ساڵە نەخۆش کەوت و پزیشکەکانیش بێ ئومێد بوو لەچاکبوونەوەی و چارەسەری، بۆیە ناچار بوو بچێتە شام کەچی خەلیفە و هاوکارانی ترسیان لەوە هەبوو نەگەڕێتەوە بەغدا، کاتێك چوو بۆ شام بە گۆشەگیریی ژیا و ماوەی دوو ساڵ لەوێدا مایەوە، دواتر چووە قودس سەردانی بەردەکەی کرد و دواتر بەرەو حیجاز رۆیشت دواتر دڵی بزویی بۆ وڵات، ئەمەش دە ساڵی خایاند بەڵام لەو نێوەندە چەندان کاری مەزنی ئەنجامدا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە سۆفیگەری رێڕەوێکە بۆ نزیکبوونەوە لەخودای گەورە، رێگەکەیان باشترین رێڕەوە و رەوشتیان بەرزترین رەوشتە.

(١٢)

بۆمان دەرکەویێ کە غەزالی تەنها فەیلەسووفێکی عەقڵیی نەبووە، بەڵکوو داناییەکی ئاینی بووە لە بنەچەدا. ئەو زانست و عەقڵ و شەرعی وەك ئامرازێك داناوە بۆ ئەو دۆخەی کە سروشت بۆی لواندووە، دەمانگەیەنێتە ئەو بۆچوونەی کەخاوەن عەقڵێکی دانسقە بووە، کاتێك سەیری فەلسەفەی یۆنانی و ئیسلامی کردووە و سوودی لێوەرگرتوون، ئەم دیاردەیەش لەنێوەندی کتێبی "مقاصد الفلاسفه" و (احیا علوم الدین" و "تهافت الفلاسفه" بەدەرکەوتووە، کە دواتر بەتێروتەسەلی باسی لێوە دەکەین، کاتێك دێینە سەر ئیبن رووشد، کە تاکە فەیلەسووفی ئیسلامە وەلآمی کتێبەکانی داوەتەوە.

## (٥-ئیبن باجه)

ئەبووبەکر محەممەدی کوڕی یەحیا کە ناسراوە بە ئیبن سائیغ یان ئیبن باجە، زانایانی ڕۆژئاوا لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـت بـە ئاڤمبـاس ناویـان بـردووە، لەناودارترین زانایانی موسڵمانی ئەندەلووسە، ئەو بەو ناسرا بوو، کە زانستی پزشکی و ماتماتیك و گەردوونی دەزانی، هەروا بە فارابی دەچێ لەزانیاریەکانی میوزیك و بەتایبەتیش ژەنینی عووددا، لەکۆتایی سەدەی پانزدەهەمی زاینی لە (سرقەسە) لەدایك بووە، کاتێك گەورە بـوو و تەمـەنی گەیشـتە تـافی لاوی، لەساڵی ١١١٨ز چووە ئیشبیلییە، لەوێدا مایەوە و چەندان کتێبی سەبارەت بە لۆژیك نووسی و یەکێك لەو کتێبانەی لە کتێبخانەی ئەسکۆریالە لەژێر ژمارەی تۆمارکراو ٦٠٩، ئەمەو ئەو دانایە لە ٤ی شەوالی ساڵی ٥١٢ك تەواوی کردووە. بەلام چوونی بۆ ئشبیلییە زۆر زانیاری وردی لەسەر نییە، لەوانەش بەناچاری چوو بێتە ئیشبیلییە لەپاش ئەوەی لەساڵی ٥١٢ك فۆنس دەستی بەسەر شاری (سرقەسە) داگرتەوە، ئەمەو ئیبن باجە و موسڵمانانی دیکەش کۆچیان کرد،

دواتر ئیبن باجە چووە غەرناتە ماوەیەکی کەم لەوێدا مایەوە، دواتر چووە مەغریب. هاوکات جێگەی ڕێز و نەوازش بوو لەلای میرەکانی مرابیت، ئەمەش لە مێژووی دانایان تۆمار کراوە، لە ژیاننامەی ئیبن خەتیب (مکاری) هاتووە، کە ئیبن باجە وەزیری یەحیای کوڕی ئەبوویەکری نەوەی یوسفی کوڕی تاشفین بووە، بەڵام ئەو گێڕانەوەیە زۆر ورد نییە، چونکە یەحیا میری فاس بووە لەسەردەمی باپیرەی و لەساڵی ١١٠٧ز لەفاس رایکردووە دوایی مردنی باپیرەی، دواتر لە عەلی کوڕی یوسفی مامی یاخی بووە کە میری ئیمارەت بووە لەپاش یوسف.

ئیبن باجە نەگەیشتبووە تەمەنی پیری کۆچیدوایی کرد ئەمەش لەساڵی ٥٣٣ك بەرامبەر ١١٣٨ز، هەندێك لە مێژوونووسانی ئیسلام باس لەوە دەکەن، کە ژەرخواردوو کراوە لەلایەن ئەو کەسانەی کە لەپزیشکیدا لەکار دابوونە و ئیرەییان پێ بردووە، ئەمەو ئیبن ئەبوو ئەسبەعیە سەبارەت بە ژیانی ئیبن باجەی زانا لە کتێبی (عیون الانبیاء) باسی لێوەکردووە کە ئەبووحەسەنی عەلە غرناتی هاوڕێ و قوتابی ئەبی سائیغ بووە، لەلایەکی دیکەوە باس لەهەندێك کۆکراوەی نووسینەکانی دەکات و ئەوەش دەخاتە روو کە ئیبن سائیغ یەکەم کەس بوو کە سوودی لەدانایی رۆژهەڵات وەرگرتووە و دەڵێت "فەیلەسووفەکانی رۆژهەڵات کە ناویان ئیبن سینا و فارابی و غەزالی و چەندان زانای دیکە جیان لە فەیلەسووفەکانی رۆژئاوا وەك ئیبن توفەیل و ئیبن باجە و ئیبن رووشد"، ئەم گێڕانەوەش لەراستی نزیکە چونکە نووسینی ئەو فەیلەسووفانە لە ئەندەلووس بڵاوبووبوونەوە واتە هەر لەسەردەمی حەکەمی دووەم ٩١٦-٩٧١ز، بەمەش ئیبن باجە یەکەم کەس بووە دەستی لەزانستەکانی فەلسەفە داوە لەئەندەلووس و هیچ ڕکابەرێکی نەبووە، بەهۆی

ئەویش ئیبن توفەیل سوودی وەرگرتووە کە زانیاری لەسەر خودی پیێ داوە و ئیبن توفەیلێ لەدوای ئەو بەچەند ساڵێك هاتووە لەبارەی ئیبن باجەوە دەڵێت کەسێك بوو ژیری پیێ ناساندم و هەرزی فراوان کردم، لەسەرووی خەڵکی سەردەمی خۆی بوو بەداخەوە زووش بەجێی هێشتین، چونکە سەرقاڵی ژیان ماندووی کردبوو، ئەو کرانەوەیەك بوو لە گەنجینەکان لەتەك ئەوەی ئەو کتێبانەی کە نووسیونی بەنیوەچڵی ماون لەتەك هەندێك توێژینەوە کە بەخێرایی نووسراون، لەگەڵ ئەوەی لەسەردەمی خۆیدا ئێرەیی و نەزانی تەنگی پیێ هەڵچنی بوو، ئەمەو فەتحی کوڕی خاقان لە (قلائد العقياندا) دەڵێت:

"ئەدیب ئەبا بەکری کوڕی سائغ ناشیرین بوو لەچاوانی ئاین و سزایەکە بوو بۆ چاوانی خودا پەرست، لەسەردەمی خۆیدا بەوە ناسرا بوو کە کەسێکی گومڕایە، تەنهاش کاری لەسەر ماتماتیك و ئەستێرەناسی کردووە و ڕقی لە کتێبی خودا بووە و بەرهەڵستی کردووە، باسی لەوەش کردووە کە خراپەکاری لە گۆڕانی بەردەوامدایە و هیچ شتێك وەك خۆی بەردەوام نابێ و دۆخەکەی دەگۆڕیێ، مرۆڤیش وەك هەندێك لە ڕووەك و ئاژەڵ ، مردنی کۆتایی هەموو شتێکە....هتد".

ئیبن خەتیب لە کتێبی (الاحاطة في الاخبار غرناطة) باس لە هۆکاری دژایەتی نیوان ئیبن سائغ و ئیبن خاقان دەکات ودەڵێت "فەتحی کوڕی خاقان ڕۆژێك لە دەرباری ئەندەلووسدا زۆر شانازیی بەخۆیەوە دەکرد، بەڵام ئیبن سائیغ قسەکانی ئەوی بەدرۆ خستەوە و دژی وەستا، بۆیە بەهەموو شێوەیەك ئیبن خاقان و ئیبن باجە ڕقیان لەیەکتر بوو.

هەروا نووسینەکانی ئیبن باجە لەلایەن ئیبن ئەبوو ئەسبەعیەوە باسکراوە، وەك کتێبەکانی پزیشکی و ماتماتیك و دانایی و ڕوونکردنەوەی چەند کتێبێکی

ئەرستۆ سەبارەت بە سروشتزانی و رووداوەکانی کەش و چەند کتێبێك سەبارەت بە سەرەتا و کۆتایی و کتێبی ئاژەڵ، لەلایەکی دیکەوە ئەوە کتێبانەی کە ئیبن توفەیل باسی لێوە کردووە زۆرن و لەنێویاندا سەبارەت بە لۆژیك کە پارێزراوە لە کتێبخانەی ئەسکۆریال و لەتەك کتێبی دەروون و وتارێك سەبارەت بە تەگبیری یەکتاپەرستی و نامەی گەیاندن و نامەی ماڵئاوایی، لەنێوەندی ئەو وتارە و نامەیەدا باسی لەو کاریگەریانە کردووە کە کاریگەری لەسەر مرۆڤ هەیە و هاندانی عەقڵ بۆ بیرکردنەوە و لێکدانەوەی بوونی مرۆڤ و مەبەستی زانست کە هەردووکیان نزیکبوونەوەیە لەخوا و گەیاندنی بەعەقڵی کارا، لەلایەکی دیکەوە نووسەر باسی لە نەمردی خود کردووە، ئەمەش هەمان رێبازی ئیبن رووشدە کە بەفراوانی کاری لەسەر کردووە کە بنەمای یەکبوونی دەروونە، ئەمەش لەلایەن زانایانی نەسرانی گرنگیەکی ئەوتۆیی پێ دەدرا، بە شێوەیەك قەشە تۆما و ئەلبەرتی گەورە ویستوویانە کاری لەسەر بکەن و لەزۆر رووەوە چالاکیەکانی خۆیان بەو بابەتە ببەستنەوە.

پێدەچێ کاتێك وتار و نامەی ماڵئاوایی نووسیوە لەنێوەندی گەشتێکی درێژ بووە و ئەو وتارەی بۆ یەکێك لە قوتابی و هاوڕێیەکانی ناردووە تا ئاگاداری بۆچوونی دانایەکان بێت، ئەوەی وتاری ماڵئاوایی بخوێنێتەوە دەبینێ دەیەوێ وێنای فەلسەفە و زانست بکات، چونکە هەردووکیان شایانی ئەوەیە تا مرۆڤ هان بدات بۆ زانیاری وەرگرتن لەسەر سروشت، بەمەش دەتوانێ لەزۆر رووەوە بڕوا و باوەڕی پتەو بکات لەنێوەندی خود و عەقڵی کارا، گلەیی لە ئیمام غەزالی کردووە لەکاتێکدا خۆی بەرزگارکەر داناوە و باس لە دەروون و جیهانی ماقووڵیەت دەکات، کاتێك مرۆڤ دەچێتە نێوەندی خەڵوەت و راماندا وایدەبینێ، کە ئەو رامانە هەموو ئەوانەی لەسەر ئەو رێچکەن بەمەبستی دەزانن.

بەلام ئەو وتارە و نامەیەی کە ئیبن باجە بەناوی (تدبیر المتوحد) نووسیوە یەکێکە لەکتێبە بەسوودەکانی لەمەوەش ئیبن رووشد باسی کردووە کاتێك لە کتێبی عەقڵی هیولانی دەیخاتە روو بەمشێوەیەی خوارەوە: "ئەبو بەکری کوڕی سائغ پلانی یەکتاپەرستی بۆ ئەو نەتەوەیە بخاتە روو، بەلام تەواوی نەکردووە و زۆر شتیش تیایدا تارماییە، بۆیە لەشوێنێکی دیکە باس لە روونکردنەوەی نووسەرەکە دەکەین، چونکە ئەو یەکەم کەس بووە بەم رێڕەوەدا تێپەڕیووە و کەسی دیکە لەپێش ئەو دەستی لەو بابەتە نەداوە".
لەتەك ئەوەی وتار و نامەکەی کاریگەریەکی وای نەبووە، هەروا لەنووسینەکانی ئیبن رووشد شتێکی وای نەدرکاندووە لەگەڵ ئەوەی بەڵێنی داوە، کە بگەڕێتەوە سەری، بەلام یەکێك لەفەیلەسووفەکانی جوولەکە لەسەدەی چواردەم بەناوی مووسای زەبوونی باس و روونکردنەوەی سەبارەت بە وتارەکەی حەی کوڕی یەقزان کردووە.
پێدەچێ مەبەستی ئیبن باجە لەخستنە رووی وتاری (تدبیر المتوحد) ئەوە دەربخا کە توانای مرۆڤ بۆ سوودی ژیان و دوورکەوتنەوەیە لە خراپەکاریەکانی بە گەیاندن و هاتنەکایەوەی عەقڵی کاراوە بەندە، لەکاتێکدا کە هێزی هزری گەشەی کرد، بەلام ئیبن باجە بە هیچ شێوەیەك باس لە نەمری و رەهایی ناکات، بەلام جەخت لەوە دەکاتەوە مرۆڤ خۆی سەرقاڵ بکات تا دەگاتە کامڵبوون و ئاماژە بەوە دەکات کە پیاوێك بەرامبەر چەند پیاوێکە ئەگەر هزری بەهێز بێت، دەبێ مەبەستی هەبێ لەژیان کاتێکیش مەرجەکانی کامڵبوون هاتە دەست ئەوا ئەو پیاوە دەتوانێ هەموو وڵات هەڵسوڕێنێ، ئیبن باجە لەخستنە رووی ئەو بابەتە نەترساوە بەڵکوو جەختی لەوە کردووەتەوە پێویستە لەشارێکدا بژین کە زانست تیایدا بەرپا بووە تا بگەینە ئەو شارەی پرەیەتی

لەکامڵبوون چونکە چاکەکاری و دانایی بۆ راپەڕاندنی باشترین دەوڵەت، هاوکات ئەو وتارەشی دابەشی کردووە بەسەر هەشت بەشدا.

## پوختەی وتاری تدبیر المتوحد – کارکردن بەیەك ئاراستە

### بەشی یەکەم

مەبەستی شیکردنەوەی ئەو کتێبە کارکردنە بەیەك ئاراستە لەنێوان خەڵکی شاردا، مەبەستی لە وشەی تدبیریش کۆمەڵێك مانا دەبەخشێ کە بەمەبەستی واتایەکی زانراو بێ، تەنها کاری کەسێك نییە، ئەمە کۆمەڵە کارێکە لەیەك کاتدا جێبەجێ دەکرێ بەپێی ئەو پلانەی بۆی دانراوە تا بگەنە مەبەستێکی دیاریکراو وەك کارکردنی سیاسی و ئەزموون، لەم ڕووەوە باس لەوە دەکرێ کە خودای گەورە گەردوون بەڕێوە دەبات، ئەمەش وەك بەڕێوەبردنی حکومەتەکانە ئەم شێوەیەش بەپێی قسەی دانایەکانە، هیچ گونجاندنێك نییە تەنها لەمانا نەبێ بەڵام ماناکان جیایە، چونکە ڕێکخستنی بەکۆمەڵ بەپێی پلانێك بەڕێوە دەچێ و دوای بیرلێکردنەوە و لەپێش دەستپێکردن و بە ئەنجام گەیاندنیەتی، ئەمەش خەسڵەتێکی مرۆڤە.

دەبێ کارکردنەکان بەیەك ئاراستە یەکبخرێ وەك نموونەی حکومەتێکی تەواو، بۆیە نووسەر باسی کارکردنی سیاسیی کردووە و گوتوویەتی : لە نیشانەکانی حکومەتی تەواو و کامڵبوو پێویستیان بە گفتوگۆ و را گۆڕینەوە نییە، چونکە ئەوان ئەو خواردنانە ناخۆن کە خراپە، بۆیە هەموو نەخۆشییەکان لەنێوەندی

ئەو نەخۆشییە ون دەبێ، بەڵام ئەو گرفتانەی کە لەرووی دەرەکیەوە بەرەو مرۆڤ دێن کەم بێ یان زۆر خودی خۆی ونی دەکات، کاتێکیش خۆشەویستی و پەیوەندییەکان باڵا بوون و لەسەر بنەمای خۆشەویستی و رێز لێگرتن بوون لەنێوان خەڵکی یەك وڵاتدا ئەوا بەهیچ شێوەیەك ململانێ و پێچەوانەیی نایەتە ئاراوە و هیچ رکابەریەکیش لەنێوان هاوڕیان دورست نابێت، هەروا حکومەت تەواو و کامڵبوو و رێکخراو ئەوا تاك تیایدا شکۆی بەرز دەبێ و دەگاتە ئەو ئاستەی لەریزبەندی کامڵبوودا بێ، چونکە هەمووان بیر لەئاراستەیەکی دادپەروەرانە دەکەنەوە و بە وردی سەیری بوارەکان دەکەن، تاکەکان بەپێی یاسا و رێساکان لەکاردا دەبن و لەمەوەش تاك وەك زانایەکی لێدێ و دەزانی ئەم کارە دەکرێ یان ناکرێ و هەموو کارەکانیشی بەبێ هەڵە دەکا و رەوشت و ئاکاری جێگەی رێزە، ئەو کات هیچ کەسێك پێویستی بەپزیشکی دەروونی نابێت، ئەمەیش لەنێوەندی کۆمارەکانی ناتەواو دانییە وەك ئەرستۆکراتی و ئۆلیجکاریە و دیموکراتی و مۆنارکییەیە.

چونکە ئەوانەی بەیەك ئاراستە کاردەکەن لە حکوومەتە ناکامڵبووەکان وەك رووەك دەژی کە خودی خۆی گەشە دەکات و بەسروشتی خۆی گەشە دەکات، بەڵام جیایە لەوەی بەشێوەیەکی پیشەسازی گەشە دەکات.

ئیبن باجە سەبارەت بە شیکردنەوەی ئەم کتێبە جەخت لەوە دەکاتەوە کاراکردنی ئەو رووەکانەیە کە دەبێ بەپێی بنەماکانی کۆمارە کامڵبووەکان بێ کە پێویستی بەهەر سێ پزیشکی نییە وەك (پزیشکی دەروون و پزیشکی دورستکراو و پزیشکی لەش) چونکە تەنها خودایە هەموو شتەکان چارەسەر دەکات، لەلایەکی دیکەوە ئەوانەی دەیانەوێ بەیەك ئاراستە لەکاردا بن واتە تا لێرەدا زۆر جیا دەبێت، چونکە نە کۆمەڵە نە نەتەوە لەتەکیان نییە، بەڵام

خودی ئەوان بەرەو کامڵبوون هەنگاو دەنێن ئەوانەش ناویان لێ دەنرێ سۆفیگەرەکان یان نامۆیەکان چونکە ئەوانە لەرەچەڵەکدا لەتەك چاکەکارین، چونکە بەپێی ئەزموونیان کە لەوڵاتی خۆیاندا نامۆن دانایی وەردەگرن، لەمەوەش دەتوانن هزریان لەنێوەندێکەوە بگوازنەوە نێوەندێکی دیکە کە لەکۆتاییدا دەبێتە کۆمارێکی تەواوکرا، ئەمەش بۆ ئەوان لەدەروونیان وەك وڵاتێکی سەقامگیرە.

تێبینی: سەیری ئەو بابەتە بکە کە لەسەر فارابی نووسیومانە کاتێك باس لە پوختەی رووناکبیرەکان دەکات les anes bien nres .

## بەشی دووەم

ئیبن باجە باسی لە کارەکانی مرۆڤ کردووە، جەختیشی لەوە کردۆتەوە کاتێك جیاکاری لەنێوان کارەکان دەکەین بەمەبەستێك کۆتایی پێدێ، سەبارەت بەو کارە مرۆڤانەیە دەڵێت: لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵ پەیوەندیەك هەیە وەك چۆن لەنێوان ئاژەڵ و رووەك و رووەك و کانزاکاندا پەیوەندی هەیە، ئەوا کارەکانی مرۆڤ پەیوەستە بەخودی مرۆڤەوە چونکە بەپێی بیرکردنەوەی و رەهابوونیەتی و بەڵام جیای دەکاتەوە لە ئاژەڵ، ئەگەر پیاوێك بەردێکی شکاند و خۆی بریندار کرد ئەوا کارێکی ئاژەڵیانەی کردووە، بەڵام ئەگەر تەنها توانی بەردێك بشکێنێ بەبێ ئەوەی بریندار بێ ئەوا کارێکی مرۆڤانەی کردووە، ئەگەر شتێکی خوارد و خۆی پیس کرد ئەوا کارێکی مرۆڤانەیە، بەڵام لەروودا وەك ئاژەڵێکە.

مەبەستی سەرەکیمان لەم بابەتە ئارەزووە چەسپێندراوەکانە لە گیانی ئاژەڵدا، بەڵام کارە مرۆڤایەتیەکان بەرەو بۆچوون و رامان دەبات هەروا

چاوپێخشاندنەوەیەك بەوەی، کە بیرکردنەوە و هزر لەپێشەوەیە یان لەپاشترە لەنێوەندی کاریگەریی ئارەزووەکان، زۆربەی کارەکانی مرۆڤیش دەگەڕێتەوە بۆ چوار جۆر، کە پێشتر باسمان لەوە کردووە کە هەندێك کاری ئاژەڵییە و هەندێك کاری مرۆڤانەیە، کاتێك کە مرۆڤ بە ئاراستەیەك کار ناکات ئەوا کارەکانی ئاژەڵییە، کاتێکیش یەکێك بەپێی هزر و دادپەروەری کار دەکات بەبێ ئەوەی رووحێکی ئاژەڵیانەی هەبێ دەکرێ ئەوە ناوبنێن کە کارێکی خوداییە مەبەستی لەچاکەکارییە بەشێوەیەك دەروونی عاقڵ بۆ جێبەجێکردنی کارێکە، بەمەش رووحە ئاژەڵییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ رووح و گیانێك کە لە پێناویدا دورست کراوە، چونکە ئەم چاکەکاریە بۆ خستنەرووی رووحە ئاژەڵییەکەیەتی، بۆیە ئەوەی بەیەك ئاراستە لەکاردایە بەجیاکاری بە بەچاکەکار دانراوە، بەڵام جیاناکرێتەوە لە ئاژەڵ چونکە دەروونی بەپێی ئارەزووە ئاژەڵییەکانی لەکاردایە بۆ نموونە کاتێك هەراسان دەبێ هەڵسوکەوتی سەیر و سەمەرە دەکا بۆیە لەراستیدا دەگەڕێتەوە نێوەندی هەمان دەروونی ئاژەڵی، لێرەوە دەروونی عاقڵ ون دەبێ بەشێوەیەك دۆخی ئەو کەسە سروشتی نابێ وەك ئەوەی کەسێکە دۆخەکانی زوو زوو پێچەوانەی یەکتر دەبێ وەك ئەو کەسانەی کە تورە و توندن.

ئەو کەسەش هەمان دەروونی ئاژەڵی دەبێ و زاڵ دەبێ بەسەر دەروونی عاقڵ بۆیە بەدوایی ئارەزووەکانیدا دەگەڕێ، هەرکەسێکی رکابەریی لەگەڵ هزری خۆی بکات و پێچەوانەی بێتەوە ئەگەر مرۆڤیش بێ دەگەڕێتەوە بۆ سروشتە ئاژەڵییەکە و سروشتی خودی خۆی ون دەکات لێرەوەش دەتوانین بە رەهای پێی بڵێین ئاژەڵ، رێگەی باوەڕ ون دەکا و بەرەو گومرایی هەنگاو دەنێ، هەروا ئەوەی هزری مرۆڤایەتی هەیە و دەکرێ کارەکان خۆی چاك بکاتەوە بەڵام

نایکات، ئەو کات ئەمە مرۆڤ نییە، چونکە ئەو هەڵوەستەی کردووە بەپێی زیرەکیەکەی و خێر و شەڕ لەیەکتر جیا دەکاتەوە، بەلام دەبینی هەر لە پێڕەوی ئاژەڵدایە.

لەم دۆخەشدا دەبینی عەقڵی مرۆڤ زیاتر بەرەو شەڕ هەنگاو دەنێ بەلام وای دادەنێ کە خێری کردووە لێرەوەش سروشتی ئاژەڵی بەسەریدا زاڵ دەبێ.

زیرەکیش وەک ئەو خواردنە بە بەهایە کە پزیشک بۆ لەشی مرۆڤێک دایدەنێ، لەم رووەوەش بکرات دەڵێت "ئەم خواردنە ئازارەکان زیاتر دەکات" وەک کەوتنە خوارەوە بەشێوەیەکی سروشتی دەبێ و هەروا توانایەکی دەوێ لێرەوەش مەبەستەکان ئازاد نین، وەک چۆن کارە ئاژەڵییەکان بەبێ مەبەست دێنە ئاراوە، لەتەک ئەمەدا دەتوانین تواناکانمان رێکبخەین لێنەگەڕێن ئەم کارە رووبدا، بەلام کارە مرۆڤایەتییەکان بەبەردەوام بەپێی هێزمان دێتە ئاراوە بەو هێزە ئەوەی دەمانەوێ دەکرێ روو نەدا، دیارە بەهۆی ئەمەش پرسیار و هەڵئاوسان و دیارینەکراوەکانی کارە مرۆڤایەتییەکان دێنە کایەوە.

## بەشی سێیەم

لەلایەکی دیکەوە فەیلەسووف باسی لەلایەنەکانی عەقڵ و جۆرەکانی کردووە تا دوامەبەستی کەسی ئاراستەکراو دەربخات، هەروا ئەوەشی روونکردۆتەوە کە کاری پیاوێکی مرۆڤ بەهۆی هێزی عەقڵەوە دێتەکایەوە ئەو هێزەش بوونی هەیە بۆ مەبەستەکان ئەم مەبەستەش لەلایەنەکانی عەقڵە.

وشەی "عەقڵ" هەموو لایەک بەکاری دەهێنن وەک بەکارهێنانی دەروون و فەیلەسووفەکانیش وەک زاراوەیەک بەکاری دەهێنن هەندێکجاریش بە گەرمیەکی سروشتی و رووحی عاقڵ و رووحی داینەمۆ بەکاری دەهێنن، دەروونیش وەک

هێزێکی داینەمۆ ناوی دەبەن بۆیە عـەقڵ و دەروون دوو وشـەی هاوشـێوەی یەکترن وەك زاراوە. وشەی رووحیش چوارچێوەیەکی تایبەتی هەیە وەك پلەی دووەم، وەك رووحی عاقڵ و بەجۆش و خرۆش، هەندێکجار بە رووحی کەرەستە رەقەکان بەکاری دەهێنن کە کەرەستەی دیکە دەجوولێنێ، بەڵام ئەوە تەن نییە بەڵکوو لایەنەکانی دیکەی تەنن، بۆیە فەیلەسوۆفەکان بۆ ئەو کەرستانە وشەی رووح بەکار ناهێنن، زۆرجـار دەڵـێن "روحانی"یـە وەك وشـەی لـەش پەیوەستە بەلەشەوە، بەڵام عەقڵی کارا پێویستی بەوەیە ئەو ناوەی لێبندرێ، هەرکاتێك ماددە لە لەش دوور کەوتەوە، دەتوانین ناوی رووحانی لێ بنـێین، چونکە عەقڵی کارا باشترین شتە ئەو ناوەی لێبنرێ هەروا ئەو کەرەستانەی کە تەن و بازنە گەردوونیەکان دەجووڵێنێ.

لاینەکانی رۆحیش چوار جۆری لێك جیاوازن یەکەمیان تەنە گەردوونییەکان یان ئەستێرە، دووەمیان عەقڵی گشتی و عەقڵی خستنە روو و سێیەمیش عەقڵی هیولانی یان ماددی واتە لاینە ماقووڵەکان یان ئەو بیرۆکانەی لەسەر بنەمای شتەکانەوە بنیاتنراون، چوارەم ئەو بیرۆکانەی لەنێوەندی هێزی دەروونندا هەن یان سەلیقەیەکی ئاسایی لە خەیاڵ و لەیاد.

بەڵام جۆری یەکەم هیچ پەیوەندیەکی بەماددەوە نییە و دووەمیش لەخودی خۆیدا هیولانییە بەڵام پەیوەنـدی هەیـە بـەماددەوە، هـەروا جـۆری سـێیەم پەیوەندیەکی راستەوخۆی هەیە بە ماددەوە ناوی نراوە هیولانی چونکە ئەو شتانە دەگرێتەوە کە ماددی و ماقووڵن واتە روحانی نییە بەهۆی گیانیـەوە لەنێوەندی مـاددە هەیـە و لـەدەرەوەی لەشـدایە هـەروا هەنـدێك شـێوە کـە لەنێوەندی هێزی عەقڵدا دەمینێتەوە ئەمەش وەك خۆی دەمینێتـەوە لەبـەر ئەوەی دەبێتە هۆی پەیوەندی لەش لەپاشاندا لـەش کۆتـایی دێ و دەبێتـە

هێزێکی عەقڵی، روحانیەتیش تەنها پەیوەندی گشتی ناپارێزێ بەڵکوو پەیوەندی بەهەموو تاکەکانەوە هەیە و جۆری چوارەمیش لەنێوەندی ماقووڵبوونی هیولانی و لاینەکانی ماددیەتیدایە.

## بەشی چوارەم

هەندێك کار هەیە مەبەستی لەدوادا نییە تەنها شێوەیەکە بۆ لەش وەك خواردنەوە و خواردن و جل پۆشین و نیشتەجێ بوون، ئەم کارانە هیچ مەبەستێکی نییە تەنها ماددی نەبێ، مەبەستیش تەواوکاری شێوەی لەسەرە و ناکرێ پەراوێز بخرێت.

چونکە کارەکان مەبەستی گیانی لەپشتەوەیەتی ئەمەش بەهۆی سروشتی شتەکانەوە دەگۆڕێ وەك کەسانێك دەبینی خۆیان بە گەورە دەزانن (ا) کاتێك جلوبەرگێکی جوان دەپۆشن لەرووکەشدا بەڵام دەروون و پۆشینی ناخ پەراوێز دەکەن، ئەو چێژە هیچ پەیوەندیەکی بەئارەزووەوە نییە بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ هەستی ناخ کە شتێکی روحانی تیادایە، (ب) ئەو کارانەی ئاراستەکراوە بۆ نمایشێکی رووحی کە تەنها خەیاڵە و خۆی پێی پڕ چەك دەکا نەك لەکاتی جەنگدا، (ج) ئەو کارانەی کە مەبەست تەنها خۆشی و یاریکردن و خۆشگوزەرانییە وەك کۆبوونەوەی هاوڕێیان و خۆشەویستان و پەیوەندی پیاو بە ئافرەتەوە نەك بۆ وەچە نانەوە، هەروا جوانکاری لەنێو ماڵدا و رەوانبێژی و شیعر، (د) ئەو کارانەی مەبەستی کامڵبوونە لە عەقڵ و هزر وەك پیاوێك زانستێك دەخوێنێ تا ئەو زانستە تەواو بکات و دواتر سوودێکی ماددی وەدەست بێنێ، یان بەهۆی رێز و شەرمەوە کار دەکا بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی ئەنجامێکی مەبەستدار یان سوود وەرگرتن لەو کارانە.

بەلام ئەو کارانە دەبێ بۆ خودی خۆت بێ نەك تەنها بۆ پێکهاتەی شێوەی روحی مرۆڤ، لەتەك ئەمەشدا زۆرێك لەپیاوان کاتێك ئەو کارانە ئەنجام دەدەن مەبەستی ناوداری و شکۆداریە، پێیانوایە خۆشی پیاو لەوەدایە کە ناوی هەتا هەتا بمێنێتەوە، عەرەب گرنکیەکی زۆر بەیادکردنەوە دەدەن و شاعیرێکیان دەلێت "یاد کردنەوە تەمەنێکی دیکەیە".

ئەو کارانەی کە شێوەی رۆحانی هەیە بەو واتایە دێ کە هەموو لایەن و مەبەستەکانی لەنێوەندی کارەکانی پێشووتری بێ کە بەرجەستەیە بە لەش و رووحی رەها ئەمەش مەبەستی کۆتاییە بۆ ئەو کەسەی بەدوای خۆشگوزەرانی یان یەك ئاراستەدا هەنگاو دەنێ.

## بەشی پێنجەم

لەپاش ئەوەی کارەکانی مرۆڤایەتی دابەشکرد بەپێی لایەنە مەبەستدارەکان دانایەکەمان مەبەستەکانی کار بۆ شێوە تایبەتیەکانی دەگەڕێنێتەوە و گوتی لایەنەکان دەبنە سێ بەش:

شتەکان یان ئەوەتا پەیوەستن بە لایەنەکانی لەش یان بەلایەنە تایبەتیەکانی رووح یان پەیوەستن بە لایەنەکانی رووحانی گشتی، بەلام کاری لەش ئەوا مرۆڤ و ئاژەڵ تیادا هاوبەشە و لێرەدا شوێنی نییە.

روحانیەتی گشتی دەبێتە داینەمۆی مرۆڤ بۆ خەسلەتەکانی خەلقی و عەقلی و هەندێك ئاکار مرۆڤ لەئاژەلیشدا هەیە وەك ئازایەتی شێر و تاووس و سەگ، بەلام ئەو خەسلەتانە تایبەت نین بەهەندێك مرۆڤەوە بەلکوو خەسلەتێکە لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەلام بە جیاکاری هەندێك پیاو هەن وەك سەگن و هەمیشە ئاگادارن، بەلام هەموو ئەوانە بەچاکە بۆ پیاو لێك دەرێتەوە ئەگەر پیاوان بەشێوەیەك کاریان پێ کرد یان لەکاتی پێویستدا هەمان جووڵەیان کرد.

بەلام خەسلەت و سیفەتەکانی عەقڵ لەنێوەندی لایەنەکانی رووحی مرۆڤایەتیدایە و هیچ پەیوەندیەکی بە سیفەتەکانی دیکەوە نییە، چونکە لەراستیدا کاری عەقڵ و زانستەکان کامڵبوونی رەهایە کە بوونێکی تەواو دەداتە مرۆڤ، کەچی نمایشی رووحانی تاك تەنها بۆ رۆژگارێکە کە زۆرجاران بەهۆی ناوبانگیەوە سەرچاوە دەگرێ بەتایبەتی کاتێك بەهۆی عەقڵی بەراوردکاری دێتە کایەوە.

کاتێکیش باسەکان تەنها بەهۆی لەشەوە بوون ئەوا لەریزی ئاژەڵدایە کاتێك بوونی لەش ون دەکەیت وەك ئەوەیە دژ بەسروشت بیت، بەلام تەنها ئەو کاتانە دێنە کایەوە کاتێك مرۆڤ بەرگری لەئایین و نیشتمانەکەی دەکات، هیچ پیاوێك بەهۆی ماددەوە ناگاتە خۆشگوزەرانی ئەگەر نەگەیشتە ئەنجامی خۆشگوزەرانی رووحانی بۆیە دەبێ لەشی کردەوەکان بکات بۆ پێویستی چێژی لەشە، ئەو کاتەش لەپێناوی ئەودا کارە خودییەکان ئەنجام دەدات بەلام کارەکانی لەش هیچ پەیوەندیەکی بەرووحەوە نییە تەنها کاتێك ماقووڵ بێ لەدواتریشدا پەیوەست دەبێ بە ماقووڵی رەها کە بەهۆی لەشەوە توانیویەتی مرۆڤانە بێ و بەپەیوەست بوونیشی بەرووحەوە دەبێتە کەسێکی بەبەها و گەورە.

فەیلەسووف بەسروشتی مرۆڤێکی پڕ بەهاو گەورەیە بەمەرجێك هەر بابەتێك جۆرێك هەڵبژێرێ لەنێوەندی کارەکان و باشترین پڕ بەهای ئەو کەسەش تێکەڵبوونە بەهەموو چینەکانی خەڵکی و لەنێویان وەك شکۆدارێك دیار بێ، مەبەشتی کۆتاییش لەوە هەموو عەقڵە سانایەکان هەڵوەستە بکەن بەرامبەری بەو شێوەیە دەبێتە کەسێکی گەورە بەلام سیفەتە لەشیەکانی لێ جیا دەکەینەوە بەڵکوو وەك شکۆدارێم سەیر بکرێ بەبێ ئەوەی هێز بەکار بێنێت

کە لەپاشاکاندا هەیە هەموو ئەم خەسڵەتانەش بۆ ئەوەی کۆمارێکی تەواوکاری و کامڵبووە بەرجەستە بکات.

## بەشی شەشەم

لایەنەکانی رووحی تاك چوار جۆری هەیە: جۆری یەکەم گشتیە و جۆش و خرۆش و هەستەکانە، جۆری دووەم سروشتی و ئارەزووە، چونکە ئەوەی تینوو بێت بە دوای ئاودا دەگەڕێ، ئەوەی برسیشی بێ بەدوای خواردندا دەگەڕێ، بەگشتی بۆ تێرکردنی ئارەزووەکان هەمووان دەگەڕێن تا ئەو پێویستیە تێر بکەن، ئەم نمایشەش لەلەشەوە دەردەچێ چونکە ئەوەی تینوو بێ بەدوای جۆرێك لەئاودا دەگەڕێ واتە ئەوە توخمەی کە ئەو لەشە ئارەزوویەتی، جۆری سێیەم خستنە رووی رووحە کە لەهزەوە سەرچاوە دەگرێ یان بەهۆی رامان و ئەرگۆمێنت و روونکردنەوە دێتە ئاراوە.

جۆری چوارەم ئەو شتانەیە بەهۆی کاریگەریی عەقڵی کارا دێنە کایەوە، بەبێ هزر و ئەرگۆمێنتێك، لەو شێوەیەدا مەبەست لە سروشی پەیامبەرەکانە، تەنها خەونە راستەقینەکان راستگۆیانە دێنە ئاراوە، تەنهاش ئەمە بەرێکەوت نییە، هەردوو جۆری یەکەم هاوبەشە لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا، لایەنە پێویستەکانی ئاژەڵ، ئەمەش کامڵبوونێکی سروشتییە کە سروشت بەهەموو ئاژەڵەکان دەبەخشێ، ئەم حاڵەتەش تەنها بۆ ئەو زیندەوەرانەیە کە خوێنیان نییە وەك هەنگ و مێروولە، هەردوو جۆری کۆتایش لایەنەکانی رووحی مرۆڤە و لەنێوەندی لایەنەکانی رووحی تاکە و لایەنی ماقووڵە تەنها لایەنی تاك نییە بۆ تێرکردنی لەش و لایەنێك نییە بۆ روحانیەتی تاك وەك لایەنە هەستیارەکان و لەپووختەی ماددەدا نییە، تا بە گشتی وەسف بکەین وەك لایەنە ماقووڵەکان،

دەكرێ چاودێر سەبارەت بەشێوەیەك بڕوانێتە پلەی رووحانی و زیرەكی كە مرۆڤ پێی گەیشتووە.

## بەشی حەوتەم

ئەوەی بەیەك ئاراستەدا نابێ كار لەسەر لایەنەكانی رووحانی خودی خۆی بكات، چونكە ئەوە كۆتایی نییە تا بگاتە ئامرازی مەبەستە پێویستەكانی، هەروا نابێ تێكەڵ بەو لایەنە نەبێ كە لایەنی رووحی بەخۆیەوە ناگرێ، چونكە كاریگەری بەجێدەهێڵی ناگاتە خۆشگوزەرانی هەتا هەتایی.

ئێستا با گریمان بكەین پیاوێكی چاكەكار وەك مەهدی و كەسێكی خراپەكار وەك ئەبی دەلامە، هەر یەك لەمانە نمایشی بەرامبەر ئەوی دیكە هەیە، هەر نمایشێكی رووحی بۆ لەشە، بۆ نموونە نمایشی ئەبا دەلامە لەلایەن مەهدییەوە جێگەی سەرسوڕمانە بەپێی دركپێكردنی یەكەم كە خراپەكارییە، هەروا نمایشی مەهدی وا لە ئەبا دەلامە دەكات كە بڕوانێتە ژیان و سینگفراوانی، چونكە ئەبا دەلامە لێرەوە بەچاوێكی سووك لەنێوەندی سروشتدا خۆی دەنوێنێ، لەبنەڕەتیشدا سروشتی ئەبا دەلامە هەمان سروشتی مەهدییە، هاوكات سینگفراوانی و ژیان زۆر شكۆدارەترە لە پووچی، كاتێك بەو شێوەیە هەڵسوكەوت دەكات كەسەكە خۆی بەشكۆدار دەزانێ، كاتێك هزری شكۆداری بەخۆیەوە بینی، بۆیە كەسی رووخاو دەتوانێ بەكارە چاكەكانی ببێتە كەسێكی شكۆدار، لەتەك ئەمەشدا كەسی شكۆدار بەكارە خراپەكانی خۆی دادەبەزێنێ، دەكرێ بەو شێوەیە بەرەوە یەك ئاراستە هەنگاو بنێن، بەشێوەیەك كەسی خراپەكار دەتوانێ ریبگەیەنێ كە بەهۆی كارە چاكەكانی دواتری دەبێتە كەسێكی شكۆدار و ماقووڵ بەپێچەوانەوەش كەسی شكۆدار دابەزێ، بەو

شێویە کەسێك کە بەیەك ئاراستەدا هەنگاو دەنێ و کەسێکی پاکە و تێکەڵ بەخەڵکی نابێ چونکە وەك ئەرکێك نایەوێ پەیوەندی بە کەسی ماددیەوە بکات، چونکە تەنها مەبەستی لە رووحانیەتێدی رەهایە، هەروا وەك ئەرکێك پەیوەندی دەکا بە کەسانی زانستخواز، چونکە کەسانی زانستخواز لەهەموو شوێنێك نین، بۆیە کەسێك بەیەك ئاراستەی رووحی لەکاردابێ ئاوێتەی خەڵکی نابێ بۆ وەدەستهێنانی پێویستیەکانی، دەکرێ لەوان دووربکەوێتەوە چونکە لەپەچەڵەکی ئەوان نییە، هیچ کاتێك گوێ لەدرۆیەکانیان ناگرێ چونکە ئەو پێویستی بەدرۆ نییە، کاتەکانی خۆی لەنێوەندی ئەواندا بە فیرۆ نادا، بەڵکوو خۆی دەخزێنێتە نێو هەموو ئەو بابەتانەی کە فێری دەکات چۆن بتوانێ لەخودا نزیك بێتەوە و رۆژانەش شت فێر بێت، دەیەوێ دەروونی خۆی رووناك بکاتەوە و بتوانێ رووناکی و تیشك بەدەوروبەری ببەخشێت، یان دەچێتە ئەو شوێنانەی کە زانایانی تیادا کۆدەبێتەوە، هەروا دەیەوێ خۆی کامڵ بکات لەرووی ئایینیەوە و خۆی لەوانە نزیك دەکاتەوە کە پێشکەوتوون و خۆی دوور دەخاتەوە لەو گەنجانەی کە ئەزموونیان لەژیاندا کەمە، هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد پێچەوانەی زانستەکانی سیاسیەکان و زانستە سروشتیەکان نییە، چونکە کەسی مەدەنی پێیوایە ئەو دوو بنەمایە لەرووی تیۆرییەوە راستن، تا ئەو کاتەی پیاوان و کەسەکان لەرووی کامڵبوونی سروشتیەوە هەنگاو دەنێن، زۆرجاریش دووركەوتنەوە لە کۆمەڵگە خێری تیایە چونکە شەربەتی مێوژ و گۆشت خواردنی بەسوودن بۆ مرۆڤ، هەروا ئەفیۆن و تلیاك دوو شتن مرۆڤ دەکوژێ، بەڵام هەندێکجار ئەو دووانەی کۆتایی زۆر بەسوودن، زۆر جاریش خواردنی ئاسایی لەوانەیە مرۆڤ بکوژێ، ئەمەش پراکتیك دەکرێ لەسەر بەهانەوەچوونی دەروونەکان.

## بەشی هەشتەم

مەبەستی کەسێك بەیەك ئاڕاستەی ئاشنا بوون بەخودا هەنگاو دەنێ لەبابەت لایەنە ماقوولێ و کارەکان کە هەموویان لە عەقڵەوە سەرچاوە دەگرێ، دیارە ئەو کەسە تەنها بە رامان و خوێندن دەگاتە خود تا جەخت بە بوونی خۆی بکات، بە دەربڕینێکی دیکە بیروبۆچوون و هزر تا گەیشتن بە عەقڵی وەرگیراو کە لەعەقڵی کاراوە سەرچاوەی گرتووە، بەو شێوەیەش مرۆڤ لە خودی خۆی تێ دەگات وەك بوونێك.

هەروا ئیبن باجە باسی لە عەقڵی وەرگیراو و بەدەستهاتوو دەکات تا تێ بگات لە خودی خۆی و دەڵێت "عەقڵی کارا دابەش نابێ چونکە لایەنە تایبەتیەکان بەگشتی تەنها یەك رووحە و دابەش نابێ، چونکە نمایشی عەقڵی کارا وەك یەکەیەکە، زانستی ئەو عەقڵە یەکەیەکە بەلایەنەکانی جۆراوجۆرن، هەروا لایەنەکانی لەچەندان کەرەستەوە سەرچاوە دەگرن، لەراستیدا لایەنە بوونیەکان لەعەقڵی کارا نمایش و خستنە رووی بۆ گەیشتن و کارکردنە بۆ درکپێکردن ماقوولێ و عەقڵی بەدەستهاتوو، بۆیە مرۆڤ بەهۆی رووحی نزیکە لە بوونەکانی عەقڵی کارا، ئەمەش رێگر نییە لە عەقڵی بەدەستهاتوو وەك ئەوەی عەقڵەکانی دیکە شتێکی پێدەبەخشێ بۆ رامان و لێکدانەوە، بەمەش دەگاتە درکپێکردنی راستەقینە واتە هەستیاری بوونەوەرێك لەرووی سروشتی عەقڵەوە بەشێوەیەك لەکاردایە بەبێ ئەوەی دەربچێ لە حاڵەتی هێزدا، ئەمەش ئەو درکپێکردنە جیایەیە واتە عەقڵی کارا درك بە خودی خۆی دەکات ئەمەش دوا جووڵەیە".

خوێنەر دەبینێ ئەوەی ئیبن باجە خستوویەتیە روو زۆر بەروونی ئەو رێگەیە نابینێ کە ئەو جوولە مەزنەی پێ ئەنجام دەدرێ، هەروا چۆن لەنێوان عەقڵی مرۆڤ و عەقڵی کارای گشتی دێتە کایەوە، وەك بینیمان لە وتاری ماڵئاوایدا نا

چار بووە کە هێزێك بخزێنێتە سەر سەرووی سروشتەوە تا هەموو لایەنـەکان بەیەك بگەن، ئەوەی بینیمان لەلای ئیبن رووشد جۆرێکە لەتارمایی، هەروا ئیبن توفەیلێ لەنێوەندی ئەو کتێبانەی داناوە کە تەواونەکراون، بەڵام ئەوەمان زانی کە ئیبن باجە وەك فەیلەسووفێکی ئیسلام توانیویەتی جووڵەیەك پەیدا بکات دژ بە بزاڤی ئارەزووەکانی سۆفیگەری، کە غەزالی دایهێناوە، وەك ئیبن باجە باس لەوە دەکات کە "زانستی تیۆری تاکە رێگەیە تا مرۆڤ لەخودی خۆی تێبگات کە عەقڵی کارایە، هەروا ئەمەش لـەوتاری ماڵئاوایـدا خسـتۆتە روو بەشـێوەیەك لەسەر رێڕەوی ئیبن رووشد هەنگاوی ناوە".

## (روونکردنەوەیەك سەبارەت بە فەلسەفەی ئیبن باجە)

١-شێواندنی ناوەکەیی و ئەشکەنجەدانی

هەندێك لە ئەفرەنجیەکان ناوی (Avenpaca) و هەندێکیان ناویـان نـاوە (Avempaca) ئەمەش لەلایەن ئیبن سینا و (Averroes) و ئیبن رووشد باسکراوە کە باس لە دایکبوون و مردنەکەی دەکات و دەڵێت لەکۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچیی لەدایکبووە و لە سـەرەتای سـەدەی شەشـەم کۆچـیدوایی کردووە (٥٣٣ك) ئەم فەیلەسووفە بە گـەنجی کۆچـیدوایی کـردووە، نـازانین تاچەند بەهرەکانی کامڵ دەبوون ئەگەر زیاتر بژیایە.

لەگەڵ ئەوەی ژیانی کورت بوو بەڵام نموونەی ژیانی فەیلەسووفێك بوو، ئەو تووشی زۆرێك لە ئەشکەنجە و ئازار بووە لەلایەن خەڵکی کشتیەوە، زۆر جار ویستوویانە لەناوی بەرن بەڵام لەدەستیان رزگار بووە، ئەم چەوساندنەوەیەش بەهۆی هزر و ئەو شتانەی بۆیان هەڵبەستووە کە دژ بە سنووری باوەڕە ئایینیەکان جووڵاوەتەوە، ئەو لەپێش ئیبن رووشد دا بوو لەئەشکەنجەو چەوساندنەوەی چونکە ئەو لەلایەن نەزانن و بازاڕییەکان ئازار دەدرا.

٢-قوتابی و خوێندکار و شوێنی گۆڕەکەی

زۆرێك لە قوتابیانی ئەبی بەکری محەمەدی کوڕی یەحیای کوڕی سائغ هەبوون وەك قازی ئەبو وەلید محەمەد کوڕی رووشد، لەنێو قوتابیانیشی ئەبو حەسەن عەلی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی ئیمامی غرناتی کە نووسەرێکی بەتوانا بووە لە رووی زانست و ئەدەبدا، هاوڕێیەتی ئیبن باجەی کردووە و لەتەك ئەودا خوێندویەتی و لەکاتی مردنی ئیبن باجە لەساڵی (٥٣٣ك) ئامادە بووە لە ناشتنی، لەم رووەوەش بەڵگەی ئەبی مەروانی ئەشبیلیمان لەلایە کە گۆڕی ئیبن باجەی بینیووە لە شاری فاس کە لەتەك گۆڕی ئەبی بەکری کوڕی ئیبن عەرەبی فەقیە بووە، بەڵام ئەبو حەسەن عەلی خوێندکاری ئیبن باجە بووە و ئەمەو لە مەغریبەوە هاتووە و لە قوسی صەعیدی میسر لەنیوەی دووەمی سەدەی شەشەمی کۆچی، کۆچیدوایی کردووە.

٣-یەکێك لەقوتابیەکانی باس لەزیرەکی و زانستی ئەو دەکا

ئەبو حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئیمامی غەرناتی قوتابی و خوێندکاری ئیبن باجە کۆمەڵێك لە وتەکانی گواستۆتەوە و کۆیکردۆتەوە، کە فەرەنسیەکان ناوی

دەنێن cours لەسەرەتا پێشەکیەکەیدا واهاتووە کە "ئەم کۆمەڵە وتەیە وتەی ئەبووبەکری کوڕی سائغی خوالێخۆشبووە سەبارەت بە زانستەکانی فەلسەفی، کاتێک دەیخوێنیەوە هەست بەمانا پیرۆزەکانی دەکەی و لەسەردەمی خۆی دەگمەن بووە، ئەو کتێبە فەلسەفیانەی کە لەژێر دەستدا بوون لەئەندەلووس ئەمەش لەسەردەمی حەکەمی خەلیفە بوو، کە هەمان خەلیفە بوو زۆربەی سەرسوڕهێنەرەکانی رۆژهەلاتی کۆدەکردەوە، زۆربەی ئەو شتانەی گواستەوە کە بلیمەتە سەرەتاییەکان نووسیوویانە، هەردەم سەیری ئەو کتێبانەی دەکرد و ئیبن باجەش هەمان رێگەی گرتە بەر، زۆرێک لەو کتێبانەش لەپێشتردا لەنێوەندی ماناکانیدا بەلا رێدا دەبردرا، وەك چۆن ئیبن حەزمی ئیشبیلی ئەو کارەی دەکرد، بۆ ئەوەش سەیری دەکرد تا لەوشەکانی ئەو سەردەمە شتێك فێر بێت و خۆی بەجیا نیشان بدات.

کاتێك سەرقاڵی ئەو وتارانە بوون لەتەك مالیکی ئیبن وەهبی ئیشبیلی کە هەردووکیان هاوسەردەمی یەکتر بوون، مالیك سەرەتا سەیری دەروون و ماقووڵاتی کرد، دواتر ئەو پیاوە وازی لەو زانستە هێنا، چونکە زۆرێك داوایان کرد خوێنی بڕێژن، ئەویش لەهەموو گفتوگۆکاندا سەرکەوتوو بوو کاتێك بەرامبەری دەبوونەوە.

پێدەچێ خوێن رێشتنی و چەوساندنەوەی بەهۆی زانستە عەقڵی و فەلسەفییەکانی نەبوو بەڵکوو بەهۆی ئەو گفتوگۆیانە بوو کە هەردەم تیایدا سەرکەوتوو بوو، ئەمەش وای کرد زۆرێك رقیان لێ هەڵسێ، لەتەك ئەمەشدا ئیبن وەهیب کەسێکی فەیلەسووف نەبوو، چونکە لەنێوەندی وتەکانی هیچ جۆرە رووناکییەك نەدەبیندرا، لەپاشاندا ئیبن وەهیب وازی لە فەلسەفە هێنا و رووی لە زانستە شەرعیەکان کرد و تیایدا دەرکەوت.

بەڵام ئیبن باجە بەهۆی بەهرە گەورەکەی وازی لە سەیر کردن و ئەنجام و هەڵسەنگاندن نەهێنا بەهەموو شێوەیەك هەڵسوکەوتی کردووە بەپێی ئەو تێگەیشتن وچەمکانەی کە تیایدا سەرکەوتوو بووە لەسەردەمی خۆیدا.

٤–ئەو زانستانە ئیبن باجە تیایدا سەرکەوتوو بووە

ئیبن باجە لەرووی دەروونی و ماقووڵبوون و لەبەشەکانی سروشتی ئەوەی سەلماندووە کە هەردوو بوار لەیەك وێنەدان بەشێوەیەك تێکەڵ و کۆك دەبن، تا ئەو کاتەی کە کار تیایدا دەکرێ.

هەروا چەندان نووسینی هەیە سەبارەت بە ئەندازیاری و زانستی باڵایی و سەرکەوتوو بووە لەو هونەرەدا.

سەبارەت بەزانستی خوداییش شتێکی تایبەتی نییە کە ببێتە پسپۆڕی ئەو تەنها چەند وتەیەك بەهۆی کاردانەوە وتویێتی. ئەمەو لە وتاری ماڵئاوایی (الوداع) کە پێشتر باسمان لە گەینەرەکانی مرۆڤ کردووە کە پەیوەستە بەعەقڵی کارا، لەلایەکی دیکەوە زۆر بە پەرت و بڵاوی باسی لێوە کردووە ئەمەش بەو مانایە دێ کە بەپێی ئارەزوو و گفتوگۆکان گوتوویەتی سەبارەت بەو زانستە پیرۆزە کە زۆربەی زانستەکانیش لەبنەڕەتدا مەبەستیان کارە مەحاڵەکاە بووە، چونکە زۆربەی ئەوانەی لەسەردەمی خۆیاندا بەهرەدار بوونە دەیانویشت وڵات و کۆمەڵگە لەتاریکی بهێننە دەرەوە وەکچۆن ئیبن باجەش هەمان ڕێگەی گرتۆتە بەر.

٥-بەراوردێك لەنێوان ئەو و گەورە فەیلەسووفەکانی ڕۆژهەلات

لەپێشەکیەکەدا کۆمەڵێك بابەت خراوەتە ڕوو کە ئەبو حەسەن عەلی کوڕی عەبدولعەزیز کاتێك باس لە وتەکانی ئیبن باجە دەکات کاتێك تێیدەڕوانیت لەبالاترین ترۆپکی مرۆڤایەتییە و زۆریش بەکورتی ئاناژەی بە سیمایی درکپێکردن کردنی ئیبن باجەی کردووە لەڕووی زانستی خوداییەوە لەتەك زانستەکانی خوارتر، هەندێك لەمێژوونووسان پێیانوایە کە ئیبن باجە باسی لە زانستە خوداییەکان کردووە بەلام تا ئێستا نەیاندۆزیوەتەوە، باسیش لەوە دەکرێ کە ئەبو نەسری فارابی وەك ئەو بووە لەڕووی هونەرەوە، کاتێك لەنێوەندی زانستەکان باسی لێوە کردووە، ئەگەر وتەکانی بەراورد بکەین بە وتەکانی ئیبن سینا و غەزالی، تێدەگەین کە وتەکانی ئیبن باجە ڕوونتر دیارن بۆ تێگەیشتن وەك چۆن بەئاسانی لەوتەکانی ئەرستۆ و هەرسێ ئیمام دەگەین، لەتەك ئەوەی هەموو ئەمانە دانا بوونە لەسەردەمی خۆیاندا و وتەکانیان بۆ هەموو ڕۆژگارەکانی پێشتر جێگەی بایەخ بووە.

٦-سەبارەت بە نووسینەکانی ئیبن باجە

(١) ڕوونکردنەوەی کتێبی گوێگرتنی سروشتی ئەرستۆتالیس

(٢) وتەیەك سەبارەت هەندێك کتێبی بالای ئەرستۆتالیس

(٣) وتەیەك سەبارەت بەکتێبی گەردوون و گەندەڵی ئەرستۆتالیس

(٤) وتەیەك سەبارەت بەهەندێك وتاری کۆتایی کە لەمەڕی کتێبی ئاژەڵی ئەرستۆتالیس نووسراوە.

(٥) هەندێك وتە سەبارەت بەکتێبی ڕووەکی ئەرستۆتالیس.

(٦) وتەیەك سەبارەت جۆش و خرۆشی سروشتی و بەهاکانی

(٧) وتاری ماڵئاوایی (الوداع) ئەو وتانەی دواتر دێ

**(٨) کتێبی عەقڵی مرۆڤ**

**(٩) کتێبی تدبیر المتوحد**

**(١٠) چەند نووسینێك سەبارەت بەکتێبی ئەبی نەسری فارابی لەمەڕ دەروونەوە**

**(١١) چەند بەشێك fratgrnents سەبارەت بەسیاسەتی مەدەنیەت و چۆنیەتی شارەکان و دۆخی یەك ئاڕاستەکان تیایدا.**

**(١٢) چەند وتەیەك سەیارەت بەو بوارانەی کە دەکرێ هەڵوەستە بکەین لەمەڕ عەقڵی کارا**

**(١٣) کورتەیەك سەبارەت ئەندازیاری و باڵایی**

**(١٤) نامەیەك کە بۆ هاوڕێی ئەبی جەعفەر یوسفی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەسدای نووسیوە (پاش ئەوەی دەچێتە میسر)**

**(١٥) ئەو نووسینانەی داناین بەپەرش و بڵاوی دۆزراوەتەوە.**

**(١٦) وەڵامی بۆ پرسیاری ئەندازیاری ئیبن سەید موهەندیش و ڕێگەکانی**

**(١٧) چەند وتەیەك سەبارەت بە کتێبی دەرمانە تاکەکانی گالنیوس**

**(١٨) کتێبی هەردوو ئەزموونی دەرمانی ئیبن وافد کە ئەبو حەسەنی سوفیان بەشداربووە لەگەڵیدا لە نووسینی**

**(١٩) کتێبی پوختەی ئەلحاوی، رازی**

**(٢٠) چەند وتەیەکی مرۆڤایەتی باڵا**

**(٢١) چەند وتەیەك سەبارەت بەو بوارانەی کەدەکرێ هەڵوەستەی لەسەر بکرێ لەمەڕ عەقڵی کارا**

**(٢٢) چەند وتەیەك سەبارەت بە ناو و ناونراو**

**(٢٣) چەند وتەیەك سەبارەت بەبەڵگە و ئەرگومێنت**

(٢٤)چەند وتەیەك سەبارەت بە فەلسەفە

(٢٥)چەند وتەیەك سەبارەت بە ململانێی دەروونی و چۆنیەتی هاتنە کایەوە و لابردنی

(٢٦)چەند وشەیەکی هەمەڕەکی سەبارەت بەو شتانەی پزیشکین

لەنێوەندی ئەو کتێبانە تەنها دوو کتێبمان بەدەستگەیشتووە:

(١) کۆمەڵەیەك سەبارەت بە پزیشکی و سروشتزانی کە دانەیەکی لەبەرلین و ئەوی دیکەیان لە ئۆکسفۆردە

(٢) نامەی ماڵئاوایی (الوداع) کە بە زمانی عیبری شی کراوەتەوە.

## ٦-ئیبن توفەیل

ئەبوو بەکر محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی توفـەیلی قەیسی، یـەکێك لەگەورە فەیلەسووفەکانی ئیسلامە لـە ئەنـدەلووس و لەسـەرەتای سـەدەی دوانزدەهەمی زایینیی بەرامبەر (سەدەی شەشەمی کۆچی) لە (دۆڵە ئاش) کە یەکێکە لەشارەکانی غەرناتە لەدایکبووە، ئەو لە ڕووی پزیشکی و ماتماتیك و دانایی و شیعر ناودار بووە، بۆ ماوەیەك پۆستی نهێنی پارێزی فەرمانڕەوایی غەرەناتەی پێ دراوە، دواتر بووە بە پزیشك و وەزیـری مـیر یوسـفی ئـەبوو یەعقووب کوڕی عەبدولموئمین، کە دووەم ئەمیری خانەوادەی مەهدی بووە و لەساڵی ٥٨٠ك، کۆچیدوایی کردووە.

ئیبن خەتیب لەباسکردنی ئیبن توفەیل ئەوە دەردەخات کە زانستی پزیشکی لە غەرناتە فێر بووە و لەمبارەیەوە دوو کتێبی نووسیووە، هەروا عەبدولواحیدی مەراکشی کە پەیوەندی بە نەوەکانی توفەیل کردووە باس لەوە دەکات کە ڕێز وخۆشەویستی لەنێوان ئەو دانایە و میر زۆر مەزن بووە، باسیش لەوە دەکات کە بەچاوی خۆی چەند کتێبێکی بینیوە سەبارەت بە فەلسەفە و دەروونزانی و

شیعرکە بەدەستخەتی خۆیی نووسیوە، کاتێك ئیبن توفەیڵ لەنزیك میر بووە، ئەو هەلەی قۆستۆتەوە چەندان ناودار و دانایی سەردەمی خۆیی هێناوەتە کۆشك، هەروا هەر ئەو دانای ئەندلووس ئیبن رووشدی پێناساندووە، هەروا رۆژێك داوای لێ کردووە، کە زانیاری پێبەخشێ سەبارەت بەنووسینەکانی ئەرستۆتالیس تا شیکردنەوە و لێکدانەوەیان بۆ بکات، بۆ ئەم کارەش ئیبن توفەیڵ، ئیبن رووشدی بە میر ناساندووە، هەروا بەهۆی بەساڵاچوونی داوای لە ئیبن رووشد کردووە ئەو کارە بکات لەجیاتی ئەو، لەمەوەش ئیبن رووشد دەستی بە لێکدانەوە و شیکردنەوەی کتێبەکانی ئەرستۆی کردووە.

هاوکات ئیبن توفوەیڵ لەساڵی ١١٨٥ز، لە مەراکش کۆچیدوایی کردووە و مەنسووریش لە پشت تەرمەکەی رۆیشتووە.

لەنێوەندی کتێبەکانی ئیبن توفەیڵ تەنها یەك کتێب ماوە، کە بەناوی (حي بن يقظان)، کەچی کازیری ناوە ناوە (اسرار الحكمە المشرقيە-نهێنی دانایی رۆژهەلاتییەکان) کە هەمان کتێبە، هەروا ئیبن ئەسبەعییە لە توێژینەوەی سەبارەت بە ئیبن رووشد باس لەوە دەکات کە ئیبن توفەیڵ چەند کتێبێکی دیکە هەیە وەك کتێبی (في البقع المسكونه و الغير المسكونه) هەروا ئیبن رووشد جەختیش لەوە دەکاتەوە کە لەرووی زانستی ئیلاهیات ئیبن توفەیڵ کتێبی (دوانزدەهەمی) هەیە، لەوێدا زانیاری بەنرخی سەبارەت بە تەنە دەرەکی و ناوخۆییەکان هەیە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئیبن توفەیڵ زانیاریەکی فراوانی هەبووە سەبارەت بە گەردوون، لەمبارەیەوەش ئەبوو ئیسحاقی بترۆجی گەردووونناسی ناودار لە پێشەکی کتێبەکەی سەبارەت بە گەردوون، جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئیبن توفەیڵ ویستوویەتی تیۆرەکانی بەتلیمۆس بگۆڕێ.

"براکەم ئەوە بزانە کە مامۆستا و قازیمان ئەبا بەکری کوڕی توفەیڵ گوتوویەتی بەپێی سیستەمی گەردوونی ئەو جوولانە، ئەوا بەپێی سیستەمی بەتلیمۆس هەنگاو نانرێ، لەلایەکی دیکەوە ئەو چەند شتێکی نوێی دۆزیبۆوە وەك تەن و بازنە دەرکی و ناوخۆییە، هەروا ئەو سیستەمە بەبێ هەڵە جوولە دەکات، لێرەوە بەڵێنمان داوە کە کتێبێك لەو رووەوە بخوێنین، ئەمەش سەیر نییە چونکە زانستێکی زۆری پێیە".

یەکێك لەو کتێبانەی کە دەیسەلمێنی ئیبن توفەیڵ خۆی سەرقاڵ کردووە بە فەلسەفە ئەوا بەشێوەیەکی خەیاڵی لەو سەردەمە باسکراوە، لەو کتێبەش ئەوەش بەدەردەکەوێ کە ئەو یەکێك بووە لە رۆژهەڵاتییەکان، هەروا لەرێگەی رامان و لێکدانەوە گرفتە گەورەکان چارەسەر بکات کە هەموو دانایان پێوەی خەریك بوونە ئەمەش پەیوەندی بە دەروونی مرۆڤە هەیە سەرەتاش پەیوەندی بەعەقڵەوە هەیە، ئەو رەزامەند نەبوو بە بۆچوونی غەزالی کاتێك باس لە تەسەووف دەکات، بەڵکوو لەسەر رێڕەوی ئیبن باجە هەنگاوی نا، لەمەوەش گەشەی هزری مرۆڤایەتی پلە بەپلە بەدەرخست، هەروا ئیبن توفەیڵ پێی وایە ئەو بوونەوەرە سەرەتا هیچی لەژیان نەدەزانی بەڵکوو بەهۆی عەقڵەوە و وەك تاکێکی رەها، هزری بەرەوە پێش چوو، بەهۆی عەقڵی کارا توانی لە نهێنییەکانی سروشت بگات و زۆرێك لە گرفتەکانی بابەتی ئیلاهیات روون بکاتەوە، ئەمە لەکتێبی (حی بن یقظان) باسی کردووە، لەپاشاندا دێین لێکدانەوە بۆ فەلسەفەکەی دەکەین.

ئیبن توفەیڵ گەردوونناس و ماتماتیکزان و پزیشك و شاعیر بوو، هەروا لەرووی پەخشانەوە دەربڕینەکانی بەجۆش و خرۆش و نەرم و نیان بوون، ئەمەش بەهۆی میر یوسف کوڕی عەبدولموئمینەوە ئەو بەهرانەی بەدرەخست، کاتێك

عەبدولموئمین لەسەردەمی ئەودا دەژیا داوای لە ئیبن توفەیل کرد وەك وەسیەتێك لەدوای خۆی محەممەدی کوڕی دابندرێ، ئیبن توفەیل خۆی موبایەعەکەی بەنێو ولاتدا گێرا، تا کوڕەکەی ببێتە میر، کاتێك میر یووسف کۆچیدوایی کرد، ئەمە بۆ محەممەدی کوڕی نەهاتە ئەنجام، چونکە براکانی میر یووسف لایان برد، دواتریش میر درایە یەکێك لەبرایەکانی یوسف کە ئەبوو یەعقووب یووسفی کوڕی ئەبوو محەمەد عەبدولموئمینی عەلی قەیسی خاوەنی مەغریب، بەم شێوەیە خەڵك موبایەعەی کرد.

میر یووسف کەسێ بوو دەیزانی زمانی عەرەب و وشەکانی عەرەبی چۆن بەکاردەهێندرا لەسەردەمی جاهیلی و ئیسلامدا.

ئەمەش بەهۆی ئاگادار بوون لە هەموو زانا و دانایانی ئیشبیلیە لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتیدا، باسیش لەوە دەکرێ ، کە هەموو صەحیحی بوخاری ئەزبەر کردووە و هەروا قورئانی پیرۆزیشی لەبەر کردووە، لەتەك هەندێك فەقیهیەکان ئارەزووی لەوە بووە ببێتە دانایەك، دیارە بۆ ئەمەش سەرەتا بەزانستی پزیشکی دەستی پێ کردووە و کتێبەکانی فەلسەفە و حیکمەتی کۆکردوونەتەوە.

لەنێوەندی ئەو زانایانە ئەبو بەکر محەممەدی ئیبن توفەیل لەتەك میردا بووە، ئەمەو ئیبن توفەیل کەسێکی کراوە بووە لەهەموو بەشەکانی دانایی، ئەمەو ئیبن خەلەکان لە بەرگی دووەم و لاپەڕە ٣٧٤ باس لەوە دەکات کە ئیبن سائغ بەهەمان شێوەی ئیبن باجە ناسراو بوو، ئەمەش وایکرد ئیبن توفەیل کتێبی ئەو وەرگێڕێ، بەڵام ئەمە راست.نییە، بەلام بەدەقێکی رووت ئیبن توفەیل لەنێوەندی کتێبەکانی ناوی دێ لە لاپەڕە ١٠١ و ئیبن توفەیل هەردەم جەختی لەکۆکردنەوەی نێوان زانستی شەریعە و دانایی دەکردەوە و لەم بارەیەوەش

بلیمەت بوو، لەنێوەندی زانایەکانیش لەهەموو ولاتان تەنها ئەبوو وەلید محەممەد ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی رووشد باسی کردووە، ئەمەش لەتوێژینەوەی ئیبن رووشد بەدرێژیی باسی کراوە.

فەلسەفەی ئیبن توفەیل لەشێوەی پرسیار و وەلامدا خۆی دێنێتە پێش، وەك کاتێك یەکێك لەبرایەکانی پرسیاری لێ کرد، بێگومان ئەمەش لاساییی ئیبن سینا و غەزالییە، کە تیایدا هاتووە:

"برای بەڕێزم خوا بۆمانت بهێڵێ و دەست بەباڵتەوە بگرێ و خۆش بەختت بکا، داوات کردبوو باس لە نهێنینییەکانی رۆژهەلات بکەم، کە شێخی ئیمام ئەبوو عەلی ئیبن سینا باسی کردووە، بەلام ئەوە بزانە ئەوەی ویستی هەق بێتە ئاراوە، ئەوا هیچ گرفتێك نییە و زۆر بە جددی با داوای بکات و با بەدەستی بهێنێ".

## ئەو دۆخەی کە ئیبن توفەیل هەستی پێ کردووە

لەنێوەندی پرسیارەکانت پەخشانێکی پاك منی بزواند، پەنا بەخوا پێش ئێستا شتی وام نەبینیوە، ئەوەندە سەیر بوو، کە زمان ناتوانێ وەسفی بکات، روونیش ناکرێتەوە وەك ئەوەی بە شێوەیەك گەشەی کردبێ لە جیهانی ئیمەدا نە بێت، ئەم دۆخەش خۆشی و خرۆشی دەبەخشێ، کە ناتوانین بگەینە ترۆپکی، بۆیە یان ئەوەتا نەیدرکێنین یان نهێنیەکەی بپارێزین، وەك ئەوەیە جۆرێك لەچالاکی پێبەخشیوی کە دەتگەیەنێتە خۆشی، بۆیە پێویستە بیدرکێنین بەبێ ئەوەی هەموو ناوەڕۆکەکە بلێین، ئەگەر زانستەکان رەشی نەکاتەوە، ئەوا بەدرکاندنی چەندان پیتە و کەسانی بەرامبەری بەپیتی دیکە وەلامیان داوەتەوە.

هەروا شێخ ئەبوو حامدی غەزالی کاتێك گەیشتووەتە ئەو دۆخە، گوتوویەتی: هەموو ئەو شتانەی کە بیرم نایەتەوە، وابزانە خێرێکە و پرسیار لەوانی دیکەش مەکە.

## فەلسەفەی ئیبن باجە لە بۆچوونی ئیبن توفەیلدا

ئەبوو بەکری کوڕی سائیغ لەنێوەندی قسەکانیدا باس لەیەك ئاراستەیی و گەیشتنە بە سیفەتی گەیەندراو، لەمبارەیەوە دەڵێت "ئەگەر مانای مەبەستدارەکە تێگەیشتی، ئەوا هەموو زانستەکان پلەیەك دەبەخشتە باوەڕەکان کە بەشێوەیەك هیولانی نییە، لەپیناو ئەوەی بچیتە ریزی ژیانێکی سروشتیەوە، ئەمەش بەشێکە لەدۆخەکانی خۆشگوزەرانی، بەمەش دەڵێن ئەوا خودا گەورە هێناویەتیە ئاراوە بۆ هەموو ئەوانەی کە بەندەی ئەون". ئەم پلەیەش کە ئەبووبەکر گەیشتوویەتی بەشێوەی زانستی تیۆری گەیشتووە پێی، بەڵام نەیتوانیوە زیاتر بڕوا و هەنگاو بنێت.

## مەبەستی ئیبن توفەیل بە درکپێکردنی خەڵکی زانستخواز و تانەدان لە ئیبن باجە

مەبەستمان لەدکپێکردن، درکپێکردنە لەو شتانەی کە لەپشت سروشتەوە هەیە، وەکچۆن ئەبو بەکر درکی پێکردووە، دەبێ ئەو درکپێکردنەش راستەقینە بێ، ئەو کات زانستخواز و درکپێکراوەکان و خەڵکی شار گرنگی بەو شتانە دەدەن، ئەمەش بۆ زیاتر روونکردنەوەیە، ئەبوو بەکر باسی چێژی کردووە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە هێزێکی خەیاڵییە، ئەمەش دۆخی خۆشگوزەرانەکانە، ئەمەش بەپێی قسەی شیکەرەوەکان، هەروا دەکرێ بڵێن

"شتێك مەخۆ ئەگەر تامت نەكردبێ، ملی هیچ هاوڕێیەكیش مەگرە". ئەگەر كەسەكە هیچی نەكردبێ، ئەگەر بەڵێنشی دابێ، لەوانەیە ئەو كارەی نەكردبێ، چونكە كاتەكە كەمە، ئەمەش لەنێوەندی ئەو شتانە دێ كاتێك باس لەخۆی دەكات كە هەندێكی درۆیە و دەیەوێ پارەیەكی زۆر پەیدا بكات، ئەمەش ڕووی فێڵاوی ئەو دەردەخات.

ئەوانەی پێشتر هاتوون وەك ئەبوو بەكری سائیغ نەیانتوانیوە وا ڕاستگۆیانە قسە بكەن، بەڵام كاری دونیایی لێنەگەڕاوە گەنجینە زانستییەكانی بەدەر بخات وەك كتێبی (تدبیر المتوحد) ئەو شتانەی سەبارەت بە زانستی لۆژیك و سروشت، بەڵام كتێبە تەواوكراوەكانی چەند كتێبێكی كورتە لەتەك چەندان بابەتدا، خۆیشی بەهەمان شێوە باسی لەمەبەست و ئەرگۆمێنتەكان كردووە لە كتێبی (رسالە الاتصال) چونكە لەهەندێك باسدا وازی نەهێناوە تاوەكو تەواوی كردووە، ئەگەر كاتیشی هەبوایە ئەوا دەیگۆڕی، بەو شێوەیە ئەو پیاوە گەیشتۆتە لای ئێمە، تەنها كەسێك كە هاوسەردەمی بووە ئەوا ئەبو یوسفە كە هەمان پلەی ئەوی هەبووە بەڵام هیچ نووسینێكی ئەومان نەبینیوە.

## ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەی فارابی و زۆرێكی دیكە

## بە پێنووسی ئیبن توفەیل

ئەوانەی كە هاوسەردەمی ئێمەن، ئێستا ژمارەیان زۆرە بەڵام دەبێ هەڵوەستە لەكامڵبوونیان بكەین، چونكە تا ئێستا ڕاستی كارەكانیان بەتەواوی نەگەیشتۆتە دەستمان، كتێبی ئەبوو نەسری فارابی گەیشتووەتە دەستمان زیاتر باس لە لۆژیك دەكات، ئەو فەلسەفانەی كە خستویەتیە ڕوو گومانی زۆر تیایە، ئەمەو لە كتێبی (الملـة الفاضلـة) باس لەمانەوەی ئەو دەروونە خراپەكارانە دەكات لە پاش مردن و جەخت لەوە دەكاتەوە كە كۆتایی نایەت،

دواتر باسی لە سیاسەتی مەدەنیەت کردووە کە بەرەو رەهەندی رووخان هەنگاو دەنێ و نامێنێ و هیچ کاتێك دەروونە تەواوەکان بوونیان نامێنێ، لەلایەکی دیکەوە لەکتێبی (الاخلاق- ئاکار) باسی لەشتێکی خۆشگوزەرانی مرۆڤایەتی کردووە، لەپاشاندا چەند قسەیەکی کردووە کە ئەمە مانایەکەتی "هەموو ئەوانەی باسی کردووە شتی سەیر و سەمەرە و ئەفسانەی پیرەکانن". دیارە ئەم قسانەیش هەموو لایەکی بێ ئومێد کردووە، بەشێوەیەك چارەنووسی هەمووان نەمان و پووکانەوە بێ، ئەمەش بەبڕوای خۆی وا وتووە و هێزی خەیاڵی تایبەت بەخۆیەتی، بەشێوەیەك هاتووە باسی لەفەلسەفە کردووە، کە پێویستیمان پێی نییە (بگەڕێوە بۆ بابەتی روونکردنەوە سەبارەت بەفەلسەفەی فارابی و دەقەکانی ببینە).

## رەخنە لە فەلسەفەی ئیبن سینا

ئەوەی ئەرستۆتالیس نووسیووەیەتی ئەوا شێخ ئەبو عەلی دەربڕینی خۆی تیایدا دەربڕیووە، بەمشێوەیەش هەمان رێگەی گرتووە بەتایبەتی لەرووی فەلسەفیەوە لە کتێبی (چارەسەر-شفا) لەیەکەم کتێبیش ئەوەی باسکردووە کە ئەو کتێبەی بەهەمان رێڕەوی پێشووتر نووسیووە بەشێوەیەك ئەوەی راستی بوێ دەبێ هەوڵی بۆ بدات تا دەگاتە راستی بە تایبەتی لە فەلسەفەی رۆژهەلاتی، کاتێك کتێبەکانی ئەرستۆتالس دەخوێنییەوە هەمان کتێبی (چارەسەر-شیفا)ی ئیبن سینایە بەو واتایەی ئیبن سینا هاتووە هەموو شتەکانی ئەرستۆی وەرگرتووە و شتێکی نوێی نەنووسیوە لەکاتێکدا هاتووە هەندێك بابەتیشی بەلارێدا بردووە و نەهاتووە نهێنینەکان ئاشکرا بکات هەروا نەگەیشتۆتە کامڵبوون کاتێك کتێبی چارەسەر-شیفا دەخوێنیتەوە.

## ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەی غەزالی

ئەوەی کە ئەبی حامد غەزالی نووسیوویەتی کاتێك قسە لەگەڵ جەماوەر دەکا، لەهەندێك شوێندا بابەتەکان بەیەکتر دەبەستێتەوە و لەهەندێك شوێندا لێکی دادەبڕێنێ و دواتریش هەندێك شت بەگومڕا ناو دەبات، بەو واتایەی ئەو گومڕیانەیە کە فەیلەسووفەکان باسیان لێوە کردووە، بەتایبەتی لە کتێبی التهافت —وڕێنە باس لەوە دەکات کە لەش و دەروونەکان سزا نادرێن لەدونیای ئەودیودا، هەروا لەیەکەم کتێبی بەناوی (المیزان—تەرازوو) باس لەوە دەکات کە بڕواکانی هەمان بڕوای شێخەکانی سۆفیگەرییە، لەلایەکی دیکەوە لە کتێبی (المنقذ من الضلال و المفصح بالاحوال) باس لەهەمان باوەڕ دەکات کە وەك شێخەکانی سۆفیگەرییە، بۆیە بەدرێژایی دۆخەکە لەهەمان خاڵدا دەسوڕێتەوە، هەروا کتێبەکانی دیکەی کاتێك سەیری دەکەی بەتایبەتی لەدوا کتێبی (المیزان العمل—تەرازووی کار) وای باس کردووە کە بۆچوونەکانی بۆ سێ بەش دابەش دەبێت، بۆچوونێکی بەشداریکردنە لەبۆچوونی جەماوەر، بۆچوونێکی دیکەی بەپێی قسەی ئەو کەسە بێ کە ڕێنمایی دەدا، لەتەك بۆچوونی ئەوەی کاتێك کەسێك شتێك دەزانێ با لەهاوڕێ و هاوبەشەکانی نەڵێت، تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە هەمان باوەڕیان هەیە، لەپاشاندا دەڵێت "ئەمجۆرە قسانە تەنها گومانێکن، بەشێوەیەك ئەوەی گومان ناکات ناگۆڕێ، بۆیە وەك ئەوەی هیچ نابینێ، ئەوەی هیچیش نەبینێ وەك کوێر وایە"، هاوکات لەدێڕە شعرێکدا بەو واتایە دێ و دەڵێت :

ئەوەی دەبینی و گوێبیستی دەبی تاوتۆی بکە، لە ڕۆژهەڵاتندا زوحەل نابینی.

لەلایەکی دیکەوە لە کتێبی (الجواهر) باس لەوە دەکات کە ناوەڕۆکەی هیچ پایەیەکی نییە، ئەوەی ئێمەش بزانین ئەو کتێبە نەگەیشتۆتە ئەندەلووس بەڵام

لەدووتوێی ئەو کتێبەدا زیاتر باس لەهەق دەکات، بەڵام خەڵکێك باس لـەوە دەکات ئەو کتێبە گەیشتووە بەڵام هەمووی جێگەی گومانـە، بـەڵام وانییـە، بەڵکوو کتێبی (العارف و العقلیە) و (النخ والتسویە) و (مسائل المجموعە) ئەم کۆمەڵە کتێبەش هیچ شتێکی دیکـەی نـەگوتووە لەتـەك ئەوانـەی گـوتراوە، لەلایەکی دیکەوە لە کتێبی (المقصد الاسنی) دەبینی تارماییەکان زیاترە، بۆیە بەهەموو شێوەیەك گومان لەو کتێبانە دەکات، لەتەك ئەمەدا هەندێك باس لەوە دەکەن کە ئەو کتێبانە کاری مەزنن بەشێوەیەك رێگەی رووناك کردووەتەوە بۆ ئەوانەی داهاتوو، ئەوان زیاتر باس لـە یەکتاپەرسـتی دەکـەن، بەشـێوەیەك هەموو گومڕاکارەکان لەبەردەم خودادا هیچ توانایەکیان نییە، ئەمەش شتێکی نوێ نییە، بەڵکوو هەمان قسەی ئەوانەی پێشووترە، لەلایەکی دیکەوە هەموو ئەو کتێبانەی کە جێگەی گۆمانن نەگەیشتۆتە دەستمان.

## دەستێکی فەلسەفەی ئیبن توفەیل

سەبارەت بە وتاری (اسرار الحکمە المشرقیە–نهێنی دانایی رۆژهەڵات)

ئێمە بەدوای راستیەکاندا ویڵین کاتێك کە سەیری وتار و باسەکانی غـەزالی و ئیبن سینا دەکەین، لەتەك ئەو بۆچوونانەی کە لەم سەردەمەدا خۆی دێنێتە پێش، هەورا وەڵامی ئەو کەسانەی کە خۆیان بە فەلسەفەوە خەریك کردووە و شتێکی وای لەبارەیەوە نازانن، بۆیە دەستمان بەتوێژینەوە کرد سەرەتا دەبێ ئێمە پرسیار بکەین و هەموو ئەوانەمان لێکدایەوە کە لامان راستە، گەیشتینە لێکدانەوەیەك، ئێمەش بۆ مەبەستی خۆمان بەکارمان هێنا، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە بەتەواوی قسەکانمان قبووڵ بکرێ، بەتایبەتی کاتێك باس لە پلـە باڵایـەکان دەکـەین، ئێمـە دەمانـەوێ ئـەو پرسـیارانە بکـەین کـە لـەرووی

بینینەکانمان بەدەرمانخستووە و بەچاوێکی روونەوە بڕوانینە هەموو ئەو شتانەی کە بینیوومانە، بەلام واز لەو زانیاریانە بێنە کە ئێمە پێتی رادەگەیەنین، کاتێك تۆ لەهونەرێکدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت بۆ بەیانی هەموو هەوڵەکانت دەدوریەوە چونکە هەست بەوە دەکەی هەموو بەتوانا و هەوڵەکانت هاتۆتە دی، دیارە هەموو ئەمانە سەرەتایەکە بۆ جۆش و خرۆشی و چوونە نێوەندی رێگەکەوە، بۆیە منیش چیرۆکی (حەی کوڕی یەقزان و ئەبسال و سلامان)ت بۆ باس دەکەم کە پەندێکە و دەبێتە یادگاری بۆ هەموو ئەوانەی گوێیان لێ بووە.

## (روونکردنەوەیەك سەبارەت بە فەلسەفەی ئیبن توفەیل)

(۱)

فەلسەفەی ئیبن توفەیل بوونی هەیە لەنێوەندی کتێبی (اسرار الحکمە المشرقیە-نهێنی دانایانی رۆژهەلات) کە هەمان وتارە بەناوی (حەی کوڕی یەقزان) ئەوانەی چاویان بەفەلسەفەی ئیبن توفەیلدا خشاندووە وا هەست دەکەن کە کورتەی فەلسەفەی ئیبن سینایە، ئەمەش هەڵەیە چونکە خودی خۆی خاوەن فەلسەفەیە، وەك چۆن هاتوون توێژینەوەمان لەبارەی بۆچوونەکانی کردووە سەبارەت بە فارابی و غەزالی و ئیبن سینا و ئیبن باجە، بینیمان ئەم فەیلەسووفە ئەندەلووسیە رێگەیەکی بۆ فەلسەفەکەی دیاریی کردووە و جیایە لە بۆچوونی هەمووان، بۆ ئەمەش توانیویەتی رێبازێك بۆ خۆی دابنێ وەك فەیلەسووفێکی ئیسلامی، شێوەی خستنە رووی فەلسەفەکەشی بەشێوەی چیرۆك باس کردووە، جۆرێکی بەکارهێناوە کە باس لەیەکێك دەکات و ئاوێتەی سروشت و تەن و کائینەکان دەبێ، هەروا باسی لە پلەکانی رەق و

رووەك و ئاژەڵ و خاڵی درکپێکردن و چۆنیەتی گەیشتن بۆی کردووە، بەشێوەیەك چیرۆکێکی خەیاڵییە بەشێوەیەك لەنێوەندی عەقڵدا چنرابێ، بۆ ئەمەش زۆرێك لەنووسەرانی بیانیەکان لاساییان کردۆتەوە.

(٢)

هەر ئەو فەیلەسووفە سەبارەت بە پێشینە چاکەکارەکان زۆری زانیوە بەتایبەتی لەیەکێك لەدوورگەکانی هیندستان و لەژێر هێڵی گەرمەسێر، بەو واتایەی کە لە وێدا مرۆڤ بەبێ دایك و باوك لەدایك دەبن و لەوێدا درەختێکی لێیە وەك ئافرەتان بەرهەمی هەیە، ئەم قسەیە بەراوردکردنێکە لەنێوان مێژووی مرۆڤ لە ئادەم و حەواوە، لەتەك ئەوەی هەموو ئایینییەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە رەچەڵەکی مرۆڤ لە پیاو و ئافرەتێکە کە خودا دروستی کردوون، هیچ کام لە زانایانی ئایینی باسی لەوە نەکردووە کە مرۆڤ لەنێوەندی زەویدا دێتە دەرەوە، بۆیە ئەم قسەیە کە لەلایەن ئیبن توفەیلەوە گوتراوە بەشتێکی سەیر و سەمەرە دادەنرێ، چونکە ئەو کەسێکی دانا و موسڵمانە و لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاوە، هەروا ئیبن توفەیل لەپاش ئەوەی باسی لەگەرمی کردووە بەهۆی جوولەوە و نزیکبوونەوەی تەنە گەرمییەکان و هاتنە کایەوەی رووناکی، هەموو سەر زەویش بەهۆی گەرمە سێرەوە تەنها دووجار گەرمی لەسەریان دەدا ئەوەیش لەسەرەتا گیسك و کۆتایی دێ بەتەرازوو "مەبەستی لەکەلووەکانە" کە شەش مانگ بەرەو باکوور دەڕوا و شەش مانگی دیکە بەرەو باشوور دەڕوا، بۆیە زۆرێك لەپارچەکانی سەر رووی زەوی دەبینی زۆر گەم نییە یان زۆر سارد نییە، دۆخەکانیش زۆر لەیەکتر دەچن، بەڵام ئەم قسانە پێویستی بە بەڵگە و ئەرگۆمێنت هەیە یان چۆن دەبێ مرۆڤ لەو پارچەیەی سەر رووی زەوی بەبێ

دایك و باوك لەدایك بێ، هەروا ئەوەش دەخاتە روو کە لەوانەیە حەی کوڕی یەقزان لەو بەشەی دونیا بێ و بەبێ دایك و باوك لەدایك بێ، زۆر کەسیش نکۆڵی لەو قسەیە کرد، بەلام ئەو بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

دواتر ئیبن توفەیل باس لە چیرۆکێکی خەیالی دەکات بەوەی هاوسەرگیریەکی نهێنی هاتۆتە ئاراوە لەنێوان یەقزان و خوشکی پاشای ئەو دوورگەیە، دواتر ئەو هاوسەرگیرییە بەرهەمەکەی منداڵێك بووە و دایکی خستوویەتیە ناو تابووتێك و فڕێی داوەتە ناو دەریا ئەمەش هەمان رووداوە کە بەسەر مووسا سلاوی خوای لەسەر بێ هاتووە.

بەلام ئەوەی ئەو منداڵەی گرتە خۆی کە پاشا خاڵیەتی و یەقزانیش باوکیەتی تا ئێستا سۆزی دەداتێ و شیری پاکی لەدەمی دەکا و تا ئێستاش بەخێوی دەکا و ئازارەکان لێی دوور دەخاتەوە.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن توفەیل بەو چیرۆکە رەزامەند نەبوو بۆیە دووبارە گەڕایەوە بۆ پێکهاتەی سروشتی کە بەبێ دایك و باوکە و گوتی: ئەوانەی باسیان لەوەکرد کە لەناو زەویدا لەدایك دەبن باسیان لەوە کرد کە ناوی زەوی ئەو دوورگەیە قوڕ و خۆڵەکانی ئاوێتەی یەکتر بوون بەهۆی زۆری ساڵەکانیش سارد و گەرمی تێکەڵ بەیەکتر بوون بۆیە شێدار و وشکیش تێکەڵ بەیەکتر بوون، ئەمەش وەك ئەوەیە مرۆڤ ئەو کارەی کردبێ، کاتێك ئەو زەویە ئاوێتەی یەکتر بوو وەك ئەوەی هەناسە بدەن بەهۆی خرۆشی پیاوەکەی و هەناسەیەکی لاواز لەلایەن ژنەکەوە، دیارە ئەو هەناسەیە زۆر فێنك بووە ئەمەش وایکرد گیانێك بێتە کایەوە وەك ئەوەی ئەمە فەرمانێك بێ لەلایەن خوداوە، دواتر ئەو منداڵە جیا بۆوە و هەست و عەقڵی پەیدا کرد!!

(٣)

ئیبن توفەیل بەردەوام دەبێ لەگێڕانەوەی چیرۆکی ئەو منداڵە کە زۆر بە ڕۆبنسۆن کرۆزی ئیسلامی ئەندەلووسی دەچێ، کە بەشێوەیەکی جیا ژیاوە و لەتەك کەسدا نەبووە و هیچ کاتێك هەڵوێستەکانی ژیان نەیوەستاندووە چ لەرووی ماددی و مەعنەوییەوە، هەروا لەسەر بنەمای ململانێی مرۆڤ و ئاژەڵدا دەمینێتەوە و دەڵێت:

"دواتر بەکەڵای دارەکان ژیا و هەر لەژێر ئەو درەختانە بوو بۆیە هەردەم دڕەندەکان ململانێیان دەکرد بۆیە هەردەم بەرگری دەکرد تا ئەو کاتەی توانی ئابڕووی خۆی بپارێزێ سروشت بووە چەکێك تا بەرگری لەخۆی بکات"!!

(٤)

ئیبن توفەیلی پزیشك و زانای سروشت و گەردوون و ماتماتیك، پاڵەوانی چیرۆکە فەلسەفییەکانی لە سەر وێنەی خۆی زۆرێك لە فەیلەسووفەکانی دیکە بوو.

"لەپاش ئەوەی ئاسکەکەی مرد دواتر کەمتر دەیڕوانیە بابەتە پزیشکیەکان، پێشتریش یەکێك بوو لە پزیشکە بە تواناکان، کە بۆی دەرکەوتوو بوو کە مرۆڤ وەك ئاژەڵ چەندان ئەندامی هەیە و هەست و جووڵەی هەیە، بۆیە ئەو رووحە لەسەر بنەمای یەك بڕیار دەرچووە".

حەی کوڕی یەقزان لەتەمەنی حەوتساڵان ململانێی لەگەڵ ئاژەڵەکان دەکرد، کاتێك تەمەنی گەیشتە بیست و یەك ساڵ دوو قوناغی لەژیانی خۆی بڕی یەکەمیان توێکاری بوو و هەڵوەستەکردن لەسەر نهێنی ژیانی ماددی، دووەمیش بەکارهێنانی هەندێك لەتەنە رەق و رووەك و کەرەستەی شەڕ کردن و

زاڵبوون، هەندێك ئاژەڵی بە فیلْ و بەهێز بۆ لای خۆی رایکێشا، بەتایبەتی بۆ کەرەستەی و پێداویستەکانی.

ئێمە ویستمان پوختەیەك لەو فەلسەفەیە روون بکەینەوە و ئێستاش هەندێك لە دەقەکان دەخەینە روو کە بەپێنووسی ئیبن توفەیڵە بەتایبەتی لە وەسفکردنی شکۆداری رووحی و وەسفکردنی ئەو رێگەیەی کە حەی کوڕی یەقزان گرتوویەتیە بەر تا ئەوکاتەی گەیشتۆتە مەبەستی کۆتایی، هەروا باسەکەمان کورت کردووەتەوە لەش بەش:

بەشی یەکەم: چۆنیەتی زانستی حەی کوری یەقزان لەهەموو رووداوێکدا کە پێویستە رووبدا.

بەشی دووەم: بەبۆچوونی حەی کوڕی یەقزان سەبارەت بە خۆر و مانگ و هەسارە و تەنە ئاسمانییەکان.

بەشی سێیەم: سەبارەت بە کامڵبوونی خود و چێژکە وێنای (واجب الوجود)ە.

بەشی چوارەم: چ جۆرێك لە ئاژەڵەکان کە بۆ مەبەستێکی دیکە دروستکرابێ.

بەشی پێنجەم: لەخۆشگوزەرانی و سەرکەوتن لە چارەسەر وەك دەرمانێك لەلایەن بوون و (الواجب الوجود)ەوە.

بەشی شەشەم: لەنەمان و گەیشتندا.

٥- بەشی یەکەم: چۆنیەتی زانستی حەی کوری یەقزان لەهەموو رووداوێکدا کە پێویستە رووبدا.

"زانست وەك پێویستیەك لەهەموو رووداوێکدا جێگەی دەبێتەوە بەو پێیەی کرداری وێنایە بەگشتی بە ناوەڕۆك، کاتێك سەیری وێنە یەك لەدوایەکەکان دەکەی دەبینی یەکێك لەپشتەوەیەتی لەپاشاندا سەیری وێنەکان بکە دەبینی تەنها ئامادەگی لەشە چونکە ئەو کردەیەی لێ دێتەکایەوە، وەك ئاو ئەگەر

زیاتر گەرم بوو ئەوا جوولەی لێ پەیدا دەبێ، بۆیە ئەو ئامادەگییە وێنەکەیەتی، چونکە هیچ لەش و شتێك بەبێ جوولە بوونی نییە، ئەمەو لەش کاتێك چەند جوولەیەك دەکات ئەوا ئامادەییە بۆ هێنانەکایەوەی وێنەی خۆی وەك هەموو ئەو وێنانەی بەهۆی کردەکانمان دێنەئارا، هەروا ئەوەی کارەکان دەکات کارەکە دەخرێتە سەر ئەو بەوە دەناسرێتەوە، ئەمەش وەك مانایەك لەفەرموودەی پەیامبەرەوە بەدی کراوە کە دەفەرمووێ "من گوێی ئەو بووم کە گوێی پێدەگرت، هەورا چاوی بووم کە پێیدەبینی"، لەلایەکی دیکەوە "کەس ئەوانی نەکوشت بەڵکوو خودا ئەوانی کوشت! ئەوان فڕێ نەدران بەڵکوو خودا ئەوانی فڕێدا!" کاتێك ئەو باسە دەگێڕێتەوە ئارەزووت لەوە دەبێ ناوەڕۆکەکەی بزانیت ئەمەش کردەیەکی هەستەکییە.

## ٦-بەشی دووەم

بۆچوونەکانی حەی کوڕی یەقزان سەبارەت بە خۆر و مانگ و هەسارە و تەنەکانی ئاسمان

"سەرەتا با سەیری خۆر و مانگ و هەسارەکان بکەین، دەبینین لەلای رۆژهەڵاتەوە هەڵدێن و لەلای رۆژئاواش ئاوا دەبن، کاتێك ئێمە سەرمان بەرزدەکەینەوە دەبینین ئەمانە وەك بازنەیەك وان وەك هەر کاتێك سەرمان بەلای باکوور و باشووردا بەرز دەکەینەوە هەروا دەبینین بازنەیەکی بچووکە تیایدا هەسارەکان تیایدا دەجوولێنەوە یەکەمیان بەرەو جەمسەری باشوور دەڕوا کە سوڕانێکی ئاسانە بەرەو جەمسەری باکوور کە سوڕی فیرقەدەینە کە هاوشێوەی هێڵی ئیستوا و گەرمە سێرە کە وەسفمان کرد لەنێو ئەو بازنانە بۆ ئەوەی بڕوانێتە یەکێك لە هەسارەکان بەڵام بەبازنەیەکی گەورە و هەسارەیەکی

دیکە بە بچووکی ببیندرێ لەوێدا هەڵاتن و ئاوابوونی دەبیندرێ، بەشێك لەو هەسارانە بوونیان نامێنێ و ون دەبن، لەوێدا بەدەر دەکەون کە گەردوون لەشێوەی تۆپێکدایە، ئەم بڕوایەش بەهۆی گەڕانەوەی خۆر و مانگ و هەسارەکانی دیکەیە بەرەو ڕۆژهەڵات لەپاش ئاوابوونی، کاتێك لەناوەڕاستدا دەبێ شێوەکەوی لەتۆپ دەچێ، هەندێك کاتیش زۆر بەجوانی دەبیندرێ و لەنزیکەوەیە".

## ٧-بەشی سێیەم

سەبارەت بەکامڵبوونی خود و چێژ بە بوونی (واجب الوجود)ەوە

"کاتی کامڵبوونی خود و چێژ بە بوونی واجب ئەلوجود، کە دەبێ بەبەردەوام بەکردەیی ببینێ، کاتێك بەشێوەی کردەیی بینیت ئەوا هەست بەچێژەکەی دەکەی بەبێ ئازار، وەك چۆن جونەیدی شێخی سۆفیگەری لە گیانەڵا دابوو بە هاوەڵەکانی گوت "لەم کاتەدا گوتنی خودا گەورەیە و نوێژکردنی لێ وەردەگیرێ"، مرۆڤ لەو کاتەی دێتە سەر دونیا تا ئەو کاتەی دەمرێ هەست بەو کردەیە دەکات وەك چۆن چاوەکانی زۆر هەستیارانە دەبینی و هەروا گوێ لەهەر ئاژەڵێك دەبێ یاخود خەیاڵێك بەمێشکیا دادێ و لەشی تووشی ئازارێك دەبێتەوە و یان ئەوەتا هەست بەبرسیەتی و تێنوویەتی دەکات و سەرما و گەرمای دەبێت بۆیە هیوا دەخوازێ بگەڕێتەوە سەر دۆخی پێشوویی ئەمەش بەهۆی هەوڵەکانەوە دێتە ئاراوە، زۆر دەترسێ کۆتایی پێ بێ، بۆیە داوای چارەسەر دەکات یان هەر شتێکی بۆ بکەن تا لەو دۆخەدا ڕزگاری بێ نەوەك بەو دەرمانانە زیاتر خراپ بێ".

## بەشی چوارەم

## لەجۆرەکانی ئاژەڵە و بۆ مەبەستێکی دیکە دروستکراوە

"کاتێك باس لەو جۆرە ئاژەڵە دەکەین مەبەست لەرووحە کە هاوشێوەی تەنە ئاسمانییەکان و وەك هەموو جۆرەکانی دیکە، ئاژەڵە بەلأم بۆ مەبەستێکی دیکە دروستکراوە، کە کارێکی مەزنی بۆ دانراوە، مەزنەیەکەی لەوەدایە هاوشێوەیەی گەوهەرە ئاسمانییەکانە و لەدەرەوەی گەردوون و گەندەڵی و گۆڕانکاری مەحاڵدایە، ئەم شتەش تەنها خودا دەزانێ چییە بەهیچ شێوەیەك بەرەو تێکچوون هەنگاو نانێ و درکی پێناکرێ بەهەست و زانست و زانیاری تەنها خودایە دەزانێ بەتایبەتی کاتێك لە لەشی مرۆڤ دادەبڕێ هیچ سیفەتێکی لەشی بۆ دانانرێ".

## ۹-بەشی پێنجەم

## خۆشگوزەرانی و سەرکەوتن لە چارەسەر بۆ بوونی (واجب الوجود)ەوە

"ئەمەیش شێوەیەکە بەلأم هەردەم بەچاوان سەیری دەکەین و بەمێشك بیری لێدەکەینەوە، بەچەندان شێوە دەیگونجێنین، بەلأم دەبێ پشت بە سێ بەشی بینین ببەستین لە هاوشێوەکان:

هاوشێوەی یەکەم شتێکی لێ نایەتە کایەوە لەبوارەکانی هەستیاری ئەمەش وەك بەردەوامبوونی رووحی ئاژەڵ وایە کە لەرووی هاوشێوەی دووەمدا دێتە کایەوە پێویستیەکی تەنە ئاسمانییەکانە تا ئەو رێگەیەی بۆ ئاشنا بکات ئەگەر هیچ زیانێکی لێ نەیەتە کایەوە.

بەلأم هاوشێوەی دووەم کاتێك دێتە کایەوە کە بەختێکی مەزنت دەبێ کاتێك بینینیەکانت بەپێی عەقڵ دێتە کایەوە.

هەروا هاوشێوەی سێیەم ئاوێتە بوون و قوڵبوونەوەیە لە بابەتەکانی خودایی، کە خۆت لەبیر کرد و هەموو لایەنەکانی دیکەت لەیاد کرد تەنها خودای گەورە نەبێ کە بەرز و بەخشندە و شکۆدارە".

## ١٠-بەشی شەشەم
## لەنەمان و گەیشتندا

"کاتێك گوێت لەدڵت بوو و بەچاوانی عەقڵت بینیت، ئەمەش بەمانای ئەوەیە رێگەی خۆت دۆزیەوە! بەڵام لێرەوە تەنها مەرج ئەوەیە لەو کاتەدا و لەو کاتە ناسکەدا هیچ قسەیەکی وامەکە کە لەوانەیە ترسناك بێ، لەم کاتەدا تەنها شتێك دەبینی، هەست بەجۆرێك لەسەرخۆش بوون دەکەی ئەمەش ناجۆری هەق و راستییە، پێچەوانە بوونی ئەو راستییەش راستەقینەی خودی خۆیەتی بەشێوەیەم وا گومان دەکات کە پێچەوانەی خودی خۆیەتی بەرامبەر بەراستییەکان، بەڵام لەهەموو شتێك خودی راستەقینەیە وەك کاتێك دەبینی تیشکی خۆر هەموو شێوەکان دەبڕێ، کاتێکیش تیشکی خۆر لەسەر ئەو لەشە نەما و تیشکی خۆریش هەر وەك خۆیی بوو، کاتێکیش ئەو لەشە تیشکەکە بەخۆیەوە ناگرێ ئەو کاتەی ئەو لەشە هیچ مانایەکی نییە".

"کاتێکیش باوەڕ بەو گومانە دەکرێ کاتێك راستییەکان بەتەواوی بەدەرکەوتن بەشێوەیەك کاتێك زانست لەنێوەندی ئەو خودەدا بوو، بەڵام تەنها ئەوە خودای گەورەیە هەموو خود و راستییەکان لەیەك جیادەکاتەوە و دەیزانێ، کاتێك مرۆڤ بەتەواوی باوەڕی هێنا ئەوا پاشماوەی تاریکیەکان لەلەشی کۆتایی پێهاتووە، هەستەکان گەورە دەبن، بەڵام هەموو ئەو شتانەی باسمان کرد یەك یەك دایبنێین هەر باس لە سیفەتەکانی لەش دەکەین".

# ٧-ئیبن رووشد

## وشەیەك لەدەستپێك

زۆر کەس سەرسام دەبن کاتێك توێژینەوە لەسەر بۆچوونی زانا دێرینـەکان دەکرێـت، هاوکـات بـاس لەپـەیڕەوەکانیان دەکـرێ لـە ڕووی زانسـتییەوە و هەڵوەسـتە لەسـەر مێـژوویان ئـەنجام دەدرێ، سەرسـوڕمانتر دەبـن کاتێـك ڕاسـتییەکانیان دەخرێتـە ڕوو، چـونکە ئـەوان پێیانوایـە ئـەوەی کـۆن بـوو شوێنەواری نامێنێ، چونکە هـیچ پەیوەندیـەك بـەو ڕۆژگـارە نـەماوە، بۆیـە پێویست ناکات دووبارە بیانهێنینەوە ئارا، تا سوودیان لێ وەربگـرین، بـەڵام وەڵاممان بۆ ئەمە ئەوەیە کە توێژینەوە کۆنەکان وەك پێویستییەك هەیە تا لە شتە نوێیەکان تێبگەین، ئەمەو هزری مرۆڤایەتی لە دێرزەمانەوە تا ئەمڕۆ وەك زنجیرەیەك وایە هەموو بەیـەکتر بەسـتراوەتەوە، لەوانەشـە دواترینیـان وەك سەرەتا بێت!

ئەگەر چاوێك بـە فەلسـەفەی ئیسـلامدا بگێـڕین دەبیـنین زۆر گرنگییـان بـە فەلسەفەی یۆنان داوە و کاتی خۆیان بۆ داناوە و زمانەکـەیان گواسـتۆتەوە

لەتەك شیکردنەوە و لێکدانەوەکان و هەموو لایەنە تەماویەکانیان روون کردۆتەوە.

ئەوەی تا ئێستا گەیشتووین پێی ژیانی فەلسەفی ئیبن رووشد مەزنترین رووی مێژوویییە، کە سێ خەسڵەتی هەیە کە لەنێوەندی خەسڵەتەکانی فەیلەسووفەکانی دیکەی ئیسلام نییە یەکەمیان گەورەترین و ناودارترین فەیلەسووفی ئیسلامە، دووەم ئەو مەزنترە لە داناکانی سەدەکانی ناوەڕاست بەگشتی و دامەزرێنەری رێبازی هزری ئازادە، بۆیە لەئەورووپا لەتەك فەیلەسووفەکانی خۆیان دایانناوە کە دژ بەباوەڕە ئایینییەکان، بۆ ئەمەش مایکڵ ئەنجلۆ لەنێوەندی خەیاڵی پەیکەرەکانی دایناوە و لەبنمیچی پەرستگای سیکتینی ڤاتیکان دایناوە، نەك لەبەر ئەوەی موسڵمانە بەڵکوو وا وەسف کردووە کە فەیلەسووفە، هەروا دانتی لەهۆنراوەکانی باسی کردووە بەتایبەتی لە سرووودی سێیەم، بەتایبەتی کتێبەکانی فەلسەفین هاوکات بنەماکانی روونکردۆتەوە.

خەسڵەتی سێیەمیش ئەو ئەندەلووسییە، خودی ئەندەلووس لەرووی پێشکەوتن و میژوو و شوێنەوارەکانی جێگەی دیارە لە مێژووی جیهان، ئەوە جگە لەوەی هێزی کاریگەریی هەیە لەسەر عەقڵی رۆژهەلاتی و باوەڕی رۆژئاوایی و گەشەکردن.

فەیلەسووفەکانی دێرین نەیاندەتوانی بژین و دەربکەون ئەگەر لەژێر سایە و سێبەری میر و پاشاکاندا نەبوونایە، چونکە فەلسەفەکەی هیچ خواردن و چێژێك نابەخشێ، بەڵکوو تەنها فەلسەفەکەی بۆ ژیان و ئازادییە بەتایبەتی بۆ دانایان، بۆیە ئەو فەیلەسووفانە هەر دەبوایە لەباوەشی پاشاکاندا بن و هەردەم پێشەکەشی ئەوانیان کردووە.

لەلایەکی دیکەوە فەیلەسووفەکان تا ئێستایش جێگەی گومان و نائەرێنین، چونکە خەڵك بەگشتی بەشێوەیەکی گوماناوی سەیریان دەکەن و قسەیان لەسەر دەکەن، زۆر شتیشیان دەخەنە پاڵ کە زۆربەیان دروست کراوە، بەلام خەڵکی دەستەبژێر زۆرجار حەسوودییان پێ دەبردن، چونکە بەهەشتی دانایان پێ بەخشراوە، بەلام بووەتە ئەشکەنجە و ئازار بۆ فەیلەسووفەکان، بۆیە پێویست بوو فەیلەسووفەکان پەنا ببەنەبەر میرەکان، لەکاتێکدا وەك نامۆیەکن لە وڵاتانی رۆژهەلات، یان خۆیان داوەتە پاڵ باڵێوەزەکانی وڵاتانی بیانی.

سەیریش نییە ئەگەر فەیلەسووف وەك نامۆیەك بێ لەوڵاتەکەی لەکاتێکدا لەنێوان خزم و کەسانی، بۆیە فەیلەسووفەکان پەنایان بردووەتە بەر میرەکان، لەکاتێکدا لەهەندێك شوێندا هەمان میر بوونەتە مایەی ئەشکەنجەدانیان، ئەمەش ئەو ئەشکەنجە و ئازارە کە ئیبن رووشد رووبەرووی بووەتەوە.

بەلام دۆخ و ژیان لەم رۆژگارەدا گۆڕاوە و فەیلەسووف لە رۆژئاوا ئێستا دەتوانێ لە باوەشی دانایدا بژیت بەبێ ئەوەی پەنا بباتە پاشا و سێبەری میرەکان، هاوکات فەیلەسووف بەهێزی فەلسەفەکەی توانیویەتی خۆیان بسەلمێنن لەسەر رووی زەویدا، بەهۆی ئەوەی مرۆڤایەتی ئازادیەکی دیاریکراوی بەدەستهێناوە، ئێستا دەنگی فەیلەسووف تەخت و تاراجی قەیسەر و پاشاکان دەجوڵێنێ، وەك دەبینین شوێنەوارەکانی لیۆ تۆلستۆ کاتێك هۆکارێك بوو لەپەرەپێدان و گەشەسەندنی گەلی رووسیا، هەر کاتێك چەند دێڕێکی دەنووسی ئەوا دڵی گەلانی دەهەژاند و نەتەوەکان رووبەرووی هەموو دەسەلاتە نەزانەکان دەبوونەوە، چونکە دەوڵەتەکان لەناو دەچن، بەلام دەوڵەتی عەقڵ و هزر هەردەم دەمێنێتەوە.

هەروا هەر کەسیك کە ناوی ئۆگست کومت و هربرت سپنسر و شوپینهاوەر ببیستێ لەوە دەگا کە رووناکییان بەخشیوە بە مرۆڤایەتی و لەدەوریدا چەندان نەتەوە کۆبوونەتەوە.
هاوکات چەوساندنەوەی فەیلەسووف و ئەشکەنجەدانی لەپیناو هزر و هاتنەکایەوە عەقڵ، تا ئێستایش ئەو جۆرە هەڵوێستانە لەهەندێك شوێندا ماون.
لەتەك ئەمەدا بلێسەیەکی بچووك دەبێتە ئاگرێکی مەزن، لەدواتریشدا گلەیینامە لە رۆژنامە و گۆڤارێکدا دەنووسن و دوایی گەورەبوونی بەخراپی دەزانن و نووسەرەکە دەبەنە بەر داری سێدارە لەتەك ئەوەی بەهەموو شێوەیەك دژایەتی دەکەن و دەیانەوێ بە دەسەڵاتیان ئەشکەنجەی بدەن، چونکە تا ئێستایش لەهەندێك شویندا مرۆڤایەتی هەر لەرۆڵی یەکەمدایە، لەتەك ئەوەی ئێستا گەیشتووتە تەمەنی گەشەکردنی.

## مێژووی ئیبن رووشد

ناو و نازناوی: محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی محمەد کوڕی رووشد، ناسراوە بە نازناوی ئەبا وەلید ئەم نازناوەشی لە باب وباپیرانی وەریگرتووە.
لەدایکبوونی: لەساڵی ٥٢٠ك-١١٢٦ز لەدایك بووە، باسیش لەوە کراوە لەپاش کۆچیدوایی باپیرەی بەچەند مانگێك لەدایك بووە.
کۆچیدوایی: لەئێوارەی پێنجشەممەی ٩ی سەفەری ساڵی ٥٩٥ك بەرامبەر ١٠ی دیسەمبەری ساڵی ١١٩٨ز کۆچی دوایی کردووە.
ژیانی: حەفتاودوو ساڵ یان حەفتا و پێنج ساڵ ژیاوە بەدرێژایی سەدەی دوانزدەی زایینی و سەدەی شەشەمی کۆچی.
شوێنی لەدایکبوونی: قورتووبە لە ئەندەلووس.

شوێنی مردنی: مەراکش.

خانەوادەکەی: لەنێوەندی خانەوادەیەکی فەقیھ و قازی لەدایك بووە، خانەوادەکەی یەکێك لەگەورەترین و ناودارترین خانەوادە بووە لە ئەندەلووس و بابوباپیرانی لە ئیمامەکانی مەزھەبی مالیکی بووە، ئەمەو باوك و باپیری قازی قورتووبە بووە و ھەروا ھەرخۆیان قازی ئیشبیلییە بوونە.

محەممەدی کوڕی ڕووشدی باپیرەی یەکێك بووە لەوانەی خولیای زانست و فیقھ بووە و چەندان نووسین و توێژینەوەی فەلسەفی و شەرعی بووە لەتەك چەندان فتوادا، کە لەلایەن یەکێك لە مریدەکانی بەناوی ئیبن ئەلوەران کۆکراوەتەوە، ھەروا ئەو ئیمامی مزگەوتی قورتووبە بووە لەو سەردەمە. (ئەمەش لە کتێبخانەی پاریسی نیشتمانیی پارێزراوە لەژێر ژمارەی تۆمارکراوی ٣٩٨ پاشکۆ عەرەبییەکان)

گومانی تیا نییە کە ئەبا وەلید میراتێکی زۆری زانستی لە باپیرەی وەرگرتووە بەتایبەتی لەرووی ئامادەیی هزرەوە، باوکیشی تەنھا پۆستی قازی وەرگرتبوو ھیچ خەسڵەتێکی دیکەی نەبوو، چونکە ھیچ شوێنەوارێکی لەژێر دەستماندا نییە، بەڵام پیاوێکی وەکو ئەحمەد کوڕی محەممەدی کوڕی ڕووشد جێگەی شانازییە کوڕی باوکی خۆی بێ ھەر خۆشی بە شێوەیەکی گونجاو پەروەردەی بکات و زانستی پێ ببەخشێ و بەھرەکانی گەشە پێ بدات.

ئەمە سەبارەت بە باوکی بوو، بەڵام سەبارەت بە دایکی شتێکی وامان لەبەردەستدا نییە، ئەمەش دۆخی زۆرێك لە ناودارانی ئیسلامە، چونکە بەپێی ڕێنوێنییە ئایینییەکان دایك ناوی ناهێندرێ کاتێك باس لە پەروەردە دەکرێ و بەھەند وەرناگیرێ، ئەمەش وای لە ئیبن ڕووشد کرد پشتگیری ئافرەتان بکات و

داوا بکات تا رزگاری خۆیان ببینن، چونکە بەچاوی خۆی ئەو جیاوازیەی بینی لەنێوان ژیانی ئیسپانی مەسیحی و ئەندەلووسی موسڵمان.

## پەیوەندی بە جوولەکەوە

کاتێك مێژوونووسان باس لە نسکۆی ئیبن رووشد دەکەن، ئەوە دەخەنە ڕوو کە ئەو فەیلەسووفە سزا دراوە و بۆ "ئەلیسانە" دووریان خستەوە، ئەو شوێنەش گوندێکی بچووك بوو و هەموو خەڵکەکەشی بە جوولەکە ناسرابوون، تەنها ئەو دوور خرایەوە، بەڵام هاوەڵ و قوتابیانی فەرمانیان پێ کرا لەشوێنێکی دیکەدا بن، ئەمەش جۆرێکی دیکە بوو لە دوورخستنەوە، هۆکاری دوورخستنەوەی بۆ ئەو گوندە لەلایەن خەلیفە مەنسوورەوە بوو چونکە ئەو خەلیفەیە زۆر ڕقی لە جوولەکە بوو و هەردەمیش دەیچەوساندنەوە، لەلایەکی دیکەوە بەشێك لەدوژمنانی ئیبن رووشد ئەمەیان بەهەل زانی و باسیان لەوە کرد کە میر گەڕاندویەتیەوە بۆ شوێنی بنەڕەتی خۆی، چونکە ئەو رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ بەنی ئیسرائیل، هەروا لەنێوەندی هۆزەکانی ئەندەلووس نەدەزاندرا سەر بە ج رەچەڵەکێکە.

ئەوەی شیاوی باسە ئیبن رووشد لەلایەی جوولەکەکان گرنگیەکی زۆری پێدەدرا، هەورا زۆرێك لە فەیلەسووفەکانیان وەك میمونید نووسینەکانی گۆڕی بۆ زمانی عیبری و هەندێکی گواستووەتەوە بۆ زمانی لاتینی و عەرەبی، ئەمەش بەهۆی پاراستنی ئەو نووسینانە لەلای ئەوان تا گەیشتە نەوەی نوێ، نازاندرێ رووداوی دوورخستنەوەی ئیبن رووشد بۆ ناو جوولەکەکان شتێکی هەمەڕەکی بووە یان بەراستی رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ بەنی ئیسرائیل، هەروا باوك و باپیری و خزمەکانی لەوان بوون؟ بەڵام ئێمە وای دادەنێن ڕێکەوت بووە.

## گەشە و پەروەردەی

ئیبن رووشد شەریعەتی ئیسلامی بەپێی رێگەکانی ئەشعەری خوێندووە، لەسەر بنەمای مەزهەبی ئیمام مالیك خوێندنی تەواوکردووە بۆیە دەبینی لێك چوونێك لەنێوان بۆچوونە شەرعی و فقهیەکان و ئارەزووەکانی فەلسەفی هەیە، هەروا شێواز و رێگەی ئەشعەری لەلایەن خانەوادەکەیەوە هەڵبژێردراوە، بەو پێیەی باوکی لەسەر کام مەزهەبە، بەڵام سەبارەت بە بنەما فەلسەفیەکانی لەلایەن خۆیەوە دەستنیشانکراوە بە ئازادانە، لەوانەشە ئەو شتانەی سەبارەت بە فیقە و مەزهەب خوێندوویەتی کاریگەری هەبوو لە سەر بۆچوونە فەلسەفییەکانی، بەڵام ناتوانین دیاریی بکەین.

خوێنەر دەبینێ کە لەزۆربەی کتێبەکانی تانە لە ئەشعەریە دەدات و هەروا رەخنە لەشێوە و رێگەکانیان دەگرێ، ئەمەش لەپاش ئەوەی چوارچێوەی هزری فراوان بوو، لەکۆتاییشدا لۆژیکی راستەقینە سەرکەوت لەبەرامبەر خەیاڵ و پووچیی.

## مێژووی ژیانی

کاتێك ئیبن رووشد تەمەنی گەیشتە بیست و هەشت ساڵی بەرەو مەراکش رۆیشت و چووە دەرباری خەلیفە عەبدولموئمین کە دووەم میری موەحەدیەکان بوو، کاتێکیش عەبدولموئمین کۆچی دوایی کرد یوسفی کوڕی لەشوێنی دانرا، لەو کاتەدا ئیبن توفەیلێ، ئیبن رووشدی وەك فەیلەسووفێکی گەورە و مەزن بە میر ناساند، ئەمەو یووسف کەسێکی زانستخواز بوو و مەزنایەتی بۆ دانایان دادەنا و رێزی دەگرتن، ئەم هەنگاوەش لەلایەن ئیبن توفەیلەوە رێکخرابوو تا بە میری بناسێنێت، عەبدولواحیدی مەراکشی، سەبارەت بە ئیبن رووشد

دەگێڕێتەوە کاتێك دیدار ئەنجامدرا لەنێوان دانا و میردا، لەکاتێکدا ئیبن توفەیل جەختی لەوە دەکردەوە، کە لەلایەن خەلیفە یووسف مەبەستێك هەیە تا دانایی ئەرستۆ بگوازرێتەوە و تێی بگەن، لەوانەشە ویستوویەتی ئەو لە ڕۆژئاوا ئەو کارە بکات وەك چۆن مەئموون لەڕۆژهەلات ئەو کارەی کردووە.

پێدەچێ ئیبن توفەیل کەسێکی ڕەوشتبەرز بووە و بەخشندە بووە و کەسێك بووە دەرووونی کردووەتەوە بۆ دانایی، هەروا سۆزی هەبووە بۆ ئیبن رووشد ئەمەو لە وتاری حەی کوڕی یەقزان ناوی دەهێنێ لەکاتێك کە باسی ئیبن باجە و هەوادارانی دەکات لەتەك فەیلەسووفەکانی دیکە، هەر ئیبن توفەیلیش بوو بە میر یوسفی ناساندووە کاتێکیش ئیبن توفەیل مردووە میر یوسف، ئیبن رووشدی وەك پزیشکێك دامەزراندووە، کاتێك شوێنی قازی لە قورتوبە بەتال بووە و لەشوێنی باوکی دایمەزراندووە، لە کاتێکدا کە میر یوسف کۆچی دوایی کردووە و یەعقووبی (مەنسووربالله) لەشوێنی دانراوە، هەنگاوەکانی ئیبن رووشد مەزنتر بوو و بەمەش میر زۆر لەخۆی نزیکی کردووەتەوە و تا وای لێهاتووە ئیبن رووشد لەکاتی گفتووگۆکاندا پێی دەگوت براکەم!

دیارە هاوڕێیەتی لەتەك پاشا و میرەکان وەرچەرخان بەخۆیەوە دەبینێ بەهۆی کەشەکان و تەمەنی درێژ نابێت و هەندێکجاریش ئەو هاوڕێیەتیە بەرەو هەڵدێرت دەبات، ئەمەو یەعقووب لەساتەوەختێکدا دژ بە ئیبن رووشد وەستایەوە لەکاتێکدا کە گفتوگۆیەکی دوور و درێ لەنێوانیان هەبوو، بەلام هۆکاری نسکۆیەکەی ئەوا مێژوونووسان هەریەکەو بەجۆرێك باسی لێوە دەکەن، بەلام هۆکاری بنەڕەتی ئەوەیە کە هەر دانایەکی مەزن دوژمنی زۆر دەبێ، ئەمەش بەهۆی ئێرەییەوە کە هەندێکیان بەناوی ئاین و هەندێکی دیکەیان بەناوی

ئەکار و چاکەکاری و سیاسەت دوژمنکاریەکەیان ئەنجام دەدەن، تا شکۆی پیاوی مەزن بشکێنن.

ئەوەی لەنسکۆی ئیبن رووشدا هاتە کایەوە ئەوا دوژمنانی کەسانی ئایینپەروەر نەبوون، بەڵکوو لەنێوەندی دەرباری خەلیفەدا تەڵەیان بۆ ناوەوە و بەمەش توانیان سەرکەون بەسەر کۆمەڵەی فەیلەسووفەکان لەکاتێکدا کە لەلای خەلیفەدا گوێبیست بوو ئەمەش بەهۆی ئیبن رووشدەوە، بۆ پشتگیری ئەو بۆچوونەش ئیبن رووشد تەنها نەبووە کە بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەتەکدا بکەن و دواتر دووری بخەنەوە بەڵکوو زۆرێك لەهەوادار و هاوەڵی وەکخۆی زانا بوون، کاتێك خەلیفە بڕیاریدا فەلسەفە و کتێبەی دێرینەکان نەخوێندرێت.

کارەساتەکە هەمان کارەساتە و لەمێژووی جیهاندا چەندان بابەتی لەمجۆرە دروستبووە، لەکاتێك کە ویستوویانە ئازار و ئەشکەنجەی دانا و زانایان بدەن.

لەلایەکی دیکەوە لەپاش ئەوەی خەلیفە زانی تێنەگەیشتنێك هەیە لەو نێوەندەدا و پەشیمان بووەوە لەوەی کە دژ بە دانایی کردوویەتی، بۆیە گەڕایەوە مەرکش دووبارە فەرمانێکی دیکەی دەرکرد سەبارت بە ئیبن رووشد و هاوەڵانی و هەموو شتێکی لادا، تا کار لەسەر فەلسەفە بکات و ئیبن رووشدی رازی کرد و دووبارە داوای لێ کردن لەنزیکیەوە بوون، دووبارە گوێی لێ راگرتن و دژ بەوانە وەستایەوە کە دەمارگیر و نەزانن کە هۆیەك بوون لە نسکۆی ئەوان.

لەلایەکی دیکەوە ژیانی ئیبن رووشد درێژەی نەکێشا لەپاش نسکۆیەکەی تەنها ساڵێك دوای ئەمە کۆچیدوایی کرد و تەرمەکەی بردرایەوە بۆ قورتوبە و لە گۆڕستانی باپیرانی نێژرا، کە گۆڕستانی ئیبن عەباسە، باس لەوە دەکرێ کە بەسواری ئەسپ تەرمەکەی گوازاوەتەوە، راسترین مێژووش ئەوەیە کە ئیبن

رووشد لە مەراکش مردووە واتە لە رۆژی پێنجشەمەی مانگی سەفەری ساڵی پێنجسەد و نەوەد و پێنج لەپێش مردنی مەنسوور کە لەپاش مانگێك تووشی نسکۆ بۆوە، لەدووری ئەو نێژراوە دواتر بردراوە بۆ قورتووبە و لەتەك کەسانی خۆیدا نێژراوە، ئیبن فەرقەد باس لەوە دەکات کە لەپاسش نسکۆکەدا کۆچی دوایی کردووە و لەنزیك دەروازەی تاغزوت نێژراوە لەدەرەوەی مەراکشدا، سێ مانگ لەپێش دامەزراندنی دەوڵەتی ناسر.

## مامۆستاکانی

لە باوکی ئەبوو قاسم دەگێڕدرێتەوە سەرەتا مۆتای خوێندۆتەوە و هەموو ئەزبەر کردووە، دواتر ئەبووقاسم لەتەك ئیبن بشکوال و ئەبوو مەروانی کوڕی مەسەرە داناوە بۆ خوێندن، هەروا لەلای ئەبووبەکری کوڕی سەمعوون و ئەبوو جەعفەری کوڕی عەبدولعەزیز خوێندویەتی، لەلایەن ئەبوو حەعفەر و ئەبوو عەبدوڵلا مازری مۆڵەتی پزیشکیی وەرگرتووە. هەروا لەلای ئەبوو مەروانی کوڕی جەریول بەلنسی فیقهی خوێندووە، لەتەك حافزی ئەبوومحەمەدی کوڕی (روق) فێری رێنمایەکانی پزیشکی بووە، لەلای ئەبووجەعفەری هەروون خوێندویەتی، ماوەیەکیش لەلای ماوەتەوە تا فێری زانستەکانی دانایی بێت.

## ئەو پیاوانەی کە لێیان فێربووە ، ئەو زانستانەی کە خوێندویەتی

فیقە: لەسەر دەستی ئیمامەکانی سەردەمەکەی خوێندویەتی، پزیشکی: لەسەر دەستی ئەبوو جەعفەر هەروون، فەلسەفە: باس لەوە کراوە، کە زانستی دانایی لە ئیبن باجەوە وەرگرتووە، لەتەك ئەوەی ئەم باسە لاوازە و بێ بنەمایە چونکە کاتێك ئیبن باجە کۆچیدوایی کردووە، تەمەنی ئیبن رووشد دوانزدە

سالآن بووە، ئەمەو ئیبن رووشد لەساڵی ١١٢٦ز لەدایك بووە، هەروا ئیبن باجە لە ساڵی ١١٣٨ز کۆچیدوایی کردووە و ئەو تەمەنەش هۆیەکە نییە بۆ وەرگرتنی زانستی فەلسەفی، لەوانەشە ئیبن رووشد یەکێك لەو بلیمەتانە بێ کە لەدەیەی یەکەمدا بلیمەتی فەلسەفی تیادا دەرکەوتبێ، لەوانەشە زانستی لەئیبن باجەوە وەرگرتبێ ئەمەش وەك گریمانێك، لەوانەشە رۆژێك لەرۆژان ئیبن باجە سەردانی ماڵ و خانەوادەی ئیبن رووشدی کردبێ لەوانەیە گفتوگۆی لەگەڵ ئەو منداڵە کردبێ و گۆیی لەیەکێك لە قەسیدەکان بووبێ، لەوانەشە ئەم کارە چەند جارێکیش دووبارە بووبێتەوە.

هاوکات هەندێك لە مێژوونووسان وەك ئیبن ئەبوو ئەسەبەعی بۆیە وای گوتبێ چونکە رێبازی ئیبن رووشد هەمان رێبازی ئیبن باجەیە، ئەم شێوەیەش زۆر سروشتییە، چونکە رەوتی هزر بوو لە ئەندەلووس بەو شێوەیە هەنگاوی دەنا، بەهەمان شێوە لەجیهان و لەسەدەی دوانزدەهەم و کاریگەریی نێوەند و بنەمایەکان، بەڵام ئیبن رووشد لەتەك ئیبن توفەیل رێز و خۆشەویستی و هاورێیەتییان بەیەکەوە هەبوو هەر ئیبن توفەیلیش بوو دەرگەی دەرباری خەلیفەی بۆ کردەوە، هەروا لەو نێوەندەدا لەتەك خانەوادەی زەهرەدین کە ئەو کات ناودار بوون، هۆکارێك بوون بۆ بڵاوبوونەوەی زانست و ئەدەب لە ئەندەلووس لەسەدەی شەشەمی کۆچییدا، لەنێوان ئیبن رووشد و ئەبووبەکری کوری زهری پزیشکی خەلیفە و ئەبوومەروان کوری زهر نووسەری کتێبی (التیسیر) هاورێیەتیەکی بەهێز هەبوو.

لەلایەکی دیکەوە ئەبووبەکری کوری عەرەبی خاوەنی پۆلێنکردن بوو کە ئیبن رووشد لێی فێر بووە، هاوکات لەتەك زانا و داناکانی سەردەمی خۆی زۆر تێکەڵ بوو.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە و بووە ڕێکەوت کە ئیبن بەیتار و عەبدولمەلیکی کوڕی زهر و ئیبن رووشد لەیەك ساڵدا کۆچیدواییان کرد، بەڵام ئیبن توفەیل و ئەبوومەروانی کوڕی زهر لەپێشتردا کۆچی دواییان کرد، بەمشێوەیە دانایی لە خاکی ئەندەلووسدا بەرەو نەمان رۆیشت، دیارە مردنی ئەو مەزنانە و بەرهەمی دوایی خۆیان وەك نەخشێکی رەنگاوڕەنگ بوو لە شوێنە پیرۆزەدا، کە مۆمیان لەسەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیدا هەڵگیرسا بەمشێوەیە تەمەنی دانایی وەك تەمەنی بەنەوشە بوو، لەوانەیە گوڵ بپوکێتەوە بەڵام بۆنەکەیان هەرگیزاو هەرگیز لاناچێ و نامرێ! بۆیە لەشوێنەواری ئەو دانایانە سوودێکی زۆرمان بینی و چاکەکانیان بۆتە شوێنەوارێکی پیرۆز، بۆیە پێویستە لەمەودا دانایەکی نوێ بنیاتبنێین لەسەر بنەمای خۆشەویستی گشتگیر و لێبوردەیی.

## هاوڕێیەکانی

بەئەبوو عەبدوڵلا محەممەد کوڕی ئیبراهیمی فقیە و قازی خەراج و ئەبوو جەعفەری زەهەبی و فقیە ئەبوو رابع کفیف و ئەبووعەباسی حافز شاعیری قەرای.

کاتێك ئیبن رووشد تووشی نسکۆ بوو، هەموو هاورێ و ئەوانەی پەیوەندییان لەگەڵیدا هەبوو بەهەمان دەرد و ئازار چوون، چونکە بۆچوونەکانیان ئاوێتەی یەکتر بوو بوون، هاوکات هەندێکی دیکە لە هاوڕێیەکانی ئەمانە بوون وەك ئەبوومحەممەد عەبدولکەبیر، ئەو کەسێکی زۆر نزیك بوو لە ئیبن رووشد بەتایبەتی کاتێك قازی قورتووبە بوو، هەروا ئەبووجەعفەری کوڕی هاروون تەرجالی کە مامۆستای ئەبوو وەلیدی ئیبن رووشد بوو لە خوێندنی پزیشکی و رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ ترجالە کە یەکێك لەناوچەکانی ئەندەلووس.

## قوتابی و خوێندکارەکانی

ئەبو عەبدوڵڵای ئەدورمی لەقورتوویە لەدایکبووە و لەوێدا گەورە بووە لەپاشاندا چووەتە ئیشبیلییە و پەیوەندی بە ئەبوو وەلیدی ئیبن رووشد کردووە و لەلای ئەو فێری زانستی پزیشکیی بووە.

ئەبوو جەعفەری ئەحمەدی کوڕی سابق رەچەڵەکی لە قوورتوویەیە و یەکێك بووە لەخوێندکارانی ئیبن رووشد لەرووی پزیشکییەوە، ئەبوو قاسم تلّیان، ئیبن رووشد سەبارەت بەو دەڵێت شیعرەکانی حەبیب و موتەنەبی دەزانی، هەروا قوتابیەکانی دیکەی ئەمانە بوون وەك ئەبووحەسەنی سەهلی کوڕی مالیك و ئەبوو رەبیعی کوڕی سالم و ئەبووبەکری کوڕی جهور و چەندانی دیکە.

## وەچەکانی

ئیبن رووشد کوڕێکی بەناوی محەممەد کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی ئەبی وەلید محەمەد کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی ئیبن رووشد، ئەو کەسێکی چاکەخواز و زانایەکی مەزن بوو لە پزیشکیدا و هەردەم جێگەی سوپاس و رێز بوو بەهۆی کار و کردەوەکانی، ئەو سەردانی خەلیفە ناسری دەکرد و ئەگەر نەخۆش بوایە چارەسەری دەکرد، لەلایەکی دیکەوە ئیبن رووشد چەندان کوڕی دیکەی هەیە کە کاریان لەسەر فیقە کردووە و وەك قازیش دەستبەکار بوون.

لۆژیك و قورئان

زۆر ئارەزووی لە لۆژیکی ئەرستۆ بوو و باسی لەوە کردووە کە سەرچاوەی خۆشگوزەرانیی مرۆڤە و مرۆڤیش زانستی بە لۆژیك دەپێورێ، هەروا پێی وایە دووپوویی (دیماگۆجی) هیچ سوودێکی نییە، کە فۆرفۆیۆس دایناوە، هەروا زۆر

گرنگی دەدا بە ڕێزمان، وەك یاسایەك بۆ هەموو زمانەکان، هەروا ئەرستۆیش یاسایەکی نوێی داناوە بۆ لۆژیك و ڕەوانبێژی.
ئەو پێی وایە لۆژیك ئامێرێکە ڕێگەکانت بۆ ئاسان دەکات تا بکەیتە ڕاستی، لەتەك ئەوەی خەڵك بەگشتی ناگەنە ئەو ڕاستییە، بەڵام هەندێك لە دەستەبژێرەکان بەهۆی لۆژیکەوە دەگەن بەو ڕاستییە، هاوکات جەختیش لەوە دەکاتەوە کە ئەو گەیشتۆتە ڕاستی و ڕاستی ڕەهای دۆزیوەتەوە ئەمەیش بەهۆی خوێندنی ئەرستۆ، پێیوایە کە ئایین ڕاستیەکە، بەڵام لەتەك زانستی کەلامدا نییە چونکە دەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە بە عەقڵ نەسەلمێندراوە، چونکە بەو هۆیەوە قورئان دابەزیووە، چونکە قورئان تەنها بۆ فێرکردنی خەڵکی نییە بەڵکوو بۆ چاککردنی دۆخەکانیانە، داوای زانست ناکات بەڵکوو داوای ملکەچی و ڕاستگۆیی دەکات، هەروا هەنگاونان بەو ڕێگەیە کە دەزانێ خۆشگوزەرانی مرۆڤ تەنها بە بژێوی کۆمەڵایەتیی دێتەکایەوە.

## ژیاننامەی لە بواری قەزا

لەپاش ئەبوو محەمەدی موغیس بوو بەقازی نەك لەبەر ئەوەی دیار بێ لەناو خەڵکی قورتووبە یان خۆی نیشان بدات بەرامبەر بە پاشاکان و پارە کۆبکاتەوە، بەڵکوو تەنها بۆ ئەوە بوو بەرژەوەندیی قورتووبە و خەڵکەکەی بپارێزێ و خەڵکی ئەندەلووس بەگشتی سوودی لێ وەربگرن.
سەرەتا لە ئیشبیلییە بوو لەوێدا زۆر بەتوانا و کارایی کارەکانی دەکرد و کاتێکیش چووە قورتووبە وەك قازی لەنێوەندی ئەندەلووسدا قازی وا بەتوانای بەخۆیەوە نەگرت بوو.

ئەو وەك كەسێكی دڵفراوان و خۆی بەگەورە نەدەزانی، بەڵام وەك باسمان كرد هەر لەمنداڵییەوە گرنگی بەزانست دەدا، تەنها شەوێكیش وازی لەخوێندنەوە هێنا ئەو كاتەی كە باوكی كۆچیدوایی كرد، باسیش لەوە دەكرێ كە نزیكەی دە هەزار كاغەزی نووسیوە و لەونێوەندە رێزمان و زانستەكانی خوێندوە و زۆر شتی كورتكردووەتەوە، كاتێكیش كە فتوای دەدا لەرووی فقهیەوە بەشێوەیەكی رێكوپێك و ئەدەبی دەینووسی، ئەو وەك كەسێك ناسراو بوو كە زانستەكان لەخۆ دەگرێ، هەردەم شیعرەكانی حەبیب و موتەنەبی ئەزبەر دەكرد و لەكاتی خۆیدا دەیگوتەوە، هەروا كەسێكی شارەزا بوو لە پزشكی و پۆلێنكردن و زانستی ماناكان و خستنە رووی ئەو مانایانە.

قازی ئەبوومەروان باجی باسی ئەو دەكات و دەڵێت "قازی ئەبوو وەلیدی ئیبن رووشد بۆچوونەكانی راستكۆیانە و ژیرانە بوو، كەسێك بوو دەروونی بەهێز بوو و زیاتر خەرێكی زانستەكانی كەلام و فەلسەفە و زانستە سەرەتاییەكان بوو تا وایلێهات وەك نموونە باس دەكرا لەزیرەكی، یەكێك لەوتەكانیشی كە باسی لێوە دەكرێ تیایدا دەڵێت "ئەوەی كاری لەسەر زانستی توێكاریی كرد بڕوای زیاتر بەخوای گەورە دەبێ".

سەبارەت بەو میرەی، كە نسكۆی بە ئیبن رووشد هێنا لەسەردەمی خۆیدا ئەوە بەدەردەكەوێ كە یەعقووب هەڵبژێردرا تا ببێتە میری ئیمانداران، ئەمەو ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلەكان باس لەوە دەكەن كە یوسف كۆچی دوایی كرد هیچ وەسیەتی نەبوو تا یەكێك لەكوڕەكانی لەپاش خۆی جێی بگرێتەوە، بەڵام هەمووان وەك سەركردەكانی موحەدین و كوڕەكانی عەبدولموئمین لەسەر ئەوە رێككەوتن كە یەعقووبی كوڕی یووسف ببێتە میر لەو كاتەی كە باوكی كۆچیدوایی كرد، ئەمەش وەك بەڵگەیەك لەسەردەمی خۆیدا كارەكانی بەباشی

دەکرد، وەك ئاڵای جیهادی بەرزکردەوە و دادپەروەری هێنا ئـارا و لـەڕووی شەرعییەوە هەموو کارەکانی ئاسان کرد، بە شێوەیەك سەیری ئایینی دەکرد، کە چاکە بکەن و دووربکەونەوە لەخراپـە هـەتا ئەمـە لەنێوەنـدی کەسـان و هۆزەکەشی پەیڕەو دەکرد و دواتریش لەسەر هەموو خەڵکیدا کردیە کردەیی، ئەمەو سەردەمی ئەو سەقامگیر بوو و واڵاکردنەکانیش بەرەو مەزنی هەنگاوی نا.

## سەربەخۆی دادوەری - قەزا لەبەرامبەر دەسەڵاتی جێبەجێکردن

یەکێك لەکارە دادپەروەریەکانی کە باسی لێوە دەکەن میر شێخ ئەبووحەفصی عومەر کوڕی مـیر ئـەبوو زەکریـا یـەحیای خـاوەنی ئـەفریقیا خۆشـکی مـیر یەعقووبی خواستبوو وەك هاوسەری، بەڵام بـەهۆی کێشـەیەکەوە ئاڵۆزیـەك کەوتە نێوانیان و بۆ ئەمەش خوشکەکەی میر گەڕایـەوە لای براکـەی، بـەڵام پیاوەکەی چەند جارێك داوای کردەوە، بەڵام ئەو، داواکاریەکەی رەتکردەوە، لەدواتردا لەلای قازی مەراکشی سکاڵای پێشکەش کرد، دواتـر ئـیبن رووشـد لەتەك میردا کۆبووەوە و بەمیری گوت "شێخ ئەبوو محەمەد عەبدولواحید داوای کەسی خۆی دەکاتەوە" لەوکاتەدا میر یەعقووب بێ دەنگ و قازیش سێ جار لێی دووبارە کردەوە کەچی ئەو هەر بێدەنگ بوو، لەپاشاندا قازی بەمیری گوت "یان ئەوەتا دەچێتەوە لای کەسی خۆی یان ئەوەتا لە قەزا لام ببە".

بۆ دووبارە یەعقووب بێدەنگ بوو، بەڵام بانگی یەکێك لە خزمەتکارەکانی کرد و بەنهێنی پێی گوت "کەسی شێخ عەبدولواحید بگەڕێنـەوە"، هـەر ئـەو رۆژە گەڕایەوە، بۆ ئەمەش قازیش نەگۆڕدرا و هیچ شتێکی خراپ نەهاتە کایـەوە، ئەمەش چاکەکاریەکە بۆ دادپەروەریی قازی دەگەڕێتەوە.

زۆرجاران ئەو کەسانەی دەکوشت کە مەییان خواردبووەوە، یاخود ئەو کرێکارانەی دەکوشت کە خاوەن کار سکاڵای دژیان پێشکەش دەکرد.

"شەمسی دەوڵەت عەبدولڕەحمانی کوڕی مورشد نوێنەرێکی بۆ لای نارد تا فریای بکەوێ نەوەک فەرەنجیەکان بگەنە وڵاتی مەغریب و دواتر وڵاتی میسر داگیر بکەن و بگەنە کەنارەکانی شام ئەمەش لەساڵی ٥٨٧ك بوو".

هیچ کاتێك بەناوی بەناوی میری ئیمانداران بانگی میری نەکردووە، بەڵکوو بە ناوی میری موسڵمانان بانگی کردووە، ئەمەش لەلای میر گرنگ بووە، بۆیە داوای هەرچی بکردبووایە بۆی جێبەجێ دەکرد.

## پەیوەندی ئیبن رووشد لەگەڵ خەلیفە یووسف کوڕی عەبدولموئمین

کە باوکی خەلیفە یەعقووب مەنسوورە، هەروا چۆن ئیبن رووشد بەهۆی ئیبن توفەیلەوە پەیوەندی بە خەلیفەکانەوە کرد، ئەمەش بەڵگەیە کە یووسف زانست و زانایانی خۆشویستووە

کاتێك ئەبوو یەعقووب یوسف کوڕی عەبدولموئمین ئاواتی ئەوە بوو تا شکۆی بەرز بێ لەرووی فەلسەفییەوە، زۆرێك لە کتێبەکانی کۆکردەوە و سەرەتاش بە پزیشکی دەستی پێ کرد، بۆی دەرکەوت ئەو کتێبانەی کە پەیوەستن بە زاستەوە شتێکی وای لێ نازانێ، بەڵام زۆرێك لەکتێبەکانی فەلسەفەشی کۆکردەوە، واتە پێش ئەوەی بەدوای زاناکان بگەڕێ لەخۆی نزیکی بکاتەوە، کاتێك ئەو کتێبانەی کۆکردەوە بۆ هەر کوێیەك بچووبایە ئەوا ئەو کتێبانەی لەتەکدا بوون، هەروا ئەو زانایەی کە لەتەك خەلیفەدا بوو لەگەڕانەکانیدا ئەبو بەکری محەمەدی ئیبن توفەیلێ بوو کە یەکێکە لە فەیلەسووفەکانی ئیسلام لە ئەندەلووس، هەروا لەزۆربەی وڵاتەکاندا زانایانی کۆدەکردەوە و بە خەلیفەی

دەناساند، هەر ئەویش ئیبن ڕووشدی پێ ناساند لەمەوەش خەلیفە زانی کە بەهای ئەو زانایە چەندە.

## یەکەم دانیشتن لەنێوان خەلیفە یوسف و ئیبن ڕووشد

### چۆن باسی فەلسەفەیان کرد

محێدین لە کتێبەکەیدا بەناوی (المعجب) کە لە فەقیە ئەبوو بەکری بندودی کوڕی یەحیا قورتوویی دەگێڕێتەوە کە یەکێك بوو لە قوتابیانی ئیبن ڕووشد باس لەوە دەکات کە "گوێم لە ئەبوو وەلید بووە چەند جارێك کاتێك چووەتە لای میری ئیمانداران بینیویەتی خۆی و ئیبن توفەیل دانیشتوون، ئەمەو ئیبن توفەیل باسی لە زیرەکی ئیبن ڕووشدی کردووە، هەروا هەر ئەو چاکەکارییە بۆ ئەو دەگەڕێنێتەوە، هەروا دەڵێت یەکەم جار میری ئیمانداران پرسیاری و ناو و ناوی باوکم و ڕەچەڵەکی کردم و هەروا گوتی "بۆچوونت چییە سەبارەت بەئاسمات (مەبەستی فەلسەفە بوو) ئایا کۆنە یان جۆرێك لەڕووداوەکان" من لێرەدا ترسم لێ نیشت، بۆیە نکۆڵیم لەوە کرد کە سەرقاڵی فەلسەفە بووبم، ئەوەم نەدەزانی کە خۆی و ئیبن توفەیل باسی منیان کردووە بۆیە یەکسەر میری ئیمانداران تێگەیشت، لەلایەکی دیکەوە پرسیاری ئەوەی لێ کردم کە ئەرستۆ و ئەفلاتوون چییان گوتووە، ئەمەش لەلایەن ئیسلامەوە ڕەت دەکرێتەوە، هەستم بەوە کرد کەزانیاریەکی زۆری هەیە، دواتر قسەی زۆرمان کرد و درکی بەوە کرد، کە چی دەزانم، کاتێك کە ڕۆیشتم هەستم بەوە کرد کە کەشتیەکەی داوەتە دەستی من".

## پێشنیازی خەلیفە یوسف

بۆ ئیبن رووشد تا ئەرستۆ وەرگێڕێ و ئیبن توفەیلیش لەو نێوەندە دابێ لەپاشاندا ئەبوو بەکری کوڕی توفەیل بانگی کردم و باسی ئەوەی ئەوەی کرد کە میری ئیمانداران سکاڵای لە دەربڕینەکانی وەرگێڕەکان هەیە سەبارەت بە نووسینەکانی ئەرستۆ کەبەشێوەیەکی نەگونجاو باس لەلایەنەکانی نووسینەکانی دەکەن و گوتوویەتی "ئەگەر کەسێك هەبێ ئەم کتێبانە پوختە بکاتەوە و مەبەست و شتەکان لەیەکتر نزیك بکاتەوە لەپاش ئەوەی بەتەواوی تێی بگات، لەخەڵکی نزیك بکاتەوە" ئەوا گەورەترین شکۆیە بۆی و پاداشتی گەورەی پێ دەبەخشرێ، بۆیە من ئێستا تەمەنم گەورە بووە و ناتوانم (ئیبن توفەیل وادەڵێت) بۆیە دەکرێ تۆ بە مێشکێکی ساف و دەروونێکی پاك خەریکی ئەو کارانە بیت.

ئەبو وەلیدی ئیبن رووشد دەڵێت "ئەمە وایکرد کار لەسەر پوختەکردنی کتێبەکانی ئەرستۆتالیسی دانا بکەمەوە"، محێدین دەڵێ "بینیم ئەبوو وەلید ئەو کتێبانەی لەیەك کتێبدا کورت کردەوە کە خۆی سەد و پەنجا کاغەز خۆی دەنواند، تیایدا هەموو کورتکراوەکانی ڕێکخستبوو لەنێوەندی ئەوان کتێبی ئاسمان و گەردوون و گەندەڵی و شوێنەوار و هەست و هەستیاری، لەپاش ئەوەی کورتی کردەوە مەبەستەکانی روونکردەوە لەکتێبێکی ئاساندا ئەمەش لەنێوەندی کتێبێکی چوار بەرگدا، هاوکات لەو سەردەمەدا کەسێکی وا نەبوو بەو جۆرە کارەکان بخاتە رووی خانەوادەی بەنی عەبدولموئمین"!!

ئەمە کۆی باس و خواسەکانی پەیوەندی ئیبن رووشدە بە خەلیفە یووسف عەبدولموئمین کە باوکی خەلیفە یەعقووب مەنسوورە، کە لەدواتردا ئەو فەیلەسووفەی تووشی نسکۆی و دوورخستنەوە کرد.

## میر یەعقووب مەنسوور و ئیبن رووشد

باسی ئەوەمان کرد کە ئیبن رووشد باسەکانی خوێندوونەتەوە و زۆربەی باسەکانی وەرگێڕاوە و توێژینەوەی لەسەر کردوون لەلایەك و لەلایەکی دیکەوە کورت و پوختی کردووەتەوە ئەمەش وایکرد ئەنجام و هۆکاری هەبێ لە مێژووی ئیسلامدا، هەروا ببێتە رووبەك بۆ مێژووی فەلسەفە کە جەختی لە لێکدانەوە و وردبوونەوە دەکرد تا بگەینە راستی و هەڵوێست وەرگرتن تا بزانین لەکوێدا قسە بکەین یان بێ دەنگ بین.

هەر ئەویش بوو ئیبن رووشدی تووشی ئەشکەنجە و ئازار و نسکۆ کرد، ئەو خەلیفەیە چوارەم خەلیفەی موحیدەکان بوو، بەڵام کاتێك نێوەندی مێژووەکەی هەڵدەدەینەوە تا بزانین ئەو شێوەیە نسکۆیە تەنها بەهۆی میرەوە بووە یان لەو سەردەمەدا خەڵکەکە ئەو شێوەیان قبووڵ نەکردووە، ئایا میر کەسێکی عەقڵ تەندروست بوو و هەستی بەبەرپرسیارەیەتی کردووە لەبەرامبەر مێژوودا یان تەنها کەسێکی بێ عەقڵ بوو و بەئارەزووی خۆی و ئەوەی بەعەقڵیدا هاتووە کردوویەتی، چونکە ئەو لەسەرووی دەسەڵاتەوە بووە و ئەمەش وای کردووە هەردەم لووتبەرز بێ کە هەردەم لەنێوەندی کۆشکەکاندا دەیبینین.

بەڵام پێدەچێ نسکۆی ئیبن رووشد کارێکی گشتی بێ و بە پێیی سیاسەت و ئایینی و کۆمەڵایەتی ئەو رۆژگارە بێ و بۆیە سزایاندا و دادگایەکی داپڵۆسێنەر سزای دا، لەتەك ئەوەی کتێبی وا لەبەردەستدا نییە تا ئەم بابەتە بە تەواوی بپشکنین چونکە موسڵمانی ئەندەلووس هیچ تۆمار وشوێنەوارێکیان بەجێ نەهێشتووە دوای ئەوەی ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە هەر وەك چۆن هەندێك لە مەمالیکەکانی ئەورووپیش وان، لەتەك ئەوەدا موسڵمان کاتێ بەجێیان

هێشت ئیسپانیەکان هەموو شتێکیان سووتاند ئەمەش بەهۆی دەمارگیری ئایینیەوە هاتە کایەوە، ئەمەش وایکرد پاشماوە و شوێنەواری موسڵمان کەس سوودی لێ نەبینێ، بۆیە توێژینەوەکەمان تەنها لەنێوەندێکدا گیری خواردووە.

## مێژووی ئەو میرەی نسکۆی بە ئیبن رووشد هێنا

یەعقووبی کوڕی یوسف کوڕی عەبدولموئمین کوڕی عەلی چوارەم خەلیفەی دەوڵەتی موەحەدین کە لەلایەن بەسووس محەمەد کوڕی تومرت دامەزراوە کە بەمەهدی ناسراو بوو لەسەدەی شەشەمی کۆچی ٥١٥ك.

یەعقووب لەدوای یوسفی باوکی بوو بە میر لەساڵی ٥٨٠ ئەو کات تەمەنی سی و دوو ساڵ بوو و هەروا ماوەی فەمانڕەوایەکەشی شانزدە ساڵ و هەشت و مانگی خایاند و لەساڵی ٥٩٥ك کۆچیدوایی کرد، ئەو کاتیش تەمەنی چل و هەشت ساڵ بوو، دایکی ناوی "کارمن"بوو و وای دەبینی ئەو لەرەچەڵەکێکی تێکەڵە و نەوەی چوارەمی دامەزرێنەری دەوڵەتی رۆژهەڵاتە لەرۆژئاوا، دیارە ئاکارەکانیش لەنێوەندی نەوەکاندا گۆڕانکاری بەسەردا دێ.

سەردەمی ئەو پڕ بوو لە جەنگی و غەزەوات و پشێویی و فیتنە ئەمەو لەساڵی ٥٨٠ك لەسەرەتای فەرمانڕەوایییەکەی میرقیونەکان بەسەرکردایەتی ئیبن غانیە کە عەلی کوڕی ئیبن غانیە بوو هێرشیان کردە سەر شاری بجایە و هەموو موەحەدینەکانیان تیایدا دەرکرد، هاوکات یەعقووب بەرامبەریان وەستایەوە لە حسامەی دقیۆسدا شکستی پێهێنان، کاتیکیش گەڕایەوە شاری قەفسە لەدژی راپەڕین بەڵام ئەو سوپاکەی گەمارۆی شارەکەیاندا و کاتێك چوونە نێو شارەکە زۆر کەسی شارەکەیان کوشت.

لەساڵە ٥٨٥ك بوترسی کوڕی ڕۆدریج (بەترۆ کوڕی ریق) هێرشی کردە سەر شاری شەلەبی ئەندەلووسی و دەستیان بەسەردا گرت، لەپاشاندا سوپای یەعقووب خۆیان ڕێکخست و پوترسیان لەو شارە دەرکرد و هەموو قەڵاکانیان لە ئەفرەنج وەرگرتەوە، هەروا لەساڵی ٥٩٠ك لە (فحص الجديد) کە شوێنێکە لەنێوان ئیشبیلییە و تلێلە شکستیان بە سوپای فونس هێنا و لەساڵی دواتردا هێرشی کردە سەر تلێلە و چووە ناو خاکی ئسیپانیا و لەمەوەش فۆنس داوای هودنەی کرد بۆ ماوەی دە ساڵ.

## دەیویست میسر داگیر بکات

ئەو دەیویست میسر داگیر بکات چونکە هەردەم باسی لەوە دەکرد دەبێ کۆتایی بەخراپەکارەکان بهێنێ و دەیگوت "لەپەنای خودا پاکی دەکەمەوە" بەڵام نەیتوانی ئەم کارە بکات، زوو کۆچیدوایی کرد لەو کاتەش هودنە لەنێوان خۆیی و فۆنس هەبوو.

## برا و مامی کوشت

برا و مامەکانی دوژمنی سەرسەختی بوون و هەردەم پێیان وابوو ئەو ناتوانێ ببێتە میری ئیمارەت، بەڵام دوای ئەوەی بە سەربازەکانی دەریای بڕی تا گەیشتە شاری سەلا و لەوێدا بەیعەی پێ بەخشرا، لەمەوەش مام و براکانی دژی وەستان و پارەیەکی زۆریان خەرج کرد تا ئەو نەبێتە میر، بۆیە میر فەرمانی دەرکرد تا ئەبوو حەفصی عومەری برای و مامەکەی سلێمان کوڕی عەبدولموئمین دەستگیر بکرێ و بهێندرێتە شار بەدەست بەستراوی، کاتێك کە نزیکی مەراکش بوونەوە نامەیەکی بۆ سوپاکەی نووسی تا بیانکوژن، تەنهاش نوێژیان لەسەر بکرێ و دواتر بیانخەنە گۆڕەوە، ئەوەی ئەو کارەشی کرد

نامەیەکی بۆ میر نووسی کە تیایدا هاتبوو "گۆڕەکەی بە کدان و رووخام بۆیان دورست کرد" لەوەڵامی ئەو نامەیەدا میر نووسیبووی "خۆی ئەوانە کەسانی مەزن نەبوون، بەڵکوو ئەوانە دوو پیاوی موسڵمانن، وا بیانێژن چۆن موسڵمانان دەنێژرێن".

لەلایەکی دیکەوە لەنێوەندی جەنگەکاندا خودی خۆی تیایدا بوو و رێگری لەهەموو پشێویی و فیتنەکان دەگرت، بەڵام تووشی نەخۆشییەك بووەوە، لەو کاتەدا برایەکی هیوای دەخواست جێگەکەی بگرێتەوە کە ناوی ئەبوو یەحیا بوو، بەڵام ئەویشیان دەستگیر کرد و فەرمانی کوشتنی دا، لەبەرامبەر خەڵکیدا کوشتی و فەرمانیدا هەموو میرەکانی دی دا بە سەرکۆتی و بەپێ خاوسی لەنێوەندی خەڵکیدا بسوڕێنەوە.

## ئاکار و رەوشتی میر

کەسێکی بەتوانا و زیرەك بوو و گومانی لەهەموو شتێکی دەوربەری هەبوو و هەردەم بەچاوی خێر و شەڕ دەیڕوانیە دەورووبەری، کاتێك لەسەردەمی باوکی کاروباری وەزارەتی وەرگرت لەهەموو شتێکی دەکۆڵیەوە بەتایبەتی لەرووی کارگێڕی و سەرکردەی ویلایەتەکان، هەردەمیش خەڵکێکی لەدەوربەردا هەبوو هەموو شتە وردەکانیان پێ رادەگەیاند، ئەویش بەپێی کاری ئەو سەردەمە هەڵسوکەوتی لەتەکدا دەکرد.

## خراپەکاریەکانی لەسەردەمی گە نجیەتیدا

مێژوونووسان ئەوە دەگێڕنەوە کە نزیکەکانی لەسەردەمی لاوەیەتیدا زۆر رق و کینەیان بەرامبەری هەبوو، چونکە هەر لەسەرەتادا برا و مامی خۆی کوشت و هەموو میرەکانی دیکەشی لەنێوەندی ترسدا هێشتەوە.

**دەیویست دادپەروەری لەنێوەندی خەڵکیدا بێتە ئاراوە**

لەسەردەم و رۆژگاری خۆیدا بە هەموو توانایەکەوە هەوڵی ئەوەی دەدا لەنێوەندی هەرێم و نەتەوەکەی دادپەروەری بێتە ئارا، گەورە و بچووکی بەیەك چاو سەیر دەکرد، رۆژێك دوو کەس لە نیو درهەم بووە شەڕیان ئەویش لەنێوەندیان دادپەروەری ئەنجامدا و فەرمانی بە وەزیر ئەبوو یەحیای کارگێڕی پۆلیس کرد لەهەردووکیان بدا، بەڵام بەسووکی تا لەنێوەندی خەڵکیدا ئەو کارە دووبارە نەکەنەوە، دواتریش تەنها خۆی وەك دادگایەکی باڵای کاری دادپەروەری دەکرد.

کاتێك ئەبوو قاسم بوو بە قازی یەکێك لەمەرجەکانی ئەوە بوو لەتەکیدا دابنیشێ تا گوێی لەدانایی و فەرمانەکانی بێ، ئەمەو لەنێوەندی قازی و ئەمیری ئیمانداران تەنها چەند تەختەدارێك هەبوو، هەروا دووهەفتە جارێك بانگی پیر و خاوەن دوکان و بازاڕەکانی دەکرد تا لەنزیکەوە باسی بازاڕ و دۆخەکەی بۆ بکەن و لەنزیکەوە ئاگاداری هەموو نرخەکان بێ، هەردەمیش پێ ڕادەگەیاندن کە ئەوان لەرۆژی دوایی و قیامەتدا بەرپرسن بەرامبەر خودا بۆیە هەردەم تەنها راستی بێژن!

**کەسێکی خێرۆمەند بوو**

لەنێوەندی شاری مەراکشدا نەخۆشخانەیەکی بنیاتنا، مێژوونووسان پێیان وایە کەس وەك ئەو نەبووە، ئەمەو لەنێوەندی گۆڕەپانێکی فراواندا نەخۆشخانەیەکی بنیاتنا و رۆژانەش سی دیناری دەدا تا خواردن دروست بکرێ و دەرمانی پێ بکڕدرێ، هەروا چەند دەرمانخانەیەکی لەوێدا دروست کرد کە چەندان جۆری دەرمانی تیا بوو، هەروا جلوبەرگیان دەدوری بۆ نەخۆشەکان، بەتایبەتی جلوبەرگی رۆژ جیا بوو لە جلوبەرگی شەوان وەك چۆن جلوبەرگی

هاوین جیا بوو لە جلوبەرگی زستان، کاتێك کە هەست دەکرا نەخۆشەکە کەسێکی بێ دەرتان و هەژارە ئەوا پارەیەکیان پێ دەبەخشی تا ئەو کاتەی دەیتوانی کارێك بکات، هیچ کاتێك جیاوازی لەنێوان هەژار و دەوڵەمەند نەدەکرد، هەر کاتێك کەسێك نەخۆش دەکەوت ئەگەر بوار هەبوایە ئەوا بەدەرمان و چارەسەریەکان چارەسەر دەکرا یان ئەوەتا دەمرد و هەر کاتێك نامۆیەك یان بیانیەك دەچووە ئەو نەخۆشخانەیە ئەوا هیچ پارەیەکیان لێ وەرنەدەگرت و ناویان لە نەخۆشخانەکە نابوو نەخۆشخانەی خێرکردن.

ئارەزووی لەوە بوو سەدەقە بدات خەڵك بەشێوەیەکی رێکخراو زۆرجار سەدەقەی دەبەخشی و زۆرجاریش چل دیناری دەکردە سەدەقە بۆ خەڵکی گشتی دەنارد و هەندێکی دیکە دەبەخشییە نزیکەکانی، ئەمە و شاری مەراکشیان کردبووە چوار بەش و بەمشێوەیە سەدەقەی پێدەبەخشین هەرکاتێك ساڵ نوێ دەبووەوە فەرمانی دەدا سەدەقە ببەخشرێتە بێ کەسەکان بۆی ئەمەش هەموو ئەمانە لەنزیك کۆشك کۆدەبوونەوە و فەرمان دەدرا هەر منداڵێك مسقاڵێك پارەی پێ بدرێ لەتەك نان و هەنارێك.

## بڕوای بە ئەفسانەکان نەبوو

رۆژێك کە بەشوێنێکدا تێپەڕ دەبوو گوێبیستی چەند ئافرەتێك بوو باسی باپیرانی ئەویان دەکرد واتە ئیبن تومرت کە بە مەهدی ناسراو بوو، ئەو ئافرتانە دەیانگوت "ئیمام مەهدی راستی دەکرد کە ئێمە دەبینە خاوەن ئیمامێکی راستەقینە"، ئەویش زۆر ناخۆشیەوە بزەیەکی کرد و پێی گوتن شتێکی وا نابیندرێ، ئەبوو عەباسی ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی مەترەفی مەریی

گوتوویەتی "رۆژێك كارێكم نەكردووە كە وابزانم ئیمام نییە" بەڵام ئەو لەوەڵامدا گوتوویەتی "ئەی عەباس ئیمام لە كوێیە".

## رقی لەماستاوچییەكان بوو

ئەبو بەكری كوڕی هانی گوتوویەتی "كاتێك میری ئیمانداران گەڕایەوە لە واڵاكردنی ئەرك كە تیایدا شكستی بە ئۆفس هێنا و لەتەك هاوەڵەكانی ویستیان قسە لەگەڵ خەڵكی گشتیی بكەن، پرسیارێكی لێ كردم كە دۆخی ویلایەتەكان و كارگێڕەكان چۆنە، كاتێك من سوپاسم كرد ئەو لەوەڵامدا گوتی تۆ هیچ زانیاریەكت نەبەخشیە منَ، منیش پێم گوت ئێمە لەسەر ڕێبازی ئیبن تومرت هەنگاو دەنێین، بۆیە بەتوڕەییەوە وەڵامی دایەوە "تۆ كتێبی خودات خوێندووەتەوە و هەروا سوونەتت خوێندووەتەوە، كەچی بەئارەزووی خۆت قسە دەكەی".

## ئارەزووی لەبنیاتنان بوو

دەستی كرد بەبنیاتنانی شارێكی مەزن لەسەر كەناری دەریا و زێدا و دوای ئەوەی دیوارێكی لەدەوردا كرد و مزگەوتێكی مەزنی لەنێویدا بنیاتنا كە رووبەرەكەی زۆر فراوان بوو، هەروا جێگەی بانگدانی لەشوێنێكی بەرزدا دروستكرد لەسەر شێوەی منارەی ئەسكەندەرییە، ئەمەو شارەكە تەواو بوو ئەو كاتەی ئەو لەژیاندا بوو، هاوكات دیوار و دەروازەكەی و زۆرێك لەخانووەكانی نێو شارەكەی تەواو كرد، لەلایەكی دیكەوە بەدرێژایی سەردەمەكەی تا ساڵی ٥٩٤ك كار تیایدا بەردەوام بوو.

## خۆشەویستی هەبوو بۆ قوتابیان و خوێندکاران

قوتابیان و خوێندکاران گرنگیەکی زۆریان پێ دەدرا لەسەردەمەکەی کە بەهیچ شێوەیەك لەسەردەمی باوك و باپیری بەو شێوەیە گرنگی بەقوتابیان نەدەدرا، هەروا قوتابیانی لەخۆی نزیك دەکردەوە بەوەی زانست و زانیاری دەهێننە کایەوە و هەردەمیش دەیگوت "ئەی موەحیدیەکان ئێوە دەتوانن هۆزەکەمان بەرەو پێش ببەن، ئەوەی ئەمڕۆش بنیاتنراوە بە هۆیی ڕێز و کاری ئێـوەوە بووە".

## چەوساندنەوەی جوولەکەکان لە پاش ئەوەی بوون بە موسڵمان

لەکۆتایی ڕۆژەکانی ئەبی یووسف فەرمانیدا ئەو جولەکانەی بوونەتە ئیسلام جیا بکرێنەوە و دیار بن لەوانی دیکە بەتایبەتی بە نیشانەی جلوبەرگێك، تا ئەو لەژیاندا مابوو بەو شێوەیە مامەڵەی لەتەکیان دەکرد، تا گەیشتە سەردەمی عەبدوڵلای کوڕی، چونکە ئەبوو یووسف گومانی هەبوو لە موسڵمان بوونیان و هەردەم دەیگوت "کاتێك بۆم دەرکەوت ئەوان بە تەواوی بوونەتە موسـڵمان ڕێگە دەدەم لەگەڵ خەڵکی گشتیدا تێکەڵ بن لەهەموو ڕووەکاندا، ئەگەر بۆم دەرکەوت ئەوان هەر گومڕان ئـەوا هـەموویان دەکـوژم و هـەموو گەنجینـە و کچەکانیان دابەش دەکەمە سەر موسڵمانان، بەڵام من نێگەرانم لەجوولەکە و نەسرانیەکان لەپاش ئەوەی یەکانگیری یەکتر بووینەوە، بەڵام ئەو جوولەکانەی بوونەتە موسڵمان لەسەر ملی ئێمەن و منداڵەکانیان قورئان دەخوێنن، خوداش دەزانێ چ لەدڵیاندایە و لەنێو ماڵی خۆیاندا چی دەکەن".

## ئارەزووی لە تەسەووف

لەپاش کوشتنی برا و مامەکەی لە ساڵی سی و شەشی تەمەنیدا، لەپاشاندا بەرەو پاکی و زاهیدی هەنگاوی نا و جلوبەرگی بەجۆرێکی دیکە دەپۆشی کە لەمتەسەووفەکانەوە نزیك بێ، لەو سەردەمەش زۆرێك لەچاکەخوازەکان و کەسانی بەو ناوە ناودار بوون و ئەویش بازاڕێکی بۆ دانان و پایەیان بەرز بۆوە، نامەی بۆ زۆربەی چاکەخوازەکان دەنووسی و داوای نوێژ و سەڵەواتی لێدەکردن، لەپاش ئەوەی بۆ واڵاکردنی دووەم رۆیشت نامەیەکی بۆ وڵاتەکەی نووسی و داوای لێکردن بەدوای چاکەخوازەکان بکەون کە هەردەم ئارەزوویانە خێر و بەرەکەت بەسەر وڵاتدا بکشێ، لەپاشاندا زۆرێك لەوانە لەدەوری کۆبوونەوە و ئینجا گوتی " ئەمانە سەربازن نەك ئەمانە" ئەمە کاتێك ئاماژەی بەسەربازەکانی دیکە دەکرد، کاتێك گەڕایەوە پارەیەکی زۆری دا بەو چاکە خوازانە.

## دژایەتیکردن لەگەڵ مەزهەبی مالیکدا

فەرمانی دا هەموو کتێبەکانی مەزهەبی مالیك بسووتێنن، هەندێك لەمێژوونووسان ئەمەیان بەچاوی خۆیان بینیوە و باس لەوە دەکەن کە زۆرێك لەکتێبەکانی مەزهەبی مالیك بەبار دەهێندرا و دواتریش ئاگری تێبەردەدرا تا بەهەموو شێوەیەك لەمەغریبدا ئەو مەزهەبە لەناو ببات، ئەمەش لەسەرەتادا مەبەستی باوك و باپیرەی بوو، بەڵام لەسەردەمی یەعقووبدا ئەم کارە کرا و داوای لەخەڵك کرد هەر کەسێك کاری خۆی بکات و هیچ پەیوەندیەکی بە بۆچوونەکان نەبێ و ئەوەی ئەو کارەش بکات سزایەکی توندی دەدرێ.

## شاری قورتوبەکە ئیبن رووشد تیایدا گەورە بوو

قورتووبە پایتەختی هەرێمێك بەناوی مەملکەتی ئەندەلووس لە ئیسپانیا دەکەوێتە باشووری سەرووی چیای سیارامورینا و لەکەناری لای راستی زێی دۆڵی گەورە و ٧٥ میل لە ئیشبیلییە دوورە و رۆمانەکان دروستیان کردووە و موسڵمان و عەرەبەکانیش چەندان کۆشك و تەلار و قەڵایان تیادا دروست کردووە هەروا چەندان مزگەوت و قەڵا و پردیان دامەزراند.

گەورەترینیان لەلای باشوورە کە پردی مەزنە کە تیایدا شێوەی تەلارسازیەکی و ئەندازیاری عەرەبی دەردەکەوێ، ئەمەش جوانی ئەندازەی ئەندەلووسییە، بۆ ماوەی سەد و شەست ساڵ ناوی قەنترەی دۆڵ بوو، لەلایەکی دیکەوە میرەکانی ئەندەلووس چەندان کۆشکیان لەوێدا دروست کرد، هەروا عەبدولڕەحمانی یەکەم، مەزنترین مزگەوتی تیادا دروست کرد لەشوێنی پەیکەری رۆمانی، هاوکات مزگەوتەکە لەناویدا جوانکاریەکی بێوێنە لەئارادایە، کە نموونەی باڵایە بۆ هونەری تەلارسازی ئیسلام لە ئەورووپادا.

لە سەرەتای دامەزراندنی قورتووبەدا پیاوە گەورەکانی رۆمانی تیادا نیشتەجێ بوون، ناویان لێنابوو (قورتووبەی رۆژهەڵات) بەهۆی ئەوەی زۆربەی مەزنەکان لەوێدا نیشتەجێ بوون، مێژوونووسانیش ناویان لەوە ناوە قرتاجنبە چ لەناو و لە پێکهاتە، کە یەکێك لە شارە مەزنەکانی ئیسپانیا بوو، باس لەوە دەکرێ قەیسەر لەتەك سەربازەکانی ئەو شارەی گەمارۆداوە لەپاش رووداوی (ئاوندا) و ٢٠٠٠٠ پیاوی لەو پێناودا بە کوشتن داوە.

کاتێك موسڵمان و عەرەبەکان چوونە ناو ئەندەلووس خستیانە سەر خەلافەتی دیمەشق و زۆریشی نەبرد بوو بە پایتەختی وڵاتەکەیان، مێژوونووسان باس لەوە دەکەن لەکاتی شکۆمەندی ئەو شارە ٢٠٠٠٠٠ خانوو بووە و ٦٠٠ مزگەوتی

تیا بووە لەتەك ٩٠٠ گەرماو و چەندان نووسینگەی گشتی و کە هەشت شاری گەورەی بەسەرەوەیە لەگەڵ ٣٠٠ شارۆچکە و ١٢٠٠٠٠ گوند.

زۆربەی پیاوانی شاری قورتووبە کەسانی مەزن بوونە، ئەمەو لەسەردەمی رۆمان تیایدا لۆکان و سنیکا لەوێدا لەدایکبوونە، لەسەردەمی ئیسلامیشدا ئیبن رووشد و قوتابیەکانی و ئیبن حەزم و زۆرێك لەسەرکردە و وێنەگر و نووسەر و چاکەخواز لەوێدا لەدایکبوونە، ئەوەی جێگەی داخیشە هونەرمەند ومێژوونووسانی ئیسپانیا دوای نەمانی دەوڵەتی عەرەبی لەوێدا کۆشکی خەلیفەیان کردە زیندانی و مزگەوتەکەشیان کرد بە کڵێسا.

شارلی پێنجەم گلەیی لەپیاوانی ئایینی کرد کاتێك نامەیەکی ناوداری بۆیان نارد و تیایدا دەڵێت "لەشوێنی مزگەوتەکە شتێکی دیکەتان دامەزراندووە کە نەتانتوانیوە لەهیچ شوێنێکی دیکە شتێکی وا دروست بکەن، بەلام ئێوە شتێکتان تێکداوە کە لەدونیادا نموونەی نەبووە"، بەلام کوا مزگەوتەکە کە کۆرەپانەکەی ١٢٠٠٠ کۆڵەگەی تیا بوو، کوا نۆزدە دەروازەکە کە لەبرۆنز دروست کرابوو، هەمووشی بەدەست ئەو پیشەگەرانە بوو، کە لەدیمەشقەوە هاتبوون بۆ ئەندەلووس ئەمانەش گەورەترین و کاراترین بەهرەمەندی رۆژهەلات بوون!

ئەی کوا ئەو پێنج هەزار چرایەیەی کە بە زەیت کاریان دەکرد و هەموو لایەکی رووناك دەکردەوە و بۆنی هەموو لایەکی دەخرۆشاند، هەروا میحرابەکەی بە زێڕ و شووشە رازابووەوە کە هەموویان رەنگاو رەنگ بوون و لەتەك بەردە پیرۆزەکاندا وەك گومبەتی لوئلوئی لێهاتبوو.

پێدەچێ قورتووبە بەدرێژایی مێژوویی خۆی سەردەمی وەك سەردەمی عەبدلڕەحمانی سێیەمی بەخۆیەوە نەبینی بێ (ناسرەدین الله) ئەو پایتەختێکی

مەزن بوو و گەیشتبووە پلەیەکی بەرز لەسەرکەوتن و پێشکەوتن هاوکات پارە و کشتوکاڵ و بازرگانی بەرەو پێشەوە هەنگاوی دەنا، لەتەك ئەوەی زانست و هونەر و فەلسەفەش هەنگاوێکی گەورەی ناوە، ئەو سەردەمیش رێژەی دانیشتووانی قورتوبە بەهەمان شێوەی دانیشتووانی قاهیرە بوو، کە تیایدا ٣٠٠٠ مزگەوت و ١١٣٠٠٠ خانوو و ٣٠٠ گەرماو و ٢٨ شارۆچکەی هەبوو، لەجیهانی ئیسلامیدا شارێکی دیکە بەو شێوەیە نەبوو، تا بەسەریدا سەربکەوێ، تەنها پایتەختی رەشید و مەئموون نەبێ لە بەغدا لای رۆژهەلات و قورتوبەش لە رۆژئاوا، وەك پاریس و لەندەنی سەردەمی ئێستامان.

لەلایەکی دیکەوە هێزی خەلیفە هەمان هێزی پاشا مەزنەکانی ئەو سەردەمە بوو، لەتەك ئەوەی کەشتیەکی گەورە لەژێر سەروەری ئەودا بوو و لەدەریای رۆمدا هاتووچۆی دەکرد، بەمەیش دەستی بەسەر دەریاچەی ئەندلووسدا گرت، هەروا زۆر ئاسان بوو دەست بەسەر (سبوتا)دا بگرێ، کە هاوکات بوو لەگەڵ چیای (تاریق) و (بۆرسەعید)، لەتەك هاوشانبوونی سوپایەکی مەزن، بەپێی قسەی مێژوونووسان بەهێزترین سوپای جیهان بوو کە لەلای راستی باکووری ئیسپانیا دابوو، لەلایەکی دیکەوە مەزنترین پاشای ئەو کاتە رێز و خۆشەویستیان بۆی هەبوو و بەردەوامیش باڵیۆزەکانی پاشا و ئیمپراتۆریەکان سەردانی کۆشکی خەلیفەیان دەکرد وەك باڵیۆزی قوستەنتینیە و پاشاکانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و فەرەنسا.

هەردەم دانیشتنەکانی خەلیفە چەندان ئیمامی موسڵمانانی تێدابوو لەتەك سەرکردەی ئایینەکانی دیکە، هەروەها لەقورتوبە قوتابخانەی زانکۆیی تێدابوو بوو، کە ناودارترین زانکۆکانی جیهانە کە بارەگاکەی مزگەوتی مەزن بوو، وەك پێشتر باسمان کرد، کە بلیمەتەکانی رۆژهەلات و رۆژئاوا لەوێدا وانەیان بە

قوتابیان و خوێندکاران داوە وەك: ئەبوبەکری کوڕی معاویەی قوڕەیشی لەتەك ئەبوعەلی قالی بەغدادی باس لە هیوایەتە ناودارەکانی دەکات لەشێوەی: شیعر، مێژوو، فیقە ، زمان ، ئەدەب. هەروا ئیبن قەتیعە یەکێك بوو لە زانا ناودارەکانی ڕێزمانی عەرەبی لە ئەندەلووس، هەر لەتەك ئەمەش ڕێزمان و سەرفی پێ دەگوتن، لەلایەکی دیکەوە بۆ هەر هونەر و زانستێك مامۆستای تایبەتی خۆی هەبوو.

هەروەها قوتابی و خوێندکاران لە مزگەوتی مەزن لە قورتووبەدا سەدان مامۆستایان هەبوو، زۆربەشیان دەیانویست فێری فیقە بن و ئەو زانستە بەدەست بهێنن و لەناو مزگەوتی گەورەدا حیکمەت وەردەگرن، دیارە مزگەوتی گەورە وەك مزگەوتی ئەزهەر ناوبانگی دەرکردبوو لە پێش هەزار ساڵدا، کە تیایدا جوانی هونەر و دەرچوونی فەیلەسووفەکان دەنوێنێ وەك ئیبن رووشد، لەتەك ئەزهەر کە تائێستا لەکاتی دامەزراندنی نەیتوانیووە کەسێکی وەك ئەو دانایە بخاتە روو، کە تیایدا سوودی بۆ ئاین و دونیا بێ.

## نسکۆی ئیبن رووشد

## قسەیەکی گشتی:

ئیبن رووشد، کەسێك بوو لەڕووی دانایی و زانستەوە جیا بوو لەهەموو ئەوانی دیکە، کاتێکیش لە خەلیفە یووسف ئەبوویەعقووب نزیك بووەوە بەهرەکانی زیاتر چەکەرەی کرد، خەلیفەش هەردەم لەسەرووی زانایانی ئەو سەردەمەی دادەنا، هاوکات کوڕی خەلیفەش، مەنسووری یەعقووبیش بەهەمان شێوە سەیری دەکرد.

ئـەو وەك كەسـێكی زانـا بێگومـان دەوروبەرەكـەی خـاڵی نـەبوو لـە ئێرەیـی سەردەمی خۆیدا، زۆرجاریش ئەو ئێرەییە سوودی بۆ ئەو هەبوو، چونكە ئەو دڵێكی باشی هەبوو و دوور بوو لەئازاردانی كەسانی دیكە، دیارە بەهۆی ئەو سادەیەی زۆر ئازاری دی و بەمەش دڵڕەشەكان زیاتر پلانیان بۆ دەنایـەوە، ئەوەی لەرۆژهەڵات هاتە كایـەوە بەهـەمان شـێوەش لـەرۆژئاوای ئیسـلامیدا بەرپابوو، بەمەش موسڵمانان زۆر بەهێز بوون.

دیارە دوژمنەكانی ئیبن رووشد چـەندان جـار و بـەبێ وەسـتان دەیانویسـت نسكۆی پێبێنن، لەسەرەتادا سەركەوتوو نەبوون، چونكە خەلیفـە مەنسـوور لەسەرەتای رۆژگارەكەی كەسێك بوو ئارەزوویەكی زۆری لەفەلسەفە بوو، بەڵام دژەكانی نەدەوەستان و چاودێری هـەلێكیان دەكـرد، دووبـارە سـەركەوتوو نەبوون كاتێكیش خەلیفە بەرەو تەسەووف و وەلیایەتی رۆیشت، دووبارە ئیبن رووشد ئەسـتێرەی گەشـایەوە، بەتایبـەتی كاتێـك نووسـینە فەلسـەفیەكانی بەشێوەیەكی زانستی بوون، لەكاتێكدا ئیبن رووشد زۆر وردبین بـوو لـەكاری پزیشكی، لەتەك ئەوەی توانی رۆڵی خۆی ببینێ لەبواری شەریعە و قەزادا، ئەم سێ بەهرەیەش هیچ كاتێك لەیەك پیاودا كۆنابنەوە.

كاتێك ئیبن رووشد تەمەنی لەحەفتا ساڵیدا بوو، دووبارە دڵڕەشی دژەكـانی دەستی بەجووڵە كرد، لەو كاتەش هەلیان وەرگرت، كە مەنسوور دەچێتە لای مەشایخەكانی رێگەكانی سۆفیەت، بۆیە خۆیان لە دەست و پێوەندەكانی میر نزیك كردەوە(وەك باویشە لەهەموو رۆژگارێكدا كەسانێك هەن دژ بە ئـازادی عەقڵی مرۆڤایەتین) بەو بیانوەی بەرگری لە شەریعەتی ئیسلام دەكەن، ئەو كات مەنسوور لە شاری قورتوبە نیشتەجێ بووبوو، كاتێكیش دانیشتنەكان زۆر بووان ئەوا زیاتر هیواكانیان دەهاتە دی و دژەكانی ئیبن رووشـدیش زۆر

بوون، بەو شێوەیە زۆر شتیان بە شێوەیەکی درۆیانە بۆ میر روون کردەوە و زیاتریش باسی خراپەکاری ئیبن رووشدیان دەکرد بەتایبەتی لەنێوەندی نووسینەکانی و لەدانیشتنەکان دەخوێندرایەوە و هەموو لایەنەکانی ڕووندەکرایەوە، بەم شێوەیە دژەکانی توانییان درز بخەنە نێو پەیوەندیەکان، تا وایان لەمیر کرد تووڕە بێ بەبیانووی ئەوەی بەرگری لە شەریعەتی ئیسلام دەکەن، دژایەتیکردنەش زۆر بەئاشکرا بوو لەدانیشتنەکانی میر، یەکێك لەمێژوونووسان دەڵێت "هەموو دانیشتنەکان تایبەتکرابوون بەبەرگری کردن لەشەریعەتی ئیسلام".

پێدەچێ دوژمن و دژەکانی ئیبن رووشد داوایان لە خەلیفە کردبێ کە خوێنی ئیبن رووشد بڕژێندرێ تاوەکو شەریعەتی ئیسلام رزگاری بێ لە هەموو خراپەکارەیەکانی ئەو زانایە، بەشێوەیەك ئەو دوژمنانە بتوانن بەرگری لە کیانی خۆیان بکەن، بەڵام خەلیفە زیاتر لێبوردە بوو "بۆیە پێی باشبوو بمینێ نەوەك شمشێر لەدژیدا بەکار بهێندرێ".

## دوژمنەکانی ئیبن رووشد

ئەوانەی کە بەهەموو شێوەیەك ویستوویانە دژایەتی و دوژمنایەتی ئیبن رووشد بکەن زۆر بوون، بەڵام لەمانە قازی ئەبو عامر یەحیا ئیبن ئەبووحسێن کوڕی رەبیع بەبێ ئەوەی هۆیەکی رووکەش هەبێ، لەتەك ئەمانەش کوڕەکانی قازی ئەبووقاسم و ئەبووحسێن و قازی ئەبووعەبدوڵڵا و خەتیب ئەبووعەلی کوڕی حەجاج و زۆری دیکە بەتوندی دژایەتییان دەکرد، کاتێك دژایەتیەکردنەکانیان سەرکەوت و کاریگەری ئەوەیان هەبوو بەخۆی و هەوادار و قوتابیەکانی شار بەدەر بکەن، لەتەك چەندان دانایی دیکە، ئەمەش بووە نسکۆی گشتی

حەکیمان، ئاماژەشیان بەوە کرد تا مەنسوور توڕەیی خۆیی بەبیانووی بەرگری کردن لە ئایین و نەتەوە بێ، تا نسکۆی دانایان زۆر توند بێ، بۆ ئەمەش مەنسوور بە فیقەهای دوڵەتەکەی گوت تا لە مزگەوتی موسڵمانان ئامادەبن و لەوێدا زۆر بەتوندی ئیبن رووشد و ئەوانەی لەگەڵی بوون نەفرەت بکرێن.

## هاوڕێیانی ئیبن رووشد

لەلایەکی دیکەوە هاوڕێیانی ئیبن رووشد چەندان دانا و فەقیهبوون، وەك: ئەبووعەبدوڵڵا کوڕی ئیبراهیمی ئسۆلی، ئەویش بەو ئاگرە سووتا، چونکە ئەویش بەدرێژایی رۆژگارەکە لەتەکیدا بوو، هاوکات ئەبووجەعفەری زەهەبی فەقیە و ئەبوورابعی کەفیف و ئەبووعەباس حافز شاعر قەرای هاوڕێی بوو.

## هۆکارەکانی نسکۆ

سەبارەت بەهۆکارەکانی نسکۆ چەندان بیروبۆچوونی جیا جیا هەبایە کە باس لەدانایی کەسایەتیەکی وەك ئیبن رووشد دەکات، زۆربەی مێژوونووسان دەیانەوێ بیگەڕێننەوە هۆکاری ماددی هەستیار کە خەلیفەی توڕە کردووە، بەڵام دووان لەو مێژوونووسانە لەباسەکە نزیك دەبنەوە یەکێکیان دەڵێت "دوو هۆکار هەیە ئاشکرا و شاراوە، هۆکاری شاراوە گەورەترین هۆکارە لەکاتێکدا ئەبووەلیدی دانا کاتێك کتێبی ئاژەڵی ئەرستۆتالیسی روون دەکردەوە، دواتر کتێبی لۆژیکی هێنا زۆر بە ئاسانی باسی لێوە دەکرد، کاتێك باسی زەرافەی کرد لەنێوەندی خوێندنەوەدا باسی لەشوێنی لەدایکبوون وچۆنیەتی لەدایکبوونی و لەچ شوێنێکدا دەژی باسی لەوەش کرد کە "پاشاکانی بەربەر بینیویانە" لەکاتێکدا ئەو پاشایانە لەرێگەی زاناکانەوە ئەو ئاژەڵەیان بینیوە و

دواتر چەندان وڵات و هەرێم گەڕاون و ئەو زانایانەش لەهەندێك كاتدا ئەو قسانەیان وەك بەزمێك باس دەكرد، باسیش لەوە دەكرێ لەو كاتەدا پاشا هیچ ئاگاداری ئەبووەلید نەبووە ".

مێژوونووسێكی دیكە دەڵێت "كەسانێك كە دژی خەڵكی قورتووبە بوون، كاتێك لەلای ئەبوویووسف داوەت بوون و داوایان لێكرد كە هەندێك كتێب بەكورتكراوی پێشكەشیان بكات، كاتێك ئەو كورتكراوەنەی ئیبن رووشدیان پێ بەخشرا، بینیان نووسراوێك نووسراوە سەبارەت بەهەندێك فەیلەسووفەكانی دێرین و تیایدا هاتووە كە "گوڵ یەكێكە لە خواوەندەكان"، لەبەر ئەمەش هەڵوەستیان لەسەر ئیبن رووشد وەرگرت، لەپاش ئەوەی هەموو سەركردە و پیاوماقووڵانی هەر چینێكیان كۆكردەوە لەشاری قورتووبە، لەپاشاندا خەلیفە بە ئیبن رووشدی گوت ئەمە دەستخەتی تۆیە؟ بەڵام ئەو نكۆڵی كرد، میری ئیماندران گوتی "نەفرەت لەو كەسە بێ ئەو نووسینەی نووسیوە" و داوای لە ئامادەبووان كرد نەفرەتی بكەن، دواتر فەرمانیدا دەری بكەن و هەموو ئەوانەش دوور بخرێنەوە كەباس لەو بابەتە دەكەن، هەروا داوا لەهەموو خەڵكی وڵات كرا كە واز لەو زانستانە بێنن و هەموو كتێبەكانی فەلسەفە بسووتێنن، بەڵام كتێبی پزیشكی و ژمێریاری و ئەو باسانەی كە پەیوەندارە بە ئەستێرەناسی و زانینی كاتەكانی شەو و رۆژ جێگەی بگرێتەوە بەم شێوەیە ئەو كتێبانە لەهەموو وڵاتدا بڵاوبوونەوە.

كاتێك میر گەڕایەوە مەراكش وازی لەم بابەتە هێنا و زیاتر رووی لەفەلسەفە كرد و چەند كەسێكی نارد تا ئەبووەلید لە ئەندەلووسەوە بهێنە مەراكش تا بكەوێتە بەر لێبووردنی خەلیفە، كاتێك ئیبن رووشد گەڕایەوە مەراكش نەخۆش كەوت و لەپاشاندا بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە مرد، واتە لەكۆتایی ساڵی ٥٩٤ك،

ئەو کات تەمەنی حەفتا ساڵ بوو، زۆری پێنەچوو میری ئیمانداریش کۆچیدوایی کرد واتە لەمانگی سەفەری ساڵی ٥٩٥ك.

یەکێکی دیکە سەبارەت بەهۆکاری نسکۆکە دەڵێن "کاتێك ئەبوویەحیا والی قورتووبە بوو لەو سەردەمەدا شێخ ئەبوومحەمەد عەبدولکەبیر پەیوەندییان بە ئیبن رووشدەوە کردووە، لەدواتردا بینوویانە چووەتە نوێژ و یەك جار بەدەست پێیەکانی پاك کردۆتەوە، دواتر باس لەوە کراوە بەپێی ساڵی فالگرەوەکان رۆژێك بایەکی گەورە هەڵدەکات، لەو ساڵەشدا خەڵك بەگشتی بەرەو هەڵدێر دەڕۆن، خەڵکیش لەو رۆژە زۆر ترسان و ترس و دڵە راوکێی خستە دەروونی هاوولاتیان بۆیە لەنێو خانووەکانیان چەندان پەناگەیان دروست کرد، نەوەك ئەو بایە لەناویان ببات. کاتێك باسەکە زیاتر پەرەی سەند والی قورتووبە خەڵکی کۆکردەوە و باسی بۆ کردن، لەنێو ئەوانەی کە لەوێدا بوون ئیبن رووشد قازی قورتووبە بوو هەروا ئیبن بەندودیش لەوێدا بوو کاتێك کە لەلای والی رۆیشتن ئیبن بەندود و ئیبن رووشد باسی ئەو بایەیان کرد کە شتێکی سروشتییە و کاریگەری هەسارەکانە، هەروا ئەبوومحەمەد عەبدولکەبیر باس لەوە دەکات لەنێوەندی خەڵکەکەدا لەوێ بووم ئەگەر ئەو بایە راست بێ ئەوا بۆ دووەم جارە با و زریانێك خەڵك بەرەو نەمان دەبات، ئەمەش لەلایەن خوداوە دێ، لەمبارەیەوە فالیری دەڵێت "ئیبن رووشد خۆی پێنەگیرا بۆیە گوتی بوون و گەڕانەوەی گەلی عاد هیچ بوونێکی نییە! ئەی چۆن هۆکاری هەیە بۆ لەناوچوونیان" کاتێك ئەم قسەیە لەنێو ئامادەبوواندا بڵاوکرایەوە کردیان بەشتێکی زۆر گەورە و بەوەی گومڕا بووە درۆ بەدەمی قورئانەوە دەکات، ئەو شتانەی دەیڵێت پووچە.

## سزا و لێبووردن
## لە نجوومەنی دادگایی

کاتێك ئیبن رووشد و هاوەڵانی ئامادەبوون لە مزگەوتی گەورە لە قورتووبە، ئەو کاتە خەلیفە دانیشتنەکەی تەواو کرد لەو کاتەدا قازی ئەبووعەبدوڵڵا کوڕی مەروان هەڵسایەوە و وتارێکی پێشکەش کرد کە بەخستنە رووی داواکاری گشتی دەچوو، مەبەستی ئەو قازیەش هەلێك بوو تا داواکاریەك لە دژی ئیبن رووشد بەرز بکاتەوە.

## داواکاریەکانی قازی ئەبووعەبدوڵلا

قازی گوتی: شتەکان لایەنێکی بەسوودیان هەیە و لایەنێکیش زیانی پێدەگەیەنێ وەك ئاگر و شتەکانی دی، کاتێك بەسوود بەسەر زیانیش سەرکەوت کارەکە دەبێتە جۆرێك لەدژایەتیکردنی یەکتری.

## تۆمەتەکە

لەپاشاندا خەتیبی ئەبووعەلی کوڕی حەجاج هەڵسایەوە سەرپێ بەخەڵکی گوت چ فەرمانێکی پێدراوە دژ بەوانە "مەبەستی ئیبن رووشد و هاوەڵەکانی بوو" ئەوانە گومڕا بوونە دژ بە ئاین و چوونەتە دەرەوە لە بڕواکانی ئیماندران لەکاتێکدا کار لەسەر فەلسەفە و زانستەکانی سەرەتا دەکەن، ئەمەش جۆرێك لە ئەشکەنجەی هێناوەتە کایەوە، بۆیە هەموویان بەچەند لایەکدا برد، بەڵام کێ دەزانێ نهێنی و شاراوە لەکوێدایە.

## بڕیاردان

فەرماندرا ئەبووەلیدی ئیبن ڕووشد نیشتەجێی ئەلیسانە بکرێ بەپێی قسەی ئەوانەی کە دەڵێن لە ڕەچەڵەکی بەنی ئیسرائیلە، بەهیچ شێوەیەکیش هیچ ڕەچەڵەکێکی لەنێو هۆزەکانی ئەندەلووس نییە.

## ئایا ئیبن ڕووشد بەرگری لەخۆی نەکردووە؟

هیچ کام لە مێژوونووسان باسیان لەوە نەکردووە کە نە ئیبن ڕووشد نە یەکێك لەهاوەڵەکانی داوای کردبێ قسە سەبارەت بەخۆی بکا و داوا لە خەلیفە بکەن تا بەرگری لەخۆیان بکات، کاتێك باس لە بەرگری فەیلەسووف دەکەین سەبارەت بە ئازادی هزر یەکسەر بەرگری سوکراتمان بیر دێتەوە، لەکاتێکدا کە لە ئەسینا دادگاییان کرد، ئەمەش لەپاش شانزدە سەدە لە دادگایکردنی ئیبن ڕووشد، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە کەسانێك هەن دژ و دوژمنی عەقڵن، بەهەموو شێوەیەك دژایەتی ئازادی هزر دەکەن بەدرێژایی نەوە و سەدەکاندا، لەلایەکی دیکەوە سەرسامین بە موسڵمانەکانی ئەو سەردەمە کە لێبووردەتر بوونە لە یۆنانیەکانی سەدەی چوارەمی پێش زایین، بەڵام لەنێوەندی ئەو دوو شارەدا جیاوازیەکی ڕۆشنگەری هەیە، دادگایکردنی ئیبن ڕووشد تەنها دووریان خستەوە بەشێوەیەکی کاتی، بەڵام ئەو قازیانەی کە سوکراتی مەزنیان دادگایی کرد سەرەڕایی پیری هیچ بەزییەکیان نەبوو هەروا هیچ بەهایەکیان بۆ دانایەکەی دانەنا، لەلایەکی دیکەوە موسڵمانانی ئەندەلووس زۆر دادپەروەرتر بوون و لەوانەی ئەشکەنجەی گالیلۆیان دا لەسەدەی حەڤدەهەمی زایینی، هەروا زۆر بەبەزیتر بوون لەخەڵکی جنێف لەسەرووی هەموشیانەوە "کالڤن"،

کە لەنیوەی سەدەی شانزدەهەم (میشێل سرڤیە)یان سووتاند لەو کاتەی کە سووڕی خوێنی دۆزیبۆوە.
بەڵام ئەمە لەتوێژمان کەم ناکاتەوە بەرامبەر بەوانەی دادگایی ئیبن ڕووشدیان کرد، دەبێ ئەوە بڵێن کە چەوساندنەوە لەهەموو کات و ڕۆژگارێکدا بوونی هەیە بەتایبەتی ئەوانەی دژایەتی عەقڵ دەکەن، ئەو دەیەوێ بەپووچی کارەکانی خۆی سەربخا، چونکە ئایین هیچ کاتێك فەرمانی بە ئەشکەنجە و کوشتن و دوورخستنەوە نەداوە لەپێناو سەرکەوتنیدا، بەڵام نەزانی و فیتنە و پشێویی دڵیان ئاو دەدا و بەئێرەیی دڵیان دادەمرێ، هەموو ئەمانەش بەناوی شەریعە و ئایینەوە ئەنجام دەدرێن، بێگومان ئایین لەوانە بێ بەرییە.

## خستنە ڕووی شیعر بۆ دژایەتیکردنی فەلسەفە

لەپاش ئەوەی ئیبن ڕووشد و هاوەڵانی ئەشکەنجەدران و دوورخرانەوە، دواتر چەندان نووسراویان لەدژ ئەواندا بەکارهێنا و لەهەرێمەکان خوێندرانەوە، دواتر شیعرەیان خستە ڕوو بۆ دژایەتیکردنی فەلسەفە، ئەمەو حاج ئەبووحسێن کوڕی حبیر کە مێژوو ناوی بۆ خستوویەنە ڕوو لەنێوەندی ئەو باسەدایە، دیارە مێژووش چەندان کاری سەیر و سەمەرەی تیایە، چونکە زۆر جار ناوی ئەو کەسانە ناهێڵێتەوە، کە چاکەکار بوونە لەسەردەمی خۆیاندا.
حاج دەڵێت:

الآن قد أيقن ابن رشد    ان تواليفه توالف
يا ظالماً نفسه تأمل    هل تجد اليوم من توالف

لم تلزم الرشد يا ابن رشد    لما علا في الزمان جدك
وكنت في الدين ذا رياء    ما هكذا كان فيه جدك

كان ابن رشد في مدى غيه    قد وضع الدين بأوضاعه
فالحمد لله على أخذه    وأخذ من كان من أتباعه

نفذ القضاء بأخذ كل مضلل    متفلسف في دينه متزندق
بالمنطق اشتغلوا فقيل حقيقة    ان البلاء موكل بالمنطق

بەو واتایەی ئێستا ئیبن رووشد دەزانی نووسینەکانی هیچ نەبوون، ئەوانەی کە لێکدانەوەیان کرد زوڵمیان لەخۆیان کرد، تۆ ئەی ئیبن رووشد نەگەیشتیە قۆناخی ژیری، کەچی رۆژگار بەرەو شکۆ برد، ئێستاش هەموو گومڕایەك دادگایی کران، ئەوەی فەلسەفە بێنێتە ناو ئایین زەندیقە، بە لۆژیك باسی راستیمان بۆ دەکەی، لەتەك ئەوەی هەموو خراپەکاریەکان لەپەنای لۆژیکە.

لەچەند دێرێکی دیکە رێز و نەوازش بۆ خەلیفە مەنسوور دەکا و دەڵێت :

| | |
|---|---|
| بلغت أمير المؤمنين مدى المنا | لأنك قد بلغتنا ما نؤمل |
| قصدت الى الاسلام تعلي مناره | ومقصدك الأسنى لدى الله يقبل |
| تداركت دين الله في أخذ فرقة | بمنطقهم كان البلاء الموكل |
| اقمهمو للناس يبرأ منهم | ووجه الهوى من خزيهم يتهلل |
| وأوعزت في الأقطار بالبحث عنهم | وعن كتبهم والسعي في ذاك أجمل |
| وقد كان للسيف اشتياق اليهم | ولكن مقام الخزى للنفس أقتل |
| وآثرت درء الحد عنهم بشبهة | لظاهر اسلام وحكمك أعدل |

بەو واتایەی میری ئیمانداران زانی ئازاری ئێمە چییە و ئەو کارەشی کرد کە ئێمە هیوامان بۆ دەخواست، تۆ ئیسلامت بەرزکردەوە وەك منارەکەی، دەبوایە ئەوانە بەشمشێر لەناو ببردرابووان

بەڵام تۆ ئیسلامت بەرزکردەوە و بە دادپەروەری کارەکانت کرد.

ویستمان شیعری ئیبن جبیر بهێنیەوە یاد تابزاندرێ لەو سەردەمە چی کراوە لە دژیان.

## وشەیەك سەبارەت بە ئیبن جبیر

ئەبو حەسەن محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی جبیری ئەندەلووسی بەلەنسی، ناوێکی باڵای هەبوو لەرۆژئاوا لەڕووی ئەدەب و شیعر، لەکۆتایی سەدەی شەشەمدا سێ گەشتی کرد و سەردانی میسر و شام و حیجاز و عێراق و سقلیەی کردووە و دواتر لە ئەسکەندەریە مایەوە، هەروا لەکۆتایی سەدەی

شەشەمدا کۆچیدوایی کردووە، ئەمەو گەشتەکەی لە لیدن دووجار چاپ کراوە و وەرگێڕدراوەتە سەر فەڕەنسی و ئیتالی ."مێژووی غەرناتە لا ١٦٨ بەرگی ٢".
ئەو یەکێك بوو لەشاعیرە بلیمەتەکانی ئەندەلووس و زۆر راستگۆ بوو لەنێوەندی شیعرەکانیدا و کەسێکی باوەڕدار بوو، زۆرێك لەشاعیرەکان بەهۆی ئەوەوە زانیارییان وەرگرتووە بەتایبەتی ئەو وەسفی شوێنە پیرۆزەکان دەکات بە تایبەتی کاتێك ئەرکی حەجی بەجێ گەیاند.
ئیبن جبیر یەکێك لەهاوسەردەمەکانی ئیبن رووشد، پێمان وانییە بۆ ماستاوچییەتی ئەو شیعرانەی نەگوتووە، بەڵکوو وەك بەرگریەك بووە لە ئایین و تا شانازی پێوە بکات، کاتێك ئەو هەڵەشی کردووە، زیاتر بەهۆی بڕوابوون و باوەڕداری بووە، هیچ کام لەمێژوونووسان ناتوانن گلەیی لە ئیبن جبیر بکەن، چونکە ئەو لە فەلسەفەی ئیبن رووشد نەگەیشتووە، چونکە شێوازی شیعر و ئایین رێگەیەکی دیکەیە و دوورە لە زانست و دانایی، بەڵام بەداخەوە ئەو ئەدیبە ئەم کارەی لێ هاتۆتە کایەوە، چونکە بە یەکێك لەشاعیرە گەورەکانی عەرەب دەژمێردرێ.

## ئەو ئازارە توندانەی کە ئیبن رووشد تووشی بووە لەکاتی نسکۆیەکەیدا

پێدەچێ ئەو ئازارە توندەی کە ئیبن رووشد تووشی بووە لەکاتی نسکۆیەکیدا داوایان لەخەڵکی کرد تا ئازاریان بدەن، دیارە خەڵکیش لەهەموو رۆژگارەکاندا دژەی سێیەمە لەدوای پاشا و پیاوانی ئایینی و فەیلەسووفەکان، کە هەرهەموویان ململانێ بۆ ئەوە دەکەن هەر یەکەو شتێکی دەست بکەوێ، ئەمەو پاشا و پیاوانی ئایینی داوای هێزی دونیایی دەکەن، کە ئەمەش لەسەر خەڵکدا

دەیکەن بەکردەیی، بەڵام دانایەکان داوای هێزی عەقڵ دەکەن، بەمەش ڕۆشنگەر دەبن.

ئەبووحەسەنی کوڕی قترنال سەبارەت بە ئیبن رووشد دەڵێت "لەکاتی نوێژدا هەندێك لەخەڵکی دەیانویست هێرش بکەنە سەری، بۆیە من و کوڕەکەم بەرەنگاری خەڵکەکە بووینەوە لەناو مزگەوتی قورتوبیە، ئەمەش لەکاتی نوێژی عەسردا، بەڵام دواتر هەندێك هیچ و پووچ تۆڵەیان لێ کردینەوە"

**بڵاوکراوە:**

مەنسوور و هاندەرە خراپەکانی تەنها بەوە نەوەستان تا لەپێش خەڵکی قسە بە ئیبن رووشد و هاوەڵەکانی بڵێن لەنێوەندی دادگایی کردنیدا، لەپاشاندا دوورخستنەوە وەك سزایەك بەکارهات بەشێوەیەك ڕێگە نەدرا بەرگری لەخۆیان بکەن، لەدوای ئەمەشدا لەهەموو وڵاتدا بڵاویان کردەوە کە گومڕا بووە، ئەمەو مەنسوور فەرمانی بە نووسەرەکەی کرد کە ئەبووعەبدوڵا کوڕی عەیاش بوو تا بڵاوکراوەیەك بنووسێ بۆ مەراکش و شارەکانی دیکە تا بزاندرێ ئیمە ئیبن رووشد چی بەسەر هاتووە لەو کێشەیەدا، نووسەری بڵاوکراوەکەش نهێنی پارێزی خەلیفە بوو، کە بە نووسەری دەستی ناسرابوو بەناوی ئەبووعەبدوڵا محەممەد کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەیاش کە خەڵکی بەرشانەیە (لەوانەشە بەرشەلۆنە بێ) ئەو نووسەرە تەنها نووسەری مەنسوور و محەممەدی کوڕی و کوڕی یوسف نەبوو، بەڵکوو تەمەنی زۆر درێژتر بوو، ئەمەو لەساڵی ٦١٩ك کۆچیدواییی کرد، ئەو کەسێك بوو لەڕووی داڕشتنەوە کارا بوو، ئەو کاتەش بۆ خەلیفەکانی خانەوادەی تومرتی نووسی کاتێك شێوازیانی زانی و بەشێوەی دڵی ئەوانی دەنووسی، چونکە ئەو شێوەنووسینە زۆر جیا بوو لە شێوازی نووسینی جددی.

پێدەچێ بەپێی ئارەزووەکانی هەر میرێك شتێ نووسی بێت، بۆیە تەنها لەخزمەتی سێ تا چوار خەلیفەدابوو، ئەویش وەك هەندێك پیاوی دەست و پێوەند لەئامادەباشی دابوو بۆ خزمەتکردنیان، ئەمانەش بۆ هەموو دەربار و کۆشکەکان دەگونجێن، ئەگەر رووداو و کۆشك و تەلارەکانیش گۆڕانکارییان بەسەردا هات بێت.

## دقی بڵاوکراوەکە:

"زۆر لەمێژە خەڵکانێك هەن لەنێوەندی دەریای خەیاڵدا دەژین، تێگەیشتنیان وایە، پێویست ناکات ئێمە لێیان گەڕێن تا رۆژی حیساب دێ، چونکە هیچ فەرمانڕەوایەك پێی چاك نییە لەنێوان باشە و گوماندا بمێنێتەوە، بۆیە ئەوانە خۆیان خستووەتە نێو ئەو پەڕانەی کە جیاکاری دەدۆزنەوە، دەستخەتی زاراوە و ماناکانیان ئەوە دەگەیەنێت، چونکە شەریعەت لەدەستی کەسانی بە شەرەف و باوەڕدارە، بەڵام ئەوا خەیاڵ دەکەن، کە عەقڵ تەرازووی بابەت و خەسڵەتەکانە و هەقیش ئەرگۆمێنت و بەڵگەکەیەتی، ئەوان لەیەك بابەتدا جیاوازیی دروست دەکەن و ئاماژە بە هەموو رێگەکان دەکەن، باس لەوە دەکەن کە خوا ئەوانی لەئاگر دروست کردووە ئەوان لەرۆژی قیامەتدا هەموو شتەکانیان هەڵدەگرن لەنێو ئاگردا، بە شێوەیەك بیانوی ئەوە دەهێننەوە کە ئێمە شەیتانی ئینسان و مرۆڤین، هەموو ئەمانە بە لاڕێدا دەیانبات، ئەوانە زیان بە ئەهلی کتاب دەدەن، ئەوانە لەگومڕایی دەژین و هەوڵەکانیان بێهودەیە، چونکە رامانەکانیان بەرەو ئاسوویەکی دیکە ئەوانی بردووە، ئەو کاتەش دەگەڕێنەوە ناومان، کە لە گوناهەکان پاك بوونەوە، خودا تۆڵەیان لێبکاتەوە کە بۆ هەموو شتێك زانیاریەکی فراوانی هەیە".

"تا ئێستا کارەکانمان بۆ پاراستنی کەرامەتی ئێوە کردووە و داواش لەوانە دەکەین بگەڕێنەوە لای فەرموودەکانی خودا، چونکە هەر خودا بوو هەموو مەبەستەکانیانی ئاشکرا کرد، لەکاتێکدا لەلایەکیان کتێبی خودایان داناوە ئەوانە گومڕا بوونە و بەشێوەیەك باوەڕداری بە زوڵم دەپۆشن، ئەوانە لەناواخنی ئیسلام دەدەن بەدەستی خاچپەرستەکان، ئەوانە بەهەموو شێوەیەك پێچەوانەی نەتەوە و زمان و باوەڕەکانی خۆیانن، دەیانەوێ ببەنە خاڵێکی رەش لە رووناکیدا، بۆیە بەهەموو شێوەیەك ئەوانەمان شاربەدەر کرد و بەوانمان گوت ئەو ئاینی ئیسلام، ئاینی هەقە تا بزانن هەق و رەوایەتی چییە، ئێمە بە شمشێر وەڵاممان نەدانەوە، بەڵکوو ئەوانمان دەرکرد لە بەزەیی خوداییدا، ئەگەر ویستیان بگەڕێنەوە تا بزانن ئەوان درۆزنن".

"بۆیە ئاگادارین لەهەموو ئەو ژەهرانەی ئەوان بڵاوی دەکەنەوە و ئاگاتان لە باوەڕتان بێ، هەر کەسێك لەئێوە کتێبێکی لەو بابەتەی دۆزیەوە یان لایبوو با بیسووتێنێ، تا هیچ کام لە خوێنەر و بینەرێکی نەکەوێتە دوای ئارەزووەکانی ئەوانە ئەمەش بۆ راستەرێبوونی هەمووانە، ئەوانەی کە کارەکانیان سووتێندرا لە کۆتاییدا و لەرۆژی دواییدا تەنها ئاگر بەشیانە، چونکە هەموو ئەو شتانەی دروستیان کردووە پووچە، ئەوەیان نەدەزانی کە خوای گەورە هەموو گومڕا و نەزانەکان لەناو دەبات، بەمەش لەنێوەندی هەموو پەڕاوەکان دەگەینە ئەو مەبەستەی کە ئەوانە گەیشتنە شوێنی خۆیان"—بڵاوکراوەکە.

## لەپاش دادگاییکردن

لەپاش دادگاییکردن و و نووسینی بڵاوکراوەکە و ناردنی بۆ هەموو لایەکی دەوڵەت و چەندان شیعر و هونراوەش رێکخرا تا ئیبن رووشد بەخراپە باس

بکرێ و تانەشیان لەباوەڕی دا، باس لەوە کراوە کە ئیبن رووشد دوورخراوەتەوە بۆ ئەلیسانە (lucena) بەلام ماوەی سزاکە بە تەواوی نازاندرێ.

زۆربەی مێژوونووسان جەخت لەوە دەکەنەوە کە نسکۆ و سزا و لێبوردنەکە زۆری نەخایاندووە، واتە زیاتر لە ساڵێك نەبوو، ئەمەو شێخی شێخان تاجەدین باس لەوە دەکات کە "کاتێك چوومە ناو وڵاتەکەوە (مەبەستی ئەندەلووسە) پرسیاری لەوە کرد کە ئیبن رووشد لەکوێیە، ئەوانیش گوتیان لەماڵی خۆیدا نەماوە بەڵکوو چووەتە لای خەلیفە یەعقووب کەس ناچێتە لای و کەسیش لەوێ دەرناچێ"، ئەمەش جۆرێکە لە دەسبەسەرداگرتنی سیاسی، کاتێك تاجەدین پرسیاری هۆکارەکەی کرد باسیان لەوە کرد کە چەندان قسەی ناشیرینی کردووە و زۆرێك لەبابەتە خراپەکاریەکانیشان خستۆتە ئەستۆی ئەو بەتایبەتی لەرووی ئەو زانستانەی کە کاری پێناکرێ وەك زانستەکانی سەرەتا، لەلایەکی دیکەوە تاجەدین باس لەوە دەکات کە ئیبن رووشد بەزیندانی کۆچیدواییی کردووە و ئەو کاتەی لەماڵی خۆیدا دەستبەسەر بووە لە ساڵی ٥٩٤ك لە مەراکش.

بەلام پێدەچێ زۆرێك لەپیاو ماقووڵانی ئیشبیلییە وەك شاهێدێك سەبارەت بە ئیبن رووشد بۆ خەلیفە مەنسوور قسەیان کردووە بۆیە مەنسوور رازی بووە هەموو قوتابی و کۆمەڵەکەی و ئیبن رووشد لێیان ببورێ، دوای ئەوەی هەموان داوای لێبوردنیان لەخەلیفە کردووە، ئەمەش لەساڵی ٥٩٥ك.

ئەمەو ئەبووجەعفەری زەهبی کرا بەسەرپەرشتیاری قوتابی و پزیشکەکان واتە وەك نەقیب و سەرۆك، لە جەعفەریش دەگێڕنەوە باس لەوە دەکات ئەو نسکۆیە شتێکی باش بوو نەوەك بکەومە هەڵەوە چونکە زۆر جار پاشاکان وا

لەدانایەکان دەکەن بەهۆی هەڵەیەکەوە بچنە زیندان و دواتریش بێن ڕێز و نەوازش و سەرسوڕمان بەرامبەر پاشاکانیان دەربڕن!

## پوختەیەکی گشتی

لەسەرەتا خەلیفە مەنسوور میرێکی هۆشمەند و دادپەروەر بوو و کەسێك بوو ئارەزووی لە دانایی و داناکان بوو تا لەتەکیدا دابنیشن، هاوکات دەست و پێوەندەکانی لەسەر دەستی ئەواندا خێر و بێرێکی زۆریان بینی، خۆی و باب و باپیرەی لەکۆتاییدا ڕێگەی پاك و بێگەردییان هەڵبژارد. لە
کاتێك هەندێك لەباسەکان لەلایەن ئیبن ڕووشدەوە ڕوونکرایەوە سەبارەت بە فەلسەفە، دژ و دوژمن پەیدا بوون، هەر ئەوان بوون هەلی ئەوەیان ڕەخساند تا ئازادی بدرێتە فەلسەفە تا بەئارەزووی خۆیان قسە بکەن ئینجا هەر چییەك بێ دواتر یەکە یەکە دانا و فەیلەسووفەکان بخەنە تەڵەوە، بە خەلیفەش بڵێن ئەوەتا فەیلەسووفەکان قسەکانیان زیان بەدەوڵەت دەگەیەنێت، بەپێی پلانی ئەوانیش تەنها ئیبن ڕووشد و هاوەڵەکانیان دوورخستەوە، ئەمەش تەنها تۆڵەلێ کردنەوە بوو لەلایەن ئەوانەی هەردەم ئێرەیی لەدڵ و دەروونیان چەکەرەی کردووە، توانییان ژەهری خۆیان بڵاو بکەنەوە، لەپاشاندا خەلیفەش بەو ڕاستییەی زانی، بۆیە تۆبەی کرد و خۆشی لەزۆر شت گەڕایەوە.

## نووسین و دانراوەکانی ئیبن ڕووشد

هیچ توێژینەوەیەکی مێژوویی ئەوەی نەسەلماندووە کە ئیبن ڕووشد پێش تەمەنی سی وشەشساڵی کتێبێکی نووسی بێ، ئەمەش سەیر نییە چونکە ئامادەیی بۆ پزیشکی و فیقه و دانایی چەندان ساڵی دوور و درێژی دەوێ، ئیبن

رووشد وەك شاعیرەكان كتێبی دانەناوە، بەڵكوو خۆی كاری لەسەر كردووە واتە وەك زانایەك دوای كورتكردنەوە و لێكدانەوە هیچ شتێكی نەنووسیوە، بۆیە بەعەقڵە كارایەكەی رێگەی هزری دەستنیشان كردووە، بەشێوەیەك لەپاش ئەو تەمەنەوە هەموو ژیانی بۆ زانست تەرخان كرد، ئەمەش وەك رێنان باسی لێوە دەكات هەموو لەگەنجینەی ئەسكۆریالدایە كە حەفتا و هەشت وتارە یان كتێبە سەبارەت بە فەلسەفە و پزیشكی و فیقه و زانستی كەلام، هەروا ئیبن ئەسبەعیە باس لە پەنجا كتێبی دەكات، بەڵام ئیبن ئابار تەنها باس لە چوار كتێبی دەكات، لەوانەشە ئەو چوار كتێبەش لەلای ئەو و ئەو سەردەمە ناودار بوو بن.

### ئەو كتێبانەی كە بە عەرەبی چاپ كراون

(١) تهافت التهافت
(٢) فصل المقال
(٣) الكشق عن مناهج الادلة
(٤) القسم الرابع من وراء الطبيعة
(٥) بداية المجتهد و نهاية المقتصد

هەروا زۆرێك لە كتێبی پارێزراوی دیكەی هەیە، لەتەك ئەو كتێبانەی كە بەلاتینی یان بە عیبری چاپكراون، هەروا كۆمەڵەیەكی دیكەی هەیە دەستنووسە بە تایبەتی هەندێك كتێبی فەلسەفی كە بە عەرەبین، كە لە خانەی كتێبی ئاوفیتشی لە فلۆرەنسا ئیتاڵیا پارێزراوە و لەساڵی ١٩١٠ بیندراوە.

## مێژووی نووسینەکانی

پاش ئەوەی کتێبەکانی کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو، توێژینەوەیەکمان ئەنجامدا بۆ پۆلینکردنی نووسینەکانی ئیبن رووشد بەپێی ساڵەکان و بۆ ئەمەش گەیشتینە ئەم ئەنجامە و ئەوەی تێبینی دەکەین سی و شەش ساڵی تەمەنی خۆی بۆ نووسین تەرخانکردووە، ئەم چەند ساڵەش بەشی دووەمی تەمەنیەتی چونکە ئەو لەتەمەنی حەفتاودوو ساڵیدا کۆچیدوایی کردووە واتە لە تەمەنێکی زۆر پیریدا بووە، لەپاش ئەوەی بە هەموو شێوەیەك سزا درا و دوورخرایەوە، ئەمانەی خوارەوەش نووسینەکانیەتی:

لەتەمەنی ۳٦ ساڵیدا بەگشتی باسی لە پزشکی کردووە

لەتەمەنی ٤۳ ساڵیدا کتێبی "الشرح الصغیر للجزئیات و الحیوان" (لە ئیشبیلییە) داناوە

لەتەمەنی ٤٤ ساڵیدا کتێبی "الشرح الوسط للطبیعة و التحلیلات الاخیرة " (لە ئیشبیلییە) داناوە

لەتەمەنی ٤٥ ساڵیدا کتێبی "شرح السماء و العالم "(لە ئیشبیلییە) داناوە

لەتەمەنی ٤۹ ساڵیدا کتێبی "الشرح الصغیر للفصاحة و الشعر و الوسط لما بعد الطبیعة " لەقورتوبە داناوە.

لەتەمەنی ٥۱ ساڵیدا کتێبی "الشرح الوسط الاخلاق " داناوە

لەتەمەنی ٥۳ ساڵیدا کتێبی "بعض اجزاء من مادة الاجرام "لەمەراکش داناوە.

لەتەمەنی ٥٤ ساڵیدا کتێبی "الکشف عن مناهج الادله" داناوە

لەتەمەنی ٦۱ ساڵیدا کتێبی "الشرح الکبیر للطبیعة" داناوە

لەتەمەنی ٦۸ ساڵیدا کتێبی "شرح غالینوس" داناوە

لەتەمەنی ٧٠ ساڵیدا کتێبی "لۆژیك" (لەکاتی نسکۆدا) داناوە
لەپاش ئەو پۆلینکردنە چەند کتێبێکی دیکەی ئیبن رووشد بەبێ ساڵ دیاریکردنە دانراوە وەك کتێبی:

(١) شروحه على التحليلات الثانى
(٢) الطبيعة والسماء
(٣) النفس
(٤) مابعد الطبيعة

جگە لەکتێبەکانی ئەرستۆ تەنها دوو شیکردنەوە بوونی هەیە کە مامناوەندی و بچووکە، هەروا کتێبەکانی ئەرستۆ هیچ شیکردنەوەیەکی نییە (١)ئاژەڵ، (٢) سیاسەت، هەروا دە کتێبی سەبارەت بە ئاژەڵ هەیە، بەڵام ونبوون، تەنهاش عەبدولواحید و ئیبن ئەسبەعیە باسی لێوە دەکەن و ناوەڕۆکەکەی لە ئەسکۆریال هەیە، هاوکات ئیبن رووشد سیاسەتەکەی ئیبن رووشدی شی نەکردۆتەوە، ئەمەو لەنێوەندی پێشەکیەکەیدا لە شیکردنەوە نێوەندی ئاکارا باس لەوە دەکات کە وەرگێڕانێکی عەرەبی نەبینیوە بۆ کتێبی سیاسەتی ئەرستۆ لە ولاتانی رۆژئاوایی ئیسلامی، کاتێکیش کە کۆماری ئەفلاتوونی شی کردەوە گوتی کتێبەکانی سیاسەت کە ئەرستۆ نووسیویەتی نەگەیشتۆتە دەستی جگە لەکۆمارەکە، ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێ کە زۆر ئاگاداری ئەدەبی یۆنانی نەبووە، چونکە ئەوەی ئەرستۆ نووسیوویەتی سەبارەت بە سیاسەت لاسایی ئەفلاتوون بووە لە کۆمارەکەیدا، بۆ ئەوەی لەدەرروونی خوێنەریش نزیك ببینەوە ئەم وێنەیە بەو شێوەیە دەخەینە روو:

## نووسینە فەلسەفییەکان

(١)تهافت التهافت وەڵامی تهافت فلاسفەی ئیمام غەزالییە، مەبەستی لە تهافتیش رمانی هەموو وێنای فێرکردنە بەسەریەکتردا، بەڵام ئەویش مەبەستی دارمانی کتێبەکەی غەزالییە و ئەمەش بەعەرەبی چاپکراوە و چەندان وەرگێڕانیشی هەیە بۆ لاتینی و عیبری.

(٢) وتاریك سەبارە بە پێکهاتەی تەنەکان، ئەو باسانە لەکاتی جیاجیادا نووسراوە و ئەو کتێبەش بە لاتینی و عیبری بڵاوبۆتەوە.

(٣) و (٤) دوو کتێبە سەبارەت گەیشتنە بە ویژدان کە بەلاتینی و عیبری هەیە.

(٥) چوار کتێب سەبارەت بەعەقڵی ماددی کە دەکرێ وێنەکان بەجیاکراوی درك پێبکا(لاتینی).

(٦) شیکردنەوەی وتەکانی ئیبن باجە سەبارەت بە گەیاندنی عەقڵی جیاکراوە لەمرۆڤ (ئاسکۆریال).

(٧) کتێبی گەردوون.

(٨) سەبارەت بە وتە مەرجدارەکان (الشرطية) .

(٩) پێویستیەکانی لۆژیك.

(١٠) پوختەی لۆژیك.

(١١) پێشەکیەکی بۆ دوانزدە وتاری (عەرەبی ئاسکۆریال ژمارە ٦٣٩).

(١٢) شیکردنەوەی کۆماری ئەفلاتوون بە عیبری و لاتینی.

(١٣) شیکردنی فارابی و ئەرستۆ سەبارە بە لۆژیك.

(١٤) شیکردنەوەکانی فارابی لەزۆربەی بابەتەکان.

(١٥) رەخنەگرتن لە فارابی سەبارەت شیکردنەوی دووەمی ئەرستۆ.

(١٦) وەڵامی ئیبن سینا لە دابەشکردنی زیندەوەرەکان، هەروا سەبارەت بەوتەی کە بەرجەستەیەکی رەها و بەرجەستیەکی خودییە و پابەندە بەخودی خۆی.

(١٧) شیکردنەوەیەك سەبارەت بەودیوو سروشت لە وەرگێڕانی نیقۆلا دیمەشقی.

(١٨) سەبارەت بەزانستی خودا و گەردیلەکان.

(١٩) لە هەردوو بوونی هەتاهەتایی و کاتی.

(٢٠) توێژینەوە سەبارەت بەو وتانەی لە کتێبی (شفا-چارەسەر) کە لەودیوو سروشتدا.

(٢١) لەبوونی ماددەی یەکەم.

(٢٢) لە زەماندا

(٢٣) چەند نموونەیەك سەبارەت بەفەلسەفە.

(٢٤) لە عەقڵی ماقووڵ (عەرەبی ئاسکۆریال ژمارە ٨٧٩).

(٢٥) شیکردنەوەی فیردۆسی سەبارەت بە عەقڵ.

(٢٦) پرسیار و وەڵام سەبارەت بە دەروون.

(٢٧) پرسیار و وەڵام سەبارەت بە دەروونناسی.

(٢٨) ئاسمان و دونیا.

ئەم خشتیەمان بۆ ئەوە داناوە بۆدیاریی کردنە بابەتەکانی ئیبن رووشدە لەوانەشە زیاتر و کەمتری هەبێ، چونکە شتەکان وا بەوردی دانەنراوە.

## سەبارەت بە ئیلاهیات

(١) فصل المقال (چاپكراوە)

(٢) پوختەیەكی (فصل المقال)

(٣) التقريب بين المشائين و المتكلمين

(٤) كشف مناهج الادله

(٥) شرح كتاب الايمان للامـام المهـدى ابـى عبـدالله محمـد بـن تـومرت شـيخ الموحدين.

## كتێبە فیقهیەكانی

(١) بدايه المجتهد ونهايه المقتصد

(٢) مختصر المستصفى فى اصول الفقه

(٣) كتاب فى التنبيه الى اغلاط المتون

(٤) الدعاوى: ٣ بەرگە

(٥) وانەیەك لەفیقهی عەرەبی (ئاسكۆریال)

(٦) دوو كتێب سەبارەت بە زەبیحە

(٧) كتێبی خەراج

(٨) قازانجی حەرام.

هەروا چوار كتێبی سەبارەت بە گەردوون و دوو كتێبی سەبارەت بە رێزمانی عەرەبی(نەحو) و بیست كتێبی سەبارەت بە پزیشكی هەیە.

## فێربوونی ئیبن رووشد

ئیبن رووشد زانیاریەکی ئەوتۆیی نەبوو سەبارەت بە زانستە باوەکانی سەردەمی خۆی، هەروا زانیاری لەسەر پزیشکی دیاریکراو بوو بە زانستی جالینۆس، هەروا لەرووی فەلسەفیەوە پشتی بە ئەرستۆ دەبەست، ئەمەو گەردووناسیشی لەمجستی وەرگرتووە، لەکاتێکدا فیقهی لەهاوسەردەم و باپیرانی لە مەزهەبی مالیکی وەرگرتووە، ئیبن رووشدی دانا کەسێکی داهێنەر نەبوو واتە زانستێکی نوێی دانەمەزراندووە، بەلام لەسەردەمەکەی خۆی و دوای سەردەمەکەی توانی بەشێوەیەکی دەگمەن رەخنە بگرێ، ئەمەش دیاردەیەکە لەرەخنەی گەردوونی بەتلیمۆس، هەروا چەندان بنەمای هەبووە کە تەنها لەعەقلێکی بالا دێتە کایەوە (سەیری کورتەی ١٣ بکە لەبەشی یەکەم لە پووختەی وتارەکانی ئەرستۆ کە سەبارەت بەو دیوسروشتەوەیە).

ئیبن رووشد پزیشك و فەیلەسووف بوو، بەلام فەلسەفەکەی مەزنتر بوو لە پزشکیەکەی، ئەمەو ئەو نووسینانەی کە پشتی بە جالینۆس بەستبوو، نەگەیشتە یاساکەی ئیبن سینا ئەو تەنها فەقیە و گەردووناس بووە، لەلایەکی دیکەوە دەستەوەستان نەوەستاوە سەبارەت بە هەلوێستوەرگرتن، بەلام مێژوو هیچ فتوا و حوکمێکی بۆ بەجێ نەهێشتووین.

پێدەچێ باپیرەی لەو سەرکەوتوو تر بووە لە لەقەزا و شەرعدا، ئەمەو کۆمەڵێك فتوای هەیە و لەکتێبخانەی پاریس پارێزراوە، یەکێك لەقوتابیەکانی گرنگی پێداوە و رێکیخستووە، بەلام ئیبن رووشد کاتێك روونکردنەوەیەکی مەزن دەبەخشێتە ئەرستۆ ئەوا ئیبن رووشد جیا دەکرێتەوە لەزۆرێك لەفەیلەسووفەکان، لەمبارەیەوەش ئارنست رینان دەڵێن "کاتێك ئەرستۆ کتێبی گەردوونی بەشێوەیەکی رەوان دانا، بەلام لێکدانەوە و شیکردنەوەی جۆرێکە

لەتارمایی، لەپاشاندا ئیبن رووشد هات بەشێوەیەکی رەوان و دوور لەتارمایی هەموو لایەنەکانی روون کردەوە".

ئیبن رووشد لەهەر هونەرێکدا کە سەرکەوتوو بوو وەك پزیشکی و فەلسەفە و گەردوون و فیقه، لەتەك ئەوەی مۆتەئی مالیك لەدڵیدا ئەزبەر کردبوو.

لەلایەکی دیکەوە سەرەڕایی ئەوەی سەرقاڵی ئەو زانستانە بوو، ئەو کەسێکی ئارەزوومەندی هونەرەکانی ئەدەب بوو، هەردەم شیعری جاهیلی و سەردەمی ئیسلامی دەخوێندەوە، چەندان هونراوەی عەنترە و ئومرئی قەیس و ئەعشی و ئەبی تەمام و موتەنەبی دەخوێندەوە و ئەزبەری دەکرد، لەوەش دەردەکەوێ کاتێك کتێبی شیعری ئەرستۆی روونکردۆتەوە، بۆ ئەمەش بۆمان دەردەکەوێ کە عەقڵە گەورە و بەهێزەکان هەردەم بازنەکەی فراوانتر دەبێ و هەردەم گرنگی بە زانست و ئەدەبیات دەدا، ئەمەش هیچ پێچەوانەیەکی لەتەك یەکتردا نییە.

## زانیاری لەسەر زمانی یۆنانی نەبوو

هەر توێژەرێك کاتێك سەیری ژیانی ئیبن رووشد دەکات ئەوە دەدۆزێتەوە کە تەنها گرنگی بە کتێبە عەرەبییەکان داوە، تەنها خۆی خەریکی ئەو بابەتانە کردووە کە لەچوارچێوەی ئەدەب و زانستی عەرەبین، یان ئەوەتا کتێبی زمانەکانی دیکەی نەخوێندۆتەوە؟ ئیبن رووشد زمانی یۆنانی نەزانیووە کە مامۆستا و سەرۆکەی ئەرستۆ پێی نووسیووە، هەتا زمانەکانی سریانی و فارسی و ئیسپانیشی نەزانیوە.

ئیبن رووشد وەك ئەوانەی پێشتر بووە لەنێوەندی دانا موسڵمانەکان، بۆیە زۆرێك لەگەنجینەکان فەوتاوە دەبینیت چاویان بە شیعرەکانی هۆمیرۆس و

لایندار و سۆفۆکلیس نەخشاندووە، ئەوە جگە لە ئیشیل و ئاریستۆفان و دیمۆستین، هەروا ئەفلاتوونیشیان پەراوێز کردووە، هەروا کەمترخەمیان لە وانەکانی ئەرستۆ کردووە، لەتەك ئەوەی وەرگێڕ و توێژەرەکانی رۆژهەلاتی گرنگیان بەو کتێبانە داوە.

بێگومان نووسین و دانراوەکانی ئەرستۆ بەزمانی عەرەبی گەیشتوونەتە ئیبن رووشد، بەتایبەتیش لەسەدەی سێیەمی کۆچیدا، واتە هاتنەکایەوە ئەو نووسینانە سێ سەدە پێشتر و پێش ئەوەی ئیبن رووشد دەربکەوێ، دیارە بەهۆی ئەدیبەکانی شام ئەو نووسینانە هاتوونەتە کایەوە و لەسەردەستی حەنینی کوڕی ئیسحاق و ئیسحاقی کوڕی حەنین و یەحیا کوڕی عودەی و ئەبووبەشری مەتی.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن رووشد هەردەم جەختی لەناوەڕۆك و کرۆکی بابەتەکان دەکردەوە، بەلام بەداخەوە نەیتوانیوە ئەو زمانانە بزانێ، چونکە ئەو کەسێك بوو زۆر بەوردی لەباس و خواسەکانی کۆلیەوەتەوە لەتەك ئەوەی زمانی بنەڕەتی ئەو نووسینانەی نەزانیووە و زمانی یۆنانیشی نەزانیووە، بۆیە دەبینی دوژمنی سەرەکی ئیبن رووشد، چەندان هەڵەی گەورەی لێگرتووە وەك لویس ڤیڤیس، دیارە دەمارگیری ئایینیشی یەکێك لەو هۆکارانە بووە کە بەو جۆرە سەیر بکرێ، بەلام ئەمەش بەو واتایە نییە کە راستگۆ نەبووە لە رەخنەکانی.

ئیبن رووشد، لەنێوان پرۆتاگۆراس و فیساگۆرس و فراتلێ و دیموکرایت لێی تێکەڵ بوو، چونکە بەپێی هیراکلیت ئەمانە کۆمەڵێك بوونە لە هەواداری هەرقل کە لەسەرووی هەمووشیانەوە سوکرات بووە، هەروا باسی لەوە کردووە کە ئەناکساگور سەرۆکی رێبازی ئیتالی بووە، بۆیە دەبینی لویس ڤیڤیس ئەو

هەڵانەی خستۆتە روو بەبێ ئەوەی بزانێ ئەو دانایانە شتێکی وایان نەزانیوە سەبارەت بە زمانی یۆنانی و مێژووە مەزنەکەیان.
کاتێك ئەرستۆ وانەی فەلسەفەی خوێند سەرەتا لەهەموو روویەکەوە ئەدەبی گەلەکەی زانیوە و دواتر دەستی بە خوێندن و وانەی فەلسەفی کردووە، لەنێوەندی پوختکردنەوە و کورتکراوە و وتەکان ئەم شێوازە بەدەردەکەوێ، لەنێوەندی ئیسلامیشدا سەرەتا دەستیان نەداوەتە فەلسەفە، چونکە پێیان وابووە کە ئیسلام ئایینی جددیەت و رەقئامێزە، بەڵام لەدواتردا بۆیان دەرکەوت کە ئەم بۆچوونی هەڵەیە.

## شێوازی ئیبن رووشد

شێوازی ئیبن رووشد لە نووسیندا وشکە، بۆ ئەمەش دەتوانێ بیانوو بهێنێتەوە، چونکە فەیلەسووف ناتوانێ باسەکانی بەشێوازێکی نەرم و نیان دابرێژێتەوە، لەتەك ئەوەی شێوازی نەرم بۆ ئەو جۆرە نووسینانە تەرخان نەکراوە، چونکە دەبینی شاعیرەکان بەزمانێکی سانا دەنووسن و دەیان قەڵەمی دیکە هاتوون کاری لەسەر کردووە، دواتر هەموو ئەمانە لەنووسینی فەلسەفەدا بەوردترین مانا و بیروبۆچوون دەخرێنە روو.
لەتەك ئەوەی فەیلەسووف دەبێ نووسەرێکی باڵا دەست بێ لەنێوەندی هونەرەکانی ئەدەبدا، ئەم شێوازەش هەمان شێوازی نیچەی ئەڵمانی و بەرجەسۆنە لەفەرەنسا و زۆرێك لە فەیلەسووفەکانی ئەفرەنج کە هەموویان بە ئیبن رووشد دەچن، بەتەواویش شێوازەکەی لەشێوازی ئۆگست کۆمت دەچێ، لەتەك ئەوەی خوێنەر شتێکی وای بەزمانی عەرەبی نەبینیوە کە ئیبن رووشد

نووسیبیّ، دواتریش دێنە سەر ئەو باسە، چونکە زۆربەی کتێبەکانی جێگەی متمانەی خوێندکاران بووە لە ئەورووپا کە زمانی لاتینی و عیبری نووسراوە. لەلایەکی دیکەوە زنجیرەی کتێبەکانی بەچەندان شێواز نووسراوە، وەك دەبینی ئەرستۆ بەیۆنانی نووسیوویەتی و دواتر وەرگێردراوتە سەر سریانی و عەرەبەکانیش کردوویانەتە عەرەبی، لێرەوەش ئیبن رووشد خوێندوویەتیەوە و شیکردووەتەوە لەتەك ئەمەدا شیکردنەوەکانی کراوەتە عیبری و لاتینی.

پوختەی شێوازی ئیبن رووشد لەنێوەندی کتێبەکانی دەبینی ناوی ئەو پیاوە مێژوویانەی هێناوە و بۆچوونەکانیانی کورتکردووەتەوە، سەرەتا بە ئەرستۆ دەستی پیّ کردووە و دواتر فەلسەفەی یۆنانی روونکردووەتەوە وەك ئەسکەندەر فیردۆسی و نستیۆس و نیقۆلا دیمەشقی، هەروا لەنێوەندی فەیلەسووفەکانی موسڵمانیش هاتووە باسی لە ئیبن سینا و غەزالی کردووە و گفتوگۆکان توند بووە لەرێی چەندان هۆکار، دەبینی دژایەتی غەزالی دەکات، چونکە پێیوایە بەرگری لە فەلسەفە و فەیلەسووفەکان دەکات، بەڵام شەڕی لەگەڵ ئیبن سینادا شەڕێکی ناوخۆیی بووە هۆکارەکەشی بۆ ئەو ململانێیە دەگەڕێتەوە کە باس لەرێباز و کەمتەرخەمیەکانی دەکات، گفتوگۆی لەگەڵ ئەسکەندەر و نستیۆس کردووە، رەخنەی لە شیکردنەوەکانیان گرتووە و پێیوایە لەرووی چەمکەکانەوە هەڵەیان کردووە، بۆیە دەبینی ماف بەلای ئیبن رووشددا دەشکیّ، کاتێك باس لە ئیبن باجە دەکەین دەبینی بەشێوەیەکی باشتر باسی دەکات، ناوی لێناوە باوکی فەلسەفەی ئەندەلووس.

لەزۆربەی کتێبەکانی دەبینی بەشێوازێکی توند نووسیونی بەتایبەتی لەدژی ئەوانەی کە ناکۆکی لەگەڵیاندا هەیە، ئەمەش بەوە ناودەبریّ کە پێنووسەکەی گەیشتۆتە بەرزترین پلەی کامڵبوونی هزری.

لەلایەکی دیکەوە دەبینی کەسایەتیەکان زۆر بەروونی بەدەردەکەن، ئەو کەسایەتیانەی کە ڕۆڵێکی چاکەخوازیان هەبووە دەبینی بە ئاماژەیەکی پەسەند باسیان دەکات، مەبەستیشی درێژدادڕی نییە، هاوکات بەهیچ شێوەی ئەنجامی توێژینەوەکەی لەبیر ناچێ، وەك سوڵتانێکیش هەڵوەستە دەکات کاتێك رادەیەکی بۆ دادەنێ.

ئێستاش کتێبەکانی بەپێی توێژینەوە لەئیبن رووشد و هزرەکانی بەیەکێك لە هەڵقە گرنگەکانی زنجیرەی هزری مرۆڤایەتی دەژمێردرێ، نەك لەبەر ئەوەی ئەرستۆ سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو بێ، بەڵکوو بەتوێژینەوەکانی ئەو ئەرستۆ ناسراوە، کاتێك لەسەدەی پانزدەهەمدا کتێبەکانی وەرگێڕدرا سەر زمانی لاتینی و زمانەکانی دیکەی ئەورووپا، ئەوە ئیبن رووشد بوو ئەرستۆی بەشکۆداری هێشتەوە، بەڵام هەردەم بۆچوونەکانی خۆشی سەلماندووە، بۆ ئەمەش مانای ئەوە نییە جیا بێ لە مامۆستای یەکەمی، خوێنەر ئەوە دەبینێ لەزۆر شوێندا زۆر جیایە لە مامۆستاکەی چونکە بۆچوونی مامۆستاکەی بەرهەڵستی ئاین دەکات، بەتایبەتی کاتێك باس لە سروشتزانی دەکات، لەمەوەش باس لەوە دەکات کە ئەمە بۆچوونی چەند کەسێکە و لێرەوەش ئیمام غەزالی وەك نموونە دەهێنێتەوە لە شیکردنەوەی بۆچوونی فەیلەسووفەکاندا ئەمەش لەنێوەندی (المقاصد الفلاسفه) بەدەردەکەوێ تا بتوانێ وەڵامی بداتەوە و راستی و رەوانییەکان بخاتە روو، کاتێکیش باس لە عەقڵە جیاکاریەکان دەکات بەمانای ئەوە نییە لەلایەن ئەوەوە داهێندرابێ بەڵکوو لەپێشتردا ئیبن سینا و ئیبن توفەیل ئاماژەیان بۆ کردووە، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە نەوەك تۆمەتباری بکەن بە گومڕا و تۆمەتباری بکەن کە

دژ بە ئایین وەستاوە، چونکە کاتێك تاوانبار دەکرێ شتێکی وا نامێنێ تا دژە فەلسەفە دەستیان لێ هەڵماڵن.

ئیبن رووشد نووسینەکانی ئەرستۆی بە سێ شێواز خستۆتە روو کە ئەمانەن: شیکردنەوەی بچووك و شێکردنەوەی مامناوەندی و شیکردنەوەی گەورە، بۆ ئەمەش لە هەر وتەیەکی پوختەیەکی لێ وەرگرتووە و دەڵێت (ئەرستۆ وایگوت) دواتر بە تێروتەسەلی باسی لێوە دەکات و لێی قووڵ دەبێتەوە، کاتێك باس لە شیکردنەوەی گەورە دەکرێ وەك ئەوە وایە شیکردنەوە بۆ قورئان بکات، دەبینی جیاکاریە رەهایەکان لەنێوەندی دەق و شیکردنەوەدا دەخاتە روو، هەروا ئیبن رووشد بەهەمان شێوازی فارابی و ئیبن سینا هەنگاوی ناوە کە دەبینی دەقەکانی ئەرستۆ تێکەڵ بە شیکردنەوەکانیان دەکەن، بەڵام لە شیکردنەوەی مامناوەندی دەبینی وشەکانی سەرەتا لەدەقی ئەرستۆدایە و دواتر لەسەر شێوازی فارابی هەنگاو دەنێ.

لەکاتێکدا شیکردنەوەی بچووك دەبینی نووسینەکانی بریتیە لە شیکردنەوەیەکی کورت لەتەك پەخشانێکی رێکخراو، لێرەدا دەبینی قسەکەر خودی ئیبن رووشدە بەشێوەیەك بەو شێوازە رازییە، ئەمەش وای دەبینێ کە شیکردنەوەیەکی تەواو راستە.

ئەوەی سەلمێندراوە دەبینی ئیبن رووشد شیکردنەوەی گەورەی لەپاش بچووك و مامناوەندی داناوە، بەڵگەش بۆ ئەمە شیکردنەوەی گەورەی بۆ سروشتزانی لەتەمەنی شەستساڵیدا خستۆتە روو، کەچی پوختەکەی لەناوەڕاستی تەمەنیدا خستۆتە روو لەتەك شیکردنەوەی مامناوەندی، بۆیە کاتێکی زۆری داناوە تا شیکردنەوە گەورەکە بخاتە روو.

## ئەو هۆیانەی نەبوونە ناوداربوونی لەلای موسڵمانان و خێرایی لەناوچوونی فەلسەفە لەدوای ئەودا

هۆکاری ناودارنەبوونەی لەلای موسڵمان وەك پێویست و خێرایی و لەناچوونی فەلسەفە لەپاش خۆیدا و پەرشبوونی وێنای دانایی، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بڵاونەبوونـەوەی کتێبـەکانی لەوڵاتـە ئیسـلامییەکان، واتـە لـە ئەنـدەلووس دەرنەچوو کە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامیش لەوێدا درێژەی نەکێشا، چونکە لەپاشاندا زیميننز وەك دەرمارگیرێك فەمارنیدا هەموو کتێب و دەستنووسە عەرەبییـەکان بسـووتێندرێ، ئەمـەش لـەپاش واڵاکردندیانـەوە لەلایـەن مەسیحیەکانەوە و ئاوابوونی دەوڵەتی موەحەدین، ئەمەو لەگوێرەپانی غەرناتەدا هەشـتا هـەزار کتێبـی عـەرەبیان سـووتاند، بێگومـانیش هـەموو نووسـین و کتێبەکانی ئیبن رووشد بووە خۆراکی ئاگر، ئەمەش بەهۆی دەمارگیری ئـەو ئەورووپی و ئەو ئاگرە گەورەیە.

ئەوەی کە ماوەتەوە لەکتێبەکانی ئیبن رووشد ئەو دەستنووسانە بوو کە بە دەستنووسی مەغریبی نووسی بووی، بەو وتایەی ئەو کتێبانە لە ئەندەلووسەوە گوازراوەتەوە بۆ ئەفریقیا و مـەراکیش لـەپێش نسـکۆیەکەیدا، بـەڵام کتێبـە عەرەبیـەکانی کتێبخانـەی ئەسـکۆریال هیچیان لـە شـوێنەواری عـەرەب و موسڵمانانی ئەندەلووس نین بەڵکوو لەنێوەندی کەشتیەکانەوە گوازراوەتەو کە چـەتەکانی دەریـای ئیسـپانی دەسـتیان بەسـەردا گرتـووە و لەدەسـتی مەغریبـەکانیان سـتاندووە، لەتـەك ئەمـەدا بـۆ جـاری دووەم ئـەو کتێبانـە سـووتێندران بەتایبـەتی لەسـەرەتای سـەدەی حەڤدەهـەم هـەروا لـەدوای کۆتاییهاتنی سەدەکە (١٦١١-١٦٧١ن) و نیوەی ئەو کتێبانە بێ کەڵك بوون.

تەنها چەند کتێبێك نەبێ کە ئێستا لە ئەسکۆریال بوونی هەیە و هەروا چەند کتێبێکی هەیە بەعەرەبی لە کتێبخانەی ئۆفیتشی فلۆرنسا و لەتەك هەندێك کتێبی دی پزیشکی کە لەکتێبخانەی پاریسی نیشتمانی و لیدن و ئەسکۆریال پارێزراوە و بەعەرەبی بڵاونەکراوەتەوە ئەم کتێبەش لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بیندراوە (١٨٥٩ز) واتە دوای مەردنی بە شەش سەدە، هەروا هۆکاری بڵاوبوونەوەی کتێبەکانی کە بەلاتینی نووسراوە لەسەدەی پانزدەهەمدا دەگەڕێتەوە بۆ شارەکانی بوندقییە و بادوا لەپاشان پۆلۆنیا و رۆما و ناپۆلی لە ئیتاڵیا لەدواتر گەیشتە لیۆنی فەڕەنسا ولەسەدەی شانزدەهەم زۆر ناودار بوو، دواتر لە سەدەی حەڤدەهەمدا ئەو کتێبانە وەك نووستوویەکی لێهات لەپاشاندا بەتەواوی لەبیر کرا، بەشێوەیەك وەك ئەوەی ئیبن رووشد لە رۆژئاوادا بەهیچ شێوەیەك ناودار نەبووە.

## رێبازی ئیبن رووشد

وێنا و باس و خواسەکانی ئیبن رووشد بەشێوەیەکی گشتی هەمان شێوەی ئەوانی پێشتر و هاوسەردەمە فەیلەسووفەکانی دیکەی موسڵمانە، بەشێوەیەك لە فەلسەفەی ئەرستۆ زیاتر نییە تا دەگاتە تیۆرەکانی ئەفلاتوونی نوێکار، بەڵام فەیلەسووفەکانی ئیسلام بۆ زیاتر روونکردنەوە تیۆری عەقڵی بازنەییان زیاد کرد لەنێوان داینەمۆی یەکەم و جیهان بەمەش بیرۆکەی هاتنەکایەوە گشتیان خستە ڕوو، بەو مانایەی هەموو بوونەوەرەکان هاتووەتە کایەوە کە خودا فەرمانی پێ کردووە، مەبەستیش لەم تیۆرە گەیشتنی جووڵە لە داینەمۆی یەکەمەوە کە نزیك لە بازنەیەك دواتریش خستنە ڕووی بۆ هەموو گەردیلە و بەشەکانی گەردوون تا دەگاتە جیهانی سەر زەوی.

بەڵام پەنابردنی فەیلەسووفەکانی عەرەب بۆ ڕێبازی هاتنەکایەوە تا ئەوە دەربخەن، کە وێناکانی ئەرستۆ ڕێبازێکی لاوەکییە بەو واتایەی هێز و مادده هاوبەشبوونە بۆ دروستکردنی جیهان تا بۆشاییەکان پڕ بکاتەوە لەنێوان هێزی بەردەست و ئەو هێزە لەماددەدا دێتەکایەوە، بەو مانایەی دوانەی ئەرستۆ شیکردنەوەی جیهانە لەنێوان دوو توخمدا، کە ڕەهان لەخودا و لەیەکتری جیان، کە هێز و ڕووح و ماددەیە، بۆ یەکخستنی یەکەم لەنێوەندی گریمانەکانی ئیسلامدایە، لەتەك ئەوەی ئەرستۆ فەیلەسووفی یەکەمە کە موسڵمان زانستیان لێ وەرگرتووە، بەڵام ڕێککردنی بۆ ئەوان باشترین چارەسەر بوو تا بە ئاسانی نەتوانن لە باوەڕی ئایینی لابدەن بۆیە ڕێبازی هاتنەکایەوەی گشتییان داهێنا، بۆ ئەمەیش لەجیاتی پێشبینییەکانی ئەرستۆ دایاننا، تا بەشێوەیەکی گەوهەری لانەدەن لە وێنا و فێرکارییەکانی ئەرستۆ.

ئیبن ڕووشد بەهەمان شێوازی فارابی و ئیبن سینا هەنگاو نا، لەپاشاندا ڕێبازی ئیبن ڕووشد بووە سەرچاوە هەموو فەیلەسووفەکانی ئیسلام بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەرستۆ هەنگاویان نا، دەتوانین ناویان بنێن کە ئەوانە هەمان شێوازیان گرتەبەر بە شێوەیەك ڕێبازی ئیبن ڕووشد هەموویان لەیەك ڕێبازدا کۆدەکاتەوە و بۆچوونەکانیان ڕێکدەخات و ناویشی بوو بە فەلسەفەی ئیسلام، زۆریش لە فەیلەسووفەکان کە لەپاشاندا دەستیان پێ کرد، زۆر سوودیان لێوەرگرتووە و بۆچوونەکانیان دووبارە کردووەتەوە و بیروبۆچوونەکانیان تێکەڵ بە هزرەکانیان بووە و مێژوونووسانیش هەموو ئەو بیروبۆچوون و هزرانە دەگەڕێننەوە بۆ بۆچوونەکانی ئیبن ڕووشد و فارابی.

تەنهاش ئیبن ڕووشد چاکەی لەسەریان نییە، چونکە ئەو تەنها کەسێك نەبووە شیکردنەوە بکات یان وتەکان بگوازێتەوە وەك هەندێك لە مێژوونووسان باسی

لێوە دەکەن بەڵکوو ئەو روون کردنەوەی داوە و لەو نێوەندەشدا داهێنانی هێناوەتە کایەوە و نوێکاری کردووە لەنێوەندی روونکردنەوە و شیکردنەوەکانی، چونکە زۆر جار فەیلەسووفەکانی ئیسلام قەناعەتیان بە شیکردنەوەکانی ئەرستۆ نەبووە، بەڵکوو شێوەی رێبازەکەیان کردۆتەوە سەرمەشقی رێبازەکەیان.

لەتەك ئەمەدا کاتێك سەیری روونکردنەوە و تیۆرەکانی عەرەبی و ئیسلامی کراوە بەشێوەیەك پوختکراوەی ئەو فەلسەفەیە توخمی هزری تیا بووە، بەڵام لەکۆی گشتی زۆر لێك جیا بووە بۆ ئەوانەی بۆچوون و رایان خستۆتە بوو، بۆیە بۆچوونەکانیان تەنها لەنێوەندی کۆمەڵەکانی موعتەزیلە و قەدەری و جەبری و سەفاتیە و باتنی و ئەشعەری و زانستەکانی کەلامدا جێگەیان دەبۆوە، ئەمەش لەنێوەندی هەموو کۆمەڵەکان زۆر بە روونی دەردەکەوت، بەڵام ناونانی فەلسەفە، تەنهاش فەلسەفەیان خستووەتە بازنەی دێرینەکان دوای ئەوەی هاتوون هەموو لاینەکانیان پشکنیوە، کاتێك باس لە فەلسەفەش دەکەین لەنێو ئیسلامدا دەبێ بگەینە ئەو خاڵەی کە زۆر دیاریکراوە لە جووڵەی هزر لە نێو ئیسلامدا.

زۆرێك لەخەڵك لەسەر ئەو خاڵە رێکنەکەوتوون کە ناو بنرێ فەلسەفەی عەرەبی یان فەلسەفەی ئیسلامی، بۆ هەر یەك لەمانە چەندان پاساو دەخرێتە روو باشتریشە وەسفی فەلسەفەی ئیسلامی پێ ببەخشین، چونکە توێژینەوەکانمان سەبارەت بە کیندی و فارابییە کاتێك سوودیان لە فەلسەفەی یۆنانی وەرگرتووە، وەك کاتێك سەیری عەباسییەکان دەکەین زۆربەیان لە رەچەڵەکی فارسین، واتە گەلێکی ئارین لە هیندۆ ئەورووپییەکانن، هەروا فەلسەفە زۆر دوور بووە لەعەرەب و شتێکی نامۆ بووە لەلایان بەو پێیەی گەلێکی سامین،

بەشێوەیە کاتێك باس لە ئیسلام دەکەین خۆی لەکۆمەڵێك باوەڕ و وێژدان و بنەمای عەقڵی و سیستەمی کۆمەڵایەتی و بنەمای مەدەنیەتدا دەبینێتەوە.
کاتێکیش وا باس لەعەرەب دەکا مانای ئەوە نییە زیانیان بەرکەوتبێ، چونکە عەباسییەکان پێش هەموو شتێك ئیسلام بوون و چاویان خستۆتە سەر فەلسەفەی یۆنانی و یەکەم فەیلەسووفی ئیسلامیش عەرەب بووە کە کیندییە و لەوڵاتی عەرەبی ژیاوە، بەڵام نوێنەرایەتی فەلسەفەی ئیسلامی کردووە کە کتێبێکی داناوە لەدوو بەشدا سەرچاوەکەی رۆژهەڵاتە، بەهەمان شێوەش کیندی و فارابی و ئیبن سینا سەرچاوەکان رۆژئاوا بووە، لەتەك ئیبن باجە و ئیبن توفەیلّ و ئیبن رووشدا، بەڵام کاتێك سەیری فەلسەفەی ئیبن رووشد دەکەین شتێکی جیاواز نابینین لە فەلسەفەی ئیبن باجە و ئیبن توفەیلّ، هەردوو داناش لەرۆژئاوا بوون کە سەرەتایەکەیان لە رۆژهەڵات بووە.
لەفەلسەفەی ئیسلامدا سێ ناوی بەرز هەیە و عەقڵیان وەك چیایەکە کە بەفری لەسەر کەوتبێ و لەسەرووی چیایە بچووکەکانەوە بێ، ئەم ناوانەش ئیبن سینا و غەزالی و ئیبن رووشدن، بەڵام ئیبن سینا باڵاترین فەیلەسووفی رۆژهەڵاتی ئیسلامە و بۆچوونەکانی زۆر فراوانن و پشوودرێژە و هزرەکانی زیاتر دەکەوێتە دڵان، لەلایەکی دیکەوەش غەزالی لەهەموویان زیاتر توێژینەوەکانی رێکخستووە و زۆر بەقووڵی چووەتە نێو هزرەکان و لەهەموویان زیاتر درك بەشتەکان دەکات، تا رێگە مەحاڵەکان ببڕێ تا دەگاتە راستیەك لەرێگەی عەقڵەوە، هەروا فەلسەفەی کانتی ئەڵمانی لەدوا ئەو بەچەند سەدەیەکەوە هات، کاتێك غەزالی زانی مرۆڤایەتی ناتوانێ لەرێگەی توێژینەوەی هزری بگاتە راستییەکان، ئەو رێگەی تەسەووفی گرتەبەر، نزیکترین رێگە بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکان، ئەم وەرچەرخانە سروشتییە لە عەقڵێکی بەتوانا گۆڕانێکە بۆ

رووخاندنی بۆچوونەکانی فەلسەفە، بۆ کتێبی (تهافت فلاسفە)ی نووسی ئەمەش دژ بەبۆچوونەکانی ئیبن سینا بوو هەروا بنەمای کێشەکانی شکاند، غەزالی لە پێش کات درکی بەوە کرد کە مەحالە عەقل بگاتە راستی، هەروا ئەو لەپێش هیوم ئەیکۆسی بوو کە کاریگەری هەبووە لەسەر بۆچوونەکانی کانت جیاوازی نێوامیشیان هیۆم بنەمای بێئومێدی دانا لەسەر بنەمای پشێویدا، بەلام کانت لەسەر بنەمای لۆژیك و سیستەم داینا.

غەزالی نکۆلی لەبەهای زانست کرد و بەهاکەی کەم کردەوە و چونکە سوودی کەمتر بووە، هەروا نکۆلی لە هێزی عەقل کرد و ئەوەی سەلماند توانای هەموو شتێکی نییە، بۆیە لەپێش ئەو دوو دانایە کە گەورەترین داناکانی ئەوروپای نوێن، بۆیە بەرەو رێبازێك هەنگاویان نا، کە دەڵێن ئێستا لەفەرەنسا فەیلەسووفن برگسۆن و ئەو دووانە دوو زانان لە رۆژهەلاتدا لەدایك بوون بەمانای ئیبن سینا و غەزالی و سێیەمیشیان ئیبن رووشدە، کە چاکەکاریەکی زۆریان لەسەر فەلسەفەوە هەیە، کە لەدێرینەوە تیۆرەکانیان لە شیکردنەوەی گەردووندا راستی یەکەم و دیاریکردنەکەیان دۆزیوەتەوە.

تیۆری یەکەم زۆر بەئازادی باس لە کێشەی عەقل دەکات و کەچەندان خەسڵەتی هەیە بۆ گرنگیدان بە تواناکانی جیهان ولەوێدا شیکردنەوەیەك دەدا بە هۆکاری هاتنە کایەوەی گەردوون و مەبەست و کۆتاییەکەی بەدەردەخات، لەوێدا جەخت لەوە دەکاتەوە کە دەروونی مرۆڤ کائینێکی ماددی نەمرە.

تیۆری دووەم باس لەوە دەکات کە ماددە ئەزەلییە و بنەرەتی ژیانیش میکرۆبێك بووە بەهۆی هێزەکەیەوە پێش کەوت و کێشەکانیشی دیاریکراو نین و سروشتیش یاسای خۆی هەیە و پێویستە دەسەلاتی بەسەردا بشکێ هەروا بوون و پێویستی یاساکانی گەردوون و بوونی عەقل لەوێدا سەربەخۆ نییە، بۆیە

فەیلەسووفەکانی ئیسلام پشتیان بە بیرۆکەی دووەم بەست، بەڵام ئەوەی بووە هۆی یارمەتیدەرێك بۆ ئیبن رووشد هەردوو زانا و فەیلەسووفی گەورە بوون کە غەزالی و ئیبن سینان، ئەگەر سەیری هەردوو رێبازمان کرد یەکەم رێبازیش رێبازی هاتنە کایەوە و دروستبوونە و دووەمیشیان رێبازی پێشکەوتن و هەڵکشانە، ئەوەی کە گرنگە لێرەدا ئیبن رووشد لەتەك تیۆری رێبازی دروستبوون و هاتنەکایەوە نەبوو، پشتگیری لە تیۆری پێشکەوتن کرد و لەوێدا باسی لەوە کرد کە ماددە تا هەتاهەتایی و ئەزەلییە، ماددە پێویستییەکە و بنەڕەتی هەموو بوونەوەرەکانە هەر ئەو دەبێ بمێنێ و هیچ بوارێکی بوارێکی دیکە نییە.

سەبارەت بە کێشە و باس و خواسی گەردوون و هەموو کێشەکانی دیکە ئیبن رووشد باس لەوە دەکات کە "دەسەڵاتی گەردوون هاوشێوەی دەسەڵاتە بەسەر شارێکدا، دەسەڵاتدار سەرچاوەی باڵایە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە جێبەجێ دەکرێ، بەڵام گەردیلە و رووداوەکان و ناوەڕۆکەکەی لەلای ئەوەوە راستەوخۆ دەرناچێ، دەتوانێ کاریشی پێ نەکات"

لەلای ئیبن رووشد ئاسمان کائینێکی زیندووە کە لەچەندان تەن پێکهاتووە و رێکخستنی تایبەت بەخۆی هەیە، وەك ژیان و سووڕ و کاریگەرییەکەی لەسەر یەکتردا، کاریگەری لەسەر مرۆڤ هەموو ئەمانەش لە کتێبی دوانزدەهەم سوودی لێ وەرگیراوە کە ئەو دیوسروشتی ئەرستۆیە، تێۆری ئیبن رووشد سەبارەت بە عەقڵی مرۆڤایەتییە، کە پوختەی کتێبی سێیەمە بەناونیشانی رووح کە تێکەڵکراوە لەتەك تەسەووف و گونجاندن و لێك نزیکردنەوە کە دانایەکانی ئیسلام تیایدا سەرکەتووبوونە.

## ڕێبازەکەی سەبارەت بەعەقڵ

ئیبن ڕووشد لەڕووی عەقڵەوە و لەڕێبازی عەقڵدا جیا لەهەمووان سەرکەوتنی بەدەستهێناوە و وتەکانی زاناکانی لاهووتی هەمووی جووڵاندووە بەتایبەتی لە سەدەی سێزدەهەمی زایینی، ئەو سەرەتا بۆچوونی ئەرستۆی سەبارەت بە عەقڵی کارا ڕوون کردەوە هەروا بۆچوونی ئەوانی پێشتریشی ڕوون کردەوە لەوێدا ئەوەی دەرخستووە کە زانا و فەیلەسووفەکانی پێشتر بە تەواوی درکیان بە نووسینەکانی ئەرستۆ نەکردووە، ئەمەشی لەنووسینێکدا بەناوی (فی النفس) ڕوونکردووەتەوە کە ئێستا ئەو نووسینە پارێزراوە لە کتێبخانەی نیشتمانی پاریس: هێز کە ماقوولەکان هیچ کاریگەریەکیان نییە، تەنها کاریگەری درکپێکردن نەبێ ئەم هێزەش هاوشێوەی هێزی درکپێکردنە و وێنا دەکرێ بەرێگەکانی پێوەر، هێزی ماقوولەکان وەك هەستی نێو هەستیارییەکان لەتەك جیاوازییەك کە هێز کاریگەری نییە لەسەر هەستیارەکان.

بەڵام هێزی ماقووڵ پوختەیەکی ڕەهایە لەنێو خودی خۆیدا بەتێکەڵکردن لەگەڵ وێنە ئەمەش دەبێ بخرێتە ڕوو لەنێوەندی عەقڵی هیولی، کاتێك درك بەهەموو ماقوولەکان دەکرێ هەموو وێنەکان کۆدەکرێتەوە بۆیە ناکرێ شێوە و وێنەکان ئاوێتە بکرێ، چونکە وێنە خۆی ئاوێتەی گۆڕانکاری وێنە درکپێکراوەکان دەکات، ئەگەر ئەو وێنانە گۆڕا ئەوا عەقڵ تووشی پشێوی دەبنەوە، عەقڵی هیولی نامێنێ کە بنەڕەتەکەی درکپێکردنی وێنەیە لەسەر ڕاستەقینەکەی و بەمەش سروشتەکە گرنگی بەو شتانە دەدات کەسروشتی نین.

بۆیە پێویستمان بەمانەوەی عەقڵە وەك هێزێکی پوختەکراو دوور لەگەرد واتە تێکەڵبوونێکی پاك لە درکپێکردنی ئاوێتەبوونی بە شێوەکان، ئەگەر بڕیار وابێ ئەوە دەسەلمێندرێ کە سروشتی عەقڵ تەنها باسێکی پێکهاتەیی نییە، بەڵام

عەقڵ پێویستی بە توخمی ڕێکخستنە لەنێو خودی خۆیدا بەپێی سیستەمەکەی، عەقڵ لە هێزی هیولیدایە، هیۆلیش یان ئەوەتا پێکهاتەیەکە لەماددەیەکی وێنە یان ساکارە کە ماددەی سەرەتاییە.

ئەمەش مانای عەقڵی کاریگەرە کە ئەرستۆ دایناوە و ئەسکەندەر فردۆسی ڕوونیکردۆتەوە، بۆ ئەمەش ئیبن رووشد ڕوونکردنەوە لەسەر تمستیس دەکات کە سەرچاوەکەی عەقڵ یان هیولانیە و تێکەڵ بەهێزی دەروونی ئەوانی دیکە نابێتەوە، بریتییە لەئامادەگی ماددەیەکی جیاکراوە لەنێوەندی هێزەکاندا، ئیبن رووشد لەمبارەیەوە دەڵێت عەقڵ شتێکە سانایە لەخۆهاتوو یان ئامادەگییە وێنەی جیای هیۆلییە، ئەویش ماددەیەکی جیاکراوەیە چونکە بە مرۆڤەوە نووساوە، بەڵام ئامادەگی بە ماددەوە نەنووساوە بۆ سەروشتی ماددەی جیاکراوە وەکچۆن وا ڕوونکراوەتەوە بەمەش ئامادەگییەکی تەواو نییە وەکچۆن تەنها ئەسکەندەر گومانی بۆ چووە.

بەو واتایەی ئامادەگی تەنها پوختەکراوەی عەقڵی هیولی نییە کە درکی پێ دەکات بەبێ وێنە لەگەڵ بوون و درکپێکردنی وێنە درك بەبوون ناکات لەمەوەش دەتوانێ درك بە خودی خۆی بکات بەبێ وێنە بەرهەمی ئەمەش ئەو هێزە درك بە ئامادەگی و وێنە دەکات کە بەسەریدا تێپەڕ دەبێ بێگومان لەدەرەوەی ئەودایە ئەمەش بەسانای لەعەقڵی هیۆلی بەدەردەکەوێ، کە شتێکی ئاوێتە بووە لە ئامادەگی تەواوی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەمەیش عەقڵە ئەو ئامادەگییە دەهێنێتە کایەوە و بۆ ئەمەیش ئامادەیە بەهێز نەك بەکردەیی، ئەمەش عەقڵی کارایە، لەبەر ئەوەی کارایە بەهێزەوە بەڵام ناتوانێ درك بەخودی بکات، تەنهاش دەتوانێ درك بە بوونی هیۆلی بکات، ئەگەر لە ئامادەگییەوە ترازا ئەو کات دەبێتە عەقڵێك کە درك بە بوونی خۆی دەکات

بەبێ ئەوەی کاریگەری هیۆلیات هەبێ، چونکە دەروون کارێکی هەیە کە دروستکەری وێنەی ماقوولێ و وەرگرتنیەتی ئەگەر عەقلێ وێنەی ماقوولێ بهێنێتەی کایەوە، ئەم دوو کارەش چەندان جۆری هەیە لە رووکەشیشدا تەنها کارێك بەڕێوە دەبات.

ئەوەی ئەسکەندەر خستوویەتییە ڕوو دوژمنکاریەکی لەنێوان هەموو ئەوانە هێناوەتە کایەوە کە بۆچوونەکانی ئەرستۆیان روون کردۆتەوە، لێرەوەش باسی ئیبن رووشدی کردووە کە توانیویەتی زۆر سەرکەتووانە لەنێوەندی ئەو گرفتە ئالۆزەدا دەربچێ، ئەوەشی خستووەتە ڕوو، کە عەقلی مرۆڤایەتی یان هیۆلی یا کاریگەر دەتوانێ ئاوێتەی ژیانی دونیایی ببێ بە عەقلی کارا.

ئیبن رووشد هێزی دەروونی دابەش کردووە لەنێوان پەیوەندیەکانی بە یەکتریەوە دواتر هەموو پەیوەندیەکانی نێوان عەقلی جیاکراوەی کارا و عەقلی هیۆلی وا لێکداوەتەوە، کە پەیوەندییەکە لەنێوان مادده بە وێنە و دەڵێت عەقلێ درك بە عەقلی کارا دەکات، پێچەوانەکەشی مەحاڵە، چونکە عەقلی کارای گشتی، ئەگەر درکی بەعەقلی مرۆڤایەتی کرد، ئەوە رووداوێکی لێ دێتە کایەوە، چونکە عەقلی مرۆڤایەتییە درك بە عەقلی گشتی دەکات، چونکە عەقلی کارا، ماددەیەکی ئەزەلییە و ناکەوێتە نێو پەشێویەکان، چونکە عەقلی مرۆڤایەتی درك بەعەقلی گشتی دەکات، هەروا خۆی بەرز دەکاتەوە بۆ عەقلی گشتی بەشێوەیەك یەکدیگر دەبێ لەگەڵ ئەوەی لەوانەیە بمینێتەوە یان لەناوبچێت، بۆ ئەمەش ئامادەگیەکی نوێ دەنوێنێ و درك بە عەقلی گشتی دەکات وەك عەقلی گشتی ئاگر و عەقلی مرۆڤایەتی پەراوێزخراو کە لەدواتردا دەبێتە بڵێسەیە لە ئاگر ئەمەش گەیاندنی راستەوخۆیە.

لەوانەیە پەیوەندی بە عەقڵی سوود و هاتنەکایەوە و دەگاتە خاڵی گەیاندن بە عەقڵی گشتی، کە بەرزترین پلەی کامڵبوونە، بەڵام بەجۆراوجۆری کەسەکانیش دەگۆڕێ کە سەرچاوەکەی سێ هێزە: یەکەم هێزی عەقڵی هیۆلی بنەڕەت، کە بنەماکەی هێزی خەیاڵە. دووەم کامڵبوونی عەقڵ کە پێویستە هەوڵێکی زۆری دابێت لەنێوەندی بیرکردنەوە. سێیەم: بەهرە یارمەتیدەرێکی خوداییە، لەلایەن خوداوە پێت دەبەخشرێ، ئیبن باجەش کردوویەتیە مەرجێکی سەرەکیی بۆ گەیشتن، ئەگەر تاکەکان ئەو سێ بەهرەیان نەبێ ئەو خودی خۆی وەن دەکات لەنێوەندی عەقڵی کارا، بە شێوەیەك تاك تاکایەتی رەهای هەیە، بەڵام لە ڕووی دەروونەوە، وەك ئەوە وایە کە بڵێسەیەکی ئاگر هەڵگیرسابێ.

بە کورتی کامڵبوونی باڵا، تەنها بە خوێندن و بیرکردنەوە و دوورکەوتنەوەیە لەهەموو ئارەزووەکان لەپاش تەوابوونی عەقڵی هزرمەند، تەنهاش ئەوەی سۆفیگەرەکان دەیڵێن بەس نییە، بۆ گەیشتن بەهۆی ڕامانێکی نەزۆك ئەگەر بێ توێژینەوە و بیر کردنەوە نەبێ، ئەم خۆشگوزرانییە باڵایەش مرۆڤ تەنها بە خوێندن و هەوڵدان دەیگاتێ، بۆیە ئەگەر وا نەبێ ئەوا لەکۆتاییدا دەمرێ و تووشی ئازارێکی گەورە دەبێتەوە، لەتەك ئەوەی ئیبن رووشد باسی لەوە کردووە، کە عەقڵی هیۆلانی ماددەیەکی تەنهایە، بەڵکوو وای داناوە، کە ئامادەگییەکی سانایە بوونی هەیە و ون دەبێ لەگەڵ مرۆڤ، کە لەدایك دەبێ و لەدواتردا دەمرێ، لە بوونی دونیایەوە دەگوازرێتەوە، بەڵام نەمریی دەروون، شتێکی ئەفسانەیە و هیچ بوونێکی نییە.

ئەو زانیارییە گشتیانەی کە لە عەقڵی کاراوە دێنە کایەوە شتێکی وا نییە، ئەمەو ئیبن رووشد لە تیۆری عەقڵی کاریگەر و عەقڵی کاریگەریی فەیلەسووف لەپێشتردا باسی کردووە.

لەپاش چەند سەدەیەك لیبنتز هاتووە باسی لەوە کردووە کە ئیبن رووشد باسی لە عەقڵی مرۆڤایەتی کردووە و لێرەوەش خوێنەر دەتوانێ بەراوردێك لەنێوان وتەی ئیبن رووشد و تیۆری لیبتنز بکات کە ناسراوە بە (Monopsychisme) مارکات ئەوەش دەخاتە روو کە ئیبن رووشد چاکەکانی ئەرستۆ رەت ناکاتەوە، بۆ ئەمەیش ئەرستۆ بەهۆی توێژینەوەکانی گەیشتووەتە زۆر ئەنجام بەڵان زۆر بەروونی باسەکانی نەخستووەتە روو.

ئەوەی کتێبی سێیەمی رووح بخوێنێتەوە دەگاتە ئەوەی کە رێبازی یەکەی دەروونی ئەنجامێکی راستەوخۆیە بۆ رێبازی ئەرستۆ، بەڵام ئەرستۆ ئەمەی نەگوتووە بەڵکوو ئیبن رووشد باسی لەوە کردووە، هاوشێوەی قسەی مالبرانشە کاتێك باس لەوتەکانی ئەرستۆ دەکات کاتێك باس لە عەقڵێکی دیکە دەکات کە هەموو لایەك بەپێی ئەو رێنماییانەوە هەنگاو دەنێن بەبێ ئەوەش درك بەهیچ شتێکی دیکە ناکات، ئیبن رووشد گەیشتووەتە باوەڕهێنان بەو تیۆرە و چەند ئەنجامێکی لێ بەدی هێناوە هەموو ئەمانەش لەنێوەندی کتێبەکانی ئەرستۆ و روونکردنەوەکانی زانایانی گریك بەدەستی گەیشتووە وەك روونکردنەوەکانی ئەسکەندەر فردوسی و تمستیۆس دی فلیبۆن و هەموو فەیلەسووفەکانی ئیسلام، چونکە ئەم تیۆرە لایەنێکی مەزنی تیایە بۆ پێویستە گرنگی پێ بدرێ.

پێدەچێ ئەوەی رێگری کردبێ لە قسەکردن سەبارەت بە گیانی فەلسەفەی سەیرو سەمەرە چەند هۆکارێك هەبێ ئەمەش لەکتێبی هەشتەمی سروشتزانی خراوەتە روو کە بۆچوونی ساگۆرە بەوەی پوختکردنەوە کە عەقڵ پێویستی بە دوو کارە یەکەم کاریگەری دەرەکی لەرێگەی هەستەوە پێی دەگات، دووەم کاردانەوە لەنێوەندی دەروونی تاکەکەوە دێتە ئارا بەهۆی بوونی رووداوێکی کاریگەر: لێرەوە هەست هەست بۆ هزر ماددەیەکی بیرکردنەوە دەهێنێتەکایەوە

و عەقڵی رووتیش شێوەی بیرکردنەوە دەداتە شێوەکان، ئەم تیۆرەش لەرووی گەوهەریەوە جیاناکرێتەوە لە تیۆرە نوێیەکان بەپێی ئەو زانیاریانەی فەیلەسووفەکانی سەدەی نۆزدەهەم پێیگەیشتوون لەپێش بەدەرکەوتنی بەرگسۆن لە فەرەنسا، بەمەیش ئەرستۆی روونکردووەتەوە و ساڵای داوەتە تیۆری عەقڵ بەپێی بۆچوونەکان کردویەتیە پێنج توێژینەوە:

یەکەم-جیاکاریی لەنێوان عەقڵی کارا و عەقڵی کاریگەر

دووەم-لەناونەچوونی عەقڵی کارا یان کاریگەر لەوانەش ئەوەی دواتر لەناوبچێ

سێیەم-عەقڵی کار لەدەرەوەی مرۆڤە وەك خۆری عەقڵ

چوارەم-یەکەی عەقڵی کارا

پێنجەم-یەکەی عەقڵی کارا لەتەك عەقڵەکانی دونیایی

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دەقەکانی ئەرستۆ دەبینین چەندان وتەی روون بەدی دەکرێ بەتایبەتی لەتوێژینەوەی یەکەم و دووەم هاوکات لە سێیەمیشدا دووبارەی کردووەتەوە، هەروەها بۆ خستنە رووی توێژینەوەی چوارەم و پێنجەم روونکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ئیبن رووشد و ئەوانی دیکە، بۆ ئەمەش لیبنتنزۆ و مالبراش کە هەردووکیان لەهەواداری دیکارتن باسیان لەوە کردووە، ئەوەشیان خستووەتە روو کە فەلسەفەکەی روونە، بەلام ئیبن رووشد سەرکەوتووتر بووە لەو گریکانەی کە روونکردنەوەیان لەمەڕ ئەرستۆ کردووە، لەبنەڕەتیشدا لەرێگەی ئیبن رووشدەوە هاتوون ئەرستۆیان خوێندۆتەوە.

ئیبن رووشد لەهەموو شیکەرەوەکانی یۆنان سەرکەوتووتر بووە وەك ئەسکەندەر فردۆسی ئەو وا باس لە ئەرستۆ دەکات کە عەقڵ حاڵەتێکی ئامادەگییە بۆ وەرگرتن لەراستیشدا ئیبن رووشد وتویەتی عەقڵ بوونەوەرێکی ئامادەیە بۆ وەرگرتن، هەروا ئیبن رووشد پاساو دەهێنێتەوە لەرووی

ئەسکەندەردا گفتوگۆیەکی توندی لەتەکدا دەکات و بەوەش تۆمەتباری دەکات کە نەیتوانیووە بەتەواوی درك بە بۆچوونەکانی ئەرستۆ بکات، زۆر بەبوێرانە پێی دەڵی تۆ هەڵەی، لەراستییدا ئەوەی ئیبن رووشد گوتوویەتی هەموو فەیلەسووفەکانی دیکە پشتگیرییان کردووە.

**دەروون**

بۆچوونی ئیبن رووشد سەبارەت بەدەروون دەڵێت پەیوەندیدارە بە لەشەوە و لەتەك گەیاندنی وێنە بەماددە، ئەمەش پێچەوانەی ئیبن سینایە کە سەبارەت بەتیۆری دەروون دەڵێت دەروونەکان لەنەمریدان واتە نەمریی دەروون بەگشتی، بەڵام دەروون بوونی نییە ئەگەر پەیوەست نەبێ بەلەشەوە هیچ بوونێکی نییە، زۆربەی بۆچوونەکانی ئیبن رووشد سەبارەت بەدەروونناسی لەتەك بۆچوونەکانی ئەرستۆیە و ئەو تەنها لەتەك گالینۆس نییە بەڵکوو لەتەك بۆچوونەکانی ئەرستۆیە و پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەی هیچ رایەکی دیکە نادات، تەنهاش تیۆرێك نەبێ کە تیۆری ئەرستۆ سەبارەت بە دەروون ئیبن رووشد پێچەوانەی ئەو بیردەکاتەوە بەو پێیەی ئەرستۆ پشتی بە بۆچوونەکانی ئەفلاتوونی نوێ بەستووە، چونکە ئەمەش پێچەوانەی رێبازەکانی ئەرستۆیە بەگشتی.

سەبارەت بەعەقڵیش مەبەستی ئەوەیە کە عەقڵی کاریگەر عەقڵی تاکەکانە و دەکرێ کۆتایی بێ و عەقڵی ئەزەلیش عەقڵی مرۆڤە وەك رەگەزێك، کاری عەقڵی کاراش لێرەدا پێشکەشکردنی وێنەیەکی دەروونییە کە پەسەندە لەلای عەقڵی هەڵچوو بەمەش درکی پێ دەکات.

زۆرێك لەفەیلەسووفەكانی سەدەكانی ناوەڕاست وا گومان دەكەن كە ئیبن ڕووشد باسی لەیەكەی دەروون كردووە بەمەش ویستوویانە تانەی لێ بدەن، هەندێكیش پێیان وایە كە ئیبن ڕووشد باسی لە دەروونی كردەیی و ناكردەیی كردووە ماوەیەك دڵخۆشە و ماوەیەكی دیكە نیگەرانە و دڵپەرۆشە، ئەمەش جیاكاریەكی گەورەیە، بەڵام باوەڕی ئیبن ڕووشد سەبارەت بەدەروون مەبەستی شتەباڵاكەی گەردوونە، مەبەستی هەموو گەردیلەكانی گەردوونە كە هاوشێوەی ژیان و بوونە، بێگومان هزری مرۆڤایەتی لەكۆی گشتیدا لە ئەنجامی گەردوون بە گشتی هێزێكی باڵاوە هاتووەتە كایەوە.

مانای ئەمەش ئیبن ڕووشد مەبەستی یەكەی دەروونەكانە بەشێوەیەك مرۆڤایەتی بەردەوام لەژیاندا دەبێت و نەمری عەقڵی كارا نوێبوونەوەیەكی بەردەوامی مرۆڤایەتییە و بەردەوامبوونی مەدەنیەتە، لێرەوەش توێژەرەكان كۆك بوون لەسەر تیۆری ئۆشگت كومت سەبارەت بە نەمری مرۆڤایەتی، مانەوەی ئەو تیۆرەش مرۆڤایەتی ئایینی بۆ دانرا و لەپاشانیشدا مرۆڤایەتی چەندان پەرستگەیان بۆ دانا لە ڕۆژئاوادا.

ئیبن ڕووشد لەبەردەوامی ئەو تیۆریدا باس لەوە دەكات كە عەقڵی بوونەوەری ڕەها سەربەخۆیە لەتاكەكان وەك ئەوەی بەشێك بێ لەگەردوون، مرۆڤایەتیش یەكێك لەكردەكانی ئەو عەقڵەیە و بریتییە لە بوونەوەرێكی پەیوەستبوو بە بوونی هەتا هەتایی، بەو پێیەش دەبێ فەلسەفە بەدەربكەوێ تا فەیلەسووف بتوانێ سەرپەرشتی عەقڵی ڕەها بكات، لەمەوەشەوە مرۆڤ و فەیلەسووفی پابەندن بە سیستەمی گەردوون.

**ڕێبازی ئیتسالْ**

بنەمایەکی سەرەکی زانستی دەروونە لە ڕۆژهەڵات کە بووە جێگەی سەرنجی فەیلەسووفەکانی ئەندەلووس وەك ئیبن باجە و ئیبن و توفەیلْ، وەك لەپێشتریشدا باسمان کرد، ئەمە ڕێبازێکی تەسەووفە، ئەمەو سۆفیگەری حەوت پلەی هەیە، هەندێك لە فەیلەسووفەکانی ئەفرەنج وەك ئەرنست رینان ناویان لێناوە ڕێبازی "ئێمە و تۆ" یان ڕێبازی ئێمە، من تۆم و تۆش منی یان من ئەوە.

اذا تبدى حبيبى     بأى عين أراه
بعينه أم بعينى     فما يراه سواه

بەو واتایەی کە تۆ خۆشەویستی من بی بەکامە چاو سەیرت بکەم بەچاوی ئەو یان بەچاوی خۆم هەر ئەوەش دەبینیْ.

ئەوەی جێگەی خۆشحاڵییە فەلسەفەی ئیبن ڕووشد زۆر دوور بوو لەو ڕێبازە، چونکە لەهەموو فەیلەسووفەکانی دیکە کەمتر بڕوای بە تەسەووف بوو، زیاتریش لەژێر ڕۆشنایی عەقلْ هەنگاوی دەنا و ئەو دەیگوت تەنها بە زانست دەگەینە زۆر شت، مەزنترین خاڵیش بۆ بلیمەتی عەقلی مرۆڤایەتی بەرزترین پلەی باڵای هزری و زانستییە بە خودا ئەو دێتە دی کە مرۆڤ توانی هەموو ماسکەکان لەسەر ڕووی خۆی لاببات و هەموو شتەکانیش بە بێ پەردە سەیر بکریْ.

ئیبن رووشد بۆچوونێکی توندی هەیە سەبارەت بەسۆفیگەری و تانە لەپاکیان دەدا، دەڵێت مەبەستی مرۆڤ سەرکەوتنە بەسەر بەشە دەروونییەکانی بەهۆی هەستەوە، ئەوەی بگاتە ئەو پلەیە دەگاتە بەهەشت، ئینجا باوەڕی هەر چییەك بێت، ئەم پلانەش مەزنترین پلەی خۆشگوزەرانییە بۆ گەیشتن پێی زۆر بەدەگمەن دێتە کایەوە تەنها ئەوانە نەبێت کە زانای مەزن و لەپیریدا لەدوای گەڕان و توێژینەوەیان و قووڵبوونەوە لە عەقڵ و شتەکان دەبێ، بەڵام رازیبوونیش بەمانای پێویستبوون بەژیانی ماددیەتە.

زۆرێك لەدانایەکان گەیشتوونەتە ئەو پلەیە و لەکاتی گیانەڵادا هەستیان بەو خۆشییە کردووە، چونکە ئەمە کاملبوونی دەروونییە گەشە دەکات بەپێچەوانەی کاملبوونی لەشە، هەرکاتێك لەش لاواز بوو و دەروون نزیك دەبێتەوە لە پلە باڵایە.

ئیبن رووشد باس لەوە دەکات کە فارابی لەهەموو تەمەنیدا هەوڵی داوە بگاتە ئەو پلەیە و تا دوا هەناسەش چاوەڕوان بووە، کاتێك نەگەیشتووە پێی گوتوویەتی ئەمە تەنها خەیاڵ و پووچییە، بەڵام نەگەیشتنی فارابی بەمە بەڵگەی ئەوە نییە کە بوونی نییە، بەڵام بەڵگەیە کە ئەو سەرکەوتوو نەبووە، ئەو کەسەیش نەبووە تا بگاتە ئەو نیعمەتە گەورەیە.

لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە ئیبن رووشد نەیتوانیوە خۆی رزگار بکات لە بۆچوونی هاوسەردەمەکانی ئەمەش پێی دەگوترێ تەسەووفی عەقڵە کە ئیبن رووشد لەجیاتی تەسەووفی رووحی داینـاوە، ئەوەی کە غەزالی باسی لە تەسەووف کردووە.

## سیستەمی سروشتی لەنێوەندی فەلسەفەکەیدا

فەلسەفەی ئیبن رووشد لەهەموو رووپەکەوە بەشەکانی بەیەکتر بەستراوتەوە و لەهەموو لایەك یەکتر دەگرێتەوە، ئەمەش لەبۆچوونی نەمریدا بەدەردەکەوێ کاتێك دەڵێت عەقڵی کارا یەکەیەکی نەمرە، ئەمەش عەقڵی گشتی مرۆڤایەتییە، واتە مرۆڤایەتی بەتەنها نەمرە وەك چۆن لەپاشاندا ئۆگشت کۆمت هەمان قسەی کردووە، هەروا گرنگیدانی خواوەند بوونەوەری لەناوچووی والیٚ کردووە هێزی زاینی پیٚ ببەخشیٚ، ئەمەش بەهۆی میراتگری کە بەشێکە لە نەمری.

هەندێك باس لەوە دەکەن کە ئیبن رووشد بوونی هەست و یاد وسۆزی رەتکردۆتەوە لە ژیانێکی دیکەدا، لەشیش لەپاش رزینی هیچ شوێنەوارێکی نامێنیٚ ئەوەی کە تەنهاش دەمینێتەوە عەقڵە کە بەهرەی بالآیە چونکە هەست و سۆز لە سیفەتەکانی خوارەوەن.

بەلآم ئیبن رووشد ئەم قسانەی زۆر بەروونی لەنێوەندی کتێبەکانیدا نەگوتووە، چونکە کاتێك لێدوان لە ژیانەوە و نەمری دەدات نکۆڵی کردنە، بەلآم دەکریٚ بگوتریٚ گەوهەری رێبازی ئیبن رووشد دەمانگەیەنێتە ئەنجامێك بەلآم دەڵیٚ بێگومان مرۆڤ تەنها لەژیانی دونیایدا سزا دەدریٚ، ئەم قسەیەش بووە چەکێك لەلای غەزالیدا تا دژ بە فەیلەسووفەکان بەرزی بکاتەوە، ئێمە گلەیی لەئیبن رووشد ناکەین بەڵکوو سوپاسی دەکەین کاتێك خەڵك بەگشتی باسی ئەفسانەی ئەو دونیا و ژیانی دیکە دەکەن، هەروا ئیبن رووشد زۆر سەرکەوتووانە تانەی لەبۆچوونەکانی ئەفلآتوون داوە کاتێك یەکێك بەناوی (هێر ئەرمەنی) هاتووە کە ژیانێکی دیکە هەیە، ئەو دەڵێت ئەفسانەکان عەقڵ بە لارێدا دەبەن و هیچ سوودێکی نییە.

ئیبن رووشد لە "التهافت"دا دەڵێت دانایانی عەرەب وای دادەنێن کە ژیانەوە جۆرێکە لە ئەفسانە، یەکەم کەسیش ئەمەی گوتبێ پەیامبەرانی بەنی ئیسرائیل بوونە لە پاش پەیامبەر مووسا و هەروا لە ئینجل و کتێبی سائیبەکانیش باسکراوە، ئەمەش بەپێی قسەی ئیبن حەزم، ئەو ئایینەش کۆنترین ئایینە و بەو واتایەی ئەوانەی ئایینییان داوە گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە ژیانەوە تەنها بەهێزی چاکسازی مرۆڤەوە دێتە کایەوە و هانیان بدرێ تا چاکەخواز بن تا سوودیان بۆ خودی خۆیان هەبێ.

ئیبن رووشد لەوەڵامی غەزالیدا دەڵێت کە رووح بەرهەڵستییەکە واتە دەگەڕێتەوە بۆ لەشی کە ڕزاوە، کەچی غەزالی دەڵێت رووحی ئەمر دەچێتە نێوەندی لەشێکی هاوشێوەی لەشی یەکەمی کە بەهیچ شێوەیەك نایەتەوە بوون واتە هەربوو لەشی نەماو و نوێ هەر یەکە ئەگەر بەرەگەز سەیری بکەین ئەم قسەیەش زۆر جیاوازیی نییە سەبارەت بە وتەی ئەرستۆ کە لە کتێبی "گەربوون و گەندەڵیدا" هاتووە بەو پێیەی بوونەوەر کە کۆتایی هات دووبارە ناگەڕێتەوە سەر هاوشێوەی، بەڵام دەکرێ بگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لەرەگەزەکەی خۆی.

## رێبازەکەی سەبارەت بە رەوشت

ئیبن رووشد وەك بابەتێکی سەرەکی ریبازی رەوشتی نەنووسیوە، نەشیویستووە ئەدەبی ئەرستۆ وەربگرێ، چونکە لەگەڵ موسڵمانان ناگونجێ، بەڵام توێژینەوەکانی سەبارەت بەعەقڵ هۆکارێك بووە تا گفتوگۆ لەتەك موتەکەلیمەکان بکات لەسەر بنەمای ئاکار و رەوشت کە خێر و شەڕە، ئەو دەڵێت: زانایانی کەلام دەڵێن: ئەو شتە خێرە کە خودای گەورە دەیەوێ،

شتێکی ناوێ لەپێش ئیرادەی خۆیەوە بێ، هەروا خودا دەتوانێ هەموو جیایەکان لەیەکتر کۆ بکاتەوە و هەر خۆشی گەردوون بەڕێوە ببات، ئەمەش بەمەرج نا، بەڵکوو بە ئازادییەکی رەها.

بێگومان ئەم بۆچوونە هیچ هەڵەیەکی تیانییە، ئەگەر پێچەوانە بێ سیستەمی گەردوون سەراوژێر دەبێ و لەتەك رێبازی دادپەروەریانەی خودا جیایە، لەپاشاندا ئیبن رووشد هاتووەتە سەر تیۆری ئازادی و دەڵێت : مرۆڤ ئازادییەکی رەهای نییە، لەتەك ئەوەی ناتوانێ بەئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت بکات، هەروا کۆتیش نەکراوە، بەڵکوو ئازادی لەنێوەندی دەروونی مرۆڤدا تەواکاری خۆی ئەنجام دەدا، بەلاّم بەدیاریکراوی دەمینێتەوە بەپێی دۆخە دەرەکییەکان، ئەمەش وا دەکا سەربەخۆیانە روو بدات لەشتێك بەپێی یاسای سروشت و گرنگیدانی خودایی.

بۆ ئەمەش لە قورئانی پیرۆزدا لەچەندان ئایەتدا باس لەوە دەکرێ کە هەندێکجار مرۆڤ ئازادە و لەهەندێك جاریش لەسەری دەچەسپێنن و هاوکات زاڵبوون هەیە بەسەر کارەکانیدا، ئەمەش لەنێوەندی یەکەم و دووەمدایە، ئیبن رووشد ئەمەی روونکردووەتەوە و رێبازی نێوەندی بەکار هێناوە لەنێوان چەسپاندن و چارەنووسسازدا ئەمەشی لەنێوەندی "مناهج الملە" خستووەتە روو.

ئیبن رووشد دەڵێت ماددەی یەکەم دەکرێ لەنێوەندی شێوە و جیاکاریەکاندا بێ و هەرواش دەروون هێزێکی هەیە تا چارەنووسی خۆی دەستنیشان بکات، بەشێوەیەکی جیا لەکاروبارەکاندا، بۆ ئەمەش ئازادە، بەلاّم ئازادیەکەی بەپێی ئارەزووەکانی خۆی نییە و رووداوێکی هەڕەمەکی نییە، چونکە هێزە کارایەکان

بەرپرسن لەسیستەمەکەی، هەروا هیچ شتێك پەراوێز نەخراوە بۆ رێکەوتەکان، چونکە ئەمە هیچ بوونێکی نییە لەنێوەندی جیهانی کاریگەرییەکان.

## فەلسەفەکەی سەبارەت بە سیاسەت و کۆمەڵایەتی

ئیبن رووشد درکی بەوە نەکردووە کە کۆماری ئەفلاتوون کتێبێکی خەیاڵییە و فەیلەسووفێك داینـاوە کـە تیایـدا بـەفراوانی بابەتـەکانی وێنـا کـردووە لـە کلێشەیەکی شیعری، لەوانەشە درکی بـەوە کردبـێ، بـەڵام چـۆن بنـەماکانی کۆماری ئەفلاتوون راسـتەرێ بکـات لەسـەر سیسـتەمی کۆمەڵایەتیـدا، بۆیـە فەلسەفەی سیاسیەکەی لەسەر ئەو کتێبە خنجیلانەیەدا بووە، ئەمەو ئاماژەی بەوە کردووە کە دەسەڵات لەدەستی پیرەکاندا بێ و نەتەوەش بەچاکەخوازی و شیعر و دەربڕینەکان پەروەردە بکرێ، هەروا لەباسی شیعردا جەخت لـەوە دەکاتەوە کە زیانی هەیە بەتایبەتی شیعری عەرەبی، هەروا دەڵێت حکوومەتی تەواوکار پێویستی بە قـازی و پزیشـك نییـە، هـەروا سـوپا دەبـێ خەڵکەکـە بپارێزێ.

کاتێك قسەکردن لەبواری کۆماردا زیاتریش سەبارەت بە دادپەروەری و زوڵمە کە زۆر فراوانە، بۆ ئەمەش ئیبن رووشد باس لە زوڵم دەکات و دەڵێت : زاڵـم بەسەر خەڵکدا بۆ بەرژەوەندی خۆی نەك لە بەرژەوەندی ئـەوان، خـراپترین جۆرەکانی زوڵمیش زوڵمی قەشەکانە، هەروا دەڵێت حکومەتی عەرەبی کـۆن لەسەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامدا لەسەر بنەما و سیستەمی کۆماری ئەفلاتوون بووە، بەڵام معاویە هاتووە هـەمووی تێکـداوە و جوانییەکـەی شـێواندووە و فەرمانڕەوایی پێشتری لابردووە و دەوڵەتێکی چەوسێنەری دامەزراندووە، بەهۆی ئەمەوەش پشێویی لەنێوەندی زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا هاتووەتـە کایـەوە

لەنێو ئەمانەشدا وڵاتی ئەندەلووس، سەبارەت بە ئافرەتیش باسی لەوە کردووە لەپلەبەندی کەمترە لەپیاو بەڵام لەسروشتدا یەکسانن: واتە بڕ نەك جۆر چونکە دەتوانێ کاری پیاوان بکات وەك شەڕ و فەلسەفە، بەڵام بەپلەیەکی کەمتر لەپیاو، بەڵام سەرکەوتووترە لەپیاو وەك لەهونەرەکانی میوزیك و باشترە ئاوازەکان بەهۆی پیاوانەوە دابندرێ بەڵام ژەنینی با بەهۆی ئافرەتانەوە بێ، خراپیش نییە فەرمانڕەوایی کۆمار بکەن چونکە دەکرێ لەجەنگدا بن، چەند نموونەیی هێناوەتەوە سەبارەت بە ئافرەتی ئەفریقیا هێناوەتەوە و دەڵێت "سەگە مێیەکان (دێڵەسەگ) پاسەوانی هەموو ئەوانی دیکە دەکات وەك نێرینەکان".

هەروا ئیبن رووشد خاڵە هاوبەشەکانی خستووەتە روو، بۆیە لەپاش مردنی بە نۆسەد ساڵ ئەمە هاتۆتە دی–ئەو دەڵێت : دۆخی کۆمەڵایەتیمان لێ ناگەڕێ هەموو سوودەکانی ئافرەت کاری پێبکرێ بەڵام لەرووکەشدا کەسێکە بۆ زکپڕی و بەخێوکردنی و پەروەردەی منداڵ کاری پێدەکرێ، بەڵام ئەمە دۆخێکی کۆیلایەتییە کە وای کردووە هەموو بەهرە مەزنەکانی ئافرەت بشێوێندرێ، دەست بەسەر توانا عەقلچییەکانی دابگیرێ، بۆیە نابینین رێگە بە ئافرەتێك بدرێ تا وەك مەزنێك لەمەیداندا بێ ئەوان وەك ژیانی رووەکێك وان، بەتایبەتی کاتێك شوو دەکەن ئەمەش بووە هۆی ئەوەی زۆرێك لەشارەکان لەنێوەندی ناخۆشیدا بن، کە دەبینی ژمارەی ئافرەتان زیاترە و سێبەشی دانیشتوانن بەڵام هەموویان لاوازن و وەك ئاژەڵێك دەژین و هەڵسوکەوتیان لەتەك دەکرێ وەك ئاژەڵێکی ماڵدار کەناتوانن هێزە پێویستەکەیان بەدەست بهێنن.

لێرەوەش زانایانی لاهووت و هەوادرانی ئیبن رووشد لەسەدەی سێزدەهەم تا سەدەی شانزدەهەم بەردەوامبوون لە گفتوگۆ و دەمەتەقێ، تا ئەو کاتەی

پاپالیزنی سەدەم بە گومرا ناوی بردن ئەمەش بەبلاوکراوەیەکی پاپایی بەلام ئەوان جەختیان لە بۆچوونەکانی ئیبن رووشد دەکردەوە، لەتەك ئەوەی پاپا هەواردانی ئیبن رووشدی بە گومرا ناودەبرد، کەسێك نەبوو لەئایین وەرگەڕابێ، بەڵکوو خەڵکی هان دەدا بەپێی ئایین کارەکانیان بکەن و ڕێز لەپیرەکان بگرن. ئەویش وەك فارابی هەوڵی خۆیدا تا ئایین و فەلسەفە لەیەکتردا کۆبکاتەوە و بۆ ئەمەش ئیبن رووشد کتێبی (فصل المقال) و (مناهج الادله )ی دانا بۆیە بە هەموو توانای ئەرستۆ شی بکاتەوە، ئەو وەك فەیلەسووفێکی ئیسلام توانی هەموو بابەتەکانی کاریگەریەکی مەزنی هەبوو لەسەر جوولەکە و کریستیانیەکان، دیارە ئەمەش کاریگەریەکی مەزنی لەنێوەندی گەلەکەی.

## بوون و بوونی خودا (الواجب الوجود)

توێژەر لە باسەکانی ئیبن رووشد ئەوەی بۆ دەردەکەوێ کە جیاکاریەکی هەیە لەتەك فەیلەسووفەکانی دیکە بەتایبەتی ئەوانەی لەپێشتردا دابوون وەك ئیبن سینا، بەو پێیەی درکیان بەوە کردووە کە جیهان دروستکراوێکی بەردەوام و ئەزەلییە، بۆ ئەمەش یەکدیگرە بەپێی رەزامەندی خوا بەو دۆخە، بۆ خستنە رووی ئەم بۆچوونە وا گریمان دەکرێ کە بوونی کائینێکی دیکە هەیە جیایە لە جیهان، بەلام گەردوون دەجولێنێ و رێکی دەخات کە خودی خۆشی دروستکەر و گیان و داینەمۆی یەکەمیەتی واتە دورستکەرەکەی بنەمای یەکەمە و وێنەی یەکەمە ئەو هەموو شتێك و کامڵبووە لەبالاترین مانادا، واتە دەتوانین زۆر سانایانە بڵێین گرنگیدانی خودایە بەمانا باوەکەی.

لێرەوەش کۆتایی بەرێبازی عەقڵ و گەردوون دێ بەخستنە رووی فەیلەسووفێك، چونکە عەقڵی فەیلەسووف بوونەوەرێکە هەردەم بیر دەکاتەوە

و لێرەوەش باوەڕە ئایینەکان لەلای ئیبن ڕووشد لەسێ شتدا خۆی دەبینێتەوە.

یەکەم: لە وتەکانیدا ئەوە دەردەکەوێ کە جیهان هەتاهەتایەکی ماددییە و ئەزەلیەتی ڕووحەکان دەیجووڵێنێ.

دووەم: پێویستبوونی هۆکاری هاتنەکایەوەی ئەنجامەکان، بەمەش هیچ شوێنێك نییە بۆ گرنگیدانی خواوەندی و موجیزەی پەیامبەرەکان و کەرامەتی ئەولیایەکان، چونکە دەرکەوتنیان دژ بە تیۆری هۆکار و ئەنجامە.

سێیەم : تاکەکان بەرەو لەناچوون دەچن و هیچ بوارێك نییە بۆ نەمری تاکەکان.

ئیبن ڕووشد هزرمەندێکی ئازا بووە و بنەماکانی چەسپاندووە ئەو داهێنەر نەبووە و تەنهاش توێژینەوەی فەلسەفەی تیۆری کردووە.

هەروا پێچەوانەی ئیبن باجە و ئیبن توفەیلە کاتێك بەیەك یەکەی هزری هاتوونەتە نێو گۆڕەپانەکە، بەڵام پشتگیریی لە ڕێبازی کۆمەڵایەتی دەکات و پێی باش و پێویستە خەڵك هاوکاری یەکتر بن بۆ وەبەرهێنانی جیهان و سوود وەرگرتن ئەم بۆچوونەشی هۆکارێك بوو تا ئافرەت ڕزگاری بێ وەك پێشکەوتنێك بۆ کارەکانی کۆمەڵگە.

## بنەماکانی ئیبن ڕووشد (سوود لەکتێبەکانی وەرگیراوە)

وشەیەك سەبارەت بەغەزالی و پشکنین و پێشکەشکردنی بەپوختەیی لەلای ئیبن ڕووشدەوە

ئیبن ڕووشد گلەیی لە غەزالی دەکات کاتێك دانایی بۆ جەماوەر دەگەڕێنێتەوە لە زۆر شوێندا لەنێوەندی کتێبەکانیدا وەك (التهافت) و (الکشف عن المناهج

الادله) ئەمەو سەبارەت بە گەندەڵی و خراپبەکارهێنان بۆ کتێبی هۆکاری لێکدانەوە لەدوا کتێبیدا "یەکەم کەس ئەو چارەسەرە مەزنەی هێنا کایەوە (شەرعی بەرووکەشی وەرگرت) خەوارج و موعتەزیلە لەپاشاندا ئەشعەری و سوفییەکان بوون، لەپاشاندا ئەبو حامیدی غەزالی هات و گوند و دۆڵەکانی تێکەڵ بەیەکتر کرد کاتێك گوتی دانایی لەلای جەماوەرە و دوورکەوتنەوە لە بۆچوونی دانایەکان، بۆیە کتێبێکی ناوناوە (المقاصد) بەو پێیەی وەڵامیان دەداتەوە، دواتر هات کتێبی (تهافت الفلاسفه)ی دانا و هەموویان بەگومڕا و کافر ناوبرد ئەو هاتووە چەندان پاساوی گومانـاوی هێناوەتـەوە کـە گوایـە خەڵکیان گومڕا کردووە و بەلاڕێدا بردووین و دووریان دەخاتەوە لەدانایی و شەریعەت".

لەپاشاندا لەکتێبی (جواهر القران) باس لەسەلماندنەکانی نێو کتێبی تهافت دەکات، بەڵام ئەم قسانە تەنها ئەو وشانەن کە لەگفتوگۆ و دەمەتەقێیەکاندا دێنە کایەوە و ئەوەی لەنێو دەقەکەیدایە هیچ بنەمایەکی نییە، هەروا لە کتێبی المشکا الانوار لەوێدا باس لەریزبەندیەکانی خوداناسی دەکات و دەڵێت هەموویان جێگەی گومانن تەنها ئەوانە نەبێت کە دەڵێن خودا داینەمۆی یەمەکەمە بۆ جووڵەی ئاسمانی یەکەم و ئەوەی لەو داینەمۆیەوە سەرچاوە بگرێ ئەوا باوەڕیان بە زانستەکانی ئیلاهی هەیە".

"لەهەندێك شوێنیشدا باسی لە زانستەکانی ئیلاهی کردووە بە ئارەزووی خۆی خەملاندوویەتی بەناو زانستەکان کەوتووە، بەڵام ئەو کتێبەی کە ناوی نـاوە (المنقذ في الضلال) لەوێدا باسی لە دانایەکان کردووە بەوە زانست و هزر بەو واتایە پلەیەکە لە پلەبەندیەکانی پەیامبەرانە ئەمەش بەخەڵوەت دێتە ئاراوە، هەروا لە کتێبی کیمیای خۆشگوزەرانی لەوێدا هەموو شتەکانی بۆ ئەوە

گەڕاندۆتەوە کە پشێویەکانی نێو خەڵکی بۆ پلانی هەرسوو کۆمەڵە داناوە لەوێدا بەخراپی باسی لە دانایان کردووە و هەروا لێکترازانی گەڕاندۆتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لێکدانەوە بۆ شەرع دەکەن، بەو شێوەیەی شەرع دەبێ بەرووکەشی بۆ خەڵك بەیان بکرێ، بەڵام مانایەکان نابێ بۆ خەڵکی گشتی لێدوانی لەبارەیەوە بدرێ، لێدوانێك بدرێ هیچ دانایەکی تیادا نەبێ، واتە بێ ئەوەی ئەرگۆمێنتیان هەبێ، لەلایەکی دیکەوە لەکتێبی (التفرقه بين الاسلام و الزندقه) چەندان جۆر لێکدانەوەی باس کردووە هەروا گوتوویەتی کەکەسی لێکدەرەوە گومڕا و کافر نییە ئەگەر لەتەك کۆی گشتی لێکدانەوەکانیش نەبێ، بەڵام ئەو پیاوە زیانی لەخودی دانایی و شەریعەت داوە، چونکە ئەو کەسەی نەزانی دانایی چییە ئەوا دانایی پووچ دەکاتەوە بۆ پووچکردنەوەی شەریعەتیش پێویستە هەموو شتێك بخاتە ڕوو، ئەوەی ڕاستیش بێت هیچ شتێك بە دانایی بۆ خەڵکی گشتی روون نەدەکردەوە".

## بڕیاردان لەسەر غەزالی و گوناهبارکردنی

ئیبن رووشد لەنێوەندی قسەکانیدا سەبارەت بە هیۆلی و وەڵامدانەوەی غەزالی دەربارەی ئەو وتانەی کە بە فەیلەسووفەکانی گوتووە لەنیوەندی دەروونیدا باس لەوە دەکات"ئەبوو حامید باسی لەهەندێك شت کردووە بەو شێوەیە گونجاو نییە بۆ ئەو، ئەمەش لە دوو شتدا تێپەڕ ناکات، یان ئەوەتا لەراستی باسەکان گەیشتووە بۆیە بەوشێوەیە دایڕشتووە، ئەمەش کاری خراپەکارانە، یاخود لەشتەکان نەگەیشتووە بۆیە زانایان بە نەزان تێدەگات، ئەو پیاوە بەو شێوەیە لەلای ئێمە وەسف دەکرێ وەك ئەوە وابێ لەسەر ئەسپدا خۆی توند

نەکردووە، بۆیە بەو شێوەیە ئەو کتێبەی نووسیوە، لەوانەشە ناچار بوو بێ بەهۆی سەردەم و شوێنەکەی".

## چڕۆکردنی کتێبی (مناهج الادلە)

ئیبن ڕووشد کتێبی (الکشف عن المناهج الادله في عقائد المله)ی نووسیوە کە تیایدا پێناسەی ئەو لێکدانەوە قەڵپانە دەکات لەنێوەندی باوەڕێکی گومرادا، ئەمەش لەتەمەنی شەست و چوار ساڵیدا تەواوی کردووە.

بەڵام بیرۆکەی ئەو کتێبە لەو کاتەدا هاتۆتە کایەوە کاتێك لەسەر نووسینی کتێبی (تهافت التهافت) بووە لەوانەشە بەهۆی سەیر کردنی کتێبەکانی غەزالیەوە ئەو بیرۆکانەی بۆ هاتبێ، مەبەستی ئیبن ڕووشد لەو کتێبەدا کۆکبوونی دانایی و شەریعەت نەبووە، بەڵام مەبەستی بووە دانایی بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لەتەمەنێکدا ئامادەگی ئەوەیان تێدا هەبووە ببنە دانا و توانیویانە وانە و توێژینەوە ئەنجام بدەن وەك خەسڵەتێکی ئەوان.

هەروا کتێبی (فصل المقال فیما بین الحکمه و الشریعه من الاتصال) مەبەستی مانا ڕووکەشەکە نەبووە بەڵکو مەبەستی چۆنیەتی گەیاندن و کۆکبوون بووە لەنێوان ڕووکەشی شەرع و دانایی خودایی، چونکە هەر لەسەرەتادا ئیبن ڕووشد درکی بەوە کردووە چۆن ئایین و فەلسەفە لەتەك یەکدا کۆك بکات ئەم مەبەستەیش لە کتێبی (مناهج الادله) بە ڕوونی دەردەکەوێ، ئەمەو لە کتێبی مناهج (لا٨٨ی تهافت)دا باس لەوە دەکات کە :

"قسەکردن سەبارکەت بەخودای گەورە ڕێگری لێناکرێ، لەتەك ئەوەی ناکرێ خەڵك بەگشتی لەچەند خولەکێکدا تێ بەگەیەندرێ، ئەگەر بەهەر شێوەیەکی مانادارى دیکە باسی لێوە بکەیت ئەوا قسەکانت بە پووچ دەزانن ئەمەش وەك

زانستێك لەلای ئەوان قەدەغەیە، بۆیە تەنها ئەوەندە بەسە تا بەتێگەیشتنەکەیان لەخۆشیدا بن، بەڵام شەرعیش ڕێگری ناکات تا خەڵك بەگشتی لەشتەکان بگەن و بۆیە پێویستە خەڵك بە خودای گەورەی خۆیان بناسێنین".

"دەبێ ناچار بین لەماناکانی خودای گەورە بگەین کە نواندنی هەموو هەستەکانی مرۆڤایەتییە وەك دەفەرمووێ (خلقت بیدی) ئەم بابەتە پەیوەستە بە زانایان کە خودا ڕێگەی داون لەڕاستییەکان بگەن بەڵام ئەم شتانە تەنها بە ئەرگومێنێت بخرێتە ڕوو، بەڵام کاتێك ئەو شتانە دەخەینە بەردەم خەڵك زۆرێك لەرێگەکانیان لەلا تەسك دەبێتەوە، وەك ئەوە وایە ژەهر فڕێ بدەیتە نێو خەڵك، ئەمە وەك ئەوە وایە ژەهر فڕێ بدەیتە نێو گیانەوەرەکان، بەڵام لەڕووی مرۆڤەوە خواردنێکە بەشێوەی ژەهر دەخرێتە ڕوو بەڵام بەخستنە ڕووی بیر و بۆچوونەکان ئەمەش جۆرێکە لە بیروبۆچوونەکانی موعتەزیلە کاتێك هەموو شتەکان وەك خواردن بۆ خەڵك پێشکەش دەکات....ئەمە سەرشێتی نەزانێکە (ئایا مەبەستی حوجەتی ئیسلامە؟) ئەو ژەهری خواردووەتەوە بۆیە پێویستە پزیشك چارەسەری بکات، بۆیە ئێمە لەنێوەندی قسەکردن لەسەر ئەو کتێبە دەبێ بڵێین گەورەترین خراپەکارییە لەسەر زەوی دیارە سزای خراپەکارەکان بە شەریعەت دەبێ!" ئەم باسانە لە تهافت هاتووە دژ بە (مناهج الادله).

## شەریعەت و فەلسەفە

ئەگەر بیرت بۆ شتێك چوو بە تایبەتی سەبارەت بە نێردراوان و نێردراوەکانی دیکە قسە بکەین ئەوا هیچ نێردراوێك نییە تەنها لەو کاتەوە دێتەکایەوە کە پەسەندی ملکەچییەکان کرا، ئەگەر نێردراوەکان لەلایەن خوداوە نەبێ کە

بنەمای یەکەمە بۆ هەموو بوونەکان، کاری یەکەم لەلای فەیلەسووفەکانەوە لەرێگەی شەریعەتی خەلق و داهێنان و راسپاردن دەبێ لەلایەن خەڵکەوە ئەو رێبازە تێگەیشتنی هەبێ، بەو شێوەیەی کە غەزالی دەیویست قسەی لەسەر بکات.

ئەو لەرێبازەکانی ئەرستۆ نەگەیشتووە و هەروا لە رێبازەکانی ئەفلاتوون نەگەیشتووە کە عەقڵی مرۆڤایەتی هەڵوەستەی لەسەر کردووە، فەلسەفەیش هەموو شتەکان دەپشکنێ کە لە شەرعەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەگەر تێگەیشتنی ئەو درکپێکردنەکانت ئەوە دەدەخات کە عەقڵی مرۆڤایەتی کەموکوڕیی تیایە.

هەروا نواندنی ئەو شێوە قسانە بۆ جەماوەر و خەڵکی گشتی بەتایبەتی ئەو شتانەی زیاتر پەیوەندی بەلەشەوە هەیە و دوورخستنەوەیان لەکاروبارە رووحییەکان وەك خوای گەورە دەفەرموێت (مثل الجنة التی وعد المتقون) جگە لەم بوونە بوونێکی دیکە هەیە چوارچێوەیەکی دیکەی هەیە باشترە لەم چوارچێوەیە، زیاتر ئەوانەی گومانیان لەو باسانە کرد، باسیان لەوە کردووە ئەوەی گومان دروست بکات ئەوانە دژ بە شەریعەتن و زەندیقن، واش دەبینن کە مرۆڤ تەنها هەوڵ بۆ خۆشییەکان بدات ئەمەش لەلایەن غەزالییەوە خراوەتە روو کاتێك بینیوویەتی لەشتەکان نکۆڵی دەکەن ئەم کارەشی باشە.

هەروا ئەو پیاوە واتە غەزالی بەسێ شت فەیلەسووفەکانی کافر و گومڕا کردووە، لەتەك ئەوەشدا باسمان لەبیروبۆچوونەکانی فەیلەسووفەکان کرد سەبارەت بەم باسە، چونکە تەنها شتە تیۆرەیەکانیان لەلایە.

بابەتی دووەمیش ئەو هیچ شتێك سەبارەت بە کارە گەردیلەیەکان نازانێت، بۆیە گوتمان ئەوکاری ئەوان نییە، سێیەمیش باس لەپێشکەوتنەکانی جیهان

دەکەین کە تا چەند کۆنە، کاتێك یەکێك ئەو قسانە دەکات یەکسەر پێی دەڵێن کافر بووە بۆ ئەمەش موتەکەلیمەکانیان بەکافر لەقەڵەم داوە، بەڵام کفر نییە بەمانا رووحییەکە، هیچ شتێکی سەبارەت بە هەستیارەکان نەگوتووە و دەتوانێ بەشێوە رووحیەکەی باسی لێوە بکات.

## کتێبی (فصل المقال بین حکمة و الشریعة من الاتصال) و (الکشف عن مناهض الادلة في عقائد الملة)

"بەوە پێناسە دەکرێ هەر لێکدانەوەیەکی تیادا بێت لە پووچی و باوەڕەکان دوورە".

باس لەوە دەکرێ هەر لەناونیشانی کتێبەکەوە کارەکان بەوارێکی دیکەدا دەبرێ، لێرەوە ئیبن رووشد زۆر هەوڵی داوە نێوان ئایین و فەلسەفە کۆك بکات و لێکیان نزیك بکاتەوە وەك چۆن فارابیش ویستی هەمان کار بکات، لە وتارەکەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە کاتێك ویستوویەتی لەنێوان هەردوو دانا ئەفلاتوون و ئەرستۆ باسێکی کۆك بوون بەدەستبێنێ تا رووبەڕووی غەزالی بکاتەوە، دیارە ئەو زۆر جیا لە فەیلەسووفەکانی ئیسلام زیاتر زۆر لەسەرخۆیانە هەموو بابەتەکانی لێکداوەتەوە و بەتەرازوویەکی ورد باسەکانی خستووەتە روو، چونکە نەهاتووە بەهۆی خەیاڵە سەرکێشیەکان کار بکات وەك زۆرێك لەفەیلەسووفەکان لەو نێوەندە دابوونە، بەڵکوو ئیبن رووشد هاتووە شیکردنەوەی بۆ شتەکان کردووە و کێشی کردووە ئینجا هاتووە بڕیاری لەسەر داوە، بۆیە وەك نەشتەرگەرێك هاتووە نەشتەرگەری خۆی کردووە بەبێ ئەوەی پەڵەخوێنێك بەبێ سوود برژێ.

لەکتێبی یەکەمدا هاتووە باسی لە چاوپێخشاندنی فەلسەفە و زانستی لۆژیکی کردووە کە ئایا لەرووی شەرعەوە رێگەی پێدراوە یان قەدەغە کراوە؟ سەرەتا هاتووە پەردەی لەسەر رێگەپێدان کردووە و بۆ ئەمەش چەندان ئەرگۆمێنتی ئایەتی قورئانی و فەرموودەکانی کردۆتە پالپشت، چونکە ئەم زانستانە تەنها بەجۆرەکانی پێوەر و ئەرگۆمێنت دەخرێنە روو، دیارە هەموو ئەو بەلگانەشی بەپێی وتە و قسەی فەیلەسووفە یۆنانەکان هێناون نەك موسلمانەکان.

دیارە ئیبن رووشد لەنێوەندی نووسینەکانیدا داناکانی وەك بەرهەمی عەقلی مرۆڤایەتی لەقەلەم داوە بۆیە پەنای بردۆتە بەر دانایە کۆن و نوێیەکانی سەردەمی خۆی و پێشتر بۆ نموونە ئێمە ناتوانین باس لە تەنە ئاسمانیەکان بکەین ئەگەر کەسێکی دیکە پێشتر ئەو باسەی نەخستبێتە روو و هەموو قەبارە و شێوەکانی بەپێی زانست نەزانیبێ.

چەندان نموونەی هێناوەتەوە وەك دەلێت "فقهزانی تا ئێستا بەتەواوی چاوی پێدا نەخشێندراوە کەچی لەسەردەمێکی زووەوە باسی لێوە کراوە، ناکرێ مرۆڤ لەبەرامبەر هەموو پاساوەکان هەلوەستە بکات ئەگەر سەیری مەزهەب و رێبازەکان نەکات کاتێك دەبینێ لەزۆر شتدا پێچەوانەی یەکترن، کە پێشتر لەولاتانی ئیسلامیدا چەندان گفتوگۆی لەسەر کراوە جگە لەمەغریب".

ئیبن رووشدی دانا زۆر سەرسام بووە بە ئەرستۆ، بەلام ئەمە رێگر نەبووە لەوەی رەخنەشی لێبگرێ و دەلێت "سەیری وتەکانیان دەکەین کە لەکتێبەکاندا هەن و سەلماندیان هەیە، ئەگەر هەر شتێك گونجاو بێ لەگەل ئێمە ئەوا لەسەری رۆیشتووین و سوپاسمان کردوون، ئەوەی لەگەل رەوایش نەبێ ئێمە ئاگادارمان کردووەنەتەوە و لێی دووركەوتینەوە و داوای لێبوردنمان کردووە".

هەروا بەرهەڵستی دەکات لە ترسی فوقەهاکان کاتێك یەکێکیان دێ کافری و گومرایی یەکێك رادەگەیەنێ بۆ ئەمەش گوتوویەتی "پێویست ناکات سەیری ئەو کتێبانە بکەیت بەئارەزووی خۆت هەرچی قسە هەیە بیڵێت و پشێویی لەدەوری خۆتدا بهێنیە ئارا، بەڵکوو مامۆستایەك پەیدا بکە تا رێنمایت بکات، چونکە کاتێك کۆبوونەوە لەسەر ئەو قسانە ئەو باسە دەبینیەوە کە زیان دەدات و هەروا هەموو ئەوشتانەش دەدۆزیەوە کە سوودمەندن، بۆیە زیان بەجێبهێڵە کە مەبەستی لەدوایە چونکە راستی هەر بەراستی راست ناکرێتەوە، بەڵکوو شایەت و بەڵگە و ئەرگۆمێنتی دەوێ".

سەبارەت بەعەقڵ لەسەر رووکەشی شەرع دەڵێت "فقیە پێوەرێکی خەڵمێندراوی هەیە، بەڵام ئاریفییەکان پێورێکی یەقینیان هەیە، بەڵام ئێمە هەموو شتێك بەبەڵگە و ئەرگۆمێنت وەردەگرین کە رووکەشی شەرع پێچەوانەی ئەمەیە، بەڵام کار و باسەکان بەلێکدانەوە دێنە ئاراوە، لەتەك ئەوەشدا ئەبووحامیدی غەزالی و ئەبوومەعالی و زۆرێکی دیکە باسیان لەوە کردووە ئەوانەی چاوپیاخشاندنەوە و توێژینەوە دەکەن و هەموویان لەسەر لێکدانەوەیەك کۆك بوون ئەوا کافر و گومرا نین.

ئەبو حامیدی غەزالی کاتێك باسی لە گومرا نەبوونیان کردووە پشتی بەسێ بابەت بەستووە ١-باس لەکۆنی دونیا نەکەن. ٢-نەڵێن خودای گەورە شتێك سەبارەت بەگەردیلە و بەشبەشەکان نازانێت. ٣-سەبارەت بە لێکدانەوەی تەن و لەشەکان و دۆخی باو، قسەیەکی وا نەکەن.

باسمان لەوە کرد غەزالی باسی لەکافربوونیانی نەکردووە، بەڵام لەکتێبێکی دیکەدا بەناوی (التفرقە) گومان دەکات کاتێك کۆمەڵێك لێکدانەوەیان کرد لەوانەیە گومرا بن.

لێرەوە ئیبن ڕووشد هەڵەی غەزالی دەدۆزێتەوە لە خاڵی درکپێکردن دەڵێت "بینیمان غەزالی هەڵە دەکات بەرامبەر بە داناییەکان (هەوادارانی ئەرستۆ وەك خودی ئیبن ڕووشد، هەروا تۆمەت دەخاتە پاڵ دانایان بەوەی گوتوویانە خودای گەورە شتێك سەبارەت بەگەردیلە نازانیێ، چونکە خودا دەزانی چ زانستێك لەلای ئێمەیە و سەبارەت بەهەموو بوونەکانیش دەزانیێ، بەڵام ئەگەر شتەکان تێکەڵ بەیەکتر بکات ئەوا مانای نەزانییە".

دیارە سەبارەت بە بەشی دووەمیش کە باس لە کۆنی دونیا دەکات مەبەستەکان لەلای هەر یەك لە کۆمەڵەکان جیایە و دەڵێت "کۆنی دونیا ئەو باسانەی کە لەدەوریدا دەسوڕێنەوە ئەوا موتەکەلیم و ئەشعەری و دانایانی کۆن هەر یەك بەشێوەیەك باسی لێوە دەکەن، ئەمەش بابەتێکە تەنها لەڕووی دەمەتەقێوە دێنە کایەوە، بەڵام لەناوەڕۆکدا یەك بابەت دەنوێنیێ، کەچی ئەرستۆ و هەوادرانی باس لەوە دەکەن کە ڕووداوێکی راستەقینە نییە بۆ کۆن و نوێی جیهان".

لەدواتردا ئیبن ڕووشد وەك مامۆستایەکی شارەزا دەڵێت "ڕێبازەکان لەجیهاندا دوورییەکی وایان لەنێواندا نییە تا تۆ بێیت ئەوی دیکە بەگومڕا بزانیت، چونکە بۆچوونەکان ئەگەریش زۆر لەیەکتریش دوور بن بەمانای وایە بەرامبەر یەکن و لێك جیان، وەك ئەوە وایە باسەکان زۆر کێشەدار بن بۆیە هەندێك لەوانە کرێگرتەن ئەگەر بەئارەزووی سەردەمێك یان فەرمانڕەوایەك قسەیان کردبیێ و ئەوانەشی نازانن، هەڵەن لەکارەکانیان وەك پەیامبەری مەزن دەفەرموویێ: "ئەگەر فەرمانڕەوا هەوڵەکانی پێکای ئەوا دوو جار پاداشت دەکریێ، ئەگەریش هەڵەی کرد، ئەوە جارێك پاداشت دەکریێ"، بەڵام فەرمانڕەوا مەزنتر دەبیێ کاتێك بڕیار لەسەر بوونی زانایان دەدا".

لەپاشاندا باس لەسێ بەڵگەی دیکە دەکات کە ئەمانەن:

١-وتاربێژی

٢-دەمەتەقێ

٣-ئەرگۆمێنت

هەروا دەکرێ خەڵکی گشتی بەهەر یەك لەو خاڵانە باوەڕدار بێ، کاتێك کوفر دێتە کایەوە وا دابنێ کە "خۆشگوزەرانی رۆژی دوایی هیچ ناخۆشییەکی تیا نییە، مەبەستی لەمەش هێنانەکایەوەی پشێوییە تا خەڵك بەهەموو شێوەیەك دژ بەیەکتر بجووڵێنەوە و هەستیان نەبێ، ئەمەش جۆرێکە لەفرت و فێڵ، چونکە مەبەستی مرۆڤ زیاتر هەستەوەرەکانە".

دواتر گەڕاوەتەوە سەر غەزالی باس لەوەش دەکات، کە شێوازی شیعری و وتاربێژی بەکارهێناوە ئەمەش زیان بەشەرع دەگەیەنێ، تا هەوادارنی زانست زۆر نەبن، بۆیە هاتووە پشتی بە شیعرەکانی شاعیرە ئەشعەرییەکان بەستووە.

لەپاشاندا دانا ئەندەلووسیەکە هاتووە مەبەستی شەرعی روونکردووەتەوە و تیایدا دەڵێت مەبەست زانین و زانست و راوایی و کاری رەوایە، زانست دانی بەوە ناوە کە خودا هەموو شتێك سەبارەت بەبوونەکان دەزانێ، کاری رەواش هۆیەکە بۆ سوودی گشتی و دوورکەوتنەوە لەناخۆشییەکان، هاوکات ئیبن رووشد هاتووە خەڵکی کردووەتە سێ بەش سەبارەت بەزانینی زانستی شەریعەت و باوەڕدار بەمشێوەیە:

(١)خەڵکێك هەیە لەنێوەندی ئەو کەسانەن کە لێکدانەوە دەکەن، بەڵام وتاربێژن ئەمانەش زۆرن.

(٢)خەڵکێك هەیە کەسانی لێکدەرەوەن، بەڵام تەنها دەمەتەقێ دەکەن، ئەمەش وەك شتێکی باوی لێهاتووە لەلای ئەوان.

(٣)ئەوانەی لێکدانەوە دەکەن، کەسانێکن دەبێ بەپێی بەڵگە و ئەرگومێنیت کار بکەن، بێگومان ئەوان دانان.

ئیبن رووشد جەختیش لەوە دەکاتەوە کە "تەنها خودا دەزانێ لێکدانەوەکان بکات"، ئەمەش سەبارەت بەو باسانەیە کە چارەسەر ناکرێن و تارمایی و نهێنیەکی زۆر لەخۆی دەگرێ وەك (ویسألونك عن الروح قل الروح من امر ربی وما اوتیتم من العلم الا قلیلا) ناکرێ لێرەوە لێکدانەوە بکەین تەنها ئەو لێکدانەوە خراپەکاریانە نەبێ کە بۆ خەڵك باسی لێوە دەکەن، چونکە لێکدانەوەی راستی تەنها ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی ئەمانەتێکە وەك هەموو بوونەوەرەکانی دیکە، بەهۆی ئەو لێکدانەوە سەیر و سەمەرانەش نەتەوەی موسڵمانیان کردووەتە چەندان کۆمەڵە تا وای لێ بکات یەکتر تۆمەتبار بکەن، بەگومرا و کافر، لەمەوەش جەنگ هاتە کایەوە و شەرعیان لێکترازاند و خەڵکیان ئاوارە کرد.

کارەکە گەیشتە سەر ئەوەی ئەشعەری و موعتەزیلە بەکافر دەبندرێ باسیشیان لەوە کرد ئەو کەسەی کتێبی ئەوانە بخوێنێتەوە نازانێ خودا بوونی هەیە!

لەپاشاندا ئیبن رووشد باس لە قورئانی پیرۆز دەکات و دەڵێت "کتێبێکی بەرز و خۆشەویستە و لەوێدا باس لەو خاڵانە دەکات کە لەئیسلامدا هەن وەك وتاریێژی تا خەڵك تێ بگات، دەمەتەقێش بۆ فێربوونی خەڵکە، ئەرگومێنت و بەڵگەشی تیاهەیە، باسیش لەوە دەکات کە سەرەتا دەرکەوتنی ئیسلام خەڵکەکە زۆر عاقڵتر بوون، چونکە هیچ لێکدانەوەکیان بۆ شتەکان نەکرد، هەرکەسێکیش لێکدانەوەی بکردابایە راینە دەگەیاند".

ئیبن رووشد سەبارەت بەم کتێبە دوا قسەی دەکات و سەبارەت بە کۆکبوونی فەلسەفە و ئایین دەڵێت وەك نوێژی دووبووك و زاوای لەیەکتر جیان، تەنهاش پێویستیەکان ئەوانی کۆکردۆتەوە و شێوەکانیش ئەوانی لێك دوورخستووەتەوە بەهۆی تێکەڵی و ئارەزووەکان، وەك قەشەیەك دەیەوێ لە تەلەزگەکەی رزگار بێ هەروا دەڵێت "دانایی هاوڕێی شەریعەتە و خوشکیەتی لەرێگەی شیرەوە ئەوەی بێتە نێوانیان ئازار زۆر دەبینێ بەمەش دوژمنکاری دروست دەکات و شەڕ دێتەکایەوە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەردووکیان خۆشەویستی یەکترن!".

بەڵام سەبارەت بە کتێبی (الکشف عن مناهج الملە) کە تەواوکاری کتیبی (فصل المقال)ە لەوێدا فراوانی کردووە لەتەك ئەوەی لەهەندێك شوێندا بەمەبەستی پشێویی توێژینەوەکانی زیاتر کردووە، بەڵام مەبەستی سەرەکی پشکنینی لێکدانەوەکانە کە لەکتێبی (فصل المقال) بەسەریدا تێپەڕیوە بەبێ ئەوەی بچێتە نێوەندی قووڵایی باسەکانەوە .

دواتر دەستی بەقسەکردن کردووە سەبارەت بە چوار کۆمەڵە ناودارەکە کە ئەمانەن:

(١)ئەشعەریە

(٢)موعتەزیلە

(٣) باتنییە

(٤) حەشەوییە

هاتووە هەر چواریانی بەگومڕا لەقەڵەم داوە و باسیان لەوە کردووە کە کۆمەڵەی چوارەم دەڵێن زانینی بوونی خودا لەرێگەی دەنگەوەیە نەك عەقڵ، بۆیە ئەم کۆمەڵەیە هیچ شتێك سەبارەت بە بەڵگە شەرعییەکان نازانن کە

پەیامبەر دروودی خوای لەسەر بێت دایناوە، تۆمەتی ئەوەشیان دەخەنە پاڵ کە لەرێگەی دەنگەوە خەڵك بڕوای هێناوە.

بەلام کۆمەڵەی یەکەم باوەڕ بەبوونی خودا دەکەن لەرووی عەقڵەوە، کەچی ئەوانە رێگەیەکی دیکەیان گرتووەتەبەر و رێگەکەشیان لەسەر بنەمای ئەوەیە کە جیهان گۆڕاوە بەهۆی تێکەڵبوونی تەنەکان و بەشەکان دونیا دامەزراوە، ئەم رێگەشیان هیچ ئەرگۆمێنتێك و بەڵگەیەك لەخۆی ناگرێ.

دەڵێن ئەشعەریەکان دوو رێگەیان هەیە، کە لەسەر سێ بنەما دامەزراون کە ئەمانەن:

١-ناوەڕۆك لەنێوەندی باسەکاندا لێك جیا نابێتەوە، واتە هیچ شتێکی وا نییە.

٢-هەموو شتەکان بەهۆی رووداوەکانەوە هاتووەتە کایەوە.

٣- ئەگەر رووداوەکان شتەکان لێك جیا نەکەنەوە واتە هیچ رووداوێك نەهاتووەتە ئارا.

بەلام ئیبن رووشد هاتووە هەموو شتەکانی بە ئەرگۆمێنت و لۆژێك خستووەتە روو، جەختیشی لەوە کردووەتەوە کە گومانی زۆرە لە پیشەی دەمەتەقێدا، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە خودا بوونی نییە، بۆیە سەبارەت بە ئەشعەرییەکان باس لەوە دەکات کە "باسەکانیان جەخت لەبوون و یەقینی خودا ناکاتەوە و ناتگەیەنێتە باوەڕ ، کە بوونی خودا لەلای ئەوان یەکلابووەتەوە".

ئەوە ئەو رێگایە کە زۆربەی ئەشعرییەکان گرتوویانەتەبەر، مەبەستیان خراپەکارییە، بەلام رێگەی دووەم ئەبوومەعالی کەمێك سووکی کردووەتەوە لەوتارە ناودارەکەی بەناوی نیزامییە، ئەمەش بە دوو رێگەی بنیاتناوە، بەم شێوەیە:

(١)هەموو جیهان بەهەموو شتێکەوە دەکرێ بەرامبەرێکی هەبێ، واتە جووڵەیەك یان داینەمۆیەك بەرامبەری هەیە (ئەمەش وەك کودەتایەك لەسەر هەموو یاساکان وەك یاسای راکێشان و نموونەکانی).

(٢)دەکرێ رووداوەکان لەپشت رووداوەکانەوە بن، بەو واتایەی هەر یەك لەو یاسانە هۆکارێك بێت بۆ دۆخی ئێستا بەهۆی یاسا و رێکخستنەکانی کە ئێستا دونیا تیایدایە.

ئیبن رووشد باس لەوە دەکات پێشەکی یەکەم ناکرێ جێگەی رەزامەندی بێت بەڵکوو تەنها درۆیەکە، دانایەکە لەکۆێدایە مرۆڤ بەگوێی ببینێ و بەچاوی بۆن بکات؟

بۆیە ئیبن رووشد بەبێ نیگەرانی وەڵامی داوەتەوە و گوتوویەتی "باسێکە تەنها داڕمانە" بەگاڵتەوەش دەڵێت "ئەمە قسەی ئەو پیاوەیە کە جەخت لە وتەکانی دەکاتەوە کە بەئارەزووی خۆی شتی داهێناوە".

بۆیە زۆر بەروونی باس لەوە دەکات کە ئەم باسانە پێویستیان بە ئەرگۆمێنت هەیە، کاتێك زانایەك بەڵگەیەك دەهێنێتەوە خودا لەریزی فریشتەکانی داناوە، لەنێوەندی دێڕەکانیش دەڵێت "تۆ ئەی ئەبوومەعالی لەوان نیت، ئیتر بەڵگە مەهێنەوە، کە ئەفلاتوون و ئەرستۆ بوون لەتەك ئەو پێشەکیەدا".

لێرەوە ئیبن رووشد، خودی خۆی پێشەکییەکان دەهێنێتەوە تا کێشەی دووەم تێبگەین و بۆچوونێکی یەکلاکەرەوەمان پێ بدات کە "رووکەشی شەرع زۆر بە قووڵی باسی لێوە نەکردووە هەروا بەشێوەیەکی بەهادار سەیری نەکردووە، کە سەر بە ڕووداوێکی کۆن بێت، بەڵکوو تەنها سەیری هەموو بوونی رووداوەکەی کردووە، خوای گەورە دەفەرمووێ "انما امرنا لشیء اذا اردنا، ان نقول له: کن فیکن" .

بەڵام ئەمە لەلای ئەشعرییەکان دوو رێگەی ناوداره بەمەش نە تیۆرێکی یەقینییە نە شەرعییەکی یەقینییە.

لەپاشاندا فەیلەسوفی قورتوبە رەخنەی لە ئامرازەکانی سۆفیگەری گرت و گوتی " رێگەکانیان هیچ تیۆرێکی تیا نییە، بەڵکوو رێگەکەیان رۆژهەڵاتییە وپێیان وایە ناسینی خودا و شتەکانی دیکەی بوون لەرێگەی دەروونەوەیە کاتێك رووت دەبێتەوە لە ئارەزووە خراپەکارییەکان، دەکرێ بەرێگەی شەرع هەموو ئەمانە چاك بکەنەوە((واتقوا الله و يعلمكم الله)) واتە باوەڕتان بەخودا هەبێ، خودا فێرتان دەکات.

ئیبن رووشد جەخت لەوە دەکاتەوە کە قورئان بانگەوازە بۆ هەموو خەڵك تا بەبیرکردنەوە بوونی لەنێو هەموو خەڵکدا هەبێت، لەتەك ئەوەی قورئان ئاگادارکردنەوە و رێگەی زانستی و بیرکردنەوە و لێکدانەوە و ڕامانە.

کاتێك باسەکەی هاتە سەر موعتەزیلە داوای لێبووردنی کرد تا بچێتە نێو ئەو باسەوە چونکە نەگەیشتە ئەندەلووس، بەڵام بەهۆی کتێبەکانیان هاوشێوەی رەگەزی ئەشعەرییە، بەڵام نەبوونی کتێبەکانی بۆ دوورگەی ئەندەلووس دەبینین ئیبن رووشد شتێکی سەبارەت بەوان نەگوتووە، لەنێوەندی مزگەوت و ماڵەکاندا هیچ لەم شێوە کتێبانە نییە تا رێگەکەیان شی بکاتەوە و دواتر وەڵامیان بداتەوە.

بەڵام ئێمە دێنە سەر باسی رێگەکانی شەرعی کە بەرێگەیەکی نموونەیی داناوە و باسیش لەوە دەکاتەوە کە لەدوو رەگەز پێکهاتووە:

(١)رێگەیەك و هەڵوەستەیەك لەسەر گرنگیدان بەمرۆڤ، خودا گەورە هەموو بوونەوەرەکانی لەپێناو مرۆڤ هێناوەتە کایەوە، ئیبن رووشد ناو لەوەدەنێ (رێبەری گرنگیدان).

(٢)ڕێگەی دووەم باس لە ڕێگە داهێنانەکان دەکات کە لەناوەڕۆکی شت و بوونەکانە وەك داهێنانی ژیان و ڕەقی و هەستە درکپێکراوەکانە و ئیبن ڕووشد ناوی دەنێ (ڕێبەری داهێنان).

هەموو ئەمانەش بەڵگەن بۆ گرنگیدان بە مرۆڤ چ لەڕێگەی گرنگیدان و داهێنان، ئەمەش خاسیەتێکە لەنێوان خەڵك و زاناکاندا واتە خەڵك زانیارییە سەرەتاییەکانیان هەیە و زانایانیش درك بەهەستەکان دەکەن بەپێی ئەرگۆمێنت و بەڵگەکان.

ئیبن ڕووشد باس لەوانە دەکات کە وای دادەنێن شتەکان لەخۆیانەوە دروست بوونە، بەڵام ئەو دەڵی شێوەی دروستکردنەکەی زۆر ورد و کارامەیە و لەشێوەی شاکارە، دیارە ئەشعەرییەکان ئەمانە بەبەڵگەی دوورخستنەوە دادەنێن ئەمەش لەلایەن خەڵکەوە تێگەیشتنێکی وای بۆ نییە، بەڵام لۆژیکزانەکان بە پێوەری مەرجدار سەیری دەکەن، بەڵام ئەشعەرییەکان ناوی دەنێن (ڕێبەری ڕێڕەو و دابەشکردن) بەڵام ئەو بەڵگەیە بە لۆژیکی مەرجدار دەناسرێ بۆیە لەنێوان ئەو دوو بەڵگەیە شتەکان بەتەواوی دیارن.

ئیبن ڕووشد کۆتایی بەمە دێنێت و لەلای ئەو وشەی (لا الـه الا الله) تاکە ڕاستییەکە و بوونی خودا دەسەلمێنێ و ڕەتی هەموو خواوەندەکانی دیکە دەکاتەوە کە دروستکراون، باسیش لەوە دەکات هەر موسڵمانێك ئەم وشەیەی پێ ڕاست بێ ئەوا موسڵمانێکی باوەڕدارە.

دواتر دێ باس لەخەسڵەت و سیفەتەکانی خودا دەکات و دەڵێت ئەو وەسفە کامڵبووەیە کە لەمرۆڤدا بوونی هەیە کە زانست و ژیان و ئیرادە و گوێگرتن و بینین و قسەکردنە، لەوانەیە هەندێك بپرسن کە ئایا سیفەتەکان دەروونیین یان مەعنەویی ، چونکە خودا زانیارە بەهەموو زانستەکان. بەم شێوەیە ئیبن

رووشد دەڵێت "ئەمە قسەی نەسرانییەکان کە پێیان وایە کە هەرسێ هەرێمی بوون و ژیان و زانست هەر یەك لەوی دیکەدا خۆی دەبینێتەوە و خستنە رووەکانیش شتێکی سروشتین لە خستنەرووی لەش وەك پێویستیەك، ململانێی نێوان ئیبن رووشد و نەسرانییەکان لەم خاڵەیە و ئەو دەڵێت ئەوان پێیانوایە چەندان سیفەتی هەیە و پێیانوایە ناوەڕۆکێکی دیار نییە هەروا پێیانوایە خودا یەکە لەلایەکەوە و سێیە لەلایەکی دیکەوە، بەشێوەیەك کە پێیانوایە ئەو سێ لایەنە کە سروشتی بوونی هەیە و زانایە لەلایەکی دیکەوە کەچی هەموو ئەمانە یەکن.

هەروا ئیبن رووشد جەخت لەوە دەکاتەوە کە خوای گەورە و دروستکەری جیهان هیچ جۆرە کەموکورتی و کەموکوڕیەکی نییە، بەڵام کاتێك دەبینی هەر کۆمەڵەیەك بە ئارەزووی خۆی شەریعەت شی دەکاتەوە و لێکدانەوەی بۆ دەکات. لەدواتردا دەڵێت مەبەستمان شەرع بوو بۆیە ئەمە شەرع پارچە پارچە دەکات و خاوەن شەرعێك دەڵێت "نەتەوەکەم دەبنە حەفتاو دوو کۆمەڵە و لێك دەترازێن ..تەنها یەکێکیان نەبێ" مەبەستی ئەوەیە رووکەشی شەرع لێکدانەوەی بۆ مەکەن و خەڵکی لێ ئاگادار مەکەنەوە.

وەك لەپێشتردا باسمان لەوە کرد کە بەهۆی ئەم قسانەوە وەڵامی غەزالی داوەتەوە تا لێکدانەوەکان بەخەڵك رانەگەیەندرێ و تەنها بەرووکەشی خەڵك تێبگەیەندرێ هەموو ئەمانەشی لەجواهر قورئاندا گوتووە، ئەوەشی لە تهافتدا گوتووە تەنها قسەی کەسانێکن هیچ حسێبێکی بۆ ناکرێ، چونکە قسەکان جێگەی گومانن و دانایی کۆیان ناکاتەوە.

دواتر ئیبن رووشد لە توێژینەوەی پێنجەم باسی لەزانینی کردەکان دەکات کە سەلماندنی دروستکردن و هاتنەکایەوەی دونیایە و ژیانەوەی پەیامبەر و قەزا و

چارەنووس و هەموارکردن و دووبارە بوونەوە و سوڕانەوەیە، بۆ خوێنەر ئەم توێژینەویە گرنگترین توێژینەویە چونکە هەوڵێکە بۆ هەموو بابەتەکانی ژیان و گەردوون، لەپاش ئەوەی ئیبن رووشد بە توێژینەوە و هونـەرەکانی هێڵێکی راکێشـاوە و مەبەسـتی دیـارە و رێگەکەشـی هەڵبـژاردووە، سـەبارەت بەهاتنەکایەوە جیهان مەبەستی لەشەرعە و جیهانیش لەلایەن خوداوە هاتۆتە کایەوە و ئەو دایهێناوە ئەمەش رێکەوت نییە بۆیە ئەوەی باسی لێوە دەکەین زۆر بەسانایییە هەموو شتەکانیش پەیوندارە بەوەوە، دیارە ئەمجۆرە شێوازە بۆ جەماوەر لەلای ئەو گرنگ نییە، چونکە ئەم شێوەیە وا لەوانی دیکە دەکـات بەنەزان بزاندرێن، بەڵام ئیبن رووشد هاتووە بە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە باس لەچەند خاڵێك دەکات.

یەکەم جیهان بەهەموو بەشەکانیەوە دامێندراوە بۆ بوونی مرۆڤ و بوونی هەموو بوونەوەرەکانی دیکە کە لێرەدان.

دووەمیش هەموو ئەو شتانەی کـە لێـرەن بەهـەموو بەشـەکانییەوە بـۆ یـەك کردەیە بۆ مەبەستێك کە دروستکراون لەلایەن دروستکەرێك و ئەم جۆرە بەڵگە و ئامازەیەش لە قورئاندا بوونی هەیە وەك ئایەتی (الم نجعل الارض مهادا و الجبال اوتادا) بەو مانایە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرناخات کە زەوی دەجووڵێ و بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی نەداوە ئیبن رووشـد دەڵـێن "ئەگـەر بجـووڵێ" بەڵگەیەکە کەنازانێ ئایا زەوی دەجووڵێ، بەڵام لێرەدا ئیبن رووشد چۆن ئەو ئامازەی هیناوە ئەگەر جیهانێك بسوڕێ یان بجووڵێ؟ ئایا دەکرێ ئەمە بکەیتە بەڵگەیەك بۆ رەزامەندی خەڵك؟ تا ئێستاش ئەم قسـانە لەنێوەنـدی قسـەی قوتابخانەکاندا هەن، وەك ئەوەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بین؟

ئیبن رووشد بەردەوام بوو لەوەی کە زەوی لەهێمنیدایە و ناجوولێ بەپێی ئەوەی چیایەکان بوونیان هەیە ئەگەر وابوابە دەبوایە زەوی بێ چیا بوایە و بچووکتر بوایە، بە جوولەی چیایەکان ئەوا هەموو لایەك دەکەوتنە لەرزە لەرز. ئەم دەقانەی ئیبن رووشد هیچ شتێکی لێ کەم ناکاتەوە، چونکە ئەو زانایەکی سروشتی و گەردوونناسی نەبووە، هەروا کەسێکی ماتماتیکی نەبووە، بەڵکوو فەیلەسووف بووە، گلەیی لەو ناکرێ کاتێك زانستەکان نەگەیشتۆتە سەردەمی ئەو. دواتر بەچەند نەوەیەکی دیکە باس لەو بابەتانە کرا، بەڵام ئەوەی ئیبن رووشد مەبەستیەتی تا جەماوەر و خەڵك رازی بکات لە هاتنەکایەوە جیهان ئەمەش مەبەستێکی سەرەکی بووە، تا خەڵك بگەیەنێتە سەر باسێك، ئەمەش وای کرد تا تانە لە ئەشعەرییەکان بدات، کە ویستوویانە بەچەندان بەڵگەی سەیر خەڵك بۆ خۆیان رابکێشن، چونکە "لەلای خەڵك ئەم قسانە هیچ مانایەکیان نییە ئەگەر شایەتحاڵێك بوونی نەبێ".

ئیبن رووشد باس لەو ئایەتانە دەکات کە تیایدا هاتووە (وكان عرشه على الماء ...)دەبێ ئەو شتانە بۆ خەڵك بەیان نەکەی، ئەگەر وابکەی ئەوا دانایی شەرعیت پووچ کردووە، لەتەك ئەوەی زانایان و خەڵك شتێك سەبارەت بە باوەڕداری شەرع نازانن، دەکرێ بڵێین لە رووداوێکدا دروستبووە لەهیچەوە هاتۆتە دی بەبێ ئەوەی زەمانێك دیاری بکرێ.

لێرەدا با واز لەم نواندنە بهێنین، چونکە هەموو باس و خواسەکان لەنێوەندی ئایەتەکانی قورئان و تەوراتدا هەن، تەنهاش کەلامییەکان زیانیان بەئیسلام گەیاندووە، کە خودا رێگەی پێ نەداون، چونکە ئەگەر رێگەی شەرع بگرینە بەر، ئەوا هەست بەخۆشگوزەرانی دەکەین ئەمەش خۆشییە لە زانستی یەقیندا.

دواتر هاتۆتە سەر ناردنی پەیامبەرەکان کە دوو باسی هەیە یەکەمیان سەلماندنی پەیامبەر و دووەمیش ئەوانەی خۆی بەپەیامبەر دەزانێ یەکێك لەمانە درۆزن نییە لە بانگەوازەکەی، بۆ ئەمەش ئیبن رووشد جارێك بە لۆژیك سەلماندوویەتی و جارێکی دیکە بە ئایەتی قورئان و باسی لەوە کردووە کە پەیامبەرەکان بوونیان هەیە و تەنها کردە سەرکێشیەکان لەلای ئەواندا بوونی هەیە مەبەستی ئیبن رووشد لێرەدا موعجیزەیە، کە تەنها لە سیفەتە باڵاکانی پەیامبەر و نێردراوەکانە، کاتێك سەیری ئەو موعجیزانە دەکەیت لەواقیع نزیکە، ئەمەش رێگەیەکی گونجاوە بۆ خەڵك و زانایانەکان، بەڵام گومان و بەرهەڵستیەکانی ئیبن رووشد سەبارەت بە موعجیزەی خەڵك هەستی پێ ناکات، بەڵام شەرع پشت بە موعجیزە دەبەستێ، نەك موعجیزە بەرانی.

دواتر ئیبن رووشد باسی لەقەزا و قەدەر و چارەنووس کردووە هەر لەسەرتادا باسی لەوە کردووە کە قووڵترە لەشەرع، چونکە ئەرگومێنتەکانی گوێ و عەقڵ تیایدا بەرهەڵستی دەکەن، لەقورئاندا چەندان ئایەت هەن و باس لەوە دەکەن کە هەموو شتەکان لەچارەنووستدا نووسراون و ناکرێ کردەوەکانی بەناچاری بکرێن و چەندان فەرموودەی دیکەی هێناوەتەوە کە بەرهەڵستی ئەمە دەکات.

سەبارەت بەمە موسڵمانان بوونەتە دوو کۆمەڵە:

یەکەمیان پێی وایە مرۆڤ خۆی هەڵگری باخیبوون و چاکەیە بۆیە سزا و پاداشت دانراوە (موعتەزیلە)

دووەم پێیانوایە کە مرۆڤ ناچارکراوە بۆ کردەوەکانی و لەسەریەتی، ئەشعەریەکان باس لەوە دەکەن کە لەنێوان هەردوو قسەدا مرۆڤ یەکێکە لەبوونەوەرەکانی خودای گەورەیە.

بەلام ئیبن رووشد رەخنە لەهەر سێ بۆچوون دەگرێ چونکە مەبەستەکە شەرعە نەك جیاوازی کردن لەنێوان گوێگرتن و ماقوولییەکان، خودا هێزێکی پێبەخشیوون تا شتەکان لەخۆ بگرین دیارە هەموو ئەمانەش بەهۆکارەکانەوە بەندە، هەموو کردەوەکانی ناچاربوون و ناناچاربوون پەیوەندی بەخۆمانەوە هەیە، لەتەك ئەو کردەوانەی لەدەرەوەی هەستی خۆمانە هەمووی بە توانای خودا دێنە کایەوە.

کردە دەرەکیەکانیش پەیوەندییان بەهەموو ئەو گرفت و تەلەزگانەوە هەیە بەپێی دۆخەکان، ئەمەش هۆکارگەلی خۆیان هەیە. لێرەوە ئیبن رووشد چووەتە نێو دەروونناسی بە رێگە کۆنەکەی بۆ ئەمەش هەموو کردە دەرکییەکان بەپێی جوولەکانمانە بۆیە زۆر جار دەمانەوێ لێی رابکەین دیارە ئیبن رووشد پەنای بردووەتە سەر دیترمنزم و کاریگەرییەکانی لەسەر کردەی مرۆڤ و دەڵێت "بەشێوەیەك هۆکارەکان لەدەرکیدا رێڕەو دەگرن بەپێی سیستەمێکە رێکخراوە بۆیە دەبێ کردەکانمان بەپێی سیستەمێکی دیاریکراو بن، چونکە هیچ پەیوەندیەك نییە لەنێوان کردە و هۆکارەکان، بەڵکوو لەنێوان ئەمانەدا هۆ هەیە لەلەشمان و سیستەمە دیاریکراوەکە کە هۆکاری دەرەکی و ناوخۆییە بەو واتایەی ئەمە بەقەزا و قەدەر چارەسەر ناکرێ کە خودا بۆ بەندەکانی نووسیویەتی کە لەوحی مەحفووزە، کاتێك خودا هۆکارەکان دەزانێ بەو واتایەی ئێمە تووشی کێشە هاتووین، چونکە تەنها خودا دەزانێ چی دێتە ئاراوە لەغەیب".

لەپاشاندا ئیبن رووشد باس لەزوڵم و دادپەروەری دەکات کە باسی چوارەمە وەك لەلای باوە بۆ وەلامی ئەشعەریەکان ئامادەی کردووە پێی وایە ئەشعەرییەکان کارێکی خراپیان کردووە کاتێك مرۆڤ و خودایان وەك یەك

داناوە، باس لەوە دەکرێ کە کردەوەکانی مرۆڤ دادپەروەی و زوڵمی تیایە، بەڵام دەبێ خۆی راسپاردەی شەرع بکات، بەڵام کاتێك هاتە نێوەندی شەرعەوە چ زوڵمێك هەیە یان چ دادپەروەریەکی کردووە، دیارە مرۆڤ لەهەر کردەیەکی سەرەتا رووتکراوەتەوە لەشەرع و ناکرێ لەتەك شەرعدا مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، چونکە کردەوەکانی بەپێی شوێن و رۆژگار و رووداو و هۆکارەکان دەبێ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

بەڵام ئیبن رووشد هەرا بەسەر ئەشعەریەکاندا دەکات، چونکە ئەو بۆچوونەیان گوتووە، بەمەش نەیتوانیوە ئەم توێژینەوە بەبێ لێکدانەوە بکات و هاتووە باسی لەزۆریەی مەزهەبەکانی دیکە کردووە، بەڵام جیاکاریەك دەبیندرێ، بەو مانایە کاتێك لێکدانەوەکان لەتەك ئایەتە قورئانییەکان نەبێ ئەوا رەتدەکرێنەوە، بۆیە سەبارەت بەم باسە پێداگریی لەسەر ئەوە کرد، کە چۆن خەڵك تێگەیشتووە هەر وایە.

سەبارەت بە بابەتی پێنجەم کە دووبارە بوونەوەیە کە کۆکە لەسەر بوونی شەرعەکان و جیاوازیش بووە لەتەك شایەتحاڵەکان بەمەش خەڵك لەوێدا بوونی نییە، بەشێویەك شەرعەکان رووحانین و دەوڵەمەندن بۆ دەروون، بەمەش دەروون و لەشەکان بەیەکەوەن.

شەریعەتی ئیسلام وای دەبینێ کە مەبەستە هەستیارەکان بۆ خەڵکی بۆ خەڵك زۆر پێویستە کاتێك دەگوترێ خودا دەروونە بەختیارەکان دەگەڕێنتەوە بۆ لەشەکانیان و بەڵێنی بەهەشتی پێ دەبەخشێ، هەروا خودا دەروونە یاخیبووەکان دەکاتە چەند پارچەیەك و دەیخاتە ناو ئاگرەوە.

هەموو شەریعەتەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەروونەکان لەپاش مردن خاڵین، بەڵام ئیبن رووشد باسی لەوە کردووە کە موسڵمانەکان بوونەتە چەندان کۆمەڵە

سەبارەت بەم باسە وەك سێ كۆمەڵە هەر یەك لەوانەش بوونەتە دووبەش، بۆیە یەكێكیان قسەی ئەوی دیكە پووچ دەكاتەوە و هەندێكجاریش نكۆڵی لەبوونی ئەو رستەیە دەكاتە ئەم جۆرە بیركردنەوەیەش هەندێكجار كەسی بەرامبەر و خاوەن بۆچوون گومڕا و تەكفیر دەكات، چونكە هەموو ئەمانە جەخت لە مانەوەی دەروون دەكەنەوە.

لەكۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا ئیبن رووشد ئاگادارمان دەكاتەوە كە ئەوەی هاتووە بۆچوونی دانایەكە كە بەقووڵی بیری كردووەتەوە.

## وڕێنە و رووخانی فەیلەسووفەكان (تهافت الفلاسفە)
## تهافت و التهافت

ئەم دوو كتێبە شوێنێكی باڵایان هەیە لە مێژووی فەلسەفەی ئیسلام و عەرەبیدا هەیە، یەكەمیان بەناوی (تهافت الفلاسفە)یە كە لەلایەن ئەبووحامید محەمەد كوڕی محەمەد غەزالییە، ئەمەو بەهۆی ئەم كتێبە و كتێبی (ژیانەوەی زانستەكانی ئایین –احیاء علوم الدین) هەوادارانی بە ئیمام و حوجەتی ئیسلام وەسفیان كرد، چونكە خۆی وادادەنا بەرگری لە باوەڕداری دەكات و پارێزەری شەریعەتە دژ بە فەلسەفە و فەیلەسووفەكان لەنێوەندی هەموو هەموو نەوە و سەدەكاندا هەر لەیەكەم داناكانی یۆنان كە بەدێرینەكان ناو دەبرێن تا دەگاتە ئیبن سینا كە نوێترین فەیلەسووف بوو تا سەردەمی غەزالی.

كاتێك دێن كتێبەكانی غەزالی پشكنینی بۆ دەكەین لەرووی رەخنەوە و هەموو فێركاری و نووسینەكانی پوخت دەكەینەوە دەبینین ئیبن روود لە كتێتبی (تهافت التهافت) وەڵامی غەزالی داوەتەوە ئەمەش دوای سەد ساڵ لەدەركەوتنی

ئەو کتێبە، لێرەوەش ئیبن رووشد خۆی وەك پارێزەری و بەرگریکاری فەلسەفە و فەیلەسووفەکان داناوە و هاوپشتی هەموو داناکان هەر لەیەکەم رۆژگاری دانایی یۆنانییەکان تا ئەو کاتەی غەزالی کۆچی دوایی کرد واتە سەدەیەك پاش ئەو.

ئەمەو غەزالی لەسەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، هەروا ئیبن رووشد لەکۆتایی ئەو سەدەیە کۆچی دوایی کرد، بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین ئیبن رووشد سەرکردەی داناکان بوو لەتەك ئەوەدا غەزالی حوجەتی ئیسلام بوو، کتێبی (تهافت الفلاسفه) بۆ ماوەی سەد ساڵ هێرشی کردە سەر فەلسەفە و هزری ئازاد و هەموو خەونی داناکان بە بەگومڕا و تەکفیر کردن ، هەروا مژدەی سزای ئاگریان بۆ دەخاتە روو لەکاتێکدا هیچ کام لە فەیلەسوفەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا وەڵامی غەزالییان نەداوەتەوە، ئەمەش سەرشۆڕییە بۆ هەموو فەیلەسووفەکان.

کاتێك ئیبن رووشد وەڵامی ئەو کتێبەی غەزالی دایەوە بۆ جارێکی دیکە ژیانی هێنایەوە نێو فەلسەفەوە، دیارە هەموو ئەمانەش بەهۆی گەڕان و پشکنین و رەخنەی قوتابی و خوێندکاران و مامۆستایانی ئەو سەردەمە بوو بۆیە بۆ جارێکی دیکە فەلسەفە تاجی شکۆداری کردەوە سەر، لەپاش ئەوەی غەزالی بەهەموو شێوەیەك رەتی دەکردەوە ئەمەش دوایی ئەوەی پێشەکیەکەی نووسی هەموو مەبەستەکانی بەدەر کەوت.

## ناوی کتێبەکە و مەبەستەکانی

غەزالی دەڵێت سەرەتای نووسینی ئەم کتێبە وەڵامدانەوەی هەموو فەیلەسووفە دێرینەکانە، لێرەشدا رووخانی باوەڕیان بەدەردەکەوێ و جیاکاری قسەکانیان

سـەبارەت بـە ئیلاهیـات و بەمـەش هـەموو مەبەسـت و خراپەکارییـەکیان بەدەردەکەوێ کە بووەتە جێگەی پێکەنین و پەندێکە بۆ ژیرەکان، مەبەستیش لەوە لەخستنە رووی ئـەو بۆچـوونە سـەیرانەیە کـە بـە هونـەری بۆچـوون و باوەڕەکان کە قسەیان سەبارەت کردووە.

**فەیلەسووفە دێرینەکان و مەبەستی غەزالی لە نووسینی ئەو کتێبە**

ڕێگە و شێوازی غـەزالی بـۆ خسـتنە رووی ڕێبـازی فەیلەسـووفەکانە تـا لـەو ڕێگەیەوە بەهەموو گومڕا رابگەیەنێ کە ئەمەیە ڕێگە نەشیاوەکانیان ئینجا چ ئەوانەی پێشتر یان ئەوانەی پاشتر دێ، چونکە دەبێ باوەڕ بەخودا و ڕۆژی دوایی بهێنن، تا ئەو شێوازە بخاتە روو کە یـەکێك دێ وەك ئـەوان لاسـاییان دەکاتەوە، دیارە هەموو ئەمانە خۆیان بەسەرکردەی فەلسەفە داناوە کاتێك دژ بەشەریعەتەکان قسەیان کردووە، لەتەك ئەوەی ئەو فەیلەسووفانە باوەڕیان بەخودا هەیە بەڵام لەزۆر ناوەڕۆکدا تێکەڵ و پێکەڵیان کـردووە بـۆ ئەمـەش ڕێگەکانیان ونکردووە.

**هۆکاری دانانی ئەو کتێبە**

غەزالی باس لەوە دەکات کە ئەوان وای دادەنێن جیان لەزیرەکیدا، هەروا ڕێگە و شێوازەکانی ئیسلامیان ڕەتکردووەتەوە و یارییان بە ڕێورەسمەکانی ئیسلام کردووە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەك هەبێ بۆ گومڕا بوونیان و هاتوون چەندان ناوی گەورەیان بۆ قسـەکانیان کردووەتـە بەڵگـە وەك سـوکرات و بـەکرات و ئەفلاتوون ئەرستۆتالیس و چەندانی دیکە بەمەش خۆیان بەوە وەسف کردووە کە وردبینن لە زانستەکانی (ئەندازیاری و لۆژیك و سروشت و ئیلاهیات)دا وایان داناوە عەقڵیان چاکەکاری لێ دەبـارێ کاتێـك دژ بـە شـەریعەت و ئایینـەکان

جووڵاونەتەوە، هەروا وای دای دەنێن نووسینەکانیان فێڵی بە نەخش و نیگارن، ئێرێکیش هاتوون ئەوانیان بە زیرەك لەقەڵەمداوە و دەستخۆشی لە باوەڕە فەلسەفییەکانیان دەکەن، بەڵام ئەوانە تەنها کوفریان کردووە، خۆیان بەرزکردووەتەوە بەو بیانووەی باوەڕەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئایینی و بۆچوونی ئازادی سەردەمی زوو.

## سەرکەوتن بەسەر ئەرستۆدا

غەزالی باس لەوە دەکات سەرەتا دەبێ هەموو جیاکاریەکانی فەیلەسووفی رەها و مامۆستای یەکەمیان بخەینە روو کاتێك پۆلینی بۆ زانستەکانیان کردووە بۆیە هاتوون بەئارەزووی خۆیان بچوونی خۆیانیان خستۆتە روو کە لەتەك ئارەزووەکانیان دەگونجێ واتە بەناو فەیلەسووفەکان کاتێك هاتوون بۆچوونی ئەرستۆتالیسیان بەنموونە وەرگرتووە، هاتوون وەڵامی ئەفلاتوونی مامۆستاشیان داوەتەوە، لەراستیدا غەزالی تەنها باسی لەئەرستۆ نەکردووە، بەڵکوو بەتێکەڵی هێرشی کردووەتە سەر هەموو فەیلەسووفەکانی دیکە.

## زانستی فەیلەسووفەکان

غەزالی باس لەوە دەکات کە توێژینەوەکانی زیاتر باس لە مەبەستە ئیلاهییەکان دەکەن، چونکە زانستەکانی ژمێریاری و بیرکاری و ئەندازیاری و لۆژیکی بوارێکی نییە تاوەکو رەخنەی لێ بگری، هەروا فەیلەسووفەکان پەردەکان دادەپۆشن کاتێك دێنە سەر زانستە ئیلاهیەکان کاتێك زانستەکانی بیرکاری و لۆژیك بەدەردەکەوێ و خۆیان بەوانە خەریك کردووە کە لەڕووی عەقڵەوە لاوازن، بۆیە هیچ جیاوازیەك بەدی ناکرێ وەك چۆن لەبیرکاریدا جیاکاری

نابینین، بێگومان غەزالی نەیتوانیوە وەڵامیان بداتەوە، چونکە جەخت لەدروستی زانستەکانی بیرکاری و لۆژیك دەکاتەوە.

## فەیلەسووفەکانی ئیسلام

ئەوانەی وشەکانی ئەرستۆیان وەرگێڕاوە هاتوون بەئارەزووی خۆیان وشەکانیان گۆڕیوە تا ڕێگەی شیکردنەوە و لێکدانەوە بەخۆیەوە بگرێ هاتوون بەئارەزووی خۆیان وشەکانیان نەقلّ کردووە و چاوخشاندنیان بە فەلەسەفەی ئیسلامی کردووە وەك فارابی و ئەبوونەسر و ئیبن سینا، ئێمەش هەموو شتێکیان پووچ دەکەینەوە بەشێوەیەك کاری هەموو سەرکردە گومڕیەکانیان ڕاست دەکەینەوە، بەلام ئێمە وەڵامی هەموو ڕێبازەکانیان دەدینەوە بەپێی نەقلکردنی قسەی ئەو دوو پیاوە.

## بەیانکردنی بیست مەبەستەکە

که تیایدا غەزالی جیاکاری فەیلەسووفەکانی خستۆتە روو لە کتێبەکەیدا

١- ڕێبازی فەیلەسووفەکان لە ئەزلیەتی جیهان

٢- ڕێبازیان سەبارەت بە ئەبدەیەتی جیهان

٣- قسەکانیان سەبارەت بەوەی خودا جیهانی دروستکردووە و جیهان وا دروست بووە

٤- نەیانتوانیووە دروستکەر بسەلمێنن

٥- نەیاتوانیووە بەڵگەیەك بهێنەوە لە تێنەگەیشتن و مەحاڵبوونیان سەبارەت بە ئیلاهیات

٦- ڕێبازیان لەرەتکردنەوەی سیفەتەکانی خودا

٧- سەبارەت بەو قسەیان کە خودی یەکەم (خودا) دابەش ناکرێ لەرووی رەگەز و بەشکردن

٨- سەبارەت بەو قسەیان کە یەکەم بوونی زۆر سانا و بێ بەهایە

٩- نەیانتوانیووە ئەوە بسەلمێنن بەیانی یەکەم بکەن بەوەیتەنێك نییە

١٠- قسەکانیان سەبارەت بەگومڕا بوونیان و رەتکردنەوەی دروستکەر و پابەند بوونی فەیلەسووفەکان

١١- نەیانتوانیووە ئەوە بسەلمێنن کە یەکەم لەوانی دیکە زاناترە

١٢- نەیاتوانیووە ئەوە بسەلمێنن کە یەکەم خودی خۆی دەناسێ

١٣- سەبارەت بەو قسانەیان کە یەکەم هیچ شتێك سەبارەت بە گەردیلەکان نازانێت

١٤- سەبارەت بەو قسانەیان کە ئاسمان وەك ئاژەڵێکی جوولاوی بێ ئیرادەیە

١٥- ئەو قسانەیان سەبارەت لەمەبەستی داینەمۆی ئاسمان

١٦- سەبارەت بەو قسانەیان کە دەروونی ئاسمانەکان شتێك سەبارەت بەگەردیلەکان دەزانێ کە لەم جیهاندا دێتە کایەوە

١٧- قسەکانیان سەبارەت بەمەحاڵبوونیان سەرکێشی لەنێوەندی نەریتەکان

١٨- نەیاتوانیووە بەڵگە و ئەرگومێنتی عەقڵی بهێننە کایەوە بەوەی دەروونی مرۆڤ گەوهەرێکی بەردەستە، بۆیە تەن و مەبەستێك نییە

١٩- قسەکانیان سەبارەت لەناوچوونی دەروونی مرۆڤایەتی

٢٠- نکۆڵیکردنیان لەژیانەوە و حەشر کردنی لەشەکان لەتەك چێژ و ئازار لە بەهەشت و ئاگردا لە چێژ و ئازارەکانی لەش.

دیارە هەموو خاڵەکان گرفتی زانستە ئیلاهیەکان و سروشت بەنویّ و کونەوە دەخاتە روو لەنێوەندی کۆمەڵە موسڵمانەکان و هەموو خاوەن باوەڕەکانـدا لەتەك ئاگادار نەبوونی هزرمەندان لەخاڵەکانی ١٤-١٥-١٦دا.

بەڵام لە رووی بیرکاریەوە هیچ مانایەك نییە ئەگەر نکۆڵی لێ بکریّ لەلای ئەوان خواوەندی لۆژیك و هزرە لەنێوەندی ماقوولییـەکان لەمـەش غـەزالی هـاتووە جەختی کردۆتە سەری بۆ ئەمەش غەزالی بەسەرسوڕمانەوە دەڵێت "ئەوانـە بەبیانووی ئـەوەی زیرەکانـە کاریـان کـردووە بـەڵام گـومڕا و کـافر بوونـە و کوشتنیان بۆتە ئەرك، هەروا ئەوانەی باوەڕ بە باوەڕەکانیان دەهێنن (غەزالی) دەبیّ تەکفیر بکرێن بۆیە دەبیّ سیّ خالّ بخرێتە روو:

١- بابەتی کۆنی جیهان و بەپێی ئەو قسەیان کە گەوهەرەکە هەمووی کۆنە

٢- کاتێك قسە لەسەر ئەوە دەکەن کە خـودا شـتێکی وا نـازانیّ سـەبارەت بەگەردیلەکانی رووداوەکان

٣- نکۆڵی کردنیان لەژیانەوە و حەشر کردنی لەشەکان.

ئەم سیّ خاڵە بەهیچ شێوەیەك لەگەلّ ئیسلامدا گونجاو نییە، چونکە ئەوانە وا تێدەگـەن کـە پەیامبـەرەکان درۆزنن، بـەڵام هـەموو ئـەو شـتانەیان بـەپێی بەرژەوەندی خۆیان داناوە، هیچ کام لە کۆمەڵەکانی موسڵمانانیش زۆر بەروونی وایان نەگوتووە.

جگە لەو سـیّ خاڵـەش هـاتوون بـەئارەزووی خۆیـان سـیفەتەکانی خودایـان باسکردووە دیارە لەرووی ئیلاهیات و بڕوابوون بەیەکتاپەرستی رێبازەکەیان نزیکە لە موعتەزیلە ئەمەش پابەند بوونە بەسروشت کە موعتەزیلەکان هـەر لەسـەرەتای دروسـتبوونیان کاریـان لەسـەر کـردووە، بـۆ ئەمـەش کۆمەڵـە ئیسلامیەکان جگە لەو سیّ خاڵە باسیان لە خاڵەکانی دیکە کردووە.

دیارە دەکرێ بەهەموو شێوەیەك ئەو کۆمەڵانە تەکفیر بکرێن و بەڵام ئێمە ناچینە نێوەندی باسێك کە بەئارەزووی خۆیان شتیان داناوە بۆ دروست و نادروستەکانیان بۆیە لەمەبەستی ئەو کتێبەدا بەدەردەکەوێ.

دیارە ئەم کۆتاییە شتێکی وا نییە کە غەزالی خستویەتیە روو و هۆیەك نییە تا فەلسەفە بەسەریەکدا بڕوخێنێ و فەیلەسووفەکان بەبێ ئومێدیەوە بڕواننە ئەکرپۆلێ کە بەرد لەسەر بەرد لەسەر یەکتریان داناوە، بەڵام غەزالی هاتووە لەسەرەتا وشەی جۆراوجۆری بەکارهێناوە و ترس و دڵەڕاوکێی خستۆتە دڵەکانەوە، هاتووە دەربڕینەکانی بەشێوەیەکی ئایینی خستۆتە روو بەو واتای ئەوەی بڕوای پێی نییە کافرە، لەنێوان چەند دێڕیکیدا نەفرەت لە فەیلەسووفەکان دەکات و دژیان دەوەستێ و پشت بەخودا دەبەستێ بۆ گومڕا کردنیان.

هەموو ئەمانە جۆش و خرۆشە دژ بە فەیلەسووفەکان بەشێوەیەکی گوماناوی لەتەك ئەوەی غەزالی هاتووە یەکە یەکە هەڵوەستەی لەسەر زانستەکانیان کردووە و نهێنیەکانیان دەخاتە روو، ئەمەش وەك جەنگێکە، بەڵام خوێنەر لەمەبەستی غەزالی تێدەگات لەتەك ئەوەی ئەو کەسایەتێکی پەسەند کراوە و یەکێکە لە ئیمامەکانی هزر لە رۆژهەڵاتدا.

ئەوەی سەیرە زۆربەی توێژینەوەکانی بەمە کۆتایی پێهێناوە و هاتووە کەموکوڕی فەیلەسووفەکانی لە بیست خاڵدا بەدەرخستووە تیایدا شەڕێکی گەورە رادەگەیەنێ بەشێوە لەحەقدە خاڵدا زۆرانبازی دەکا، کاتێکیش کە دەیەوێ لە گۆڕەپانی زۆرانبازیدا بێتە دەرەوە بەسەرسوڕمانەوە دەڵێت: "بەڕێزان من کارای خۆم بۆتان خستە روو و ئەوانەی دژمن لەسێ خاڵدا کۆکن، ئەگەر هەلی ئەزموونەکەش درێژەکەی کێشا".

لەپاش ئەم پێشەکییە هیچ بوارێك بۆ ئیبن رووشد نەما تا رۆانبازی لەتەك بکا بەتایبەتی لەنێوەندی گۆڕەپانی هزری فەلسەفی.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن رووشد لە نێوەندی کتێبەکانیدا بەشێوەیەکی ریزبەندی و سەلماندن و شێواز و رێگەکان بەشێوەی بنەڕەتی زانستی نوێی نووسین باسی لەبابەتەکان کردووە.

دیارە کتێبی (تهافت الفلاسفه) کە ئێمە باسی لێوە دەکەین بەشێوەی دەقی رستەکان وەڵام دەدرێتەوە کە تیایدا غەزالی دەڵێت "ئەو قسانە و قسەکانی دیکە لەلایەن ئەبو حامیدەوە گوتراوە"، بۆیە ئیبن رووشد وەڵامی دەداتەوە. بەڵام لەلای ئیبن رووشد وەڵامەکان بەشێوەیەکی خراپەکاری نایەتە کایەوە تا هەموو شتەکان لەدەستی خەڵکدا بێت، دیارە لەتەك ئەمەش هەندێك هاتوون بەسەردەمی رووخانی دەزانن لەرۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، وەك خۆجە زادە یان یەکێك لەزانایانی رۆم بەشێوەی رووخان و هەڵدێران باسی لێوە دەکەن.

ئەمەش سەیر نییە لەلای زانایەکی رۆمی تا بەم شێوەیە باسی لێوە بکات، چونکە ئەمە واتایەك نییە تا هەردوو لایەن روون بکرێتەوە بەشێوەیەك وا لێك بداتەوە هەر یەکێکیان بەرێڕەوێکی باوەڕ و هزر و بۆچوون و شێوەکانیان لەیەکتر جیا دەکرێنەوە.

بۆ ئەمەش کتێبی تهافت هۆیەکە تا خوێنەران پابەندن پێی و تیایدا قووڵ ببنەوە، بۆ ئەوەی بەراوردێك بکەین لەنێوان کتێبە فەلسەفیەکان تا تونای دانایی روونبکرێتەوە دیارە بەبەراوردکردنی دەتوانین هەموو جیاکاریەکان بەدەربخەین لەتەك کتێبەکانی ئەفرەنجی تا بزانین دانایی تا چەند زاڵبووە بەسەر عەقڵ و دەروونمان لە جیهاندا.

کتێبی (تهافت التهافت) بەهایەکی تایبەتی هەیە چونکە بریتییە لەدەربڕینی بەرگری فەیلەسووفێك لە فەلسەفە و ئەمەش مەزنترین بەرگریە لەلایەن مەزنترین فەیلەسووفی موسڵمانەوە، دژ بە مەزنترین هزری شەرعی موسڵمانان.
ئیبن رووشد لێرەدا لەنێوەندی هەموو خاڵ و باسەکاندا و یەکەکەی هزرمەندانی جیهانی دێرین لە یۆنان و موسڵمانان دەکۆڵێتەوە، هاوکات دژ بە پێچەوانەکان دەبێتەوە کە هاتوون خەونیان بینیووە لەکاتێکدا ئارەزووی لەوە نییە پێیبڵێن سەرکەوتنی دژ بە دژەکانی بەدەستهێناوە و ئەو تەنها هاتووە رەواییەکانی خستۆتە روو.
پێدەچێ تەنها رێز لەیۆنانییەکان دەنێ واتە لە ئەرستۆوە تا ئەوانی دیکە، لەتەك ئەوەی نایەوێ بەشێوەیەك تانە لە غەزالی بدات تەنهاش زانستی بۆ روونکردۆتەوە.
لەزۆریەی باسەکانیدا هاتووە کە ئەبووحامیدی غەزالی خوا لێی رازی بێت باس کردووە بەشێوەی ئەو باسی لێوە دەکات و دەڵێت "دیارە ئەو ئازارانە هۆیەکن بۆ تێکەڵ و پێکەڵکردن بەشێوەیەك لە کتێبی سەفسەتە دەچێت ئەگەر خوێنەر شتێکی لەبارەیەوە بزانێ".
دیارە خستنە رووی هەردوو کتێب کە نزیکن لەیەکتری، بەمەش دیارە خۆجە زادە کە لەکۆتایی سەدەی نۆیەمی کۆچیدا مردووە تەنها لەکارێك خزمەتی زانستی کردووە کاتێك هاتووە ناوبژیوانی هەردوو لای کردووە، بۆ ئەمەش خۆجە زادە توانیویەتی نەمری لەنێوەندی پەراوێزەکاندا بەدی بهێنێت، بەشێوەیەك جەخت لەوە دەکاتەوە کە کتێبە فەلسەفییەکان دوورخراونەتەوە و هەندێکیان سووتێندراون.

دیارە ئیبن رووشد بە سانایی و بەبێگومان سوودی لە مامۆستایە یۆنانییەکانی وەرگرتووە بۆیە هاتووە پێشەکیەکەی کردووەتە دوودێڕ بۆیە باسی لێوە دەکەین ئەو دەڵێت لەپاش سوپاسی خودا و سەڵەوات "مەبەست لەم باسە خستنە رووی ریزبەندی وتەکانە کە چەسپاوە لە کتێبی (تهافت) لەتەك راستکردنەوەی کەموکووڕیەکان لەریزبەندی یەقین و ئەرگۆمێنت و بەڵگە".

دیارە ئەم پێشەکیە سانا و هێمنە دژ بە تۆپ و بۆمبەکانی غەزالین لەتەك زرێپۆش و تەپڵ و هێرشەکانیەتی دژ بە فەیلەسووف و ژیر و گومڕاکانە؟

بێگومان راستی پێویستی بە ئاهەنگ نییە، چونکە زۆر دەوڵەمەندە بە هێز و جوانییەکانی لەنێوەندی هەموو دیاردەکانی.

## وتە و لێدوانی ئیبن رووشد سەبارەت بە کتێبەکە

باسی لەوە کرد کە لەلای فەیلەسووفەکان شتێکی وا نییە کە باس لە بوون و نەبوونی جیهان بکرێ بەوەی وێنەیەك بگوازێتەوە بۆ وێنەیەکی دیکە، چونکە ئەمە بەخستنە روو دەبێ، بەڵام ئەوکات لەلای ئەوان شتێك نایەتە کایەوە کە هیچ بوونێکی نەبێ، ئەگەر وابێ کردار پەیوەستە بە نەبوونەوە دواتر بەخود، هەموو ئەمانە قسەی غەزالییە کاتێك باس لە خود کرد و فەیلەسووفەکانی پابەند کرد کە ناتوانن رێگری لەهیچ بکەین و ناتوانن ئەو بوونە وەلا بێنێن!

باشترین قسەی نێو ئەو کتێبەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە رووخانی فەیلەسووفەکان نییە، بەڵکو تەنها رووخانی ئەبی حامیدی غەزالییە، باشترین ناونیشانیش بۆ ئەمە رووخان و وێنەی نووسەرکەیەتی، (کتێبی جیاکردنەوە لەنێوان رەوایی و رووخان (لا٤١ لە میسر چاپکراوە).

هەورا باسیش لەوە دەکات کە هەموو قسەکانی نێو ئەم کتێبە بەهەموو شێوەیەك دوورە لەقسە و لێدوانی نائەرگومێنێت و بێ بەڵگەیی.

لەنێوەندی قسەکانیدا باس لەوە دەکات کە خودا زانیارە بەهەموو گەردوون و بوونەکان، ئەمەش بەڵگەیە کە قسەکانی پووچە چونکە تەنها خۆی بەرەو رووخان هەنگاوی ناوە نەك فەیلەسووفەکان، دیارە قسەکانی غەزالی دوور نییە لە نەزانی و هەموو وشە و دێڕەکانیشی کە لەتەك ئیبن سینادا گوتوویەتی تەنها بۆ دەمە تەقێیە (لا١٠٠).

لێرەوە ئیبن رووشد زۆرێك لە مەبەستەکانی خستۆتە روو بەتایبەتی هەر بیست خاڵەکەی و بۆچوونی فەیلەسووفەکان، دیارە ئەم قسانەش بەرزترین پلەی دەمەتەقێیە، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی بە بەڵگە و ئەرگومێنتەوەکانەوە نییە، چونکە کاتێك باسێکی بەڵگەیی دەخەیتە روو دەبێتە باسێکی گەوهەری و قسەکردنە لەسەر ناوەڕۆك بەشێوەیەکی گونجاو، ئەوەی بۆ خوێنەر شاراوە نییە خودی غەزالی بەشێوەیەکی لۆژیکی باسەکەی خستۆتە روو تا بتوانێ دژایەتی فەیلەسووفەکان بکات.

هەروا غەزالی ویستوویەتی بەخستنە رووی شەرع مستی خۆی بوەشێنێ، ئەمەو ئیبن رووشد لەوەڵامدا دەڵێت "ئەم نموونە وەسفییە شتێکی خەیاڵاوییە و دوورە لەراستی تا بیانوو لە لەفەیلەسووفەکان بگرێ، بەشێوەیەك ئەشعەریەکانیش بەو شێوەیە دەیانەوێ بە بەرامبەرەکەیان بڵێن جیهان بەدرەنگەوە هاتەکایەوە تا ئەو کاتەی خودایەك هات هەموو جیهانی دروستکرد، بەڵام ئەمە پەیوەندی بە وەسفەوە نییە بەڵکوو پەیوەستە بەعەقڵەوە.

هەروا غەزالی سەبارەت بەهەمان بابەت دەڵێت : پێدەچێ موتەکەلیمەکان باسیان لە رووداوی جیهان نەکردووە تا بگەنە ریزبەندی و پلەی یەقین، بەڵام

ئەمە هیچ پەیوەندیەکی بە پلەکانی بەڵگە و ئەرگومێنت و بەڵگەوە نییە، بۆیە ئێمە مەبەستمان لەو خاڵەیە بۆ روونکردنەوەی ئەم کتێبە.

سەبارەت بەوەڵامدانـەوەی غـەزالی و پابەنـدبوونی فەیلەسـووفەکان، ئەگـەر وەسفی شوێنەکان بکات ئەوا پەیوەست نییە بە دەروونێك لە نێو مـاددەدا، لەبەرامبەر شوێنی کردەیی، چونکە بەکردەوە ئەو شوێنانە دێتەکایەوە.

مەبەستی غەزالی لەوەیە کە دەروونەکان جیان واتە دوورن لە لەش و ئەمەش لەدەرەوە دروستکەر دەیهێنێتە ئاراوە، هەروا دەروون لـە لەشـدا نییـە وەك ئـەوەی دورسـتکەر دامـەزراوێك نییـە، ئـەم مەبەسـتەش وەك سـەرکەوتنی زانایەکانە بۆ داهێنانی کەشتیەکی جەنگ یان ئۆتۆمبێلێك جووڵە بکات بە هێزی کارەبایی زۆر دوور بێ و سەربەخۆیانە بێت.

ئیبن رووشد باس لەوە دەکات کە شتەکان بەیەکتر ناچن و ناکرێ بیانچووێنین بەیەکتری، بەڵکوو تەنها چەندان گومان وەك کردەوە خراپەکانی سەفستائین، کە دژایەتی فەلسەفە دەکەن، وەك غەزالی دەیەوێ بەهەر شێوەیەك بێت بـە یاسایەك دوژمنانی بخاتە زیندانەوە، بەمـەش ئامرازەکـانی دڵـەراوکێ بـەکار بێنێت، بەشێوەیەك مکوڕی لەسەر هەموو شـتێك دەکـات، بەمـەش دەیـەوێ رێبازی بەرامبەرەکەی پووچ بکاتەوە. بەڵام دەبوایە ئەبوو حامید زیاتر باسی لەرەوایەتی بکردبوایە نەك دژایەتیەکی تەواوی بەرامبەرەکانیان بکات، ئیبن رووشد باس لەوە دەکات کە غەزالی بەقسەی خۆی ویستوویەتی کتێبێك دابنێ رەوایی و ماف و هەق بخاتە روو، لەتەك ئەوەی هەندێك لەکتێبەکانی غـەزالی نەگەیشتوونەتە مەغریب، هاوکات جەختیش لەوە دەکرێتەوە ئەو کتێبانەی بۆ ئەو دەگەڕێننەوە زیاتر سەبارەت بە رێبازی ئیلاهی تا رێبازەکانی فەلسەفی، بۆ زیاتر روونکردنەوەش ئەو کتێبە بەناوی (المشکات الانوار) بووە.

ئیبن رووشد نیگەران نییە لەهەندێك قسەی غەزالی كاتێك باس لەوە دەكات كە ڕێبازی فەیلەسووفەكان باس لەخودا دەكەن نەك تەنها وەسفێك بەڵكوو چەندان وەسفی پێدەبەخشن و دەڵێت "جیهان تەنها بۆ چەند دەروازیەكی نییە، بەڵكوو دەروازیەكی ناوەڕۆك بەرهەڵستی دەكات".

غەزالی لەوەڵامی فەیلەسووفەكان بەتایبەتیش باس لە ئیبن سینا دەكات، دواتر ئیبن رووشد هاتووە، سەركەوتنی غەزالی بەسەر ئیبن سینادا راگەیاندووە، بەتایبەتی كاتێك ئیبن سینا باس لە وێنەی تەنە ئاسمانییەكان دەكات و دركی بەوە كردووە كە وێنەكان زۆر جیان لەتەك كەرەستەكان، بەو پێیەش ئەوە دەردەكەوێ كە ئیبن رووشد ئەو كتیبەی نووسیوە بۆ سەركەوتن و پشتگیریكردنی فەیلەسووفەكان و هاتووە هەموو شتەكانی غەزالی زۆر بەروونی باسكردوون و هەموو هەڵەی دانایانی بەتەواوی خستوونەتە روو.

لەلایەكی دیكەوە باس لەوە دەكات كە یەك ژمارەیەكی سانایە و تەنها یەك ژمارەی لێ دێتەكایەوە، لەتەك ئەوەی یەكتاپەرستی هەر یەكە كاتێك زیاتریش بوو ئەوا كێشە و گرفتەكان زیاتر دەبن" غەزالی ئەم قسەیەی خستووەتە پاڵ ئیبن سینا پێیوابووە كە دەتوانێ پشتی یەكێك لەفەیلەسووفەكان بشكێنێ، ئیبن رووشد لەمبارەیەوە دەڵێت "ئەم قسانە هیچ بنەمایەكیان نییە و دەیەوێ بەرامبەرەكان رازی بكات و هەروا ئەم قسانە هیچیان راست نین و ناخرێنە سەر بنەمایەكانی فەلسەفە، ئەم قسانەی خراپترین وێنەیە تا بەهەر شێوەیەك بێت دەروونی فەیلەسووفەكان بەلارێدا ببات، هەموو ئەمانەش مانای ئەوەیە هیچ وتەیەكی ئەرگۆمێنتی و بەڵگەیی نییە، ئەو تەنها خودی خۆی دەناسێت، كاتێك غەزالی باس لەوە دەكات كە فەیلەسووفەكان دەبێت پابەند بن، غەزالی گەورەیی خۆی نیشان دەدات و لەمبارەیەوەش ئیبن رووشد دەڵێت "ئەم قسانە

ناشیرینترین قسەن کەلەلایەن ئەو پیاوەوە وتراون کاتێك دانایان دەخاتە ژێر باڵی بۆچوونەکانی، کەچی ئەوان چەندان بۆچوونی دیکەیان هەیە".
لەلایەکی دیکەوە باس لەوە دەکرێ کە غەزالی کۆکە لەتەك هەموو قسەی فەیلەسووفەکان، بەڵام ویستوویەتی پێچەوانە بجووڵێتەوە تا بەدەربکەوێ تا شکۆمەندی شەریعە و سەرکەوتنی شەریعەت بەدەست بێنێ، بۆ ئەمەش لەرووی عەقڵەوە لەگەڵ دانایانە، بەڵام ویستوویەتی خەڵك رازامەند بکات وەك رووکەشییەك.
لەپاشاندا ئیبن رووشد هات گەورەترین هەڵمەتی کردە سەر بەوەی توڕەیە لەدانایی و لەنێوەندی قسەکانیشدا ئەمە بەدەردەکەوێ:
"ئەوەی من لێرەدا دەیڵێم تەنها مەبەستم زانیاری نییە لەسەر رەوایی بەڵکوو مەبەستمە چەندان قسە پووچ بکەمەوە و ئەوە بخەمە روو، کە هەندێك بابەتیان لەبنەڕەتدا پووچە، چۆن ئەمە ناکات کاتێك ئەو پیاوە قسەی کردووە و هاتووە سوودی لەهەموو دانایان وەرگرتووە؟ کاتێکیش هەڵەی کرد نکۆڵی لێ ناکات، تەنها ویستوویەتی عەقڵەکان لەخۆی رازی بکات، چونکە دانایان مەبەستیان لەداهێنانی لۆژیکە، دەبوایە سوپاسیان بکات، لەپاشاندا گوتوویەتی سوودی لە کتێبی خودا وەرگرتووە، خەڵکی سەردەمی خۆی رازی بکات و لەپاشاندا دژایەتی هەموو زانستی دانایان بکات؟"
"کاتێك بینیمان ئەوان هەڵە دەکەن سەبارەت بە زانستەکانی ئیلاهی بۆیە بیانوو بۆ هەڵەکانیان دەهێنینەوە بەپێی یاساکان کە لەرووی زانستەوە فێریان کردووین، بۆیە ئەوان هەڵوەستە لەسەر هەڵەکانیان بکەین، ئەمە بەسە بۆ ئەوەی نەوازشیان بۆ بهێنێتەوە، لەتەك ئەوەی بەکەسی نەگوتووە ئەمە زانستێکی ئیلاهییە و هەروا باس لەوە دەکات کە زۆربەی بابەتەکان

لەدەرەوەی تواناکانی مرۆڤە و سروشتەوەیە، بەڵام نازانین بۆچی ئەم پیاوە ئەو قسانەی کردووە، داوا لەخودا دەکەم لێی ببورێ".

لەلایەکی دیکەوە ئیبن رووشد نیگەرانە لەوەی کە ئایا وەڵامی بداتەوە یان دژەکەی رابگرێ تا دانایی خۆی بۆ جەماوەر بگێڕێتەوە، بۆیە دەڵێت "پێویستە ناوی ئەو کتێبە رووخانی دوو کۆمەڵەکە بێ و هەموو ئەمانەش باس لە شەریعەت و پشکنین دەکەن، لەکاتێکدا شەریعەت فەرمانی بەوە نەداوە کە مرۆڤ کەموکووڕی هەیە، بەشێوەیەك شەریعەتیش بێدەنگ نەبووە لەئاست زانستەکان، بۆیە پێویستە بۆ هەموو خەڵکی باسی بکرێ، بەڵام قسەکانی ئەو سەبارەت بەشەریعەت هەموو لایەنەکانی نەزۆك کردووە، لەرووی ماناوە، لەتەك ئەوەی خەڵك دەزانێ کە عەقڵیان کەموکووڕی تیایە، بۆیە دەبێ هەموان فێر بکرێن تا دەگەنە ئامانجەکانیان".

بەم شێوەیە ئیبن رووشد کە بەیەکێك لە فەیلەسووفە ناودارەکان دادەنرێ، بەڵام هاوسەردەمەکانی بەگومڕا ناویان بردووە و میریش لەکۆبوونەوەیەکی فراواندا دادگایی کردووە و سزای دوورخستنەوەیان بەسەردا داوە، ئەمەش وەك ئەوەیە لەسەردەمی غەزالیدا روویدابێ، کەچی سەد ساڵ لەنێوانیانە، لەتەك ئەوەی ئیبن رووشد جەختیش لەوە دەکاتەوە کەلەنێوەندی هەموو لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا بەرگری لە شەریعەت دەکات و هەروا هەواداریەتی لەم رووەوە، بۆیە ناویان لەو پیاوە ناوە حوجەتی ئیسلام.

ئیبن رووشد لەزۆربەی بابەتەکان باسی لە دانایی و لێکدانەوەی بۆ شەرع کردووە و زۆربەی بابەتەکان تاوتو دەکات، بەڵام بەنووسین پەردە لەسەر هەموو شتێك لانابات و دەڵێت "ئەو شتانەمان باس کردووە کە پێویست بووە،

خودا دەزانێ و شایەدە دەمانەوێ بەکورتی لەو بابەتانە بدوێین، ئەمەش شێوەیەکە لەقسەکردن لەم بابەتە".

کاتێك ئیبن ڕووشد کتێبی (التهافت)ی نووسی مەبەستی ئەوە بووە عەقڵەکان ڕزگار بکات لەتارمایی تا درك بەوە بکرێ، کە غەزالی چ هەڵە و ترسناکیەکی ئەنجام داوە، چونکە کارەکەی مەبەستدارە، بەڵام غەزالی ویستوویەتی ژاوە ژاو بخاتە نێو عەقڵەکانەوە.

لێرەوەش دەبێ ئەوە بزانین کامەیان لەسەر هەقن و کامەیان مەبەستی سەرەکی هەیە بۆ خستنە ڕووی ڕاستیەکان، ئیبن ڕووشد وەڵامی ئەمەی داوەتەوە لەنێوەندی قسەکانیدا دەڵێت "مەبەست لەداینەمۆیی ئاسمان، ئەگەر فەیلەسووفەکان گوتیان ئاسمان ئاژەڵێکی ملکەچی خودایە"، هەروا کاتێك باس لەخاڵی پانزدەهەم دەکەین کە غەزالی باسی کردووە، بۆ ئەمەیش ئیبن ڕووشد دەڵێت "سەیرە ئەم قسانە لەنێوان دوو پیاودا بێتە ئاراوە، یان کەسێکە خراپەکارە یان نەزان، بەڵام کەسی خراپەکار لەلای ئەبووحامید دوورە لەو دوو سیفەتە، لەوانەشە لەلای نەزان و خراپەکارێك دەرناچێ، کە تیایدا باس لە کەموکووڕیی مرۆڤەکان دەکات، کاتێك تووشی دڵەراوکێیان دەکات".

ڕاسترین قسەش بۆ ئەمە ویستوویەتی ڕووبەڕووی ڕەوایی و ڕاستی ببێتەوە بەو گومانەی ڕووناکیەکەی کەم دەکاتەوە!

## وەڵامدانەوەی ئیبن ڕووشد لەسەر شێوازی غەزالی

ئیبن ڕووشد، غەزالی بەوە تاوانبار دەکات کە سەفسەتائیی و زۆر بلێیە لەپێناو دەمە تەقێیەکی بێ ئەنجام لەچەندان بواری مەزندا دەدوێت، چونکە هەر یەك لەمانە پێویستی بە پشکنین هەیە بۆ هەموو ئەو وتانەی کە دێرینەکان باسیان

لێوە کردووە، دەبوایە تەنها بابەتێك وەربگرێ نەك ئەو هەموو بابەتە بەیەکجار، لەتەك هەموو ئەو هەڵانەی کە سەفسەتائییەکان دەیکەن کە ژمارەیان حەوتە و تەنهاش هەڵەیەکە دووبارەی دەکەنەوە بەرامبەر بە بنەماکان هۆکارەکەش دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەی گەورە لەکاتێکدا کە پشکنین لە بوونەکان دەکەنەوە. هەروا تۆمەتباری دەکات کە زۆر بەسانایی هەڵەی بەرامبەر بە دانایان کردووە و خۆشی دڵخۆش کردووە بەوە گەندەڵی و خراپەکاری ڕووبەڕووی فەیلەسووفەکان کردووە، لەتەك ئەوەی کەسێك نەبووە تا وەڵامێکی راستەقینەی بداتەوە، لەپاڵ ئەوەی چەندان هەوڵی دیکەی داوە کە هەمووی پووچە.

سەبارەت بەژمارەی رەچەڵەکەکان لە زانستی سروشتیدا، راستە لەسەر رێبازی ئەرستۆتاڵیس و زانستەکانی دیکە چەندان لقی لێ دەبێتەوە بەڵام ئەو ژمارانە نین کە ئەو باسی لێوە کردووە، سەبارەت بە پزیشکی ئەوا زانستێکی سروشتی نییە، بەڵکوو پیشەیەکە بنەماکانی لەزانستی سروشتیدا وەردەگیرێ، چونکە زانستی سروشتی تەنها تیۆرییە، بەڵام پزیشکی کردەیی و پراکتیکییە. کاتێك دێتە سەر موعجیزەکان ئەوا هیچ کامێك لە فەیلەسووفە دێرینەکان بەو شێوەیە باسیان نەکردووە کە پشکنینی بۆ نەکرێ، لەکاتێکدا ئەوەی باس لەمانە بکاتە ڕووبەڕووی سزا دەبێتەوە، بەڵام کاتێك دێت پرسیار دەکەی سەبارەت بەوەی کە ئایا خودا بوونی هەیە، ئایا خۆشگوزەرانی بوونی هەیە، ئایا چاکەکاریەکان بوونیان هەیە؟ بێگومان هەموو ئەمانە بوونیان هەیە، چۆنیەتی بوونیشی کارێکی موجیزەیە بۆ درکپێکردنی عەقڵی مرۆڤایەتییە.

هەروا سەبارەت بە روانگەی فەیلەسووفەکان کاتێك باسیان لە خەون و سروش کردووە ئەوە تەنها غەزالییە و کەسی دیکە باسی نەکردووە، بەڵام خودا لێرەدا

لەنێوەندی رووحانیدایە نەك تەنیا بە لەش، ئەمەش بەهرەیەكی مرۆڤایەتییە كە زیرەكەكان ناوی دەنێن عەقڵی كارا و لەشەریعەتیش ناوی مولكەیەتە.
پێویست ناكات بڵێین نووسینی (تهافت التهافت)ی ئیبن رووشد بۆ خستنە رووی بنەماكانی فەلسەفە و لقەكانی و گرنگیدانە بە رێبازەكانی مێژووی فەلسەفەی كۆن و نوێیەكانە، بەلام دەكرێ بڵێین خستنەڕووی وتە و بەراوردكاریەكانە لەتەك یەكتردا، هاوكات خستنەڕووی روونكردنەوەیە بۆ بەرامبەر و دژەكان.

## سەبارەت بە فەیلەسووفەكانی یۆنان

سەبارەت بەقسە و وتەی فەیلەسووفەكان باسی لەوە كردووە كە جیهان لە پێنج تەن پێك هاتووە:

(١) تەنێكی قورس نەك سووك تەنێكی ئاسمانی جولاوە.
(٢) تەنێكی قورس بە خستنەڕووی بۆ سەر زەوی.
(٣) تەنێكی سووك بە خستنەڕووی وەك ئاگرە.
(٤) تەنێكی قورسە لەتەك زەویدا كە ئاوە.
(٥) تەنێكی سووكە لەتەك ئاگر كە هەوایە.

هەروا باس لەوە دەكات هیوامان وایە هەموو ئەمانە بە بەڵگە و ئەرگۆمێنت بخرێنە ڕوو لەلایەن ئەو كەسانەی كە لەم بوارەدا كار دەكەن، هەروا قسە بكەن سەبارەت بە تەنە ئاسمانییەكان و باسیش لەوە دەكات كە جووڵەكانی دیاریكراون.
هاوكات ئەرستۆ پێی وایە كە ئاسمان لەچەپ و راست و پشت و پێشەوە و خوارەوە و سەرەوەی هەمووی تەنە ئاسمانییەكانە لە رووە جووڵەییەكان جۆراوجۆرن لە شێوەكانی كە بەهەموو شێوەیەك دەتواندرێ پشكنینی بۆ بكرێ

تا هەموو جیاوازییەکانی جووڵەی دیاری بکرێ، هەروا بەو پێیەی کە تەنە ئاسمانییەکان تەنها ئاژەڵێکن، لەتەك ئەوەداین بەهەموو شێوەیەکی جووڵەی تیایە، وەك جووڵەیەکی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا و هەموو گەردوونەکانیش لەتەکیدان هەمان جووڵە دەکەن، بەپێی سروشتی تەنەکە، ئەمەش بەهۆی تەنها داینەمۆیەکە کە هەموو گەردوون و تەنە ئاسمانییەکان دەجووڵێنێ.

## زانستی خودا سەبارەت بە بوونەکان

### کە بەشی سێزدەهەمە لەخاڵەکانی غەزالیدا

ئیبن ڕووشد دەڵێت: زانست زۆر دەبێت بە بوونی کاراییەکان، چونکە زانست بەپێی بوونەکان دێتە ئاراوە لەنێوەندی کێشەکان تا تەنها بەیەك زانست بیبەستنەوە تا زانیاری زیاتر وەدەست بێ واتە لەلایەن دروستکەرەوە دێتە ئاراوە ئەمەش وەك گەنجینەیەك وایە، بەڵام زانستی کۆن زۆر جیایە لەزانستی نوێ وەك کردەیی کۆن و نوێ، لەمەوەش ڕێبازی ئیبن سینا پووچ دەکاتەوە کاتێك تۆ باس لەمانە دەکەی.

باسیش لەوە دەکرێ کە کۆمەڵەی فەیلەسووفەکان وەڵامەکانیان لەیەك بۆتەدایە بۆ سێ وەڵام

(١) زۆربوون لەلایەن هیۆلییەوە بووە

(٢) زۆر بوون لەلایەن ئامێرەکانەوە بووە

(٣) زۆر بوون لەلایەن نیوەندکار و هۆکارەکانەوە بووە

بەڵام کۆمەڵەی ئەرستۆ وەڵامی سێیەمیان ڕاستکردۆتەوە، لەم کتێبەیش ناتواندرێ بە وەڵامێکی بەڵگەیی و ئەرگۆمێنت، وەڵام بدرێتەوە، هەروا وەك

ئەرستۆ کە کۆنترین ناوداره لەو بوارە کاتێك ئەو وشانەیان خستە پاڵ (فرفۆریۆسی وێنەیی) کە خاوەنی دەروازیەکە بۆ زانستی لۆژیك، بەڵام غەزالی باس لەوە دەکات کە زۆر بوونەکان پەیوەندی بە نێوەندی و ئامادەگی و ئامێرەکانەوە هەیە.

سەبارەت بەقسەکانی ئەبووحامید بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی فەیلەسووفەکان و چەسپاندنی دروستکەر باس لەوە دەکات کە : بوونی پێشکەوتووەکان لەلای فەیلەسووفەکان مەرجێك نییە بۆ بوونی پاشکەوتووەکان بەڵکوو تەنها مەرجیان خراپەکارییە ئەمەش کێشەیانە (بوونی باران لەسەر تارمایی ڕەش و تارمایی ڕەش بەهۆی هەڵمەوەیە) لەلای ئەوان کێشەیەکی ئەزەلییە بە جووڵە کوتاییی دێ، بە شێوەیەك کاتێك دەڵێن سوکرات بیروبۆچوونەکانی بەهۆی ئەفلاتوونەوە لەدایك بووە ئەوا دەیگەڕێننەوە بۆ دەروون و عەقڵ، هەروا ئەرستۆ دەڵێت مرۆڤ مرۆڤی لێ لەدایم دەبێ، هەروا گەردوونەکانیش بەو شێوەیە تا ئەو کاتەی دەگاتە داینەمۆیەکەی کە داینەمۆی یەکەمە، بەو شێوەیە مرۆڤی رابردوو مەرج نییە بۆ بوونی مرۆڤەکانی دیکە.

## زانستی خودا سەبارەت بە گەردیلەکان

سەبارەت تێکڕایی گەردیلەکان خودای گەورە دەزانێ و زانیارە لێی، ئەمەش لەنێوەندی بنەمای فەیلەسووفەکانی دێرین ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام ئەوەی شتەکان لێك جیا بکاتەوە تەنها لەبابەتە تێکڕاییەکان دەزانێ و هیچ شتێك سەبارەت بە گەردیلەکان نازانێ، بۆیە ڕێبازەکەیان گۆڕی و پابەند بوون بە بنەمەکانیان، چونکە زانستە مرۆڤایەتیەکان هەمووی هەڵچوون و کاریگەرییە سەبارەت بە بوون و بوونی کاریگەر، بۆیە خودای گەورە کاریگەرە لەسەر بوون

و بوونەوەرە هەڵچووەکان، ئەگەر بڕیاری دا ئەوا شتەکان یەکلادەبێتەوە و شەڕ دەکەوێتە نێوان ئەبووحامید و نیوان فەیلەسووفەکانی ئەم دەروازەیە.

## ڕەخنەگرتن لە فەیلەسووفەکان

باسمان لەوە کرد کە ئیبن ڕووشد لایەنداری هیچ تیم و کۆمەڵەیەکی نەکردووە، بەڵام لەنێوەندی کتێبەکەیدا نێوەندی لەنێوانیان کردووە لەو بابەتەی کە خودا کارا نییە بەڵکوو هۆیەکە لەنێوەند هۆکارەکانە لەنێوەندی جیهان و ڕووداوەکانی "ئەم قسەیە یەکێکە لە وەڵامەکانی ئیبن سینا لەو بابەتە سەبارەت بە فەیلەسووفەکان ، بەڵام ئەم قسەیە سەفسەتائییە و تەنها بۆ دەمەتەقێیە، بەڵام دۆخەکە هەردەم پێویستی بەداینەمۆیە، لەلایەکی دیکەوە هەندێك لە فەیلەسووفەکان پێیان وایە دۆخی جیهان بەرزترە لەخواوەند، بەڵام جیهانی سەرەوە پەیوەندارە بە دروستکردن، کە بوونی هەبوو بەراورد دەکرێ بە نەبوون و بەردەوام دەبێ لە بوون.

ئەوەی ئەرستۆ ویستویەتی قسەی لەسەر بکات کە گەردوون بازنەییە، بەمەیش کێشەی بۆ عەقڵ دروست کردووە دواتر ئەمە دەگوازرێتەوە بۆ ئەزەلییەت ئەمەش لەنێوەندی وتاری دووەمی ئاسمان و جیهانە، چونکە فەیلەسووفەکان دەڵێن هەموو تەنێك ڕووداوێکە و داهێندراوە لە نەبوونەوە بەشێوەیەك کە کەس نەیبنووە، بەڵام بەگشتی تەنەکان ڕووداو و یان دێرینە، بەڵام سەریەخۆ نییە لە بوون، بەشێوەیەك تەنە کۆنەکان ئەرکێکی داڕێژراوە بۆ تەنی نوێ، بەڵام خەیاڵ نازانێ چۆن بوونە کۆنەکەی بزانێ وەك چۆن تەنە نوێیەکە هەمان کار دەکات.

بەڵام دەهریەکان باس لەوە دەکەن کە هەست پشتی پێ بەستووە بۆیە جووڵەکانی وەستاوە لەتەك تەنە ئاسمانییەکان، واتە پەیوەندی براوە بە عەقڵ و هەستەکان، کەچی فەیلەسووفەکان باس لەوە دەکەن کە هۆکارەکان کۆتایی هاتووە لەتەك تەنە ئاسمانییەکاندا دواتر هۆکارە مەقووڵییەکان پەیوەندار نییە بە هەستەوەرەکان، واتە کێشەیەکە بۆ بوونی هەستەوەر.

لەو لاوەش ئەشعەریەکان (کە سوونەن کە ئیبن رووشد بنەماکانی فیقهی لەمندالّی لێ وەرگرتووە) ئەوان دەستیان بەچەندان هۆکاری هەستیار بردووە، بەڵام نەیانگوتووە هۆکارەکان وای کردووە کە کێشەی بوونەوەکان بێتە ئاراوە، بەجۆرێك لەگەردووندا، نابیندرێ و هەستی پێ ناکرێ، هەروا نکوڵییان لەهۆکارەکان کردووە، واتە بە چاوێکی مرۆڤانە سەیریان نەکردووە.

بابەتی گەردوون شتێکی زۆر کۆنە بەواتایەك ئەو گەردوونە لەچەند پارچەیەکی کۆن پێکهاتووە، ئەمەش شێوەیەکی لاوازە کاتێك تەنێکی سانای نا پێکهاتە گریمان دەکەی کە پێکهاتووە لە ماددە و وێنە کە لەرێبازەکەدا.

لەلایەکی دیکەوە ئەسکەندەر باس لەوە دەکات کە هەموو شتەکان و گەردوون هێزێکی رووحییە کە لەهەموو جیهاندا هەیە و لەیەك بوونەوەردا بوونی هەیە و هەموو بەشەکان بەیەکتر دەبەستێتەوە، جیاوازیەکەش لەنێوەند جیهانی کۆن و نوێدایە بەشێوەیەك جیهانی تەواوکاری یەکتر بووە لەدواتردا، ئەمە لەکتێبی ئاژەڵی ئەرستۆدا بەدەردەکەوێ، بەڵام لەو سەردەمەدا زۆرێك لە هەوادارنی ئیبن سینا ئەم بۆچوونەیان تاوتۆ کردووە و بۆیە ناویان ناوە فەلسەفەی رۆژهەڵاتی، چونکە رێبازی رۆژهەڵاتیەکانە کەوای دەبینن تەنە ئاسمانییەکان خواوەندە، بەمەش شێوە و رێگەی ئەرستۆ لاوازکراوە بۆ چەسپاندنی رێگەیەکە بۆ جووڵە.

## قسەکردن سەبارەت بە خودای گەورە

ڕێبـازی ئـیبن ڕووشـد سـەبارەت بـە خـود و سـیفەتەکان پەیوەسـتبوونی بەباسەکانەوە یەکدیگرە و هیچ شتێکی زیاد نییە، هەروا تەنی ئاسمانی لەلای فەیلەسووفەکان پێکهاتە نییە لە ماددە و وێنە لەلای ئەواندا شتێکی سـانا و ساکارە بە شێوەیەك خودای گەورە پێی ڕەزامەندە.

## ڕێبازی نەسرانییەکان سەبارەت بە سێ حاڵەکە

لەتەك ئەوەی ئەوان وای دەبینن کە ئەو سیفەتانە زیاترە لە خود، هەروا لەلای ئەواندا رادەیەکی زۆرە، کە هێزێکی زۆری هەیە نـەك کردەیـی، بۆیـە ئـەوان دەڵـێن: سـێ نـەك یـەك، واتـە یـەکێك بـەکردەیی و سـێش بـە هێـز، بـەڵام فەیلەسووفەکان باس لەوە دەکەن کە خودای گـەورە یەکـە، بـەڵام چـەندان سیفەتی لێنراوە.

ناوی خودای گەورە لەرووی عەقڵەوە ناوە، ئەمە لەلای فەیلەسووفەکان، کەچی ئەفلاتوون باس لەوە دەکات عەقڵ وەك بنەمای یەکـەم نییـە بۆیـە بەعـەقڵ وەسف ناکرێ.

بۆ بوونیش دوو بوون هەیە، بوونێکی بەرز و بوونێکی نزم، بوونی بەرز کێشەیە بۆ ئەوی دیکە، بەمانایەك کە دێرینەکان وەسفیان کردووە کە خودای گەورە بوونەکەیـە کـە ئـەو تـەنها کـردە و کردەگـارە، بـۆ ئەمـەش سـەرکردەکانی سۆفیگەری هەموو کات دەڵێن (لاهو الاهو) ئەمەش هـەموو زانسـتێکە لـەلای ئەوانەی کە دەزانن، بەڵام نابێت ئەم شتانە بنووسرێ، بەڵام باوەڕ بەخـەڵك

بهێنن تا باوەڕشی پێی هەبێ، ئەمەش خوێندن و فێرکردنی شەرعی نییە، واتە ئەوەی لەشوێنی خۆیدا وەك خۆی دانەنا ئەوا زوڵمی کرد و هەروا ئەوەی شاردیەوە لەخەڵك دیسان ئەمەش زوڵمی کردووە.

## سیستەمی گەردوون بەپێی بۆچوونی ئیبن رووشد و فەیلەسووفەکان

رێبازی خەڵکی دێرین (مەبەستی فەیلەسووفە دێرینەکانە) لێرەدا بنەماکانی تەنە ئاسمانییەکان و ئەو تەنە ئاسمانییانەی جوولە دەکەن و بۆ خودا ملکەچن، ئەم جوولانەش زیندوون بەپێی عەقڵ و بنەماکان دەجوولێن، ئەو بنەمایانەش ماددی نین، بەڵام بەپێی گەوهەر و عەقڵە ئینجا هەر ناوێکی دیکەی لێ دەنێیت.

ئەم بنەمایانەش لەبووندا جیاکاری تیایە و مەبەست لەمەش ماددەکان جۆراوجۆرن، کە پەیوەستە بەبنەمای یەکەم ئەگەریش وا نەبوایە ئەو سیستەمە بەو جۆرە بوونی نەدەبوو، ئەمەو فەیلەسووفەکان جوولەی یەکەم و بنەمای یەکەمیان بەخودای گەورە خستوویانەتە روو کە فەرمان بەسەر هەموو بنەماکانی دیکەدا دەکات، هەروا فەرمان بەسەر هەموو گەردوون و جوولەکان دەکات، بەو شێوەیەش زەوی و ئاسمان دامەزراوە، وایان چواندووە کاتێك پاشای شار فەرمان بەسەر شاردا دەسەپێنێ کە چەندان جۆر خەڵکی تیادا دەژیت، ئەم راسپاردە و ملکەچییە بۆ مرۆڤ، چونکە ئاژەڵێکی قسەکەرە.

## دەبڕینی دانا دێرینەکانی یۆنان و ئیبن رووشد

لەزۆربەی بابەتەکان ئیبن رووشد شەرمەزاری خۆی دەردەبڕێ کاتێك توێژینەوە لەهەندێك بابەتی ئیلاهی و فەلسەفی دەکات، بە یەکێك لەبابەتە گرنگەکانیشە،

دەیەوێ خۆی لێ دوور بخاتەوە، بەلاّم وەك لاسایكردنەوەی دێرینـەكان وەك لەسەر زمانی خۆی هاتووە بە تایبەتی لەلاپەڕەكانی ۱۲۱ی (تهافت التهافت) ئەو دەڵێت "خودا مافی خۆی لەوانە وەردەگرێتەوە كە باسی ئەو شـتانەیان كردووە و بەبێ زانست دەیەوێ قسە و وتەی سەیر و سەمەرە بڵێ بەرامبـەر بەخودا".

لەكۆتایی ئەم كتێبەدا دەڵێت :

"زۆر شتی لەو خراپترم بینیوە و خۆم لێی دوور خستۆتەوە و قسەم لەسـەر نەكردووە، پێویستیش ناكات داوای هەق بكەیت لەخاوەنەكەی، بۆیە قسـەم نەكردووە، (چونكە خودا زۆر بەباشی دەزانێ)".

## فراوانی زانستی فەلسەفەكەی

قسەكردن لەسەر سروشتی بوونێك كە هەیە، كەناویان ناوە هیۆلی

ئەبو حامیدی غەزالی قسەیەكی سەبارەت بە فەیلەسووفەكان وتووە كە كەسی دیكە نەیگوتووە بەتایبەتی ئـەو باسـانەی كـە پەیوەسـتن بـە ڕووداوەكـانی دەروون، ئیبن ڕووشدیش لەوەلاّمدا دەڵێت:

"كەسێكی وا ناناسم لە داناكـان كـە باسـی دەروونـی كردبـێ وەك ڕووداوێـك هاتبێتە كایەوە، تەنها ئیبن سینا باسی لەوە دەكات كە دەمێنێ، بەلاّم هەموو ئەوانی دیكە باس لەوە دەكەن ئەمە پەیوەنداره بە تواناكـان بۆیـە دەكـرێ پەیوەست بێ بەگەیاندن، وەك تواناكانی ئاوێنە كاتێك پەیوەندی بە تیشكی خۆر دەكات، ئەم توانایەش لەسروشتدا هاتووە وەك وێنەیەكی خراپە، بەلاّم ئەگەر ئەركۆمێنت و بەڵگەیان هێنایەوە كە ئەو توانایە سروشـتی نییـە واتـە

هیۆلی نییە، بەڵام ئەمە هەڵوێست نییە لەو شتانە، بەڵام بەپێی نووسینی نێو کتێبەکانیانە کە بەشێوەیەکی زۆر وەستا و ژیرانە نووسیوویانە.

## سەبارەت بە ڕۆژگار

لەو بابەتە گرنگانەیە کە بۆتە جێی بایەخی فەیلەسووفە دێرینەکان و لەمەوەش ئیبن ڕووشد زۆر بەروونی قسەدەکات و وەڵامی غەزالی دەداتەوە کە باسی لە ئەزلییەتی جیهان کردووە، ئەوە جگە لەوەی زۆرێك لە فەیلەسووفەکان و ئەهلی شەرع بە ئەرگۆمێنت باس لەئەزلییەت دەکەن، بۆ نموونە ئەبووهەزیلی عەلاف کۆکە لەتەك فەیلەسووفەکاندا واتە هەر ڕووداوێك پابەندبوونێکی تەواوە بە ڕووداوەکان، بەڵام سەبارەت بە ئەزلیبوونی جیهان پێچەوانەن، هەروا ئیبن ڕووشد وەڵامی دەداتەوە، کە جیهان لەڕووداوێك شتێکی بەسەردا هات، بەڵام ڕۆژگارەکان تەواوکاری شتێك نین.

بەڵام ئەگەر ڕۆژگار جیا بوو لەتەك شوێندا ئەمە جیایە لەگەڵ بوونی جوڵاو، چونکە بوونی جووڵە سەرەتایەکی نییە، چونکە فەیلەسووفەکان هیچ جووڵەیەکی بازنەیی دانانێن بۆ بوونی ڕابردووی کائینێك ، واتە ئەوەی چووە نێو ڕابردوودەچێتە نێو ڕۆژگارەوە کاتێکیش بچێتە نێو ڕۆژگار، ئەوا بەشێکە لەنێوەندی ڕۆژگاردا.

ئیبن ڕووشد ئەم تیۆرەی کردە قسەکردن بەوەی جیهان ئەزەلییە، هەروا ئەهلی شەرعیش هەمان بۆچوونیان هەیە، بەشێوەیەك مەبەستەکە هەڵەیە، بەڵام بەکردەیی ڕووداوێکە لەجیهان کاتێك ئەشعەرییەکانیش هەمان بۆچوونیان هەبوو، بەشێوەیەك ڕووداو و کردەکان سەرەتا و کۆتایی نییە، بۆیە لەلای

ئیسلام بارقورسی بوو کاتێك بڵێن خودا زۆر کۆنە، هەروا ئەوەش نازانن کە کۆن و دێرینەکان کێشەیەکیان هەیە.
شاراوەش نییە کە کۆنی جیهان، یەکەم بابەتە لەنێوان غەزالی و ئیبن رووشد و یەکەم بابەتیشە تیایدا فەیلەسووفەکانی پێ گومڕا دەکرێن.

## بەرگریکردنی ئیبن رووشد لە فەلسەفەکەی

ئیبن رووشد باس لەوە دەکات دەستی گەیشتووەتە ئەو بابەتە جوانانەی کە دانا و فەیلەسووفە ئیسلامییەکان نووسیویانە بەتایبەتی کاتێك وەڵامی هەندێك لەخاڵەکانی غەزالی دەداتەوە، مەبەستی لەمەش هەڵوەستەکردنە لەسەر هەق و راوەیتی، هەروا باس لە زانستەکانی دوو کۆمەڵە دەکات وەك: ئەهلی شەرع و دانایەکان، بۆ ئەمەش هەموو شتەکان دەگەڕێنێتەوە لای خودا.
"بەڵام فەیلەسووفەکان داوای زانیاری بوونەکانیان کردووە بەپێی عەقڵیان نەك یەکێك داوای پەسەندکردنی قسەکانی بکات بەبێ ئەرگومێنت و بەڵگە، لەوانەیە پێچەوانەی بوارە هەستیارەکان بکات، لەمەوەش چوار هۆکارەکەیان بەدەرخستووە، کە وێنە و ماددە و کردە و مەبەستە".
"هەروا مەبەستی کردەیی کە گالینۆس ناوی ناوە هێزی وێنەیی یان خالیق و دروستکەر، وەك ئەوەی ئامێرێك بێ یان خوداوەند کە هۆکاری کردەییە کە بۆ دەروون و وێنە و جووڵە شتێکی بەخشیوە، لێرەوە پشکنینیان بۆ ئاسمانەکان کردووە، بەڵام نەیانتوانی کۆك بن لەسەر بنەمایەك، پێیان وابوو کە تەنە هەستیارەکان تەنی ئاسمانین، بەتایبەتی لەشێك یان تەنێکیان بینیووە کە شێوەی لە ئاژەڵ دەچێ، کە یەك جووڵەی هەیە ئەمەش جووڵەیەکی رۆژانەیە، هەروا پێیان وابوو کە تەنە بازنەییەکان بە یەکتر بەستراونەتەوە و دەگەڕێنەوە

یەك لەش، هەروا هەموو جیهان دەگەڕێتەوە یەك سەرچاوە، ڕێکخستنەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمەکان و بوونی عەقڵیش لێرەدا زیاتر دەبێ کاتێك لێك دوور و نزیك بووەوە".

"یەکەم لەلای ئەوان جێگەی عەقڵ نییە، کە خودی عەقڵێکە بۆ هەموو بوونەکان، بەم پێوەرەش دەبێ لەچەمکی فەیلەسووفەکان تێبگەین، ئەمەش وایکرد کە بزاڤی موتەکەلیمەکان واتە موعتەزیلەکان و ئەشعەریەکان، بڕوایان بە بنەمای یەکەم بوو، بەواتایەك پێیانوایە لەشێوەی لەش نییە، واتە زیندووە و زانایە و تواناداره بەقسە و بەبینین".

"بە ئەرگۆمێنت ئەوەیان سەلماندووە هەموو هێزەکانی ئاژەڵی قسەکەر و هەموو هێزەکانی دیکە پەیوەندار بەو هێزە گەورەیە کە بنەمای یەکەمە، ئەگەریش ئەو نەبوایە ئەوا بەش بەش دەبوو".

"جیهان لەلای ئەوان لە شارێك دەچێ، وەك چۆن شار یەك سەرۆکی هەیە و لەتەك ئەمەشدا چەندان سەرکردەی دیکەش کاری خۆیان دەکەن، ئەمەش هەمان چەمکی جیهانە بۆ هەموو سەرکردەکان، بەڵام هەر هەموویان پەیوەندارن بەیەك سەرکردە، کە یەك هەڵوێستە لەنێوەندی ئەو هەموو سەرکردانە، بۆ ئەمەش زاڵە بەسەر هەموو کردەوەکان کە بنەمای یەکەمە، بنەمای هەموو بنەمایەکانە واتە ئەو کردە و وێنە و مەبەست و هەموو بوونەکان بۆ مەبەستی ئەو لەکاردان، لەپێناوی ئەویش هەموو بوونەکان هاتۆتە کایەوە، مرۆڤیش لێردە چەندان ئاواتی دیکەی هەیە".

## قسەکردن سەبارەت بە حەشرکردنی لەشەکان

غەزالی باس لەوە دەکات کە فەیلەسووفەکان نکۆڵی لە حەشری لەشەکان دەکەن، بەڵام ئەم شتە بوونی نییە و کەسێك نەهاتووە باس لەحەشرکردنی لەشەکان بکات، چونکە ئەمە لەنێوەندی شەریعەتەکان هەزاران ساڵە بوونی هەیە، یەکەم کەسانیش باسیان لەمە کردبێ پەیامبەرەکانی بەنی ئیسرائیل بوونە وەك مووسا، هەروا لەنێوەندی زەبووردا هاتووە لەتەك چەندان کتێبی دیکە کە بە کتێبی ئەوان ناسراوە، ئەمە لە تەورات و ئینجلدا باسی لێوە کراوە و سەلمێندراوە، دواتر ئەو قسەیە لەلایەن عیسا باس کراوە، ئەمەو ئەبو محەمەدی کوڕی حەزم باس لەوە دەکات کە ئەمانە کۆنترین شەرع و قسەی داناکانە، هەموویان پێیانوایە کە شەریعەتەکان لاسایی پەیامبەر و دانەرانی بنەماکان دەکەنەوە.

ئەوەی کە زۆر پێویستە ئەو بنەمایانە پێویستبوونی خۆیان دەخەنە روو و داوا لەخەڵك دەکەن کە کاری باش ئەنجام بدەن، هەموو ئەمانەش لەنێوەندی شەریعەتی ئیسلامیدا باس کراوە، کە پەیوەندارە بە نواندنی بوارە رووحییەکان.

## ئیبن رووشد و ئازادی هزر

مامۆستا لویجی ریناڵدی لەتوێژینەوەیەکی سەبارەت بە (مەدەنیەتی عەرەبی لە رۆژئاوا) دەڵێت :

"بەهۆی چاکەکانی عەرەب کە ئەوان زۆرێك لە فەیلەسووفەکانی یۆنانیان پێناساندین، هەروا دەستە سپییەکانیان

بوو کە گەشەی فەلسەفی مەسیحییان پێناساندین، ئەمەو ئیبن رووشد گەورەترین وەرگێڕ و شیکرەوەی تیۆرەکانی ئەرستۆتالیس بوو، شوێنێکی

بەرزی هەیە لەلایەن موسڵمانان و مەسیحییەکان بەیەك ئاست، لەلایەکی دیکەوە فەیلەسووفی نەسرانی تۆماس، تیۆرەکانی ئەرستۆتالیس خوێندۆتەوە کە لە شیکردنەوەی ئیبن رووشد بوو، ئەوەش لەبیر نەکەین کە ئیبن رووشد داهێنەری (هزری ئازاد)ە، ئەو ئەوینداری فەلسەفە و گرنگی بە زانست دەدا بەو هۆیەش قوتابیەکانی بەجۆش و خرۆشەوە فێر دەکرد، لەتەك ئەوەی لەسەرەمەرگدا وتەیەکی ناوداری گوتووە کە دەڵێت (رووحم دەمرێ بە مردنی فەلسەفە) لەپێش تۆماسیش، هزرمەندی ئینگلیزی جۆن رۆبرتسۆن لە کتێبی (مێژوویەکی تێروتەسەل بۆ هزری ئازاد) (بەرگی ١ لا ٢٧٧) دەڵێت :

ئیبن رووشد ناودارترین هزرمەندی موسڵمانە، چونکە ئەو مەزنترین هزرمەند بووە لەنێوەندی موسڵمانان و ناودارە بووە لەنێوەندی هزری ئەورووپی، شیکردنەوەکەی بۆ ئەرستۆ زۆر باڵا و نموونەییە، لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، بەهۆی ئەویشەوە رێبازی سیانتزم هاتە ئارا، کە پشتگیری لە بۆچوونی ئەزەلیەتی گەردوونی ماددی دەکات، هەروا باسیش لەوە دەکات کە دەروونی جیا لەنێوەندی دەروونی گشتییەوە دێتە ئارا، دواتر دەگەڕێتەوە و پەرش و بڵاوەی لێدەکات، دیارە ئەم رێبازەی ئبن رووشد دەستێکی باڵای هەیە لەنێوەندی هزری ئیسلامی و مەسیحی.

دیارە ئەمەش لەیەکجیاکردنەوەی پاکی و تەسەووفی ئیبن باجە و ئیبن توفەیلە و لەتەك ئەوەی دژایەتی غەزالی کردووە لە بۆچوونە ئایینیەکانیدا، بەهۆی کتێبی (تهافت التهافت) وەڵامی (تهافت الفلاسفه)ی غەزالی داوەتەوە، لەلایەکی دیکەوە بابەتی (بژاردە)ی خستۆتە روو بەشێوەیەك زانستییە و بەرهەڵستی رێبازی موتەکەلیمەکانی کردووە، چونکە ئەوان گوتوویانە کە ئیرادەی خودا

پێوەری هەق و جگە لەو پێوەرەش هیچ پێوەرێکی دیکە نییە، لەتەك ئەوەی ئیبن رووشد بەرهەڵستی قەدەریەکان بۆتەوە.

ئیبن رووشد درکی بەوە کردووە کە جیاکاریەك لەنێوان رێبازەکەی و رێبازەباوەکان هەیە، لەتەك ئەوەی زۆر شتی دانەمێناوە، بەڵکوو لەهەندێك خاڵدا ویستوویەتی ئەهلی شەریعەت رازی بکات بەمەیش توانیویەتی زیاتر سینگ فراوانتر بێ لە ئیبن توفەیل، گوتوویەتی ئیسلام چاکسازی کردووەتە نێو سیستەمی نەتەوەیی و گەلانی بەرەو چاکسازی بردووە، کە زۆر بەروونی راستییەکانی زانست و فەلسەفە و ئایینی روون کردووەتووە، ئەو رێبازەش بۆ ماوەی چەند سەدەیەك گرنگ بووە لە توێژینەوەکانی نەسرانی.

لەنێوەندی کتێبی (فصل المقال) و (منهاج الادلە) وەك کەسێکی پارێزراو لەسەر باوەڕەکان قسەی کردووە، خۆی لەپەنای بوارەکانی شەرعدا شاردووەتەوە و گوتوویەتی کەسی عاقڵ هیچ وشەیەك سەبارەت بە باوەڕی باو نابێ قسە بکات، هەروا کەسی گومڕا کە تانە لەئایین دەدا موستەهەقی مردنە، چونکە کیانی چاکسازی نەتەوەیی دەڕووخێنێ، باسی لەوەش کردووە کە ئەو باوەڕدارە بەزانستەکەی ئەگەر وانەبێ دەبێتە کەسێکی زەندیق.

"بەڵام ئیبن رووشد لەسەدەی رووخانی ماریفەتدا بووە، لەتەك ئەوەی لەو سەردەمە دەمارگیری گەشەی دەکرد، بۆیە سوودی نەبووە کاتێك خۆی بە باوەڕ و باوەڕداری خەریك کردووە، بۆیە خەلیفە زەفەری پێ بردووە و تاوانێکی بۆ رێکدەخەن، هەموو کتێبەکانی دەدڕێن کە پێشتر ئیبن رووشد بەدوایدا دەگەڕا، سەیرکردنی بیروبۆچوونی دێرینەکانی لێ قەدەغە کرا و هەروا نەدەبوایە سەیری کتێبەکانی یۆنان بکات، هاوکات ئیبن رووشد لەساڵی ١١٩٨ز لە مەراکیش کۆچیدوایی کرد، لەپاشانیشدا ئەستێرەی ئیسلام زۆری نەبرد لە

ئەندەلووس کوژایەوە، بەمەش ئاین شوێنی فەلسەفەی گرتەوە و ئەندەلووس بوو بەکەشێکی ئیمانداری... !

ئەمە ئەم وێنەیە کە جۆن رۆبرتسۆن کێشاویەتی سەبارەت بە ئازادەکانی بواری هزر، کە سەرۆکەکەیان برادلو بوو لە یەکێك لەدوورگەکانی بەریتانیا، لەلایەکی دیکەوەش رێنان خۆی تەرخان کرد بۆ خوێندنەوەی ئیبن رووشد، باسی لەوە کردووە کە دوژمنکاری خەڵکی ئەندەلووس دژ بە فەلسەفە زۆر بەهێز بووە، بەڵام گلەییەکە زیاتر دەکەوێتە سەر رەگەزی مەسیحییەکان کە سەرکەوتن لەتەك ئەوەی لەرەچەڵەکدا دانیشتوویی ئەو وڵاتە بوون، کە لەدێرزەمانەوە دەمارگیری ئاین بوون و دژایەتی زانستەکانیان دەکرد وەك گەردوون و سروشتزانی (لا ٢١-٢٦).

ئێمەیش وای دەبینین کە بۆچوونی رێنان گرنگە و ئێمەش بۆی زیاد دەکەین بەوەی ئەوەی بەسەر ئیبن رووشد و هاوەڵەکانی داهاتبوو شێوەیەکی ئاکاری خەڵکی ئیسپانیا بووە، چونکە کەسانی وەك ئەو لەرۆژهەڵات تووشی هیچ ئازارێك نەبوونەوە، لەتەك ئەوەی ئیسلام هیچ شتێکی بەرامبەر کیندی و فارابی و ئیبن سینا نەکردووە.

## جوولەکە و ئیبن رووشد

چاکەکاری سەرەکی بۆ بڵاوبوونەوەی زانستەکانی ئیسلام و عەرەب، جوولەکەکان بوو، کە چەوساندنەوەیان دژ ئەنجامدراوە و دەرکراون لە ئیسپانیا، لەپاشاندا پەنایان بردووەتە باشووری فەرەنسا و لە ویلایەتی برۆنسەدا نیشتەجێ بوون و لەوێدا نووسینگە و قوتابخانەیان لە ناربۆن و بزییرس و نیم کاراسکۆن و مۆنپلیە دروست کردووە، ئەمەو کۆلێژی مۆنپلیە

پزیشکی و رووەکیان لەسەر دەستی موسڵمانان فێر بوونە، ئەویش وەك ئەوەی ویلایەتێکی ئیسلامی بێ، لەقوتابخانەکانی فەلسەفەی ئیبن رووشد خوێندراوە و شیکردنەوەکانی ئەزبەر کراوە، لەتەك فەلسەفەی ئیبن رووشد، فەلسەفەی ئیبن مەیموونی دانای ئیسرائیلییان خوێندراوە.

فەلسەفەی ئەرستۆ بەوە دەناسرێتەوە کە پشتگیری لە عەقڵی مرۆڤایەتی دەکات ئەمەش بۆچوونی ئەزلیەتی ماددەیە، ئیبن رووشد وەریگرتووە و لەپاشاندا موعتەزیلە بەبۆچوونی خۆیانیان زانیووە، وەك دەڵێن فەلسەفەی ئیبن مەیموون لەباوەشی ئیبن رووشدا ژیاوە، بەلام لیڤی کوڕی جرشوم لەتەك ئەزلیەتی ماددەدا نەبووە، ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی راستی خۆشدەوێ، بەڵکوو بەهۆی خۆشەویستی بووە بۆ تەورات.

بەلام بەهۆی ئیبن مەیموونەوە و هاوڕێ و قوتابییەکانی، فەلسەفەکەی ئیبن رووشد کراوە بە عیبرانی و لاتینی، لەتەك ئەوەی ویستوویانە گۆڕانکاری تیادا بکەن تا کتێبەکە ببێتە کتێبی یەکەم، لەنێوەندی پەرستگەکانیان لەپاش کتێبە پیرۆزەکانیان، بەلام ئەم هەوڵە شکستی خوارد، چونکە جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان (سفری تکوین) و فەلسەفەی ئیبن رووشد!

## بەرهەمی فەلسەفەی ئیبن رووشد لە ئەورووپا

لەکۆتایی سەدەی دوانزدەهەم لە هەرێمی بریتانیای فەرەنسا، هزرمەندێکی چاکساز بەناوی ئامۆری بنیاوی و هاوڕێکەی داود دنیانتی ئەوانە پێچەوانەی کڵێسا جووڵانەوە ئەمەش وای کرد خەڵکێکی زۆر لەدژی کۆبنەوە و هەردووکیان بە زیندوویتی بسووتێنن، ئەوان داوای رزگاربوونیان دەکرد، بەلاتی دەستی کڵێسا لەسەدەکانی ناوەڕاست زۆر درێژ بوو، بۆیە کڵێسا ئەوانی سووتاند و

لەنێو گۆڕیشدا خۆڵەمێشەکەیان پەرت و بڵاو کرد تا ببێتە پەندێك بۆ باوەڕداران.

کڵێسا ئەو کات بۆی دەرکەوت کە هۆکاری ئەو بەڵایە فەلسەفەی ئەرستۆیە، وەك چۆن ئیبن رووشد شیکردووەتەوە، ئەمەو لە پاریسدا لەساڵی ١٢٠٩ز کۆڕبەندێکی ئایینیان ئەنجامدا، لەوێدا خوێندنی فەلسەفەی ئەرستۆ و شیکردنەوەکانی ئیبن رووشد قەدەغە کران، سەرەتا سروشتزانی قەدەغە کرا، دواتر ئەو دیوسروشت، ئەم قەدەغەکردنەش سی ساڵی خایاند، هەروا لەساڵی ١٢٦٩ز ئەسقفی پاریس هەڵمەتێکی گەورەی دژ بە فەلسەفە هێنا ئاراوە، بەتایبەتی سەبارەت بەکەسایەتی ئیبن رووشد و نەفرەتی لەو بنەمایانە کرد:

١- ئەزلییەتی جیهان

٢- نکۆڵیکردنی ئادەم

٣- یەکەی عەقڵی مرۆڤایەتی

٤- ئەگەر قسەی ئەوە بکرێ کە عەقڵ شێوەیەکی مرۆڤایەتییە، هەر ئەو خودە جەستە بەرەو رووخان دەبات

٥- ئەگەر بڵێن کردەکانی مرۆڤ لەدەرەوەی دەسەڵاتی خودایە.

٦- خودا ناتوانێ بە نەمریی بتهێڵێتەوە و ئەوی بەرەو نەمان رۆیشت و خراپەکار بوو ناتوانی چاکی بکاتەوە

کاتێك ئیبن رووشد لەسەرپزیشکیی نووسی لە باشووری فەرەنسا و باکووری ئیتاڵیا بڵاوبۆوە و لەتەك ناوداری لەقوتابخانەکان فەلسەفەکەشی ناودار بوو و لەسەر دەستی ئەو فێری ئازادی هزر بوون، وەك جاتیاد سیناوی کە زانای ئەو وڵاتە بوو دەستی بەخوێندی شیکردنەوە مەزنەکە کرد ئەمەش لەساڵی ١٤٣٦ و داوای کرد چاپ بکرێ بەڵام نەیتوانی، لەدواتردا لەساڵی ١٤٧٦ چاپکرا، لەپاش

ئەمەشدا دەستکرا بە فەلسەفەی سینکۆڤرنیاس، ئەوان (رووحی جیهان)یان خوێند ئەمەش هیچ جۆرە بەرهەڵستیەکی لێ نەهاتە ئاراوە چونکە هیچ پێچەوانەی ئایینی مەسیحیی نەبوو، هەروا دژایەتی ئەو قوتابیانەیان دەکرد کە باسی عەقڵیان دەکرد.

هەروا ئیبن رووشد هۆیەك بووە بۆ خستنەڕووی بابەتەکان بۆ رۆجێرس بیکۆنی فەیلەسووف و زۆر سوودی لە کتێبەکانی وەرگرتووە، ئەمەو لەکتێبی (ئایوس ماجۆس) کە بە لاتینیی نووسراوە، زۆر بەجوانی باسی کردووە و هەر ئەویش بوو زۆرێك لەتارماییەکانی لەسەر کتێبەکانی لابردووە.

هەروا تۆماس ئاکویناسی ناودار (١٢٢٥-١٢٧٤) لەدواتردا بوو بە قەشەیەکی گەورەی لاهووتی لە کڵێساکانی رۆژئاوا و گەورەترین فەیلەسووفی سەدەکانی ناوەڕاست، هاوکات بە کتێبی (سۆماتیولۆجیا) ئەستێرەی درەوشاوە بوو، کە لەوێدا وەسفی خودای کردووە بە سروشتێکی کارا.

بۆ ئەمەیش تۆماسی قەشە هۆکاری ئەوەی دەرخستووە، کە چۆن پەیوەندی بەبیرۆکەی ئایینی کردووە و ئەوەشی خستووەتە ڕوو کە دانانی کتێبەکەی زیاتر دەگەڕێنەوە بۆ ئیبن رووشد و فەلسەفەکەی، هەروا ئەزلیەتی ماددەی خستووەتە ڕوو، بەپێی ئەرگومێنتی ئیبن رووشد و ئەرستۆ.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن رووشد نەیتوانی رزگاری بێ لە زمانی پیاوانی کڵێسا، بۆیە هەردەم دەیانگوت ئەو سەگە دژ بە ڕێنوێنیەکانی کڵێسا و کاسۆلیکە، هاوکات بەو جۆرەش دانتی لەدانیشتنەکانی بەدۆزەخی ناودەبرا بەهۆی گومڕا بوونی.

لەپێناو ئیبن رووشد یەکێکی دیکە بەناوی هرمان ڤان ئەشکەنجە درا، بەتۆمەتی هەرتەقە لە دادگەی لاهای ١٥١٢، ئەوەی سەیرە ئەو دانایە پێش ئەوەی

بگەڕێتەوە قازی بوو لە دادگەی پشکنین، کەس وەك ئەو بەرگری لە ئایینی مەسیحی نەدەکرد، بەڵام کاتێك بەزمانی خۆی گوتی "نیگەرانم لە هەموو سیفەتە شەرعییەکان و لەتەك ئەوەی عەقڵم تێکنەچووە"، ئەمەو لە ئەنجوومەنی پشکنین کە لەساڵی ١٥٠٢ دادگایی کرا و دادگا گوتی "جیهان ئەزەلییە، بەڵام وەك ئەوە نییە کە ئەو شێتە دەیڵێ! دەڵێ دۆزەخ نییە و ژیانی داهاتوو نییە و مەسیحیش کوڕی خودا نەبووە، من بە مەسیحی لەدایکبووم، بەڵام ئێستا من لەئێوە نیم، چونکە ئێوە شێتن". بۆیە زیندانی هەتاهەتایی کرا.

لەپاشاند دوای دە ساڵ دووبارە دادگایی کرایەوە و وایانزانی بەندینخانە توانیویەتی بیڕوخێنێ، بەڵام بینیان زۆر بەهێزترە، بۆیە بڕیاریان دا بیسووتێنن، ئەمەو لە ١٤ی دیسەمبەری ساڵی ١٥١٢ سووتاندیان، ئەو لەو ڕۆژەدا ڕستەیەکی گوت کە تیایدا هاتبوو "دەزانم زانایان ئەرستۆ و شیکەرەوەکەی کە ئیبن ڕووشد ئەوان نزیکترن لەراستی، بۆیە بەهۆی ئەوان گەڕامەوە بۆ ڕووناکی کە پێشتر کوێر بووم".

بەمەیش ئەوەی سەلماند، کە ئیبن ڕووشد بنەما و ململانێیە، چونکە بەهۆی ئەو و لەپێناو هزرەکەی ئەشکەنجە درا.

# ٨-ئیبن خەلدوون

ئیبن خەلدوون یەکێکە لەمەزنترین فەیلەسووفەکانی رۆژهەلات و رۆژئاوا، لە سالی ٧٣٢ك لە توونس لەدایك بووە و لەسالی ٨٠٨ك لە میسر کۆچیدوایی کردووە و یەکێکە لە پیاوە مەزنەکانی سەدەی هەشتەمی کۆچی، ناوی تەواوی ئەبوزێد عەبدولڕەحمان کوڕی محەمەد کوڕی محەمەدی کوڕی خەلدوون وەلی دینی تونسی خەزرەمی ئەشبیلی مالیکییە، رەچەلکی دەگەڕێتەوە بۆ سەر خانەوادەیەکی ئەندەلوسی کە لە ئیشبیلییە نیشتەجێ بوونە، دواتر باب و باپیرانی کۆچیان بۆ توونس کردووە ئەمەش لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی کۆچیدا بووە. ئەمەو باب و باپیرانی رەچەلەکیان دەگەڕێتەوە بۆ بەنی وائیل لەهۆزەکانی یەمەن و باس لەوە دەکرێ کە باپیرە گەورەی لەیەمەنەوە چووەتە ئەندەلووس، واتە: لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە.

ئیبن خەلدوون لە توونس لەدایك بووە و لەوێدا زانست و زانیاری سەردەمی خۆی وەرگرتووە، دواتر توونسی جێهێشتووە بەهۆی بلاوبوونەوەی نەخۆشی و چووەتە هەوارە و چووەتە نێو خانەوادەی ئیبن عەبدون، ئەویش زۆر رێزی

لێناوە و گرنگی پێداوە، سواری یەکێك لەکەشتییەکانی کردووە تا بچێتە وڵاتی مەغریب، لەتافی لاوەیەتیدا زۆر وڵات گەڕاوە هاوشێوەی ئیبن بەتووتە، دواتر لەلای سوڵتان (ئەبووعەنان مەرینی) کاری کردووە کە خاوەنی تلمسان تا فاس بووە.ساڵی ٧٥٥ك، لەسەرەتای تەمەنی سی ساڵەی دوای ئەوەی کاریگەری هەبووە لە دەربـاری سـوڵتاندا زۆر کەسـی ئـەرێزەیی پـێ بـردووە، بۆیـە تۆمەتباریان کرد بەوەی دەیەوێ سوڵتان بکوژێ ئەمەش وایکرد دەسـتگیر بکرێ، تا ئەو کاتەی سوڵتان ئەبووعەنانی مەرینی خاوەنی تلسمان کۆچیدوایی کرد لەساڵی ٧٥٩ك، لەپاشاندا لەلایەن وەزیر ئیبن عومەر ئازاد کرا و گرنگی پێدرا.

لەو ماوەیەدا باس لەوە کراوە کە سوڵتان ئەبووسالم سالمی مەرینی دەیەوێ لەئەندەلووسەوە بەرەو مەککە بڕوا، بۆیە پشتی بە ئیبن خەلـدوون بەسـت، چـونکە لـەنێوان ئـەو و شـێخەکانی خانـەوادەی مـەرینی دڵسـۆزی و رێـز و خۆشەویستی هەبوو، دیارە ئیبن خەلدوونیش لەو کارە سەرکەوتوو دەبێ.

بەڵام خەتیب ئیبن مەرزووق بەهۆی فرت و فێڵەکانی توانی ئارەزووی سوڵتان بگۆڕێ و نەیویست ئیبن خەلدوون لەو کارە دەستی هەبێ و ئەمەش هۆیەك بوو تا سوڵتان چەند کەسێکی پیاوانی دەوڵەت لەگەڵ خۆیدا ببات، بەڵام دوای ئەوە ئیبن مەرزووق کۆچیدوایی کرد، دووبارە ئەستێرەی ئیبن خەلدوون درەوشایەوە دیارە ئەمەش بەهۆی وەزیر عومەری کوڕی عەبدوڵلا، لەپاشاندا ئیبن خەلدوون ویستی بەرەو ئەندەلووس بچێ، بـەڵام ئـیبن عومـەر وەزیـر نەیهێشـت دوای داواکردنێکی زۆر وەزیر رێگەی پێدا ئەمەو لەساڵی ٧٦٤ك بەرەو ئەندەلووس رۆیشـت و چـووە غەرناتـە، لەوێـدا سـەردانی سـوڵتان ئەبووعەبـدوڵلا کـە

لەخانەوادەی ئەحمەر بوو زۆر گرنگی پێدا و لەیەکێك لە کۆشکەکانی خانوویەکی پێ بەخشی.

هەروا لەساڵی ٧٦٥ك بەرەو کاستێل (قشتاله) چوو و چووە لای دەسەلاتدارەکەی تا ببێتە نێوەندی لە رێکەوتنی نیوان ئەو سولتانە و پاشاکانی (عەدوە) لەپاش پێدانی دیاریەکی بەنرخ، خاوەنی قشتاله داوای لێکرد لەوێدا بمینێتەوە بەلام ئەو داوای لێبوردنی کرد ئەویش بەهۆی ئەو کارەی بارێك زێڕی پێبەخشی، کاتێك ئیبن خەلدوون گەڕایەوە غەرناتە ئەسپ و بارەکەی پێشکەش بە سولتان ئەبووعەبدوللا کرد، سولتانیش زۆر بەخۆشییەوە پێشوازی لێکرد، دوای ئەوە ئیبن خەلدوون سۆزی هەستا تا بگەڕێتەوە لای خزم و کەسانی و نیشتمانەکەی، دوای ئەوە چووە (بجایە) سولتانیش نازناوی ئەبووعەبدوللای پێبەخشی، بەمەیش هەموو خەڵکی بەخۆشییەوە پێشوازییان لەمە کرد، لەپاشاندا سولتان زۆربەی کاروبارەکانی دەوڵەتەکەی خستە ژێر دەستی، ئەویش زۆر بە دڵسۆزی ئەو کارانەی کرد کە پێی سپێردرابوون.

بەلام ئەبووعەباسی میری قەسنتینە شمشێری شەڕی دژی بەرزکردەوە دژ ئەبووعەبدوللای خاوەنی بجایە بەمەیش ئەو وڵاتە بەرەو پشێوی هەنگاوی نا، لەپێش هەمووان ئیبن خەلدوون رەزامەندی ئەبووعەباسی وەرگرت، بەلام لەدواتردا قسەی خراپی زۆر دەرهەق کرا لەلای ئەبووعەباس، بۆیە ئەویش داوای کرد دەست لەکار بکشێتەوە، دواتر ئیبن خەلدوون ڕووی لە هۆزەکانی عەرەب کرد.

لەپاشاندا ئەبووحمو خاوەنی تلمسان داوای کرد کار بکات لەگەڵیدا و پۆستی گەورە ئەمینداری پێبەخشی، بەلام ئەو داوای لێبوردنی کرد، چونکە زانستی پێباشتر بوو لەسیاسەت، بۆیە ویستی لە ئەندەلووس بچێتە دەرەوە، داوای لە

ئەبووحەمو کرد تا ڕێگەی بدا بڕوا، ئەویش نامەیەکی پێدا تا بیداتە ئیبن ئەحمەر، بەڵام نەیتوانی سواری کەشتی ببێ، کاتێك سوڵتان عەبدولعەزیز ئەو هەواڵەی بیست فرمێسك لەچاوانی هاتە خوار، هەروا ئەو هەواڵەی بەراست نەدەزانی، بەڵام پشتگیری لێ کرد تا لە بجایە بمێنێتەوە، ئەمەو ئیبن خەلدوون لە تلمسان مایەوە لەگەڵ خزم و کەسان و کوڕەکەی و لە قەڵای بەنی سەلامە لە وڵاتی (بنی تۆجین) چوار ساڵ مایەوە.

لەو ماوەیەدا دەستی بەنووسنی مێژوو کرد و لەوێدا(مقدمە)کەی تەواو کرد، بەشێك لە دەروازەکانی مێژووی نووسیوە، ئەو کات تەمەنی هەشتا ساڵ بوو لەسەدەی هەشتەمی کۆچیدا.

ئەمجارەیان ئیبن خەلدوون سۆزی بۆ توونس هاتە جوڵاو داوای ئیزنی کرد تا ڕێگەی پێ بدرێ و ئەمە لەساڵی ٧٨٠ك بەرەو ئەو وڵاتە ڕۆیشت، سوڵتان ڕێگەی پێدا و هەموو نهێنیەکانی پێگوت و ئەویش هانی دا تا بەردەوام لە نووسینەکانی لەرووی مێژووییەوە و دواتر چوو بۆ ئەسکەندەریە و لەساڵی ٧٨٤ك گەیشتە ئەوەێ و دواتر چوو بۆ قاهیرە و لەئەزهەر دەستی بەخوێندن کرد، لەوێدا فیقهی مالیکی خوێند، ئەم هەواڵە گەیشتە سوڵتان و داوای لێکرد لێی نزیك بێتەوە و ئەمەو لەساڵی ٧٨٦ك کرا بەقازی و کارەکەی بە جوانترین شێواز ئەنجام دا، ئەمەو ئیبن خەلدوون بە زانا و دانا و قازی و مێژوونووس و ئەدیب ناوی دەرکردبوو، بەڵام ئەوانەی کە دژی دەوەستان هەردەم شتیان بۆ هەڵدەبەستا.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن خەلدوون دەیویست کەسانی نزیکی خۆی و کوڕەکەی لێی نزیك بن بۆیە داوای لێکردن لەتوونسەوە بێن بۆ قاهیرە، بەڵام ئەمە بووە هۆیەك ئەو خانەوادەیە لەڕێگەدا لێك دابڕێن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەو

فەیلەسووفە تووشی خەم و ئازارێکی زۆر بێ و لەمەوەش لە پۆستی قازی دەستی کێشایەوە و وازی لە وانە گوتنەوە و نووسین هێنا، بەمشێوەیە سێ ساڵ مایەوە، ئەمەو لەساڵی ۷۸۹ك لەقاهیرە چووە دەرەوە تا بڕوات بۆ حیجاز بۆ ئەوەی حەج بکات، لەدوای ساڵێکدا گەڕایەوە میسر، دووبارە دەستی بەنووسین کردەوە لەساڵی ۷۹۷ك تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو، بۆ ماوەی پانزدە ساڵ خەریکی نووسین بوو.

ئیبن خەلدوون لەمیسر مایەوە کە پەناگەیەك بوو بۆ زانست و ئەدەب هەر لە دێرزەمانەوە. لەساڵی ۸۰۸ك کۆچی دوایی کرد، لەیەکێك لەگۆڕستانەکان نێژرا، کە کەس نازانێ لەکامە گۆڕستانە.

## نووسینەکانی ئیبن خەلدوون

### ١-مێژووی ئیبن خەلدوون

ئیبن خەلدوون لەنێوەندی زانا و هزرمەندان بەتەنها کتێبێك ناودار بووە یان بەبەشێکی کتێبێك کە (مقدمە ابن خلدون)ە، بەلام لە ڕووی مێژووییەوە بەچەندان بابەت ناوی دەرکردووە، وەك: (العبر، دیوان المبتدا و الخبر، في الایام العرب و العجم و البربر، ومن عاشرهم من ذوی سلطان الاکبر) .

ئەو کتێبەش دابەشکراوە بۆ سێ کتێب لە حەوت بەرگدا

**کتێبی یەکەم:**

سەبارەت بە ئاوەدانکردنەوە کە تیایدا باس لەو بەرهەڵستیانە دەکات لەنێوان خۆیی و پاشا و سوڵتان و بژێوی ژیان و پیشەسازی و زانست لەتەك چەند کێشە و هۆکار، ئەم کتێبە پێشەکیەکی ناودارە و خۆی لە چوارسەد لاپەڕە

دەدا، تیایدا ئیبن خەلدوون شکۆدار بووە پێی، چونکە تیایدا چەندان توێژینەوەی نوێی بەدیدەکرێ، لەو سەردەمەشدا ناو نراوە زانستەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری سیاسی و ئابووری کۆمەڵایەتی و فەلسەفەی مێژوو و یاسای گشتی، بێگومان ئێستاش لەم بوارانە (هێگل)ی ئەڵمانی و (میکافیلی)ی ئیتالی و (جیبۆن)ی ئینگلیزی قوتابی ئیبن خەلدوونن.

ئەو فەیلەسووفە ئیسلامییە کە لەسەدەی هەشتەمی کۆچیدا ژیاوە (سەدەی چواردەمی زایینی) لەنێوەندی ئەو توێژینەوانەدا زۆر شتی بەدەر خستووە لەکاتێکدا ئەورووپا ئاگاداری ئەو شتانە نەبوون، بێگومان ئاوارە بوون و نامۆ بوونی لەو وڵاتە بۆ چەندان وڵاتی دیکە و گەڕانی لە دەوڵەتێکەوە بۆ سەڵتەنەیەك و لە ئیمارەتەوە بۆ دەربار و تیکەڵبوونی بەچەندان نەتەوە و کارکردنی لەچەند بوارێکی ئەو دەوڵەتانە هۆکارێك بووە بۆ دەوڵەمەندی توێژینەوەکانە، بێگومانیش بیرۆکەکە پێشتر لەسەریدا هەبووە بۆیە لەگەڕاندا بەردەوامبووە تا ئەو کاتەی نووسینەکانی لە دایك بوون.

أ-قسەکردن لەسەر پێشەکی (مقدمە)ی ئیبن خەلدوون

بەشی یەکەم باس لەئاوەدانکردنەوە زەوی دەکات کاتێك زەوی لەچەندان هەرێم پێك دێ و کاریگەری هەوا و رەنگی مرۆڤەکان و ئاکاریان و جیاوازی دۆخی ئاوەدانکردنەوە لە بەپیتی و برسیتیدا، هەموو ئەمانەش کاریگەری دەبێ لەسەر مرۆڤ و رەوشتی.

ئەم توێژینەوە زیاتر بە توێژینەوەی زانا ئەورووپاییەکان دەچێ کە باس لەتیۆری گەشە و پەرەپێدان دەکەن، بەڵام ئیبن خەلدوون پێنج سەدە لەپێش ئەوانەوەیە.

بەشی دووەم ئاوەدانکردنەوەی رەوەندەکان لەنێوەندی نەتەوە دڕندە و هۆزەکاندا، ئەمەش وەك بەراوردکردنی سروشتی رەوەند و شارستانیەتە، جیاوازی نیوانیشیان دەرماگیرییە و سەرکایەتیە ئەمەش بەپێی پێوەری پاشا و سیاسەتە.
ئەم توێژینەوەیە بنەمایەکی گشتییە بۆ سیستەمی کۆمەلایەتی کە لەئەورووپادا لەسەدەی نۆزدەهەم هاتە ئارا و هاوسەردەمەکانیش پێی دەلێن (سۆسیۆلۆژیا).
بەشی سێیەم سەبارەت بە دەولەتە لەرووی پاشا و خەلافەت و ریزبەندییەکانی سولتانە، لەوێدا هەموو هۆکارەکانی سەروەری و هاتنە کایەوەی ولاتانی باسکردووە لەتەك ئەوەی ئیمارەت چۆن خۆی دەپارێزێ لەنێوەندی دەسەلات و خەلافەت و شێوازەکانی پاشا و مانای بەیعە بەخشین و ویلایەتی عەهد و ریزبەند سولتانی و دیوانەکانی دەولەت و سەرباز و کەشتی و هێماکانی و بنەمای سەرباز و جەنگ و هۆکارەکانی چەسپاندنی دەولەت و رووخانی لەهەموو روویەکەوە خستۆتە روو.
ئەم توێژینەویە جۆرێکە لەسیاسەت بەشێوە پراکتیك و زانستیەکەی، ئەمەو (جیبۆن)ی مێژوونووسی ئینگلیزی کتێبێکی سەبارەت بە رووخانی دەولەتی رۆمانی نووسیوە تا ئەو کاتەی دەرووخێ هەمان رێرەوی گرتووەتە بەر کە ئیبن خەلدوون کێشاویەتی لە پێشەکیەکەیدا.
لەبەشی پێنجەمدا باس لە ولات و شار و ئاوەدانکردنەوەکان دەکات، لەتەك ئەو شارانەی کە سەر بەدەولەتن یان بەتەنها دەولەتن، کە دەبێ بەهەموو شێوەیەك ئاگاداری بیت لەرووی دەریا و وشکانی و دورستکردنی مزگەوت و خانووەکان و

گەڕاندنەوەیان بۆ ڕەچەڵەکی ئیسلامی، ئەم توێژینەوەیە لەنێوەندی ئەندازەی جەنگدا خۆی دەبینێتەوە.
بەشی پێنجەم باس لە بژێویی دەکات کە پیشەسازی و بژێوی ژیانی تیادا پەیدا دەکرێ، کە بەهای کاری مرۆڤایەتییە، لەتەک ئەمەشدا باس لەبژێویی و جۆرەکانی دەکات بەپێی سروشتی ئاوەدانکردنەوەکان، لەلایەکی دیکەوە باس لە دەروازەکانی بژێویی دەکات چ لەرووی بازرگانی یان پیشەسازی و بەهەموو جۆرەکانیەوە، هاوکات باس لەو پیشەسازیانە دەکات کەلەسەردەمی ئەودا هەبوون وەك کشتوکاڵ و تەلارسازی و رستن وچنین و پزیشکی و گۆرانی گوتن.
ئەم توێژینەوەیە ئێستا پێی دەگوترێ ئابووری سیاسی و ئابووری کۆمەڵایەتی، زۆربەی ئەو بنەمایانە بووەتە باسی سەرەکی تۆمارەکانی (کارل مارکس)ی ئیسرائیلی ئەڵمانی لە کتێبی (سەرمایە) (Das capital) .
بەشی شەشەم باس لەزانست و جۆرەکانی و چۆنیەتی فێرکردن لەهەموو روویەکەوە دەکات، هەروا چەند توێژینەوەیەکی تیایە دەیگەڕێنێتەوە بۆ شارستانیەت و قسەکردن لەسەر مێژوو و مەرجەکانی زانستی قورئان و فەرموودە و فیقە و زانستە زارەکییەکان و سروشتی و ماتماتیك و پزیشکی و ئەدەب و شیعر و مێژوو و ئیلاهیات و دەروونناسی و ئەستێرەناسی و زانستە جەنگییەکان.
ئەم بەشە لەرووی پەروەردەییەوەیە، کە گەورەپیاوانی ئەمریکا وەك ولیەم جێمس و لەئەوروپا (سپنسر) و(فرۆبیل) سوودیان لێ وەرگرتووە.
شێوازی ئیبن خەلدوون لەم توێژینەوەیەدا
ئەم پێشەکییە کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەلای هزرمەندانی ئەفرەنج بۆ ئەمەش پرۆفیسۆر (کاترمیر) گۆڕیویەتی بۆ زمانی فەرەنسی و دانەیەکی لەکتێبخانەی

پاریسدا هەیە، ئەمەو لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کراوەتە فەرەنسی دواتریش کراوەتە ئینگلیزی و ئەڵمانی و ئیتاڵی و تورکی، لەهەموو کتێبخانەکانی ئەورووپا بەچاپکراویی و دەستنووس بەرچاو دەکەوێ.

ب-قسەکردن لەسەر مێژووی ئیبن خەلدوون

سەبارەت بەمێژووەکەی خۆی لەدوو کتێبدا دەنوێنێ کە کتێبی دووەم و سێیەمە و لەشەش بەرگدایە، کتێبی دووەمیش باس لەمێژووی عەرەب و دەوڵەت ونەوەکانی دەکات هەر لەهاتنەکایەوە تا سەدەی هەشتەمی کۆچی، ئەو سەردەمەیش مێژوونووسی تیادا ژیاوە، کە لەتەك گەلانی دیکەدا ژیاون وەك فارس و هیند و نەبەت و حەبەشە و سریان و یۆنان و رۆمان و میسریەکان و چەندانی دیکە.

کتێبی سێیەمیش باس لەمێژووی بەربەر دەکات، کە نەتەوەی دووەمە لەمەغریب کە ئەو وڵاتە هەواری یەکەمیانە.

هەروا مێژووی ئیبن خەلدوون زۆر جیایە لە کتێبە مێژووییەکانی دیکە کە دەبینی پێشەکی فەلسەفی تیایە لەتەك ئەوەی لەدەوڵەتێکەوە دەگوازێتەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە هەموو ئەمانەش بەهۆ و شیکردنەوە رێکی دەخات، ئەمەش زۆر فراوانترە لە لە مێژووی عەرەبی جاهیلی و بەربەر و دەوڵەتەکانیان.

لەلایەکی دیکەوە زۆرێك لە رەخنەگرانی رۆژهەلات بەچاوێك سەیری دەکەن کە تارمایی زۆری تیایە، بەڵام لەرۆژئاوادا بە جۆرێکی دیکە سەیری دەکەن، کە مایەی گرنگی پێدانە، ئەمەو دی سەلان بەشێکی سەبارەت بە وڵاتی مەغریب و بەربەر لە جەزائیر چاپ کردووە لەپێش ئەوەی بکرێتە فەرەنسی ئەمەش لەساڵی ١٨٥٢ز کراوەتە فەرەنسی.

بەشێکیشی تەرخان کردووە بۆ مێژووی بەنی ئەغلەب لە ئەفریقیا و سەقلییە تا ئەو کاتەی ئەفرەنجیەکان دەستیان بەسەردا گرت، ئەم بەشەیان لەپاریس چاپ کراوە لەلایەن مامۆستا (دفرچییە) لە ساڵی ١٨٤١، هەروا بەشێکی تایبەت سەبارەت بە مێژووی بەنی ئەحمەر وەرگێڕدراوە بۆ فەرەنسی.

٢-یاداشتی کەسیەتی ئیبن خەلدوون

ئیبن خەلدوون لەنێوەندی نووسەرانی عەرەب و ئیسلام رۆژانە یاداشت و یاد و یادگاری خۆی نووسیوە، ئەمەشی ناوناوە (ناساندنی ئیبن خەلدوون) تیایدا هەموو رەچەڵەکی خۆی تیادا باس کردووە، ئەمەش وەك لەسەر هەمان رێگەی ئەورووپییەکان، لەنێوەندی ئەمەشدا باسی ژیانی رۆژانە و نامە و شیعرەکانی کردووە لەهەر دۆخێکدا کە نووسرابێ، رووداو و مێژووی ئەو یاداشتانە لە ساڵی ٨٠٧ك کۆتایی پێ دێ، واتە ساڵێك پێش مردنی.

لەکتێبخانەی میسری دانەیەکی دەستنووسی هەیە، کە یاداشتەکانی خۆی لە سەد و پەنجا لاپەڕە خۆی دەنوێنێ بە دەستخەتێکی جوان نووسراون، لەتەك ئەوەدا چەند دانەیەك لە مێژووە درێژەکەی دانراوە.

## فەلسەفەی کۆمەڵایەتی ئیبن خەلدوون

ئیبن خەلدوون لە پێش هەموو نووسەرانی ئەورووپا باسی لە بنەماکانی زانستی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵناسی کردووە، تەنهاش فەیلەسووفەکانی یۆنان باسیان کردووە، لەتەك ئەوەی پێشەکی (مقدمە)کەی ئیبن خەلدوون بووە جێگەی گرنگی نووسەرانی ئەورووپا، لەگەڵ ئەوەشدا بووە جێگەی گرنگی خەڵکی رۆژهەڵات، چونکە ئەو کتێبە بەماناکەی زۆر بەجوانی رێکخراوە و سوودێکی

زۆری هەیە، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەم دانایە موسڵمانە مەغریبی و ئەفریقییە دانەری بنەماکانی کۆمەڵناسی نوێیە.
ئیبن خەلدوون دیاردەکانی مەدەنیەتی خستووەتە دەرەوەی کۆمەڵناسی مەبەستی لە دیاردە دەرەکییەکانیش ئەو دیاردە سروشتیانەیە کە باوەڕداری ئایینی و کەش و ژینگەیە، تا دەگاتە دیاردە کۆمەڵایەتییە ناوخۆییە کە لەباوەشی کۆمەڵێك دێتە کایەوە کاریگەری و هێزی دەبێ، ئیبن خەلدوون هەر لەسەرەتادا ئارەزووی لەزانستی کۆمەڵایەتی هەبوو بەو پێیەی مرۆڤ خۆی لەخۆیدا کائینێکی کۆمەڵایەتییە، ئەمەش تیۆری داناکانی گریکە، کە لەپاشاندا ئۆگست کۆمت چارەسەری بۆ دۆزیوەتەوە لەبەشی چوارەمی فەلسەفەی دانراو، ئەمەو ئیبن خەلدوون و کۆکە لەتەك داناکانی یۆنان بەوەی کۆمەڵ تەنها ئامرازێکە بۆ خۆشگوزەرانی تاك، ئەم بۆچوونەش لەلایەن هربرت سپنسر لە رێبازە فەلسەفیەکەی جەختی لێ کراوەتەوە، هاوکات ئیبن خەلدوون باسی لەراستییەکان کردووە کە تەنها پێشتر فەیلەسووفەکانی یۆنان باسیان کردووە، ئەمەو جیاکاری کردووە لەنێوان کۆمەڵە مرۆڤایەتییەکان و کۆمەڵە ئاژەڵییەکان، چونکە کۆبوونەوە و کۆمەڵەی ئاژەڵییەکان هۆکاری سەرەکی خۆرسکین، بەڵام کۆمەڵە و کۆبوونەوەی مرۆڤەکان زیاتر بەندە بە عەقڵ و بیرکردنەوە لەتەك یەکتردا.
ماکیاڤیلی بە ئیبن خەلدوون دەچێ و هەروا دەتواندرێ بە مۆنتسکیۆش بچێت، هەردوو لا ویستویانە یاساکانی کۆمەڵناسی پەیوەست بکەن بە رووداوەکانی مێژوو، لەلایەکی دیکەوە ئیبن خەلدوون باس لەوە دەکات کە زۆرێك لەنەتەوەکان بەبێ ئاین دەژێن و گەورەترین سوڵتان و پاشایەتیەکی فراوانیان سەقامگیر کردووە لەتەك ئەوەی شاری بەجۆش و خرۆش و سووپایەکی

مەزنیان هەیە، هەروا ئەوا ئەو نەتەوانەی کە ئاینیان تیایە پێویست ناکات دەوڵەت و مەمالیك دروست بکەن لەسەر بنەمای پەیامبەرایەتی.

ئیبن خەلدوون پێچەوانەی زۆربەی فەیلەسووفەکانی ئیسلامە بەوەی پێویست ناکات ئاین ببێتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەت، چونکە ئەو دەوڵەتەی لەسەر بنەمای ئاین دێتە کایەوە لەنێوەندی سوودەکانی دونیا و قازانجەکانی ئاین کۆدەبێتەوە.

ئیبن خەلدوون باس لەکەش دەکات وەك یەکەم هۆکاری دەرەکی و هەروا باسی لە هەرێمەکانی زەوی کردووە و دابەشی کردووەتە سەر حەوت هەرێم، کە تیایدا کەشەکان لەهەر هەرێمێك جیایە کە هەندێکیان سارد و گەرمە و پلەی فێنکی تیایە، بۆ ئەمەش (بۆکل)ی ئینگلیزی باسی لەوە کردووە کە گەرمی و ساردی کاریگەری هەیە لەسەر لەشی مرۆڤ و شێوەکەی بەمانایەکی دیکە نەتەوە و مەمالیکەکان تا دەگاتە مەدەنیەت و شارستانییەت.

باسیش لەوە دەکات ئەو هەرێمانەی کە توند و تیژن لە مەدەنیەت بەشیان نییە، هەروا هەرێمی چوارەم کە هەرێمێکی زۆر سارد نییە ئاسۆیەکە بۆ ئاوەدانکردنەوە و مەدەنیەت و گەشەی زانست و هاتنە کایەوە ئایینەکان و رێکخستنی یاساکان، ئیبن خەلدوون مەبەستی لە لەهەرێمی چوارەم وڵاتانی سووریا و عێراقە و ئەوەش سەلمێندراوە کە دیاردەیەکی شارستانیەت و ئایینە لە دێر زەمانەوە.

ئیبن خەلدووم لەتەك مۆنتیسکۆ سەبارەت بەو تیۆرە لەتەك یەکتردان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئیبن خەلدوون و مۆنتسکیۆ ئەو تیۆرەیان دۆزیوەتەوە کە لەلایەن سوکرات و ئەرستۆدا باسیان لێوە نەکراوە، هەروا (لەپیچش جان بۆدانی)فەرەنیسش باسیان لەو تیۆرە کردووە.

لەپاشاندا ئەو دانایە چووەتە سەر رەگەزی دووەمی رەگەزەکانی دەرەکی کۆمەڵایەتی کە نێوەندی جوگرافی یان ژینگەییە و توێژینەوەی لەسەر کاریگەری ژینگە کردووە کە تیایدا تاك دەژی لەپێناو خۆشگوزەرانیدا و دەبینی ئەو تاکە ئازا و جەنگاوەرە.

بەڵام دەبینی ئیبن خەلدوون زۆر باسی لە کەش نەکردووە، چونکە ئەمەش سروشتە کاتێك لەبواری کەشدا قسە دەکەی، رەگەزی سێیەم لەلای ئیبن خەلدوون بۆ هەموو کۆمەڵە مرۆڤایەتییەکان هاتنە کایەوە بۆچوونە فەلسەفی و ئاینییەکانە، کە ئیبن رووشد باسی کردووە.

پێدەچێ ئەو مەبەستی کۆك بوونی دانایی و ئایینی بووە، وەك چۆن مەبەستی سەرەکیی ئیبن رووشد بووە، بەڵام ئەوەی سەیرە نەك پیاوانی ئایینی و نە فەیلەسووفەکان بەوە رازی بوون، کە یەکێك لەجیاتی ئەوی دیکە دابندرێ یاخود کۆك بوونێك لەنێوانیاندا هەبێ، ئەم شکستەیش هیچ پەیوەندیەکی بە ئیبن رووشدەوە نییە چونکە ئەو دەیویست ئایین لەسەر بنەمای عەقڵ و فەلسەفە پەیرەو بکرێ، بەڵام دوور بێ لە گومرایی و کوفر، زۆر کەسی دیکەش لەم سەردەمە ئەو هەوڵەیان داوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوونە، چونکە بیروبۆچوونەکان رێرەوی خۆیان گرتووە.

لەتەك ئەمە ناتوانین ئیبن رووشد وەك فەیلەسووفێك سەیری بکەین، بەڵام وەك کەسێکی چاکەکار لەپێناو چاکسازی هەوڵی داوە و دەیویست لەنێوەندی تەسەووف و خەونە راستەقینەکان و سروش و خودا و هەموو ماددە دەرەکییەکان کار بکات لەنێوەندی توێژینەوەکەی. لەتەك ئەوەی ئیبن خەلدوون دەیەوێ کاریگەری ئایین لەنێوەندی نەتەوەکاندا بخاتە روو تا جیاکاری لەنێوان مەدەنیەت و نەتەوە بێ ئایینیەکان بکا و لەتەك ژماردنی وەك

مەدەنیەت و ئاوەدانی و پەیوەندی جۆرەکانی دەوڵەت بە ئایینەوە لەتەك پێچەوانەکان لە رابردووی و داهاتووی مرۆڤایەتیدا بۆ ئەمەش چەندان نموونەی مێژوویی هێناوەتە ئارا و بەراوردی کردووە لە تەك یۆنانی کۆن کە نەتەوەیەك بووە بێ ئایین بووە، تەنهاش چەندان داناى تیادا هەڵکەوتووە وەك هیراکیت و بەکرات و سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ لەتەك هەر نەتەوەیەکی دیکی کە پەیامبەرانی بۆ ناردراوە، بۆ ئەمەش هەردوو لا بەراورد دەکات لەتەك کاریگەرییان بۆ سەر شارستانییەت لەسەر نەتەوە سەردەمییەکان.

سەبارەت بەمرۆڤایەتی و توێژینەوەکانی ئیبن خەلدوون لەنێوەندی ئیسپانیا و ئەفریقیادا گەرشاوە تیایدا هەموو ئەو بابەتانەی خستووەتە ڕوو، کە پەیوەندی بەکاریگەریی ئایینەوە هەبووە، لەتەك هەندێك هۆزی دڕندە وەستاوە کە هیچ ئایینێکیان نەبووە، ئەمەشی بۆ ئەوە کرد تا ئەو خاڵانە بزانێ کە لەداهاتوودا چی دێتەکایەوە.

ئەمجۆرە توێژینەوەیە سوودێکی زۆری بۆ مرۆڤایەتی هەیە بەتایبەتی کاتێك باس لە تەسەووف و ئیستخارە و خەونە راستەقینەکان و رووت بوونەوە دەکات، بەڵام ئەو دانایە ئەوەش دەخاتە ڕوو کە هیچ سوودێکی نەبووە.

ئیبن خەلدوون کۆتاییی بە شیکردنەوەی هۆکارە دەرەکیی کۆمەڵایەتییەکان دێنێت، دواتر باسی لە توێژینەوەی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان دەکات لەباوەشی کۆمەڵگەدا، لەوێدا بڕیاری داوە کە هەر کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتی بەچوار تەوەردا تێپەڕ دەبێ، یەکەم: رەوەندی. دووەم: داگیرکاری. سێیەمیش: شارستانیەت و شارنشینییە. هەر نەتەوەیەکیش یان ئەوەتا لە ناو بیابانەدا دێتە ئارا یان لەدۆڵێکن لەدواتردا دەست دەکەن بەداگیرکاری و نەتەوە لاوازەکان دەخەنە ژێرڕکێفی خۆیان، لە تەوەری دووەمدا هەر پەیوەستە بە مەدەنیەت و

شارستانیەت لەنێوەندی شار و شارۆچکەکان کە تیایدا چەندان دیوەخانی دێتەکایەوە و لەوێدا هونەرەجوانەکان بۆ خۆشی و خۆشگوزەرانی دێنەکایەوە و جەنگ لەبیر دەکرێ.

بەوشێوەیە جوولەی مرۆڤایەتی بەردەوام دەبێ دەبینی نەتەوەیەك دێتە ئارا و نەتەوەیەکی دیکە ون دەبێ و دەوڵەتێك گەشە دەکات و دەوڵەتێکی دیکە دەڕووخێ ئەمەش بەشێکە لەسروشت کە ئیبن خەلدوون لەو رۆژگارە درکی پێکردووە کاتێك سەیری مێژووی عەرەب و بەربەر کردووە، چونکە زانایەکانی دیکە باسیان لەو دوو نەتەوەیە نەکردووە.

ئیبن خەلدوون باس لەوە دەکات کە ژیانی رەوەندایەتی تەوەری یەکەمە بۆ هەموو کۆمەڵە و هۆزێك و لەتەك سروشتدایە و جووڵەی زۆر و بەردەوامە و دەیانەوێ لەو شوێنانە بژین، کە بژێوێکە بۆ مەڕ و ماڵاتەکانیان لەنێوەندی مێرگەکاندا و دەبێ کەشەکەش گونجاو بێ بۆیان. وەك چۆن بۆ مانگاکانیان دەبێ لەنێوەندی دۆڵەکاندا بێ، لەتەك ئەوەی مرۆڤەکان لەوێدا ئازا و بوێر و بەهێزن تا بەرگریی لەخۆیان بکەن.

ئیبن خەلدوون باسیش لەوە دەکات کە دەمارگیری هۆیەکە بۆ خۆشەویستی و رێزلێگرتنی تاکی هۆزەکان لەتەك یەکتردا ئەمەش وادەکات یەکدیگر بن بۆ بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان بەشێوەیەك ئەو دەمارگیرییە بەهێز تر دەکەن لەسەر ئاستی رێزگرتن لە دابونەریتەکان و هەردەمیش پێویستیان بە هێرش و بەرگریکردنە، هەروا هەر هۆزێك لە وەچەی چوارەمدا رێزی خۆی لەدەست دەدات، بەکورتی خوێنی پاك و رەگەز لەنێو هۆزدا مەرجی سەرەکین تا هێزی بەردەوام بێ بەبێ ئەمەش ناتوانێ بژی و بەردەوام بێ.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن خەلدوون لەنێوەندی باسەکەیدا باس لەوەرچەرخانی هۆزگەری دەکات بۆ تەوەری داگیرکاری و دامەزراندنی دەوڵەت بێگومان ئەو سۆسیۆلۆژیەی لەسەر بنەمای مێژووی عەرەب و بەربەرە بەو پێیەی هۆزن و بەو سیفەتەی ئیسلامیش وەك دەوڵەت سەیر دەکرێ، دواتر باس لە ژیانی شار دەکا، هەروا ئەم دانایە جیاکاری لەنێوان سیاسەت و ئاکار دەکات لەتەك باوەڕ و شەریعەتەکان، چونکە سیاسەت لەسەردەمی ئەودا تێکەڵ بە هەموو شتێك بوو بوو، بەراستیش یەکەم نووسەری سیاسییە لە رۆژهەلات و لەسیاسیە یەکەمەکانی رۆژئاوایە.

هەروا ئیبن خەلدوون باس لەوە دەکات کە دەرمارگیری و چاکەکاری دوو بەشە بۆ هێزی هۆزەکان کە هۆکاری سێیەم دەبێتە هۆی سەرکەوتن و هێزی هۆز دواتر بەهۆی داگیرکاری زیاتر هێز پەیدا دەکات، بەمانایەکی دیکە ئیبن خەلدوون باس لە پێویستبوونی سەرکردە و کەسی بالا دەکات، وەك چۆن لە پێش ئیسلام هۆزە عەرەبییەکان بەهۆی داگیرکاریەکانیان زیاتر بەهێز بوون لەژێر یەك ئالادا، دیارە سەرکەوتووەکان کاریگەری بەهێزیان دەبێ لەکاتی والاکردن و داگیرکاریدا.

سێ هۆکاریشی خستوونەتە ڕوو بۆ رووخانی نەتەوە بەهێزەکان، کە لاوازی سەرپەرشتی و زاڵبوونە بەسەر سەربازە خۆفرۆشەکان و سێیەمیش خۆشییە لەلایەن کەسانی سەرکردەوە، کە تەنها سێ ئەوە دەتوانن ئەو نەتەوەیە بپارێزن، ئەم تیۆرە لەنێوەندی دەوڵەتە ئیسلامییەکان زیاتر بەرچاو روونترە، زۆربەی بۆچوونەکانی ئیبن خەلدوون سەبارەت بە سەرکەوتن و سیاسەت پەیوەستە بەبۆچوونەکانی ماکیاڤیلی کە لەساڵی ١٩١٢ کراوەتە عەرەبی.

لێرە بوار نییە رەخنە لەفەلسەفەی ئیبن خەلدوون بگرین لەرووی کۆمەڵایەتیدا، بەڵام بۆ پوختکردنەوەی بنەماکانی گەورەترین هەوڵ لەلای ئەو ئەو پێشەکییە نەمرەیە، هەروا ئەو ویستویەتی بە دۆزینەوەی ئەو یاسایە بنەمایەکی سەرەکی بۆ فەلسەفەی کۆمەڵایەتی دابنێ بەشێوەیەك رووداوەکانی مێژوو سەرچاوەیەکی سەرەکییە بۆ ئەنجامەکان کە زانا کۆمەڵایەتیەکان پشتی پێ دەبەستن (سەیری مێژووی فەلسەفەی عەرەب بکە کە لەنووسینی بۆیرە).

ژیانی ئیبن خەلدوون و ئاکارەکانی لێکچوونێکە لەنێوان خۆی و ماکیاڤیلی کە نووسەری کتێبی میرە، هیچ جیاوازییەك نییە لە مێژووی لەدایکبوونیان تەنها سەدەیە، دۆخی هەر یەك لەوانە و سەردەمەکەیان لەپۆستدا بوونە و کەسەکانی تەکیان زۆر جار گۆڕانکاری پێکراوە و بۆ ئەمەیش سوودیان لەهەموان وەرگرتووە بۆیە توانیویانە سوودێکی زۆر لەئاکار و بیروباوەڕی هاوسەردەمەکەیان وەربگرن، وەك چۆن ئۆگست کۆمت لەدوو باسدا کورتی دەکاتەوە:

یەکەم: باس لەوە دەکات کە فەلسەفە زانستی بوونەکان ئەم بۆچوونەش لەلایەن ئەرستۆوە نەگوتراوە کە ناویان ناوە مامۆستای یەکەم، بەڵام ئۆگست کومت لەپاش ئیبن خەلدوون و لەپاش شەش سەدە گوتوویەتی، ئەم خاڵەش بەرزترین درکپێکردنە لە ئەرستۆدا لەتەك ئەوەی ئەو راستییە لەلایەن فەیلەسووفەکانی ئەورووپا لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم درکی پێ کراوە یان گوتراوە.

تەوەری دووەمیش کۆمەڵایەتیبوونی مرۆڤایەتی لەژێر رکێفی یاسا و بنەمایەکانە لەنێوەندی زانستە رێکخراوەکاندا، وەك چۆن ئۆگست کۆمت باس لەوە دەکات کە لەسەر دوو شتدا بەندە، یەکەم بینینی نەتەوە و

تاقیکردنەوەیان و دووەمیش یاسایە باوەکان ئەمەش بەهۆی ئەزموونە عەقڵییەکان و ئەنجامی هزر، بەشێوەیەك ئەزموون و زانست راستیەکانمان بۆ دەدۆزنەوە و عەقڵیش کێشە و هۆکارەکانمان بۆ دەردەخا.

بەو شێوەیە ئیبن خەلدوون یەکەم کەس بووە بەو مانایە لێکی داوەتەوە کە مێژوو زانستە بەشێوەیەك مەبەستی کۆکردنەوەی راستیەکان بێ، واتە: هەر رووداوێك مەرجێك یان دۆخێکی تایبەتی تیایە، هەروا ئیبن خەلدوون باسیشی لەوە کردووە، کە ئێستا بەڵگەیەکە بۆ رابردوو و داهاتووش لە ئێستا دەچێ، هەروا ئیبن خەلدوون گوتوویەتی کە مەبەستی مێژوو خوێندنەوەی ئاوەدانکردنەوە یان ژیانی کۆمەڵایەتییە.

هەموو هۆکارەکانیش دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی ئەمەیان هەژارە و ئەوی تریان دەوڵەمەندە کاتێکیش ئازایەتی و بوێری لەدڵی رەوەندەکان کۆتایی هات ئەوا ئاوێتە بوونی هۆزەکان لەنێوەندی سەردەمی نوێی شار و گەڕان بەدوای خۆشگوزەرانییەکانە.

هەر کەسێك ئەو پێشەکییە بخوێنێتەوە دەگاتە ئەو مەبەستەی کە مەزنایەتی مرۆڤایەتی لەنێوەندی دەوڵەت و نەتەوەکاندا بەچوار نەوەدا تێپەڕ دەبێ و چوارەمیش کۆتایی شکۆدارییە، بەو واتایەی نەوەی یەکەم تێدەکۆشی بەراستەوخۆیی و نەوەی دووەم لاسایی دەکاتەو و نەوەی سێیەم هۆکارێکە بۆ ڕووخان، نەوەی چوارەمیش بەرەو ڕووخان هەنگاو دەنێ.

دیارە هەموو ئەو توێژینەوانە خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە و ئەورووپییەکان کارێکی زۆریان لەسەر کردووە، بۆ ئەمەش رەنگدانەوەی هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە تا دەگاتە هۆکارە سروشتییەکان و لەلای ئیبن خەلدوون روونکراوەتەوە و بۆتە واقیعێك لەهەموو سەردەم و رۆژگارەکاندا.

دیارە ئیبن خەلدوون لەنێوەندی توێژینەوەکانی لەهەندێك شوێن هەموو شتێکی نەگوتووە و ئەوەی بەجێهێشتووە بۆ زانایانی دواتر تا کاری لەسەر بکەن.
لەو کاتەی ئیبن خەلدوون کۆچیدوایی کردووە واتە لەناوەڕاستی سەدەی پانزدەهەم تا ئێستا زۆرێك لەزانایانی ئەورووپا ئەو دانایە لەبیر نەکراوە، هەروا سەیر نییە کاتێك ئۆگست کۆمت هەڵوەستە دەکات لەسەر نووسینەکانی ئەو دانایە موسڵمانە، لەتەك ئەوەی بە وشەیەکیش باسی نەکردووە، بەڵام ناکرێ ئەو چاکەکاری ئیبن خەلدوون لەبیر بکات، لەکاتێکدا شولز لە گۆڤاری ئاسیا و لەساڵی ١٨٢٥ باسی لەئیبن خەلدوون کردووە واتە پێش بەدەرکەوتنی فەلسەفەی ئۆگست کۆمت، ئەو کات ئۆگست کۆمت تەمەنی بیست و حەوت ساڵ بوو، ئەو گۆڤارەش لە پاریسدا باس لەو دانایە گەورەیە دەکات.

## بەراورد لەنێوان ئیبن خەلدوون و نیکۆلا مکیاڤیلی قوتابی

نیکۆلا میکاڤیلی فەیلەسووفێکی کۆمەڵناسی سیاسییە و خەڵکی فلۆرەنسایە و لەساڵی ١٤٦٩ز لەدایکبووە و لەساڵی ١٥٢٧ز کۆچی دوایی کردووە، زۆرێك لەپۆستی سیاسی لە کۆماری فلۆرەنسادا وەرگرتووە، ئەمەش لە کۆتایی سەدەی پانزدەهەم و سەرەتایی سەدەی شانزدەهەم، ئەمەو سکرتاریەتی دیوانی قەزای دەیی وەرگرتووە بۆ ماوەی چواردە ساڵ، لەهەندێك ساڵدا بیست و سێ کاری ئەنجامداوە کە لەبواری سیاسەتدا بووە لەوڵاتانی دەرەوەدا، ئیتاڵیای ئەو کات ناخۆشترین هەڵوێستی تووش بوو بوو لەسەر سەروەری لەنێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا کە پاپا بە ئارەزووی خۆی شار و ئیمارەتەکانی قۆرخ کرد بوو بۆ کڵێسا، لە لایەکی دیکەوە دز و جەردەکان کەسانێکیان بە شمشێر سەر دەبڕی و خوێنەکەیان بە شمشێرەکەیان دەهێشتەوە، هەموو

ئەمانە بووە هۆی ئەوەی لەنێوان حکومەت وپاپادا ململانێیەکی توند بێتە کایەوە، لەکاتێکدا کڵێسا بانگەوازی ئەوەی دەکرد کە بۆ چاکسازی لەوێدان و دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕێنوینەکانی کڵێسا، لەو کاتەشدا خانەوادەی مدیتشی دژایەتی پارتی گەلی دەکرد بە شاراوەیی.

میکافیلی هاوسەردەمی ئەو کێشە و ململانێیانە بوو بۆیە زۆر لەگرێیەکانی دەزانی و چۆنیەتی چارەسەرکردنی لەدووتوێی کتێبەکاندا دەنووسی بۆیە ئەمەی کردە بژاردە لەمەوەش فەلسەفەیەکی سیاسی دانا یان زانستی سیاسەت کە بەناوی ئەوەوە ناسراوە، هاوکات سەبارەت بەمێژوو و سیاسەت و نواندن و ئەدەب چەندان نووسینی تۆمار کرد لەلایەکی دیکەوە هەڵبەستی هۆنیەوە و سەبارەت بە هونەرەکانی جەنگ چەندان بابەتی نووسی و ناودارترین کتێبیشی (میر)ە کە بۆ میر (لۆرنزودی مدیتشی) گەورە نووسی.

زانایان چەندان بیروبۆچوونی جیایان هەیە سەبارەت بەکتێبی میر لەڕووی ڕاستییەکانی ئاوەدانکردنەوە و سیاسیدا، هەیانە باس لەوە دەکات کە بنەما سیاسیەکانی زیان دەگەیەنێت چونکە لەسەر بنەمای داپڵۆسین و ناپاکی بنیاتنراوە لەتەك چەندان ئامرازی خراپەکاری، کەچی هەندێك باس لەوە دەکەن بنەماکانی ڕاستن بۆ دامەزراندنی دەوڵەت.

ئەو کتێبە لە ٢٦ بەش پێکدێ تیایدا باسی لەجۆرەکانی دەسەڵات کردووە لەتەك جیاکاری لەنێوان ئیمارەتی بۆماوەیی و تێکەڵ و کێشەی حکومەت و جۆرەکانی ئیمارەتە مەدەنی و ئاینیەکان و جۆرەکانی جەنگاوەران کە دەبێ میر لەسەری بڕوات تا بەهەر شێوەیەك بێ سەروەری خۆی بچەسپێنێ، هاوکات ئەو بەشانەی کە پەیوەستە بە ئەرکی میر و چۆنیەتی ڕاکێشانی سەربازەکان لەدەوری خۆیدا، کە بەچ شێوەیەکی توند و تیژی و نەرم و نیانی مامەڵەیان

لەتەکدا بکات، هەروا بەراوردی کردووە لەنێوان میر و ترش و چۆن وەفادار دەبن بەرامبەر بەمیرەکەیان، هاوکات چۆن میر ناودار دەبێ لەرووی ئاوەدانکردنەوە و سیاسەتدا، هەموو ئەمانە باس لە ئیمارەتەکانی رۆژئاوا دەکات لە سەدەکانی ناوەڕاست، هەموو ئەمانەش وەك ئەو کارەیە کە ئیبن خەلدوون لەپێش دوو سەدەدا ئەنجامی داوە یان نووسیوویەتی، بۆیە پێمان باش بوو بەراورد لەنێوان هەردووکیان بکەین لەرووی ئاوەدانکردنەوە و سیاسەتدا، ئەم فەیلەسووفە بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە سەبارەت بە شێوازەکانی ئاوەدانکردنەوە و دەسەلات کە دەکرێ ناوی بنێن فەلسەفەی خەلدوونی (khaldounisme) وەك چۆن بۆچوونەکانی مکیاڤیلی ناونرا بە فەلسەفەی مکیاڤیلی (mlachia vellisme).

## کتێبی میر و پێشەکیەکەی (مقدمە)کەی ئیبن خەلدوون

ئیبن خەلدوون بۆچوونەکانی لەنێوەندی پێشەکیە ناودارەکەی بەدەرخستووە وەك چۆن مکیاڤیلی لەکتێبی میردا بۆچوونەکانی خۆی خستووەتە ڕوو، بۆیە دەکرێ بەراورد لەسەر هەمووی بکرێ، کتێبی میر باس لە بنەما سیاسی و ئاکارییەکان دەکات، کە پشتگیری بێ بۆ دەسەلات، واتە: دەسەلاتی میرەکان کە بەشەکانی لە ١٥٠لاپەڕە زیاتر نییە، بەلام پێشەکیەکەی ئیبن خەلدوون کە بەپوختکراویی و کورتکردنەوەی ٢٢٩ لاپەڕەیە، چەند بەشێکیشی تیایە کە مکیاڤیلی بۆی نەچووە.

## لێکچوونەکانیان

مکیاڤیلی و ئیبن خەلدوون کۆکن لەسەر زۆربەی ئەوانی لەکتێبەکاندا هاتووە لەرووی ئەم بابەتەوە یان ئەو شێوازەی ئەوان گرتوویانەتە بەر، مکیاڤیلی ئەو

بنەمایانەی لەسەر ئەو کاتە داناوە کە دۆخەکە لە ئەورووپادا بەرەو خراپی رۆیشتووە بەتایبەتی باس لەخۆی دەکات کە تووشی چ ئازار و ناڕەحەتیەک بووەتەوە لە ڕێکخستنی دەوڵەت و ئەو ترسناکی و گەندەڵکاریانەی کە دەهاتنە ئارا لەتەك هەموو کارە دەسیسەکاندا، لەنێوەندی هەموو ئەمانەدا بۆچوونەکانی بنیاتناوە کە میر چۆن دەتوانێ سەروەری خۆی داچەسپێنێ، هاوکات دۆخی هاوسەردەمەکانی وەك نموونە هێناوەتەوە یان مێژووی دەوڵەتەکانی رابردووی خوێندووەتەوە، بەڵام لەنێوەندی هەموو ئەمانەدا باسی لەدۆخی ئەورووپا نەکردووە لەتەك رۆژهەڵاتدا تەنها باسی لەتوورکەکان کردووە.

بەڵام ئیبن خەلدوون لە مەغریب ژیاوە و لەنێوەندی پۆستە سیاسییەکانی ئێش و ئازارێکی زۆری بینیوە لەنێوەندی هەموو وەرچەرخانەکانی مەراکش و توونس و ئەندەلووس و میسر، لەنێوەندی هەموو ئەمانەدا خودی خۆی چووەتە نێو بابەتەکە لەنزیکەوە روانیویەتیە هەموو نهێنییەکان و لەهەندێکیان بەنهێنی نووسراوی کردووە، لەنێوەندی هەموو ئەو دۆخ و کارەساتانە بەرەو فەلسەفە هەنگاوی ناوە، ئەمەو نووسینەکانی لەو نێوەندە سەرچاوەی گرتووە کەتیادا ژیاوە، سەبارەت بە بۆچوونەکانی و سیاسەتی دەوڵەت بەپێی ئەو زانیاریانەی بووە کە سەبارەت بەمێژووی ئیسلام و هەموو رۆژهەڵات زانیویەتی، بەهیچ شێوەیەك باسی لە مێژووی یۆنان و رۆمان نەکردووە تەنها لەهەندێك شوێندا نەبێ.

هەردوو فەیلەسووف لەزۆر روانگەوە لێکچوون لەبابەتەکەیان بەدی دەکرێ سەبارەت بەبۆچوونەکانیان لەبارە وەزارەت و دۆخی لایەنگران و دروستکراوان و دوورکەوتنەوە لەماستاوچییەکان، لەهەندێك شوێندا باس لە هۆکار و کێشەی رووخانی دەوڵەت دەکات و ئەو کاتەی کە پشت بەسەربازەکان دەبەسترێ،

بەڵام لێرەوە تەنها باس لەو جیاوازیانە دەکەین، کە سەبارەت بە بنەما سیاسییەکانە بۆ پشتگیریکردنی دەسەڵات.

## جیاوازییەکانیان

بنەمای توێژینەوەکەی مکیاڤیلی سەبارەت بەدەسەڵات کە دابەشی کردووە بۆ کۆمار و پاشایەتی وەك چۆن لە ئەورووپادا وا دابەشکرابوو لەو سەردەمەی ئەو تیایدا ژیا، گەڕاندنەوەی بۆ کڵێسا ئەو خانەوادانەی داوای میری و پاشایەتی و سەروەری دەکەن، بەڵام لەلای ئیبن خەلدوون کۆمار نەبووە، بەڵام نموونە بە خەلافەت و پاشا و سەڵتەنە و ئیمارەت دەهێنێتەوە، ئەوکاتیش ئەو دۆخە باو بووە لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا کە زیاتر پەیوەست بووە بە ئایین و دەمارگیری لەدۆخی عەرەب و موسڵمانەکاندا.

ئیبن خەلدوون پێی وایە کە دەوڵەت گشتیەکان لەبنەڕەتدا ئایینین یان لەڕووی پەیامبەریەوەیە یان بانگەوازی هەق بوون، ئەم بانگەوازە ئایینییەش تەنها بە دەمارگیری یەك رەچەڵەکی رەوەندی دێتەکایەوە و پەیوەندی بەخەڵکی شارەوە نییە، چونکە ئەمانە دژایەتی یەکتر دەکەن لەزۆر رووەوە هەموویان لەگەڵ یەکتر کۆنابنەوە.

بەڵام رەوەندەکان هەموو بەرگری لەیەکتر دەکەن بەدەمارگیری بەمەش پیر و گەنجیان بەرگری لەیەکتری دەکەن و دەروونیان بەرزە، کاتێکیش ئەوان دەروون بەرزن کاتێك دەمارگیر دەبن و بەرگری لەیەکتر دەکەن لەڕووی رەچەڵەکەوە، نموونەش بۆ ئەمە دامەزراندنی زۆربەی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لەسەر بنەمای ئایین و دەمارگیری بووە.

هاوکات مکیاڤیلی دەروازەیەکی بۆ ئیمارەتی ئایینی نووسیووە لاپەڕە(١٢٠) و پێیواییە کە سەروەری ئایینی بەهۆی دابەونەریتەکان و ڕێورەسمە کۆنەکان بەردەوام دەبێت ئەمەش وادەکات زیاتر لەسەر دەسەلاَت بمێننەوە، باسی هۆکارەکانی ئایینی نەکردووە چونکە هیچ دەوڵەتێکی نەسرانی بەهۆی ئایینەوە دانەمەزراوە، هەروا باسیش لەوە دەکات کە کڵێسا چۆن گەیشتووەتە ئەو هێزە دونیاییە لەو سەردەمەدا دژایەتی پاشای فەڕەنسای کرد و پاشایان دەکرد بۆ ئیتاڵیا و دەستیان بەسەر هەموو خەڵکی بوندقیەدا گرت، دیارە ئەمەش بەهۆی پێویستبوونی میرەکان بووە تا ململانێیەکان هەر بەردەوام بێت، لەلایەکی دیکە باس لەخۆشگوزەرانی میرەکان دەکات کە بەهەموو شێوەیەك جەنگیان رەتکردووەتەوە.

لەلایەکی دیکەوە سەبارەت بە ئەرکەکانی میر دەڵێت :

"نابێ میر مەبەست و هزری هەبێ و تەنها پێویستە گرنگی بە جەنگ بدات، چونکە ئەمە تەنها کارە دەتوانێ تیایدا فەرمان بکات و شتەکان رەتبکاتەوە، سوودەکەشی ئەوەیە هەروەك پاشا و میر دەمێنێتەوە، بەتایبەتی کاتێك کوڕەکەی وەك میر لەدایك دەبێ، لەتەك ئەوەدا هەندێك میرمان بینی تەنها بیریان لە خۆشگوزەرانی دەکردەوە، بۆیە ئیمارەتەکەیان لەدەست داوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە بەهەموو شێوەیەك دژ بەجەنگ بوونە، بەلاَم باشترین ئامانج و ئامراز ئەوەیە هەردەم لەجەنگدا بیت".

لەزۆر جێگەشدا دەبینین بۆچوونەکانی ئیبن خەلدوون هەمان مەبەستە، بۆ سەروەری میرەکان، بەلاَم مکیاڤیلی سەبارەت بەترس و تۆقاندن لەدڵی خەڵکدا بەو شێوەیە باسی دەکات:

"لێرەوە پرسیارێك دێتە ئارا كە كامەیان بۆ میر سوودمەنترە و زیاتر خەڵكی خۆشبوێ یان زیاتر بەترسەوە تێیان بڕوانێ؟ بەڵام وەڵامە ئەوەیە، كە خۆشەویستێكی شكۆدار و ترسیان لێی هەبێ بێ بەڵام ئاستەمە هەردوو لا كۆبكرێنەوە لەیەك دۆخدا، بەڵام باشترە ترسێنەر بێ، بەڵام بەخەڵك، چونكە ئەوان چاكەكان زوو لەبیردەكەن و هەر یەكەو شێوازێكیان هەیە بۆیە ترس باشترە چونكە دەیانەوێ دەستكەوتیان هەبێ".

پێی وایە میر ترسێنەر بێ و سوپاكەی بەرەو روویان بكاتەوە و بەدڵرەق بناسرێ بەمە نەبێ ناتوانێ یەكگرتووی لەنێو سوپاكەیدا بهێڵێتەوە بۆیە دەبێ ملكەچ بن، بۆ ئەمەش پێباشە میر سەروەری خۆی بچەسپێنێ لە لاپەرە ١٤٠ دەڵێت "میرێك كە دەیەوێ دەسەڵاتەكەی بپارێزێ دەبێ ئەوە فێر بێ چۆن باشیەكانی كەم دەكاتەوە یان چۆن خێر بەكار دەهێنێ یان دژەكەی بەكار دێنێ لەدۆخە گونجاوەكاندا".

لەلاپەرە ١٤٢ دەڵێت "نابێت شەرم بكات لە ئابڕوو چونكە بەبێ ئەمە ناتوانێ پاشایەتی و میرایەتی خۆی بپارێزێ، چونكە زۆر جاران باشییەكان كارەسات دەهێنێتەكایەوە كاتێكیش كە رەزیل دەبێ هەردەم بەئاسانی دەتوانێ دەست بەدەسەڵاتەكەیەوە بگرێ".

لەلایەكی دیكەوە باس لەوەفاداری میرەكان دەكات بەمانایەك كاتێك میر بەڵێنی دا ئەو دەڵێت "لەزۆر شوێندا میرەكان بەڵێن دەدەن، بەڵام ئەگەر توانی خەڵك بە بەڵێنەكانی خەیاڵاوی بكات و لەكۆتایشدا سەركەوتوو بوون، بەڵام دەبێ ئەمانەت و بەڵێن و وەفاداری بەشێك بێ لەژیانیان".

لەتەك ئەمەدا باس لەوە دەكات كە میر وەك ریوی بێت بتوانێ فرت و فیڵ بكات و وەك شێر بێت تا گورگەكان بترسێنێ، هەروا نابێ میر ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بكات كە دژ بە بەرژەوەندیەكانیەتی.

چونكە لەوانە هۆكارەكان وایكردبێ كاتی ئەو بەڵێنانە نەمابێ، چونكە لەوانەیە خەڵك هەمووی وەك یەك نەبێ هەندێكیان شەڕانگێزن، چونكە ئەوانەی شەڕانگێزن هیچ كاتێك بەڵێن و بەخشندەیی تۆیان لەیاد نەماوە".

بۆیە میر كاتێك بەڵێنێكی جێبەجێ نەكرد پێویستە پەنا بباتە بەر فرتوفێڵە شەرعییەكان، ئەو میرانەی توانیویانە لاسایی رێوی بكەنەوە لەكۆتایدا سەركەوتوو بوونە، بەلام دەبێ بەرامبەرەكەت وا بخافڵێنێ كە تۆ راست دەكەی، چونكە بەگشتی خەڵك نێچیری فرت و فێڵەكانن.

بۆ ئەمەش نموونەی بە ئەسكەندەری شەشەم هێناوتەوە كە لەژیانی تەنها فرت و فێڵی كردووە و مكیاڤیلی دەڵێت "كەس وەك ئەو پەنای نەبردە بەر فرت و فێڵ ئەگەر بیزانیبوایە سەر دەگرێ ئەوا بەردەوام دەبوو، پێویست ناكات میر لەهەموو شتێكدا راست بكات، میر دەبێ ئەو رێڕەوانە بگرێتە بەر كە سوودی بۆی هەیە باشترە وەك باوەڕدار و ئەمانەت خۆی نیشان بدات و وای تێبگەن كە زۆر لەتەك مرۆڤایەتی و دڵسۆزییە، بۆیە دەبێ پتەو بێ تا ئەو كاتەی وەردەچەرخێ زۆر بەئاسانی".

ئەمە ئەو رووەیە كە پشتگیری میرەكانە، بەلام ئیبن خەلدوون پێچەوانەی ئەو قسە دەكات لە زۆر بابەتدا:

ئیبن خەلدوون پێی وایە توندوتیژی زیان بە پاشا دەگەیەنێت، بەڵكوو میر دەبێ ئاگاداری خەڵك بێ زۆر بە نەرم و نیانی لەتەكیان بجولێتەوە و پێی باشە پاشا دوور كەوێتەوە لە توندوتیژی و دڵڕەقی و دەڵێت "جوانی و رێكوپێكی

پاشا بەنەرم و نیانی بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەگەر پاشا زۆر توند بوو بەرامبەر بەخەڵك و خەڵکی ترساند و دەستی بەفرت و فێڵ کرد ئەوا بەرەو خراپەکاری هەنگاوی دەنێ، ئەگەر بەفرت و فێڵ کارەکانی کرد ئەوا لەجەنگەکاندا کەس پشتگیری لێناکات و دەوڵەتە دەڕووخێ و هیچ دیوارێك نامێنێ، ئەو کاتیش میرەکان ناتوانن بەرگری لەو دیوارە بکەن، باشترین کاریش بەرگری کردنە لەخەڵك ئەمەش دەبێتە باشترین بەرگریکردن لەپاشایەتی، چونکە کاتێك سەیری بژێوی ژیانیانت کرد ئەوا بەهەموو شێوەیەك خەڵك دوور دەخەیتەوە لەدژایەتیکردن".

لەلایەکی دیکەوە ئیبن خەلدوون پێیوایە "یەکێك لەئامازەکانی پاشایەتی دەبێ پێشبڕکێ بخاتە ناو کارە باشەکان تا بەهەر شێوەیەك بێ هۆز و دەمارگیرەیەکان لەخۆی نزیك بکاتەوە ئەمەش گونجاوە بۆ سیاسەتی پاشا، چونکە کاتێك خەڵکی لەخۆی دوور خستەوە وەك ئەوە وایە کەسێکە دوورە لەئەندامەکانی دیکە، بۆیە هۆز و دەمارگیرەکانی دەوروبەری دەبێ لەسەر کاری چاکە رایهێنێ، ئەمەش دەبێتە شکۆیەك بۆ پاشا، چونکە سیاسەت و پاشا لەکاتی بڕیارەکانی و بڕیارەکانی خودا لەتەك بەندەکانی دەبێتە هۆیەك بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکان".

لەتەك ئەمەدا سەبارەت بە سوپا و سەربازەکان هەردەم دەبێ عەقڵ کاری خۆی بکات تا بەهەموو شێوەیەك هێزی سوپا لەدەستدا بێ بەتایبەتی سەبارەت بە ئیمارەتە مەدەنییەکان چونکە ئەمە سوودی زۆری هەیە.

لێرەوەش دەبینین زۆر بەش لەیەك دەچێ واتە لەنێوان هەردوو کتێبدا، بەڵام ئێمە ویستمان جیاوازی و لێکچوونەکان بخەینە روو.

## ڕوونکردنەوەیەک لەئیبن خەلدوونەوە
## بۆچوونی سەبارەت بە فەلسەفە

ئیبن خەلدوون لەنێوەندی فەیلەسووفەکان بە فەیلەسووفی عەقڵ ناژمێردرێ، چونکە خۆی وانەبوو، بەڵام با بەپێی وتەی مێژوونووسانی ئەفرەنجییەکان باسی لێوە بکەین، ئەوان بەبلیمەتێکی بواری زانستی کۆمەڵناسی و ئابووری و فەلسەفەی مێژوویان لەقەڵەم داوە، ئەو لەنێوەندی زنجیرەی فەیلەسووفەکانە کە لە کیندی دەست پێ دەکات بە ئیبن ڕووشد کۆتاییی دێ.

لەتەك ئەمەدا ئیبن خەلدوون دوور نییە لەفەلسەفە بەڵکوو بەشدار بووە و درکی بەسەرەتایەکان کردووە دواتر وازی لێهێناوە بەهۆی ئارەزووەکانی کە توێژینەوەکانی بۆ کۆمەڵناسی پراکتیکی هەنگاوی ناوە، بەتێڕوانینێکی فەلسەفیانە و بنەمای توێچژینەوەی عەقڵی سەیری کردووە، کاتێك وەسفی (مقدمە)ی کردووە زۆر بەدڵفراوانییەوە ڕوانیوەیەتیە باسەکان کە دەکرێ بە فەلسەفەی مێژوو بژمێردرێ.

ئیبن خەلدوون لەچەند بەشێکدا بەرهەڵستی فەلسەفەی کردووە وا وەسفی کردووە کە زۆربەی باس و خواستەکان پووچ دەکاتەوە سەبارەت بە شێوەی بیرکردنەوەی دەڵێت:

"ئەمجۆرە زانستە ڕێگرە لە ئاوەدانکردنەوە زۆربەی شارەکان و زیانی هەیە بۆ ئایین بۆیە پێوستە بەرهەڵستی بکرێ و لێرەدا هەرچی ڕەوایە بخرێتە ڕوو، بەشێوەیەك کۆمەڵێك لە عاقڵمەندان باس لە هەست و ئەو دیوهەست دەکەن بەپێوەری هزری و عەقڵ شتەکان دەپێون، ئەگەر باوەڕەکان ڕاست دەکەنەوە پێویستە گوێیان لێبگرین چونکە بەشێکی پەیوەستە بەدرکپێکردنی عەقڵ، هەموو ئەمانە ناویان نراوە فەیلەسووف ئەمە بەزاری یۆنانیەکان و ئارەزوویان

لەدانابییە، لەتەك ئەمانەشدا دیارە جیاكاریان كردووە لەنێوان هەق و پووچی كە ناویان ناوە لۆژیك، هەروا باس لەوە دەكەن كە خۆشگوزەرانی ئەو كاتە دێتە كایەوە كە درك بە بوونەوەكان بكرێ هەمووشی لەپشت هەست و ئەو دیوو هەستەوەیە، ئەمەش بەهۆی ئەركگۆمێنت و دركپێكردنە عەقڵیەكانەوەیە، چەندان لقی لێ بۆتەوە، ئەوان تەنی خوارەوەیان دۆزیوەتەوە و هەستیان بە دەروون كردووە لەنێوەندی جوولە و هەست لە ئاژەڵەكان، دواتر هەستیان بەبەهێزی دەروون كردووە وەك سوڵتانێك لەسەر تەنی سەرەوە واتە ئاسمانی، باس لەوە دەكەن كە گەردوون دەروونێكە و عەقڵیش لەلای مرۆڤە، لەتەك ئەمەدا باس لەوە دەكەن كە خۆشگوزەرانی ئەو كاتە دێتە ئارا كە درك بە بوون دەكەن لەتەك باشی دەروون چاكەكاری دەكەن، هەموو ئەمانە ئەگەر هەبێ ئەوا خۆشی و چێژ دێتە كایەوە و نەزانیش جۆرێكە لەئازارێكی سەرمەدی، ئەمەش لەلای ئەوان بەهەشت و ئازارە لەكۆتایشدا تێكەڵیەك لەنێو وشەكانیاندا هەیە".

"لەنێوەندی ئەم رێبازانە ئەرستۆ مەقدۆنی بەمامۆستای یەكەم دەزانن، ئەو خەڵكی مەقدونیایە لە وڵاتی رۆم و یەكێكە لە قوتابیەكانی ئەفلاتوون وبەرەهایی ناویان ناوە مامۆستای یەكەم و ناونیشانی پیشەی لۆژیكی پێدەبەخشن چونكە ئەو یەكەم كەس بووە یاسای بۆ داناوە".

"كاتێك ئیسلام هات و ئەو رێبازانەش باو بوو، لێرەوە نەفرەتی لێكرا، چونكە هاتن دەمەتەقێ و گفتوگۆیەكی زۆریان كرد سەبارەت بە خودا، بەڵام لەزۆربەی باسەكاندا جیاواز بوون لەنێو ئەمانەشدا ئەبو نەسری فارابی لەسەردەمی سەیفی دەوڵەت و ئیبن سینا لەسەردەمی پاشایەتی بەنی بۆیە لە ئەسبەهاندا".

"ئەوە دەزانم زۆربەی بۆچوونەکان پووچە، چونکە هەموو عەقڵەکان ئەگەر پەیوەیستیان کرد بە خودا کارەکەیان بەجوانی بەڕێوە دەچێ، بەڵام ئەگەر جیاکاریان کرد ئەوا کەموکوڕی لەکارەکەیان بوونی هەیە، چونکە خودا دروستکەرە و ئێوە درکی پێناکەن، ئەوان پێیانوایە لەپشت تەنەکانەوە دانایی خودا بوونی نییە، ئەوانەی بە ئەرگۆمێنت و بەڵگەش کار دەکەن و بەپێوەری لۆژیك و یاسا ئەوا کارەکەیان کەموکوڕی تیایە و مەبەستی تەواوی نەداوەتە دەست".

"کاتێك باس لە بوونی تەنەکان دەکەن و ناویان ناوە زانستی سروشتی ئەوا کەموکوڕی دەبیندرێ لەنێوان ئەنجامەکانیان بیانووی ئەوە دەهێننەوە کە لەدەرەوەی یەقینیدایە، چونکە یەقینی تیادا نادۆزنەوە، لەوانەشە بیروبۆچوونیان پەیوەست بێ بە کەسایەتی و وێنە خەیاڵییەکان نەك بەپێی مەعقولاتەکانە، لەتەك هەموو ئەمانە وازیان لەتاکی موسڵمان هێناوە، لەتەك ئەوەی ئەو باس و خواستانە لەنێوەندی ئایینەکەمان گرنگ نییە بۆیە دەبێ وازی لێبێنین".

"کاتێك باس لە بوونەکان دەکەن کە لەپشت هەستەکانەوەیە، کە رووحییە و ناویان لێناوە زانستی ئیلاهیات و زانستی ئەو دیوو سروشت هەموو شتێکی ونە بەهیچ شتێك ناگەین پێی ئەگەر ئەرگۆمێنت و بەڵگەش بهێننەوە، چونکە لەنێوەندی هەموو باسەکانیان ناتوانن تەنها بەڵگەیەك بهێننەوە، چونکە هەموو ئەمانە لەنێوەندی دەروونی مرۆڤایەتیە، بەتایبەتی لەرووی خەونەکاندا باسەکە هەمووی پەیوەستە بەویژدانەوە، بەهیچ شێوەیەك ناگەیتە نهێنیەك چونکە خودی کارەکە تارمایی لەسەرە و ناتواندرێ هەڵوەستەی لەسەر بکرێ".

"ئەوانەی کار لەسەر ئەمە دەکەن باس لەماددە دەکەن چونکە ماددە ناتوانرێ بەپێی ئەرگۆمێنت و بەڵگە بخرێتە روو لەم نێوەندەشدا گەورەکەیان ئەفلاتوون دەڵێت "ئەو شتانەی پەیوەستە بە ئیلاهیات بەهیچ شێوەیەك ناگەیتە یەقین و باوەڕی، بەڵکوو تەنها دەگوترێ یەقین پەیوەستە بەڕەوایی و خودا". مەبەستی گومانکردنە ئەگەر زۆریش خۆمان ماندوو کرد لەو نێوەندەدا هەر گومان لەدەروونمان دەمێنێتەوە، واتە چ سوودێکی هەیە ئەمجۆرە زانستە، لەتەك ئەوەی مرۆڤایەتی دەیەوێ بگاتە مەبەستی سەرەکی".

"سەبارەت بەو قسانەیان کە خۆشگوزەرانی پەیوەستە بە درکپێکردنی بوونەکان ئەوا دەڵێین هەموو باسەکانیان قەڵپە بەهۆی شیکردنەوەکانیان بەوەی دەڵێن مرۆڤ لە دوو پێکهاتەیە یەکێکیان لەشە و ئەویتریان رووحە و تێکەڵ بەیەکتر بووە و هەر یەکێك لەمانەش دوو بەشی درکپێکراوە، یەکێکیان بەشی رووحە و لەلایەکی دیکەوەش پەیوەندی بەتەن و لەشەکانەوە هەیە، بەڵام درکپێکردنی رووحی بەخودی خۆی درکی پێدەکات بەبێ لایەنێکی دیکە، هەروا درکپێکردنی لەش بەهۆی ئامێرەکانی لەشەوەیە، لەلایەکی دیکەوە خۆشی و چێژ تەنها بەدرك و چاوپێخشاندنەوە نییە بەڵکوو بە لەبیرکردنی درکپێکردنی لەش و تەسەووفە، کاتێك ئێمە وەك وەرزشێك ئەم کارانە دەکەین ئەوا هزر لەمێشکدا نامێنێ و دەروون درکی پێدەکات و هەموو لایەنە خراپەکانی لەش لادەچێ بەمەش خۆشی و چێژ هەموو لایەك دەگرێتەوە، بەڵام ئەوان لەنێوەندی باسەکەیان کەموکوڕی هەیە".

"کاتێکیش باس لەوە دەکەن کە ئەرگۆمێنت و بەڵگەکان بەشێکە لەدرکپێکراوەکان و خۆشی ئەوا باسەکەیان پووچە، چونکە هەموو ئەمانە درکپێکردنی لەشە و پەیوەستە بەهێزی مێشك لەخەیاڵ و هزر و یاد، ئەوەی

ئێمە گرنگی پێدەدەین درکپێکردنی مێشکە چونکە هەموو شتەکانی دیکە ڕەت دەکاتەوە".

"زۆریان بەکارایی خۆیان جەخت لە کتێبی چارەسەر و ئاماژە و ڕزگاربوون دەکەنەوە" بەمەش پوختەکردنەوەکانی ئیبن ڕووشد کە لەئەرستۆی وەرگرتووە تیایدا دەبینی کاغەز و نووسینەکانی هەریەك بەلایەکەوەیە و کەمێك لە خۆشییەکان نزیك دەبێتەوە بەپێی بۆچوونی خۆی، ئەوەش لەبیر دەکات کە چەندان ڕێگری دیکەی هێناوەتە کایەوە وەکچۆن فارابی و ئەرستۆ و ئیبن سینا دەڵێن "ئەگەر درکپێکردنی عەقڵ هاتە کایەوە و پەیوەست بوو بەژیانیەوە ئەوا بەختی لەخۆشگوزەرانیدا دەبێ" لێرەوە عەقڵی کارا لەلای ئەوان بریتییە لەیەکەم ریزبەندی کە هەست دەیدۆزێتەوە لە ریزبەندیەکانی ڕووحی، جگە لەوەی پەیوەست بوون بەعەقڵی کاراوە دەبەستنەوە بە درکپێکردنی زانستی، منیش ئەو خراپەکاریەم بینی (؟!)".

"کاتێك ئەرستۆ و کۆمەڵەکەی باس لەپەیوەست بوون و درکپێکردن دەکەنەوە، ئەوا درکپێکردنی دەروون بەپێی خودی خۆیەتی نەك بەهۆکارێك تەنها دەبێ هەستەکان دەربڕ بن، هەروا باسیان لەخۆشی و چێژەکانە کە دەیبەستنەوە بە درکپێکردن کە سەرچاوەی خۆشگوزەرانییە ئەمەشیان پووچە، لەوێدا بڕیاریان داوە کە لەپشت هەستەکانەوە و بەدرکپێکردن بەبێ هۆکار ئەوا خۆشییەکان چێژیان لێوەردەگیرێ، هیچ گرنگی بە خۆشی کەسانی دیکە نادەن، بەڵکوو ئەوان تەنها مەبەستیان لەو چێژەیە کە لەخۆشیدا بەدەستی دەهێنن، هەروا ئەو قسەیان سەبارەت بەوەی کە مرۆز لەنێوەندی درکپێکردندا خۆشی دەدۆزێتەوە ئەمە باسێکی پووچە".

"هەروا کاتێك دەڵێن مرۆڤ سەربەخۆیە لەچاککردنی خودی خۆی بەشێوەیەك کە دەبینێ بەو شێوەیە خۆشگوزەران دەبێ، بەڵام ئێمە ئەوەمان خستە روو کە خۆشی و ناخۆشییەکان پەیوەستە بە درکپێکردنی لەش و رووحی، چونکە ئەوە درکپێکردنی رووحییە و بەمەش دەگاتە خۆشی و خۆشگوزەرانی، چونکە مەبەستە رووحییەکان پەیوەست نییە بە ئەرگۆمێنتی عەقڵی و پێوەرەکان چونکە ئەمە خۆی لەخۆیدا سروشتێکی دیاریکراوە، هەموو ئەمانەش لەنێوەندی شەریعەتدا زۆر بەسانایی باسکراوە".

"ئەو زانستەی ئەوان باسی لێوە دەکەن کەموکوڕی تیایە و مەبەستی خۆیان نەگەیاندووە تەنها ویستویانە لەنێوەندی پێچەوانەی شەریعەتەکان بجوولێنەوە، ئەگەر مەبەستیان نەپێکابێ، بەڵام یاساکانیان راستەقینەیە، هەموو ئەو قسانەشم لەپاش ئەوە هات کە سەیری هەموو رێبازەکانم کردووە و لەنزیکەوە خوێندومەتەوە و ئاشنای بوومە، لەوانەشە سەرکەتوو نەبوونە لەچوونیەتی بەخشینی ماناکانیان".

## ٩- برایانی سەفا (ئیخوان سەفا)

فەلسەفە لەسەردەمی عەباسیدا رۆڵێکی باڵای هەبوو، زۆرێك لەوانەی خەریکی زانست بوون خۆشیان بەفەلسەفەوە سەرقاڵ دەکرد بەتایبەتی ئەوانەی زیاتر کاریان لە زانستەکانی زانایانی پێشتر دەکرد، لەتەك ئەوەی فەیلەسووفەکانی ئەوکات تۆمەتبار دەکران بە گومڕایی و کوفر، ئەمەو زاراوەی فەلسەفە لەتەك زاراوەی کوفر و گومڕایی دادەنرا، ئەمەش وایکرد رکابەریەك لەتەك خەلیفە مەئموونددا بکرێ، چونکە ئەو هۆکاری ئەوە بوو فەلسەفە وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، هەتا ئیبن تەیمیە لەیەکێك لەوتەکانی دەبێژێت "باوەڕناکەم خودا لە مەئموون خۆش بێت، هەر دەبێ سزای بدات، چونکە ئەو باسانەی هێناوەتە نێو ئەو نەتەوەیە!".

### ناودارترین تاکەکانی کۆمەڵەی ئیخوان سەفا

ئەوانەی کاریان لەسەر فەلسەفە دەکرد بۆ ئەوەی بەشاراوەیی بمێننەوە چەندان کۆمەڵەی نهێنیان دامەزراند و ناودارترین کۆمەڵەش کۆمەڵەی ئیخوان سەفا بوو، کە لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچیدا لەبەغدا پێکهات، کە باس لە پێنج لەئەندامانیان دەکرێ کە ئەمانەن:

١- ئەبوسلێمان محەمەد کوڕی معشر ئەلبستی کە ناسراو بوو بە (مەقدسی)
٢- ئەبو حەسەن عەلی کوڕی هاروونی زنجانی
٣- ئەبو ئەحمەد مهرەجانی
٤- ئەلعووفی
٥- زید کوڕی رفاعە

هەموو ئەو ئەندامانە بەنهێنی کۆدەبوونەوە و باسیان لەجۆرەکانی فەلسەفە دەکرد تا وای لێهات بوون بەخاوەنی رێبازێکی تایبەت، کە پووختەی توێژینەوەکانی فەیلەسووفەکانی ئیسلام بوون، ئەمەش لەپاش ئەوەی چاویان خشاندەوە بە بۆچوونەکانی یۆنان و فارس و هیندیەکان، هەمواریان کرد بە پێورێك لەگەڵ ئیسلام بگونجێ.

بنەمای رێبازەکەشیان لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە "شەریعەتی ئیسلامی پڕکراوە لە لەنەزانین و تێکەڵ کراوە بەگومڕایی وتەنهاش بە فەلسەفە و دانایی باوەڕ پاك دەبێتەوە، لەتەك بەرژەوەندیەکانی باوەڕداری، بەشێوەیەك کە فەلسەفەی یۆنانی و شەریعەتی محەمەدی رێکخرا بەیەکەوە ئەوا کامڵبوون دێتە کایەوە".

## نامە و وتارە فەلسەفییەکانیان

فەلسەفەکەیان لەنێوەندی پەنجاو دوو وتاردا تۆمار کرد و ناویان نا نامە و وتارەکانی (ئیخوان سەفا) بەڵام ناوەکانیان شاردەوە، کە نواندنی فەلسەفەی ئیسلامییە بەهەموو جوانکاریەکەوە، کە بریتییە لە چاوخشاندنەوە لە بنەمای بوون و بنەڕەتی کائینات تا جیهانی هیۆلی و وێنە و بەهای سروشت و زەوی و ئاسمان و رووی زەوی گۆڕانکاریەکان و خراپەکاری و شوێنەواری باڵا و ئاسمان

و جیهــان و جیهــانی ئەســتێرەکان و پێکهاتــەی کــانزا و زانســتی رووەك و وسفەکانی ئاژەڵ و چۆنیەتی پێکهاتەی لەش و هەست و عەقڵ و مـاقووڵ و پیشەسـازی و ئەنـدازە و میوزیـك و لۆژیـك و جۆرەکـانی ئاکـار و سروشـتی ژمارەکان و جیهانی مرۆڤی گەورە و جیهانی مرۆڤی بچووك (ئەمەش تیـۆری هربرت سپنسرە لە کۆمەڵناسـیدا) لەتـەك چـیا و رۆڵ و بـەهای ئەویـنداری و ژیانەوە و نماکردنی رەگەزەکان و جووڵە و کێشە و سنوور و وێنـە بەگشـتی هەروا هەموو زانسـتە سروشـتی و بیرکـاری و فەلسـەفی و ئیلاهـی و عـەقڵی بەخۆیەوە گرتبوو.

ئەوەی سەیری ئەو وتارانە بکات دەبینی بەتوێژینەوەیەکی ورد کاری لەسەر کراوە، ئەو بۆچوونانەش باشترین بۆچوونن کە ئێستا گوترابێ و سەد سـاڵی نەبرد تا گەیشتە وڵاتی ئەندەلووس ئەمەش لەسەر دەسـتی ئـەبی حەکـەمی عەمری کوڕی عەبدولڕەحمان کرمانی قورتووبیەوە.

ئەبو حەکەم یەکێك بوو لەزانایانی قورتوویە بەرەو رۆژهەڵات چوو تا بچێتە نێو دەریای زانست وەك هەموو زانا ئەندەلووسیەکان، کاتێك گەڕایەوە وڵات ئەو وتارانەی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە باس لەفەلسەفە دەکـات و یەکـەمجاریش لـە ئەندەلووسدا بڵاوی کردەوە، ئەمەش زوو بەزوویی بڵاو بۆوە تا وایلێهات لەسەر ئەو بابەتانە دەیانخوێند و لێکدانەوەیان لەمەڕ ئەنجام دەدا.

ئەو نامە و وتارانە لە ساڵی ١٨٨٣ز لە لیزج و لە ساڵی ١٨٨٦ز لە بۆمبـای و لەساڵی ١٨٨٩ لەمیسر چاپکرا و گۆڕدرا بۆ زمانی هیندی و لەساڵی ١٨٦١ لە لەندەن چاپکراوە.

پوختەی فەلسەفەی ئیخوان سـەفا لەنێوەنـدی پـەنجاو دوو وتـار و نامـەدا دابەشکراوە کە کراوەتە چوار بەش:

**بەشی یەکەم – چواردە نامە و وتار بیرکاری فێرکارییە**

**بەشی دووەم – حەڤدە نامە و وتار باس لە لەشی سروشتی دەکات**

**بەشی سێیەم – دە نامە و وتار دەروونی عەقڵییە**

**بەشی چوارەم – یانزدە نامە و وتار باس لە ئیلاهیات دەکات**

**نامە و وتاری یەکەم سەبارەت بە.....**

**نامە و وتاری دووەم سەبارەت بە ئەندازەیە**

**نامە و وتاری سێیەم سەبارەت بە ئەستێرەیە**

**نامە و وتاری چوارەم سەبارەت میوزیکە**

**نامە و وتاری پێنجەم سەبارەت بە جوگرافیایە**

**نامە و وتاری شەشەم سەبارەت بەڕەچەڵەکە**

**نامە و وتاری حەوتەم سەبارەت بە پیشەی زانستییە**

**نامە و وتاری هەشتەم سەبارەت بە زانستە**

**نامە و وتاری نۆیەم سەبارەت بە جۆرەکانی ئاکارە**

**نامە و وتاری دەیەم سەبارەت بە ئیماگۆجییە**

**نامە و وتاری یانزدەهەم سەبارەت کاتیفۆریاسە**

**نامە و وتاری دوانزدەهەم سەبارەت بە بارمینیاسە**

**نامە و وتاری سێزدەهەم سەبارەت ئەنولۆتیکای یەکەمە**

**نامە و وتاری چواردەهەم سەبارەت بەئەنولۆتیکای دووەمە**

## بەشی دووەم

**نامە و وتاری یەکەم سەبارەت بە هیۆلی و وێنەیە**

**نامە و وتاری دووەم سەبارەت بەئاسمان و جیهانە**

نامە و وتاری سێیەم،

نامە و وتاری چوارەم،

نامە و وتاری پێنجەم،

نامە و وتاری شەشەم،

نامە و وتاری حەوتەم،

نامە و وتاری هەشتەم،

نامە و وتاری نۆیەم سەبارەت بە پێکهاتەی لەشە

نامە و وتاری دەیەم سەبارەت هەست و هەستەوەرەکانە

نامە و وتاری یانزدەهەم سەبارەت بەسەرچاوەی دڵۆپەکەیە

نامە و وتاری دوانزدەهەم سەبارەت بە مانای وتەی داناکانە کە "مرۆڤ جیهانێمی بچووکە" کە مانای (جیهانێکی گەورەیە

نامە و وتاری سێزدەهەم سەبارەت بە چۆنیەتی بڵاو بوونەوەی دەروونەکانە

نامە و وتاری چواردەهەم سەبارەت بە توانای مرۆڤە

نامە و وتاری پانزدەهەم سەبارەت بەبەهای مردن و ژیانە

نامە و وتاری شانزدەهەم سەبارەت بە بەهای چێژ و ئازارەکانی لەش و رووحییە

نامە و وتاری حەڤدەهەم سەبارەت بەکێشەی جۆرەکانی زمانە

## بەشی سێیەم

نامە و وتاری یەکەم سەبارەت بە بنەمای عەقڵییە بە بۆچوونی فیساگۆرس

نامە و وتاری دووەم سەبارەت بە بنەمای عەقڵییە بە بۆچوونی ئیخوان سەفا

نامە و وتاری سێیەم سەبارەت بەواتای وتەی داناکان کە دەڵێن (جیهان مرۆڤێکی گەورەیە)
نامە و وتاری چوارەم سەبارەت بە عەقڵ و ماقووڵە
نامە و وتاری پێنجەم سەبارەت بە رۆڵ و جۆراوجۆری سەدە و رۆژگارەکانە
نامە و وتاری شەشەم سەبارەت بەبەهای ئەویندارییە
نامە و وتاری حەوتەم سەبارەت بە بەهای ژیانەوەیە
نامە و وتاری هەشتەم سەبارەت بڕی توخمی جووڵەیە
نامە و وتاری نۆیەم سەبارەت بە کێشە و چارەسەریەکانە
نامە و وتاری دەیەم سەبارەت بە سنوور و وێنەکانە

## بەشی چوارەم

نامە و وتاری یەکەم سەبارەت بە بۆچوون و رێبازەکانە لە ئایینە شەرعییەکان و فەلسەفییەکانە
نامە و وتاری دووەم سەبارەت بەو رێگەیانەیە کە بەرەو خودا دەمانبات
نامە و وتاری سێیەم سەبارەت بە بڕوایی ئیخوان سەفا و خلانی وەفایە
نامە و وتاری چوارەم سەبارەت بە چۆنیەتی دەیەی ئیخوان سەفا و خلانی وەفایە
نامە و وتاری پێنجەم سەبارەت بە بەهای باوەڕە
نامە و وتاری شەشەم سەبارەت بە بەهای خوداییە
نامە و وتاری حەوتەم سەبارەت بە چۆنیەتی بانگەوازە بۆ خودای گەورە
نامە و وتاری هەشتەم سەبارەت بە کردەوەی رەوحانییەکانە
نامە و وتاری نۆیەم سەبارەت بە بڕی سیاسەت و چۆنیەتی کارکردن لەسەری

نامە و وتاری دەیەم سەبارەت بەحیهانی گشتییە
نامە و وتاری پانزدەهەم سەبارەت بەبەهای سیحر و داوەتکردنە
پوختەی فەلسەفەکەیان لەکۆی گشتیدا پەنجا و دوو نامە و وتارە.

## لەنێوەندی دە لە برایانی سەفا و هاوکاریکردن لەتەك یەكتردا

پێشتر باسمان لەوە کرد کە ئیخوان سەفا بەنهێنی کۆبوونەوەیان کردووە و باسیان لە فەلسەفە کردووە بەهەموو جۆرەکانیەوە تا ئەو کاتەی رێبازی تایبەت بەخۆیان دانا، ئەم کۆمەڵەیە دەستوریٚکیان هەبوو لەژیانیاندا و ویستویانە گشتگیری بکەن بۆ ئەوانەی وەك خۆیانە لەهەموو ولاتاندا ئێمەش لێرەدا ویستومانە ئەو باسایە پوخت بکەینەوە وەك دانایەکی مێژوویی.

توانیان لەنێوەندی هەموو کۆمەڵەکان خۆیان بسەلمێنن تا ئەو کاتەی کۆبوونەوە و دانیشتنی تایبەت بەخۆیان هەبوو و لەکاتی زانراودا کۆدەبوونەوە تەنهاش خۆیان بوون و کەسی دیکە نەدەهاتە نێو دانیشتنەکەیان و لەوێدا باسیان لەزانست و نهێنیەکانیان دەکرد، لەتەك توێژینەوە و چاوخشاندنەوە بە کتێبە ئیلاهیەکان بەتایبەتی لەرووی شەرع و گێڕانەوە و فەرموودەکان و ئەو مانایانەی کە تیایدا بەدەردەکەوێ، هاوکات باسیان لە زانستە بیرکاریەکان دەکرد کە چوار بەشە کە ژمارە و ئەندازە و ئەستێرەناسی و نووسینە.

بەلام مەبەستی سەرەکیان توێژینەوە بوو لە زانستە ئیلاهیەکان کە مەبەستی سەرەکی بوو، بەکورتی باسیان لەزۆربەی زانستەکان دەکرد و بەهیچ شێوەیەك دەمارگیریان بەرامبەر هیچ کام لە رێبازەکان نەبوو، چونکە بۆچوونی ئیخوان سەفا سەیر کردن و چاوخشاندنەوە بوو بەهەموو رێباز و بوونەکان لەرووی هەست و عەقلّ تا رووکەش و ناوەڕۆکەکەی و شاردراوەیی لەنێوەندی راستی

کە لەبنەمادا یەك کێشە و یەك جیهان و یەك دەروونە کە لەنێوەندی هەموو رەگەزە جۆراوجۆرەکانە.

## سەرچاوەی زانستەکانی بریانی سەفا ( ئیخوان سەفا )

بریانی سەفا یان ئیخوان سەفا لەوتارەکەیاندا باسیان لەوە کردووە کە زانستەکەیان لەچوار کتێب وەرگیراوە یەکەمیان کتێبە پۆلینکراوەکانە کە لەزاری دانا و فەیلەسووفەکاندا هاتووە لەبیرکاری و سروشتزانی و دووەمیان کتێبی موعتەزیلە و ئەو کتێبانەی بۆ پەیامبەرەکان هاتووە وەك تەورات و ئینجیل و فرقان و چەند جۆرێکی دیکەی کتێبە ئاسمانییەکان، کە ماناکانی بە سروش هاتۆتە خوارەوە لەلایەن فریشتەکانەوە و ئەو نهێنیانەی کە تیادایە.
سێیەمیش ئەو کتێبانەیە کە باس لەسروشت دەکەن کە وێنەی شێوەی بوونەکان کە پێکهاتەی گەردوون و بەشەکانی تەوەر و جوولەی هەسارەکان و پێوەری تەنەکانیەتی لەنێوەنجی زەمان مەحالبوونی کۆلەگەکەیەتی لەتەك هونەری کائینات لەکانزا و ئاژەڵ و رووەك و جۆرەکانی دروستکراوەکان لەسەر دەستی مرۆڤ، چونکە هەموو وێنە و رەچەڵەك و ئامێرەکان مانا و نهێنی خۆی هەیە کە زۆر وردە و خەڵکیش تەنها رووکەشەکەی دەبینێ و نازانن ناوەڕۆکەکەی چ مانایەکی هەیە کە خەسڵەتێکی خودایییە.
چوارەم ئەو کتێبە ئیلاهیانەیە کە تەنها پاکەکان دەستی لێ دەدەن وەك فریشتە کە ناوەڕۆکەکەی باس لەدەروون و رەچەڵەك و گەردیلە و تەنەکان دەکات و بەپێی جوولەکانی، بەپێی دۆخ و رۆژگارەکان، حەشر کردنی لەنێوەندی تەرازوو و حسێبدا تا ئەو کاتەی دەگاتە بەهەشت یاخود فرێدانی بۆ نێو دۆزەخ ئەو ئاگرەی کە دەیسووتێنێ یان دانانەوەی لە بەرزەخ .

## بۆچوونەکانیان سەبارەت بە هاوڕێیەتی

کاتێك برایانی سەفا –ئیخوان سەفا ویستویانە کەسێك بکەنە هاوڕێی خۆیان دەبوو هەموو شتێکی دەربارەی بزانن لەرووی مێژوو و ئاکار و رەوشتی و پرسیاری مەزهەبەکەی لێدەکرا تا بزانن دەکرێ ببێتە هاوڕێکی خۆشەویست و برایان یان نا.

هەموو دەزانن شەڕانگێزی تائیفە و کۆمەڵەکان لەتەك یەکتریدا زۆر جار بۆتە هۆی ئەوەی رەوشت و ئاکارەکان بەرەو ئاقارێکی دیکەدا بڕۆن، چونکە مرۆڤەکان بەپێی سروشتی لەشیان بەو جۆرە رەوشت و ئاکاریشیان جیایە.

لەتەك ئەوەی هەمووان دەزانن هەموو لەلایەن خوداوە دروستکراون بەڵام هەر یەکە و رەوشت و ئاکارێکی هەیە هەیانە چاکەکارە و هەشیانە خراپەکارە.

بۆیە پێویستە ئەو هاوڕێیەی کە هەتە وەك درهەم و دینارەکان کە لەلاتە بەکاریان بهێنیت و بزانیت کامەیان زۆر باشە و دەتواندرێ بیروبۆچوونی خۆتی پێ بڵێت، ئەوەش دەزانین کاتێك هاوڕێیەکمان دەبێت خۆشەویستی خۆمانی بۆ دەدرکێنین و زۆرجاریش زۆر جیایە لەتۆ لەرووی ویژدانەوە.

لەلای ئیخوان سەفا تەنها هاوڕێیەتی نییە بەڵکوو بەمانای سۆز و خۆشەویستی و هاوکاریکردنە لەتەك یەکتردا و وای دادەنێن یەك دەروونیان هەیە بەڵام لەچەند لەشێکی جیادا، بەو مانایەی لەش گۆڕانکاری بەسەردا نایەت و ئاڵوگۆڕ نابێت.

لەخەسڵەتێکی دیکەدا واغی دەبینن کاتێك چاکەیەك لەتەك هاوڕیەکدا دەکەی دەبێ ئەوە بزانی کە هەمان چاکەی لەتەکدا بکات، کاتێکیش کە هەڵەی کرد دەبێ وابیر بکاتەوە کە وەك برایەتی و هەڵەی کردووە، لەوانەشە گۆڕانکاری بەسەردا بێت بەهۆکارێك.

ئەوە دەزانن کە خەڵك لەچەندان نەتەوە پێکدێ و باس لە کەسانی زانستی دەکەن و لە ئایین نزیك دەبنەوە : هیچ فەلسەفەیەك نازانن، ناتوانن هیچ شەریعەتێك بپێکن، بەڵام دەبینی باس لەنهێنی و شتە شاراوەکان دەکەن، کەچی خودی خۆیان ناناسن و بیر لە بوون و رووکەشی درکپێکراوەکان ناکەن کە بەهەستەکان فریوویان دەدەن لەنێوەندی عەقڵدا ئاگادار بە ئەوانە کەسانی دەجالن.

ئەگەر کارەکە وابڕوات بیر لەچاکسازی پیرەکان مەکەنەوە کە هەر لەمنداڵیەوە فێر بۆچوونی خراپەکاری بوونە لەتەك چەندان ئاکاری خراپ بەڵام لەتەك گەنجەکاندا بە و ئەوان بکەرە هاوڕێ و تەنهاش دانایی ببەخشە بەگەنج و هەردەم ڕێز و نەوازشی خۆت پێیان ببەخشە، چونکە کاتێك خودا هەر پەیامبەرێك دەنێرێ سەرەتا قسەی پیر و بەناو شێخەکان بەدرۆ دەخاتەوە.

## ریزبەندی برایانی سەفا ( ئیخوان سەفا ) لەرووی دەروونییەوە

زانراوە کە هێزی دەروونی برایانی سەفا بۆ چوار بەش ریزبەندکراوە

یەکەم- پاکی ناوەڕۆك و دڵ و دەروون و پەسەندکراو و خێرایی بۆچوونەکان کە ریزبەندیەکە بۆ ئەوانەی پیشەگەرن لە شارەکەمان کە لە وتاری دووەمدا باسی کراوە کە هێزی عەقڵە بۆ مانای هەستیارەکان لەسەر هێزی قسەکەر لەپاش پانزدە ساڵ لە لەدایکبوونی لەش.

دووەم - ریزبەندی سەرکردەکانە کە خاوەن سیاسەتن و بایەخپێدەری برایانن و دەروون و دڵیان پڕیەتی لەبەخشش و سۆز و هێزی دانایی لەسەر هێزی عەقڵ لەپاش سی ساڵ لە لەدایکبوونی لەش کە ناویان نراوە چاکەکاران.

سێیەم – لەسەرووی ئەمانەوە ریزبەندی پاشا و سوڵتانەکانە کە دەتوانن بڕیار بدەن و فەرمان بکەن و هەموو نکۆڵیەکان راست بکەنەوە و بەرەو چاکسازی بمانبەن کە هێزێکی ناموسییە کە لەپاش چلْ ساڵ لە لەدایکبوونی لەشەوە دێتە ئاراوە کە ناویان دەنرێ برایە چاکەکارەکانمان.

چوارەم – لەسەرووی ئەمانەوە داوا لەهەموو برایانمان دەکەین کە لەهەر ریزبەندیەك دابێت دەبێ کارەکان پەسەند بکەن کاتێك رەوایی و هەق لەسەرووی شتەکانەوە بوو ئەمەش هێزێکە لەپاش پەنجا ساڵ لە لەدایکبووی لەشەوە دێتە ئاراوە، کە بەرەو رۆژی دوایی هەنگاو دەنێ واتە بۆ ژیانەوە و حەشر و تەرازوو و رۆیشتن لەسەر رێیە راستیەکان هەنگاو دەنێ و هۆیەکە تا رزگاری بێ لەئاگر و گەیشتن بە بەخشندەیی خودایی، بۆ ئەمەش فیساگۆرس ئاماژەی بەوە داوە لە نامە زێرینەکەی کە تیایدا دەڵێت "تۆ ئەگەر کارەکەت کردە هیچ شتێکم بۆت نییە، کاتێك لەش جیا دەبێتەوە لەرووح، ئەوکاتە تەنها لەهەوا دەمێنیتەوە و ناگەڕێتەوە بۆ مرۆڤبوون و ناچێتەوە نێو ئاگر".

**ئەوەی داواکراوە بۆ چوار دۆخە:**

یەکەمیان: دانپیانانی راستی فەرمانەکان

دووەمیان: خستنە رووی بۆچوونەکان بە هێنانەوەی پەند و روونکردنەوە

سێیەم: راستیەك کە وێژدان و بڕوای لەتەکدایە

چوارەم: چاوخشاندنەوە بە ئیجتهادەکان لەنێوەندی کارەکاندا ئەگەر گرفتێك لەبابەتەکان هاتە کایەوە.

**ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بە فەلسەفەی برایانی سەفا ( ئیخوان سەفا )**

**فەلسەفەی ئاکار و ڕەوشت بە پێی بۆچوونی برایانی سەفا ( ئیخوان سەفا )**

بەپشت بەستن بە کورتکردنەوەی وتار و نامەی چوارەم و نۆیەم لە دەروازەی یەکەم و دووەم لە توێژینەوەی دووەم و شەشەم لەبەشی سێیەمدا:

کۆمەڵەی ئیخوان سەفا لە نامە و وتاری چوارەمدا باسیان لە ماتماتیك لەزانستی میوزیکدا کردووە و کاریگەری لەسەر دەروون و چاکسازی ئاکاردا، لەوێدا بەروونی گوتوویانە مەبەستیان فێرکردنی گۆرانی و دورستکردنی جێگەی ڕابواردن نییە، بەڵکوو مەبەستیان لە زانیارییە سەبارەت بە ڕەچەڵەکەکان و چۆنیەتی نووسینی میوزیکە و ئەوەی ئەو کارە بکات کەسێکی زیرەکە، هەروا دەنگ و ئاوازەکان کاریگەرییان لە دەروونەکاندا هەیە وەك کاریگەری هێزلی لەبابەت پیشەکەیان، دیارە ئەو جۆرە دەنگ و ئاوازانە مرۆڤ بەرەو کاری قورس دەبات، هەروا بەهێزی دەکات لەنێوەندی ئەو ئاوازی ماندەرانە کە لە جەنگەکاندا بەکار دەهێندرێ، بەتایبەتی ئەوانەی بەیتەکانیان کێشی هەیە، هەروا کێشەکان هەموو خراپەکاریەکان دەجولێنێ و دەروونە هێمنەکان دەبزوێنێ، لەتەك ئەوەی ئاواز و میوزیکەکان لەنێوەندی هەموو گەلاندا بوونی هەیە چ لەکاتی ئازار و خۆشیدا و هەندێکجاریش لەنێوەندی پەرستگەکان و بازاڕەکان یان لەکاتی پشوو و ماندوو بووندا، کە لەلایەن پیاو و ئافرەت و زانایان بەکاردەهێندرێ، لەتەك ئەوەی کاروانچییەکان لەڕێگە دوورەکاندا گوێی لێ دەگرن، هاوکات لەکاتی ڕاوکردنیشدا میوزیك بەکارهاتووە.

دەنگەکانیش دوو جۆریان هەیە: ئاژەڵی و نا ئاژەڵی، وەك دەنگی بەرد و ئاسن و بروسکە و تەپڵ و ئامێرەکان، لەلایەکی دیکەوە دەنگە تیژ و پڕەکان سەرەتا دەنگی ناخۆش بوو دواتر تێکەڵ کران لەگەڵ دەنگی دیکە و گوێگرانی پەیدا

بوون، لەتەك ئەوەی دانایان چەندان ئامێریان دروست کرد بۆ ئاوازەکانی میوزیك، هاوکات ئەوەش دەزاندرێ گەردوونەکانیش دەنگیان هەیە، بەڵام ئاواز نییە، کەچی سوودی هەیە بۆ ئەوانەی حەز بەو دەنگانە دەکەن، هەموو ئەو دەنگ و ئاوازانەش لەلایەن قوتابییان و مامۆستایان و دانا و زایانەوە گوێگری هەیە، لەنێوەندی دانایانیش فەلسەفە توانایەکی مرۆڤایەتییە، باس لەوە دەکرێ کە فیساگۆرس زۆر بەهێمنی گوێی لەدەروونی خۆی گرتووە لەتەك ئاوازی دڵی کە پێی گوتراوە جوولەی گەردوون و هەسارەکان و بەو پێیەش جوانترین بیرۆکەی بنەماکانی میوزیك و ئاوازەکانی داناوە.

هەروا مەبەستی پەیامبەرەکانیش لەدانانی شەریعەتەکان چاکسازی بووە لە ئاین و مەبەستی سەرەکیشیان بۆ دەروونەکان بووە تا لە ئازارەکانی دونیا دووربکەونەوە.

هەروا کاریگەری میوزیکژەن لەژەنینی میوزیك لەسەر یەکێك بۆ یەکێکی دیکە جیایە و هەریەك چێژێکی لێ وەردەگرێ، هەموو ئەمانەش بەپێی ریزبەندییە، ئەوەش زانراوە کە ئاکار و شێوازی خەڵکی چوار روو دەگرێتەوە:

یەکەم: لەرووی تێکەڵبوونی لەشەکانیان و سەلیقەی تێکەڵبوونیان

دووەم: لەرووی شێوازی وڵاتان و جیاوازی ناسنامەکەی

سێیەم: لەلایەکی دیکەوە لەرووی چۆنیەتی گەشەکردنی ئایینەکان لەلایەن مامۆستا و ئەوانەی ئامۆژگاری دەکەن.

چوارەم: لەرووی هۆکارەکانی ئەستێرە لە نێوەندی لەدایکبووەکان.

هەروا ریزبەندی دەروونەکانیش سێ جۆرە: وەك دەروونەکانی مرۆڤایەتی و ئەوەی لەسەرروویەتی، یان لەتەکیدا نییە.

ئەوەی لەتەکیدا نییە حەوت ریزبەندییە لەگەڵ گشتیش پانزدە ریزبەندییە، دیارە پێنجی یەکەم لەسەرووی ریزبەندی مرۆڤەوەیە کە ریزبەندی پیرۆزی و مولکەیەتە، ریزبەندی مولکیەتیش دانابیە و ریزبەندی پیرۆزیش پەیامبەرییە.
هەموو ئەمانە و چەندان باسی دیکەش لەلایەن سپنسری زانا کراوەتە بنەمایەك بۆ زانستی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵناسی و بەپێی قسەی دانایان جەختی لەوە کردووەتەوە کە جیهان مرۆڤێکی گەورەیە، هەروا باس لەوە دەکرێ کە گرنگی بە زەوی و ئاسمان و هەموو بەشەکانی گەردوون دەدرێ و هەموو نێوەندەکانیشی لەیەك تەن و لەش پێك هاتووە، بەو پێیەی هەمووی یەك دەروونە وەك هەموو ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و ئارەزووە و جوولە و دەروونی لەیەك لەشدا دەسوڕێتەوە.
کۆمەڵەی ئیخوان سەفا هەوڵی ئەوەیان داوە لەوتاری دووەم و دەروازەی دووەم باس لە (ئاسمان بکەن وەك چاکسازیەکی دەروون و ئاکار، هەموو ئەمانەش وەك پێکهاتەی لەشی مرۆڤ باسیان لێوە کردووە و ئەو هێزەی کە لەنێوەندی لەشیدا دەسوڕێتەوە، لەوتارێکی دیکەدا باس لە بەهای دەروونی جیهان دەکات.
لەلایەکی دیکەوە باسیان لەرۆژی دوایی کردووە کاتێك دەروون لەلەش جیا دەبێتەوە پەیامبەری مەزن دەفەرمووێ "ئەوەی مرد ئەوا رۆژی قیامەت و دوایی هاتووە". مەبەستی لە دەروون بووە نەك لەش، چونکە لەش لەکاتی مردندا هەڵناسێتەوە بەڵکوو وەك خۆی دەمینێتەوە و هەڵناسێتەوە.
هەروا باس لەوە دەکەن کاتێك دەروون لەو پەیکەرەدا جیا بۆوە هیچ سوودێکی نییە و نامێنێ، لەلایەکی دیکەوە ئیخوان سەفا بەشی سێیەمیان کردووەتە بابەتی بەهای عیشق و ئەویندرای و دەروونی نەخۆش، زۆرێك لە زانایان باسیان

لەو نەخۆشییە کردووە کە نەخۆشەکان ناتوانن بخەون و لەش و چاویان هەردەم کراوەیە، باسیش لەوە دەکەن کە ئەمە شێتیەکی ئیلاهییە، پزیشکەکانیش ناویان ناوە (مالیخولیا) و هەندێکی دیکەش باس لەوە دەکەن بەهۆی هێزی ئەو عیشق و ئەوینە زۆر بەرەو شکۆ بوون هەنگاو دەنێن لەبارەی ئەمەش شاعیر دەڵێت :

أعانقها والنفس بعد مشوقة  اليها وهل بعد العناق تداني
وألثم فاها كي تزول صبابتي  فيزداد ما ألقى من الهيمان
كأن فؤادي ليس يشفي غليله  سوى أن ترى الروحين يمتزجان

بەو مانایەی لەتەك دەروونداا باوەشی پیادا دەکەم، تا هەموو گوناه و تاوانەکانم نەمێنێ وەك ئەوەیە دڵم تێکەڵ بەهەموو شتەکان دەبێ تا هەرچی خەم و ئازارە چارەسەر دەبێ، دیارە هەموو مەبەستەکان عیشقی خوداییە.
ئەگەر خەڵك وابزانن خۆشەویستی و ئەوین تەنها بۆ شتە باشەکانە، بەڵام کێشەکە لەنێوان عاشق و مەعشووقە کە چەندان بۆنە هەیە تا لەیەکتر بگەن ئینجا بەهەست و هەستەوەرەکانیش بێت، زۆر جاریش ئەویندداری پڕیەتی لەنەزانی و سەرخۆش بووە بەو عیشقە.
لێرەوەش مەبەست لەتایبەت و گشتییە، چونکە گشتی کاتێك شتێکی دروستکراو دەبینن و رازاوەتەوە ئەوا دەروون و ئارەزوویان بۆی دەچێ و لێی نزیك دەبنەوە و بەڵام ئەوانەی بژاردە و تایبەتن تەنها بیرکردنەوە و رامانەکانیان بۆ دروستکەری دانا دەچێت کە زانا و دانا و بەخشندەیە، ئەویش خودای مەزنە.

تا ئێرە کورتکراوەی ئاکارە لەلایەن ئیخوان سەفاوە واتە لەنێوەندی فەلسەفەکەیان، وەکچۆن خوێنەر تێکەڵیەکی لەنێوان دانایی و تەسەووف و گەردوون و بیرکاریدا بەدی کردووە.

فەلسەفەی ئیخوان سەفا نواندنی ماوەیەکە لە مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی و نووسینەکانیان تەواوکارە تەنها شیکردنەوە و باسکردنی دەوێ تا ببێتە زنجیرەیەکی جوانی شوێنەواری فەیلەسووفەکانی ئیسلام.

## ١٠-ئیبن هەیسەم

ئەبو عەلی کوڕی حەسەن کوڕی هەیسەم لەرەچەڵەکدا خەڵکی بەسڕایە و لەپاشاندا چووەتە میسر تا کۆچی دوایی لەوێدا مایەیەوە بەهەمان شێوەی ئیبن خەلدوون.

ئەو یەکێك بوو لە بلیمەتەکانی سەردەمی خۆی لە زانستەکانی ماتماتیك و کاری لەسەر فەلسەفە کردووە و زۆرێك لەکتێبەکانی ئەرستۆی شیکردۆتەوە و هاوکاتیش پوختەی کردووە.

علمەدین قەیسر کوڕی ئەبی قاسمی کوڕی عەبدولغەنی کوڕی مسافر حەنەفی موهەندیس باسی لەوە کردووە کە ئیبن هەیسەم سەرەتا فەرمانبەر بووە لەبەسرا، بەڵام کارەکەی وایلێکردبوو کار لەسەر دانایی و فەلسەفە نەکات، بۆیە بەهەر شێوەیەك بێ دەیویست واز لەفەرمانبەری بهێنێ لەکۆتایدا خۆی شێت کرد لەسەر ئەو شێتیەشی بەردەوام بوو بۆیە حکومەت لە فەرمانبەریەتی و ئەو پۆستەی لەدەستی دابوو دەریکرد.

ئیبن هەیسەم لە لەدایکبووی ساڵی ٣٥٤ك و لەساڵی ٤٣٠ك کۆچی دوایی کرد.

پاش ئەوەی وازی لەپۆستەکەی هێنا بەرەو میسر ڕۆیشت کە تا سەردەمانێکی زوو پەنایەك بوو بۆ هەموو زانا و ئەدیبێك، ئەو لە مزگەوتی ئەزهەری قاهیرە مایەوە و ئەمەو بە دانەکانی (ئەکلیدس ) و (مجستی) دەژیا تا کۆتایی ژیانیشی بەو جۆرە مایەوە.

لەلایەکی دیکەوە کاتێك ئیبن هەیسەم چووە میسر ئەو هەواڵەیان بە حاکم بامراللە گەیاند، باسیش لەوە دەکەن ئەو دەسەڵاتدارەی سەردەمی فاتیمیەکان شێت و گومڕا بووە وەك بەشێك لە مێژوونووسان باسی لێوە دەکەن، چونکە لەناکاوێك ون بوو، ئەو کاتەی لەسەر دەسەڵاتیش بوو هۆگری ئەوە بوو کە ئیبن هەیسەم ببینێ، چونکە لەلای ئەوە باسی ئەوەیان بۆ کردبوو کە ئیبن هەیسەم کەسێکی کارایە لە فەلسەفە و بیرکاری ۆ ئەندازیاری.

ئەو کاتەش حاکم زیاتر هۆگری ئەوە بوو کە ئیبن هەیسەم ببینێ کاتێك یەکێك لە وتەکانی ئیبن هەیسەم پێگوترابوو کە تیایدا دەڵێت " ئەگەر لەمیسر بوومایە لەسەر نیل کارێکم دەکرد سوودێکی زۆری هەبوایە هەموو دۆخێکی نیلم بەبێ زیاد و کەمی دەکرد".

لێرەوەش جەمالەدین ئەبو حەسەنی کوڕی قەفتی لە کتێبی (تراجم الحکما) پشتگیری لە ئبن ئەبی ئەسبەعیە دەکات کە ئیبن هەیسەم لەبەسرا خۆی شێت کردووە و ویستویەتی واز لەکارەکەی بهێنێ، ئەو کاتەی کە ئیبن هەیسەمیش حاکمە بینووە تەنها کاری فەلسەفەی پێنەداوە بەڵکوو پڕۆژەیەکی داوەتە دەستی بۆ ئاودێری زەوی و خامی میسر، بۆیە هەردەم حاکم زۆر هۆگری بینینی "ویلکوکس" بووە بۆیە بەبار پارەی لەتەك خۆیدا بردووە نەوەك کێشەی بۆ دروست بێ.

کاتێك ئیبن هەیسەم لە وڵاتی خۆیدا خۆی شێت کرد و چووە میسر ، لەو کاتەدا حاك بامر الله خۆی ئامادە کرد بۆ پێشوازی کردنی و ئەمەو لەنزیك دەروازەی قاهیرەدا کەناوی خەندەق بوو بە ئیبن هەیسەم شاد بوو، زۆر ڕێزی گرت و میوانداریەکی پاشایانەی لێکرد تا پشوو بدات.

لەپاشاندا حاکم داوای لێکرد ئەو بەڵێنە تەواو بکات کە سەبارەت بەنیل داویەتی.

بەڵام ئیبن هەیسەم تەنها مەبەستی دروستکردنی کۆگایەکی ئاو بووە (خزان ئەسوان) لەپێش ئەوەی ئەندازیارە میسری و ڕۆژئاواییەکان بیری لێبکەنەوە، لەپاش دە سەدە ئینگلیزەکان دروستیان کرد، بۆ ئەو کارەش ئیبن هەیسەم و هاوڕێیەکانی کە وەستای خانوو بوون چوونە ئەو هەرێمە، لەوێدا دەستیان بەکارەکانیان کرد تا گەیشتنە شاری ئەسوان، کە شوێنێکی بەرزە، بەڵام کاتێك شوێنەکەی بینی زانی کارەکەی سەرکەوتوو نابێ زۆر بەشەرمەزاری گەڕایەوە و داوای لێبوردنی لەحاکم کرد و حاکمیش لێبوردنەکەی قبووڵ کرد و بۆ ئەمەش پۆستی دیوانی پێبەخشی ئیبن هەیسەمیش لە ترسانا وەریگرت نەك بە ئارەزووی خۆی.

کاتێك ئیبن هەیسەم ئەو شوێنەوارە دێرینە میسریانەی بینی هەستی بە بێ ئومێدی نەکرد، چونکە ئەو شوێنەوارانە هیچ پەیوەندەیەکی بە پرۆژەیەکی ئەندازیاریەوە نییەوە، لەتەك ئەوەی کاتێك ئەو شوێنەوارانەی بینی لەوڵاتی خۆیدا بەهیچ جۆرێك باسی ئەو شوێنەوارانەی بۆ نەکرابوو، دیارە ئەو پرۆژەیەی کە حاکم پێی سپاردبوو کارێکی زۆری دەویست چ لەرووی دەستی کار بۆ شکاندنی بەردەکان ئەوە جگە لە دروستکردنی پرد، هاوکات گرنگی بەهەموو ئەو شتانە دابوو کە ئەو کارەی پێ ئەنجام دەدرێ، لەتەك ئەوەی خەرجیەکی

زۆری دەوێ لەتەك خەڵکێکی هونەرمەند تا ئەو کارە بکەیەننە ئەنجام، ئەو کاتیش میسر لەرووی دارابییەوە زۆر هەژار بووە، بۆیە ئیبن هەیسەم هەر لەسەرەتاوە وەك دانایەك دەستی لەکارەکە کێشایەوە، چونکە ئەگەر دەستیشی بەکار بکردبوایە ئەوا لەناوەڕاستدا دەبوایە وازی لێبێنێ، بۆ ئەمەش وڵاتی بەرەو هیلاکی دەبرد نەك دەسکەوتی پێدەبەخشی.

کاتێکیش دیوانی میسری گرتە دەست، لەهەموو هەڵەکانی کۆڵیەوە، بینی حاکمی دەسەڵاتدار کەسێکی مەحاڵە و خوێنی زۆر کەسی رشتووە بەشێوەیەك کە خەیاڵ قبووڵی ناکات، بۆیە ئیبن هەیسەم بیری لەوە کردەوە واز لەو کارەش بێنێ، هیچ ڕێگەیەك نەبوو، تەنها ئەو ڕێگەیە نەبێ کە لە بەسرادا گرتییە بەر کاتێك خۆی شێت کرد، کاتێك لەمیسریش خۆی شێت کرد هەر زوو هەواڵەکە بڵاوبووەوە، حاکم بامرالله چەندان کەسی بۆ خزمەتی دامەزراند و لەتەك ئەوەی بەزنجیر بەستیانەوە و لەنێو ماڵەکەیدا جێیان هێشت.

کاتێك ئیبن هەیسەم وازی لەو شێتییە هێنا دووبارە حاکم لەسەر بەڵێنەکەی خۆی بوو و لەماڵەوە هێنایە دەرەوە و لەنزیك قوبەی دەروازەی ئەزهەر شوێنێکی پێدا تا تیایدا بژیت، ئەویش لەو کاتەوە دەستی بەکاری نووسین و وەبەرگرتنەوە(النسخ) کرد، هەر ساڵی جارێك سێ کتێبی نەسخی بەناوی ئەقلیدس–ئەکلیدس دەفرۆشت، لەتەك (متوسئات و مجسئی) ئەم دانانەشی بە سەد و پەنجا دیناری میسری دەفرۆشت، نرخی ئەو کتێبانەش وایدەکرد بۆ ماوەی ساڵێك پێی بژیت.

ئیبن هەیسەم یەکێکە لەوانەی یاداشتی کەسیەتی خۆی نووسیوە ساڵ لەدوای ساڵ و مانگ دوای مانگ، ئەمەو لە یاداشتە تۆمارکراوەکانی لەکۆتایی ساڵی ٤١٧ك کە ئەو کات تەمەنی شەست و سێ ساڵ بووە نووسیوویەتی:

"من هەر لەمنداڵیەوە بیرم لە باوەڕی خەڵکی جۆراوجۆر کردۆتەوە، هەر کۆمەڵەیەکیش پابەند بووە بەو بۆچوونانەی کە لەلای چەسپاوە، بەڵام من گۆمانم لەهەموویان هەبوو کە هەق و راستی تەنها یەکە و شێوازەکانیش جۆراوجۆرن، کاتێك درکم بە بوارەکانی عەقڵ کرد وازم لەزۆر شت هێنا تەنها هەق و رەوایی نەبێ، رووم وەرگێڕا بۆ درکپێکردن و دەمویست هەردەم رەزامەندی خودا بەجێبهێنم، وەك چۆن گالینۆس لە کتێبی حەوتەمیدا بەناوی (حیلة البرء) لەتەك قوتابیەکەیدا قسە دەکات و دەڵێت "نازانم چۆن ئەوەم بۆ رەخسا کە لەمنداڵیەوە لەگەڵ خۆمدا کۆك بوون و داوای بەهرەی خودایم دەکرد تا خودا لێم رازی بێت، زۆر جاران بەشێتیان لەقەڵەم داوم، بەڵام من دژ بەخراپەکاریەکانی گشتی جولامەوە و هەردەم دەمویست تۆڵەی هەق و رەوایی بکەمەوە، لەدوایدا بۆم دەرکەوت باشترین شت ئەوەیە خۆت لەخودا نزیك بکەیتەوە". ئەمانە قسەی گالینۆسە.

ئیبن هەیسەم دەڵێت "ئەم باسانەم پشکنی لەنێوەندی بۆچوون و باوەڕ و جۆرەکانی زانستی ئایینەکاندا، شتە پووچەکانم بەلادا و هەق و رەوایم کردە پەیڕەوی خۆم، بۆچوونی یەقینیم کردە شێوازێکی نوێی ژیانم، بەڵام لەدواتردا بینیم ناگەمە راستی و هەق تەنها بەوە نەبێ کار لەسەر بوارە هەستیەکان بکەم کە لەوێنای عەقڵە، تەنها ئەوشتانەم دۆزیەوە کە ئەرستۆتالیس بڕیاری لەسەر داوە کە باس لە زانستی لۆژیك و سروشتزانی و ئیلاهیات دەکات، ئەمەش سروشتی فەلسەفەیە کاتێك بڕیار لەسەر بوارە گشتی و بەشبەشکراوەکان و تایبەتەکان دەدرێ، دواتر باس لە فۆنەتیکە لۆژیکیەکان دەکرێ کە دابەش دەکرێتە سەر رەگەزە سەرەتاییەکانی دواتر ماناکانی دەخرێتە نێو پێکهاتەکان بەو شێوەیەش قسەیەکی زانراوی پڕ لەمانایە.

"دواتر سەیری مێژووی توخمی پێوەرەکانم کرد کە دابەشی کردووەتە چەند بەشێك لەرێگەی دەروازە و خەسڵەتەکانیدا و لەوێدا پابەند دەبیت بە درۆ و راستیەکانی و کۆك و جیاوازیەکانیشی بەدەردەکەوێ، لەپاشاندا پێوەر و پێشەکی و شێوە و جۆرەکانی دەخرێتە ڕوو، لەپاش ئەوەی ئەنجامەکانی بەدەر دەکەوێ هەست بەشتێکی خۆش دەکەیت، هەروا باس لە سروشتی ئەرگۆمێنت و بەڵگە دەکات لەتەك هەر چوار شێوەی دەمەتەقێ و شیعری و وتار و گفتوگۆکاندا، لەتەك هەموو ئەمانەشدا دەست دەکەیت بە خوێندنەوەی کتێبەکانی (السماع الطبيعی) و (الكون والفساد) و (الاثار العلوية) و (النبات والحيوان) و (السماء والعالم) و (النفس) .

کاتێك ئەو باسانەم تەواو کرد هەوڵمدا تا داواکاری زانستەکانی فەلسەفە بم کە سێ زانستە : بیرکاری و سروشتی و ئیلاهی، بەو شێوەیە پابەند بووم بەو سێ بوارە لە رووی بنەما و لقەکانی، دواتر بینیم سروشتی مرۆڤ دەکرێ بەرەو خراپی بڕوات یان بەرەو کۆتایی و لەناوچوون بڕوان، لێرەوە هەرسێ بابەتم کورتکردەوە بەپێی هزری خۆم و هەڵوەستەکردنم بۆ رێکخستن و پۆلینکردنی لەرووی روونکردنەوەی هەر سێ تارمایی تا ئەو کاتە کە زەوحجەیساڵی ٤١٧كۆچییە".

## سەبارەت بە نووسینەکانی ئیبن هەیسەم

١- شرح اصول اقليدس
٢- الاصول الهندسية و العددية
٣- شرح المجسطى و تالخيصه
٤- الكتاب الجامع فى اصول الحساب
٥- علم المناظر
٦- تحليل المسائل الهندسية

٧- تحليل المسائل العددية بجهة الجبر والمقابلة مبرهنا
٨- تحليل المسائل الهندسية و العددية
٩- كتاب فى المساحة
١٠- حساب المعاملات
١١- اجازات الحفور والابنية بجميع الاشكال الهندسية
١٢- قطوع المخروطات
١٣- الحساب الهندى
١٤- استخراج سمت القبلة فى جميع المسكونة بجداول
١٥- مقدمة الامور الهندسية
١٦- كتاب فى الة الظل
١٧- رسالة برهان الشكل الذى قدمه "ارخميدس" فى قسمة الزاوية ثلاثة اقسام ولم يبرهن علية
١٨- تلخيص مقدمة "فورفوريوس" وكتب ارسطوطاليس الاربعة المنطقية
١٩- مختصر للكتاب السابق
٢٠- رسالة فى صناعة الشعر ممتزجة من اليونانى والعربى
٢١- تلخيص كتاب النفس لارسطوطاليس
٢٢- مقالة فى مشاكلة العالم الزنى وهو الانسان بالعالم الكلى
٢٣- مقالة فى العالم من جهة مبدا و طبيعة وكماله
٢٤- كتاب فى الرد على يحيى النحوى ما نقضة على ارسطوطاليس و غيره من اقوالهم فى....العالم
٢٥- رسالة بطلان مايراه المتكلمون من الله لم يزل غير فاعل ثم فعل
٢٦- مقالة فى طبيعتى الالم واللذة (فلسفة ابيقور)
٢٧- رسالة فى طبيعة العقل
٢٨- مقالة فى ان فاعل هذا العالم انما يعلم ذاته من جهة فعله.

ئەمەی خوارەوەش دوا دەستنووسە بە خەتی فەیلەسووف نووسراوە:

"ئەم وتارەم بۆ هەموو خەڵك نییە، بەڵكوو بۆ ئەو پیاوانەیە كە هاوسەنگی هەزار پیاوە یان دەیان هەزار پیاو، ئەگەر هەق و رەوایی بەدەركەوت كە هەموو خەڵك دركی پێدەكات، ئەوانەی بەتەواوی تێیدەگەن دەزانن من لەچ باڵایەكی زانستدام، دەزانن پایەم چەندە لەمەبەستەكانی رەوایی و هەق، دەزانن ئەو زانستانە تاچەند گرنگن بۆ كارە دونیایەكان كە كڕۆی گشتی خێرە و دژ بەشەڕە، بەرهەمی هەموو ئەو زانستانەشس رەوایی و هەقە واتە زانستی راستی و هەق و كاركردن بەدادپەروەری لەهەموو بوارەكانی دونیایی و دادپەروەریش بنەمای خێرێكە كە كردەیەكی سەركەوتووە".

ئەمە دوا نووسینی ئیبن هەیسەمە كە لەساڵی ٤٢٩ك نووسیوویەتی واتە ساڵێك پێش ئەوەی كۆچی دوایی بكات.

## روونكردنەوەیەك سەبارەت بە ئیبن هەیسەم

مێژوونووسە فەلسەفییەكانی ئەفرەنج، ئیبن هەیسەم بەگەورەترین زانای بیركاری و سروشتزانی دادەنێن لەسەدەكانی ناوەڕاست، هاوكات ئیبن هەیسەم لەسەرەتای سەدەی یانزدەهەمی زاینی ژیاوە لەتەك ئەمەدا باس لە توێژینەوەكانی دەكەن وەك دیاردەیەكی لە بیركاریدا بەكردەیی.

ئیبن هەیسەم لەفەلسەفەدا كاری نەكردووە وەكچۆن لەدانپیانانەكەی باسی لێوە دەكات بەڵام توێژینەوە گەڕان بەدوای راستییەكان هەر لەسەرەتای ژیانیەوە تاكە هۆگری بووە، تا ئەو كاتەی قەناعەتی بەوە هات كە فەلسەفە بنەمای هەموو زانستەكانە و نووسینەكانی ئەرستۆش تاكە سەرچاوە و رێپیشاندەرە، لەمەوەش محەمەد كوڕی حەسەن دەیەوێ بەو رازیمان بكات كە ئەو رێگەیانەی نەگرتۆتەبەر تەنهاش لەپێناو مرۆڤایەتیدا بووە دیارە ئەمەش بۆ

ئەوە بووە تا خۆی جیا نەکاتەوە لەگەمژە و خەڵکی گشتی (لا٩٧ بەرگی ٢ عیون الانبا لابن ابی اصیبعە) بەڵام ژیانی لەسەر توێژینەوە فەلسەفییەکان داناوە تا خزمەت بەمرۆڤایەتی بکات، ئەو بە دوو دانا دەچێت کە وەك ئیبن رووشدی ئەندەلووس و ئۆگست کۆمت لەڤەرەنسای نوێدا (سەیری کتێبی پۆیر بکە سەبارەت بە مێژووی فەلسەفەی عەرەبی).

ئەوەی جێگەی داخە هیچ کام لەنووسین ودانانەکانی ئبن هەیسەم نەماوە بەڵام باس لەوە دەکرێ کە لەرووی بیرکاریەوە زۆر زیرەك بووە وەك دیکارتن و سپینۆزا.

هاوکات بلیمەتەکەی لەنێوەندی دەروونناسی و درکپێکردنی هەستی گشتی بووە، لەتەك ئەوەی چووەتە نێوەندی هەستەوەرە جۆراوجۆرەکان.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن هەیسەم ژیانی وەك متەسەوفێکی گەڕیدە بووە لەدەرگای دانایی داوە و چاوەڕوانە دەرگەکەی بۆ بکرێتەوە تا لەنزیکەوە راستییەکانی بزانێ، لەتەك ئەوەی لەبەسەرای نیشتمانی ئەو سەرکەوتنەی بەدەست نەدەهێنا، دوای ئەوەی رووی لە بنەما سەرکییەکانی بیرکاری و گەردوون کرد.

فەلسەفەی ئەرستۆتالیس لەلای ئەودا سەرکەوتنێکی وا بەدەست نەهێنا و مێژوو تەنها یەك قوتابی ئیبن هەیسەم دیاری دەکات کە ئەبو وەفا بووە، ئەگەر لەناوەڕاستی سەدەی یانزدەهەمدا کیتابێکی سەبارەت بە دانایی و مێژووی فەلسەفی نووسی بێ، ئەوا بیرۆکەی کەسانی پێشووترە و داهێنانی خۆی نییە.

ئیبن هەیسەم دوای مردنی کەسانێك تۆمەتی گومڕایی و کوفریان خستە پاڵی، بۆیە زۆرێك لەکتێبەکانی لە سەرەتای سەدەی سێزدەهەم لەبەغدا سووتاند.

# ١١-محيدين ئيبن عەرەبى

زانستی تەسەووف لەسەردەمی عەباسیدا گەشەی کرد، کە یەکێکە لە زانستە شەرعییە و لەبنەڕەتدا پەرستنی خودایە و دابڕانە لە زۆر شت و رەنگاو رەنگی ژیان، ئەم جۆرە خۆ نواندنەش چێژێکی هەیە کە خۆی جیا دەکاتەوە بۆ پەرستنی خودا لەکاتی خەڵوەتدا.

ئەمەو زانایانی ئیسلام سەبارەت بە وشەی تەسەووف چەندان بیربۆچوونی جیایان هەیە و کۆمەڵێك لەو زانایانە دەیگەڕێننەوە بۆ پاکی و بێگەردی، بەڵام کەسانی دی قسەی دیکەیان کردووە، هاوکات ئیبن خەلدوون پێیوایە کە بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سووفەی دەیپۆشن، چونکە هەموو ئەوانەی لەنێوەندی تەسەووفدان وەك گوتمان سووف دەپۆشن، بەڵام ئێمە دەڵێین ئەمە هەڵەیە، چونکە وشەکە لەوشەی سیۆسۆفیا وەرگیراوە کە یۆنانییە و ماناکەشی دانایی خوداییە و کەسی سۆفیکەریش دانایە و داوای دانایی لەخودای خۆی

دەکات و دەیەوێ بگاتە راستی خودایی کە تێکڕایی مەبەستی سۆفی و سۆفیگەرییە.
هاوکات ئەوەی سۆفیگەرەکان بەدوایدا دەگەڕێن یان دەینووسن توێژینەوەیەکی فەلسەفییە لەپێناو راستی بالآدا، ئەوەی کە پشتگیری لەم بۆچوونە دەکات کە سۆفیگەرەکان تا ئێستا زانستی خۆیان دەرنەخستووە، تا ئەو کاتەی زۆربەی کتێبەکانی یۆنانی وەرگێڕان بۆ زمانی عەرەبی و هاتنە ناوەوەی وشەی فەلسەفە بۆ ناو سۆفیگەری.

## رێگەکانی سۆفیگەری و پلە و پایەکانی

رێگە و شێوازەکانی سۆفیگەری یان پلانیان زانستییە و هەوڵێکە بۆ گەیشتن بە راستەقینەیە و دوورکەوتنەوە لەهەموو کارە خراپکارەیەکان لەهەموو زاراوە خراپەکان، ئەوەی ئەوان دەیانەوێ شێوازێکە بۆ هەوڵدان و پێ داگرتن لەسەر دەروونی خۆیان لەهەموو ئارەزووەکانی ژیان تا بگەنە ئەو پلە و بالآیەی کە لای ئەوان زاراوەیە و لەنێوەندیان باسی لێوە دەکرێ.
هەروا سۆفیگەرەکان چەندان پلە و پایە لەنێوەندیان باوە و هەردەم لەسەر زمانیانە بەتایبەتی ئەو نهێنیانەی کە لەدانیشتنەکانیان باسی دەکەن، ئەمەش وەك سیستەمێکی گەوهەری و ناوەڕۆکی دەروونیان دەمێنێتەوە، بەتایبەتی ئەو پلانەی کە هێزیان هەیە وەك جەمسەر و لاکان و گۆڕاوەکان، لەنێوەندی ئەمانەشدا جەمسەری غۆس بۆ یەکێکە بەدرێژایی ژیانی لەنێوەندی سۆفیگەریدا بێت هەندێکیان بۆ ماوەیەکی دیاریکراوە و کاتێکیش ئەم جەمسەرە جێ دەهێڵێ دەیبەخشێتە یەکێکی دیکە لە مریدەکانی ئەمەش مێژوویەکی ناودارە لەنێویان.

لەهەموو سەردەمەکانیش جەمسەری غۆس ئەو پۆستەی هەیە و هەروا ناو دەنرێن خاوەنی کات، ئەوانەی لەنێوەندی ئەو جەمسەرەدان زۆریان لە وەلیەکانن و مەزارگەکەیان ناودارە، باسیش لەوە دەکرێ کە ئەمانە کارەکانیان چاکسازی و خێزخوازی بووە و لەسەرووی هەمووشیانەوە سەرپەرشتیاری سیستەمی گەردوونی بوونە و هاوبەش لە تەگبیرکردنی بوارە گشتی و تایبەتەکان بەرێگە زانراوەکان کە تەنها خۆیان دەیزانن.

زۆرێك لە نووسەران باسیان لەو بابەتانە کردووە و هەندێکیان تەنها بۆی چووە و لەمبارەیەوە سەهروودی سەبارەت بە جۆرەکانی سۆفیگەری قسەی کردووە و هەروا لەبارەی خۆ پێوەگرتن و گلەیی کردن لەشیکردنەوەی ژیانی خۆیدا، لەتەك ئەوەی باسی لە پلە و پایەی شێخایەتی کردووە کە بەرزترین پایەیە لەشێوازەکانی سۆفیگەری و بەشێوەیەك وای دادەنێن جێگرەوەی پەیامبەریەتییە کاتێك نزا بۆ خودا دەکات، نهێنی ئەمەش بەچەند شێوازێکی نهێنیە کە کاری سیاسەتی دەروونی دەکات، نهێنی ئەمەش لەنێوەندی ئایەتی پیرۆزدا بەدەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە (لو انفقت مافی الارض جمیعا ما الفت بین قلوبهم، ولکن الله الف بینهم).

لەو کاتەدا شێخ خۆی بەبەشێك لەدروستکراوان دەزانێ وەك ئەوەی مەریدێك بەشێکە لەو شێخاتییە یان منداڵ بەشێکە لەباوکی، بە لەدایکبوونێکی مەعنەوی ئەمەش مانای وردەکەی زۆر سەیرە ! وەك چۆن حەزرەتی مەسیح دەفەرمووێ "فریشتەکان ئاسمانن، ئەگەر دووجار لەدایك نەبن" بەو شێوەیە شێخ محێدینی ئیبن عەرەبی لەسەر پەیڕەوی حەزرەتی مەسیح هەنگاو دەنێ، وەك چۆن هەندێکی دیکە بەپێی پەیڕەوی حەزرەتی مووسا هەنگاو دەنێن، بۆ ئەو

لەدایکبوونەش پەیڕەوکار دەتوانێ میراتی پەیامبەرەکان وەربگرێ، بەشێوەیەك کە دەڵێن (زانایان میراتگری پەیامبەرەکانن).

## پەیڕەوکارانیش دەبنە چوار بەش کە ئەمانەن:

١- پەیڕەوکاری رووت

٢- سەرنجڕاکێشراوی رووت

٣- پەیڕەوکارێك کە سەرنجڕاکێشراوە

٤- سەرنجڕاکێشراوە بەپەیڕەوکاران و شێوازەکانیان.

یەکەمیان بۆ شێخایەتی نابێ، هەروا دووەمیش وایە، بەڵام سێیەم دەکرێ ببێتە شێخ و هەواداری هەیە و زانستیان پێ دەبەخشێ، چوارەمیش خاوەنی مەقامێکی بەرزە لە شێخایەتی.

## پێناسەی سۆفیگەری و رەچەڵەکی ناوەکەی

سۆفیگەری و تەسەووف سێ مانای هەیە:

١-ئەوانەن کە رووناکی زانیاری لەلایان ناکوژێتەوە

٢-بەناوەڕۆك قسە ناکەن لەزانستێك کە کەموکوڕی تیایە لەرووی رووکەشی قورئان و سووننەت

٣- کەسێك دژ بەخوا بێ هیچ کەراماتێکی نییە

جونەید دەبێژێت "لەنێوەندی تەسەووفدا قسە و قسەڵۆکمان وەرنەگرتووە، بەڵام برسیەتی و وازهێنانە لەدونیا و لابردنی هەموو شتە باوەکانە بۆ چاکەکاری"، مەبەستی لەمە تێکۆشان و هەوڵدانە بۆ سەلیقە.

باسمان لەوە کرد کە زانایان وتەی جۆراوجۆریان هەیە سەبارەت بە ڕەچەڵەکی سۆفیگەری و ماناکانی، لەمبارەیەوە شێخ شەهابەدین ئەبووحەفس عومەر کوڕی محەمەد عەبدوڵڵا سەهرودی لە کتێبی (عوارف المعارف) کە لەبنەڕەتدا ئەو دانەیە لەلایەن شێخ محەمەد مەحمود شەنقیتی لەساڵی ١٢٩٤ك هەڵوەستەیەکی لەمبارەیەوە کرد و سەبارەت بە سۆفیگەری دەڵێت :"پەیامبەری خودا دروودی خوای لەسەر بێ دەفەرمووێ " ((إن مَثَلي ومَثَل ما بعثني الله به كمثل رجل أتى قومه فقال: يا قوم، إني رأيتُ الجيش بعيني، وإني أنا النذير العُريان، فالنجاء، فأطاعه طائفة من قومه فأدلجوا، فانطلقوا على مهلتهم، وكذَّبتْ طائفة منهم فأصبحوا مكانهم فصبَّحهم الجيش فأهلكهم واجتاحهم، فذلك مثل من أطاعني واتَّبَع ما جئتُ به، ومثل من عصاني وكذب ما جئتُ به من الحق)).زانایان دەیانەوێ ئەوە بڵێن ئەوانەی ملکەچبوونە بوونە بۆ پەیامبەری مەزن دروودی خوایان لەسەر بێت ئەوا دڵیان بێگەرد بووە و بوونەتە سۆفی، ئەمەش لە بێگەردییەوە هاتووە و بەهۆی باوەڕیان دەروونیان پاك بووەتەوە.

ئیمام سەهرودی باس لەوە دەکات سۆفیگەری نزیکبوونەوەیە، بەڵام لە قورئاندا باسی نەکراوە، تەنها بەو کەسانەش دەگوترێ کە جلوبەرگی سۆفیگەری دەپۆشن، هەر کەسێك نزیك بووەوە لە مەقامی وەلییەکان ئەوا دەبێتە سۆفی، بەڵام سۆفیگەر و سۆفی بە جلوبەگەکانیان جیا دەکرێنەوە.هەروا شێخ ئەبووقاسم عەبدولکەریم کوڕی هۆزان قشیری کە یەکێکە لە ئیمامەکانی ئەو کۆمەڵەیە لەکتێبەکەی بەناوی (الرساله القشيريه) ڕەتی ئەوە دەکاتەوە کەسەرەتای سۆفیگەری بگەڕێنێتەوە بۆ ئەبوو حجیفە، باسیش لەوە دەکات کاتێك پەیامبەری مەزن دروودی خوای لەسەر بێت هاتە دەرەوە و ڕەنگی گۆڕا بوو و فەرموویەتی (ذهب صفو الدنيا وبقي كدرها فالموت

تحفة لكل مسلم ). هەروا قشیری دەڵێت ئەم ناوە نـاونراوە لـەو كۆمەڵەیـە هەروا ناوە بەهیچ پێوریك نییە.

لەلایەكی دیكەوە رەتی ئەوەش دەكاتەوە كە سووفیان پۆشـی بـێ و هـەروا رەتی ئەوەش دەكاتەوە كە لەمزگەوتی پەیامبەری درودی خوای لەسەر بێ، هەروا رەتی ئەوە دەكاتەوە لە بێگەردی هاتبێ و لەریزبەندی یەكەمدا نییە، هاوكات شێخ قشێری لەباسی رەچەڵەكەكەدا سەركەوتوو نەبووە، بەلام ئەوەش دەخرێتە روو لەوشەیەكی یۆنانی سیۆسـۆفیا هـاتووە كـە ماناكـەی دانـایی خودابییە و دانایە لەپێناو خودا.

سەبارەت بە تەسەووف و ماناكانی هەر یەك لەلای خۆیەوە بەشێوازێك باسی لێوە كردووە ئیبن ئەحمەد بەغدادی باس لەوە دەكات كە تەسووف لەسەر سێ خەسڵەت پێكهاتووە :

١-پشت بەستن بەهەژاری ٢-هەوڵدانی بەردەوام ٣-وازهێنان لەهەڵبژاردن.

هەموو زانایانیش لەسەر ئەوە كۆكن كە سۆفیگەری بەو مانایە دێ "پیاوێـك خودای خۆش دەوێ بۆیە وازی لەدونیا هێناوە".

## هەندێك زاراوەی سۆفیگەری كە هەمووان لەسەری كۆكن

لەنێوەندی سۆفیگەریدا چەندان وشە هەیە بەكاردەهێندرێ و هـەر یـەك لـەو وشانە بۆ شتێك بەكاردێ وەك زمانێكی هێمایییە لەنێوەندی كۆمەڵە رۆژهەلاتی و رۆژئاواییـەكان، زانایـانیش چـەندان كتێبیـان لەمبارەیـەوە نووسـیووە وەك كتێبێكی ئەورووپی بەناوی رووح (ارجۆ) گرنگترین ئەو كتێبانەش لەلایەن زانای ئیتاڵی (نیتشۆفۆرۆ) خراونەتە روو كە ئەو وشانە دەگرێتە خۆ:

(كات) بەو مانایەی كاتی تۆ كە تیایدای وەك كاتی دونیا و كاتی خۆشی، یەكێك لەوتەكانیان ئەوەیە كە "خۆخەریككردن بە كاتەكانی رابردوو دووبارە كاتت بەفیڕۆ دەڕوا"، هەروا دەڵێن خاوەنی كات مەبەستیان جەمسەری غوسە لەنێو ئەوەشدا چەند واتایەكی دیكە دەبەخشێ:

(مقام) واتە ئەو شوێنەی تیایدا دەمینێەوە و تیایدا كارەكانت پەیڕەو دەكەی

(حال-دۆخ) بەو مانایە ئەوشتانەی بەدڵدا دێ

(القبض و البسط- سانایی و بەخوداچوونەوە) بەو مانایە دێ كە لەهەردوو دۆخی ترس و نەوازش دای

(الهیبە و الانس- پایە و خۆشەویستی) ئەمە لەسەرووی سانایی و بەخۆداچوونەوەیە بەشێوەیەك لەسەرووی ئەمانەوە بیت

(تواجد والوجد والوجود) ئەمەش چیرۆكێكی دیارە لەنێوان ئەبوومحەمەد جەریری و جونەید

(جمع و الفرق-كۆ و جیاوازی) لەناوچوونی هەموو هەستەكانە لەسەرووی پلەكانی:

(جیاوازی دووەم) دەبێ خاوەن ئەو پایەیە لەكاتی هەڵسانەوەی ئەركەكانی جێبەجێ بكات

(لەناوچوون و مانەوە) رووخانی هەموو كارە خراپەكان و هەڵسانەوەی كارە باشەكان و چەند مانایەكی دیكەشی هەیە.

(غەیب و ئامادەبوون) غەیب بۆ دڵەكانە لەهەموو ئەو كارانەی كە خەڵك پێوەی خەریكە بەشێوەی هەست، ئامادەبوونیش بەو مانایە دێ كە پەیڕەوكار بەمانا راستییەكەی ئامادەیە ئەگەر لەنێوەندی خەڵكدا بوونی نەبوو.

(ئاگاداربوون و سەرخۆشی) ئاگادار بوون مەبەستی لەهەستەوەرەکانە لەپاش سەرخۆش بوون لەدوای هێزەکانەوە.

(سەلیقە و خواردنەوە) مەبەستی لەو بەرهەمانەیە کە بەهۆی بەرز بوونـەوە دێتە ئارا و بەرزترین پلەشی ئەمانەیە:

(ئاودێری) بـاس لـەوە دەکـەن خـاوەنی سـەلیقەی سەرخۆشـبوو و خـاوەنی خواردنەوە و سەرخۆش و خاوەن ئاودێر هەڵسایەوە بەهۆی خۆشەویسـتی و سەرمیدیەتی خواردنەوەی.

(رەوایـی و سـەلمێندراو) رەوایـی چـەند وەسـفێکی هەیـە، سـەلماندنیش رێنوێنەکانی پەرستنە

(خۆ دوورخستنەوە و بەرزبوونەوە) بەو مانای دوور دەکەوێتەوە لەگشـتی و تایبەتمەندەکانیش بەردەوام بەرز دەبنەوە.

(وانە و دۆزینەوە و بینین) کە سێ پلەیە:

(اللوائح و الطوالع و اللوامع)مەبەست لـەو کەسـانەیە کـە سـەرەتا دڵیـان بەرەو بەرزی دەکشێ، یەکەمیان لاوازە و بەهێزترینیان کۆتاییەکەیە.

(البوادە و الهجوم) ئەو شتانەی کە لەناکاو دێنە ناو دڵی پەیڕەوکار ، ئەوەی دووەمیشیان ئەوەی لەدڵدا دێتە کاتەوە بەهێزی کاتەکانەوە بەبێ دروستکردن.

(نزیکی و دووری) یەکەم پایەی پەرستنە و دووریش پێچـەوانەبوونە و کـاری خراپ دەکات

(شەریعەت و راستی ) شەریعەت پابەندبوونی ملکەچییە و راسـتیش بینینـی خودایـە، هـەر شـەریعەتێکیش پشـتگیری لێ نـەکرێ پەسـەند نییـە، هـەر راستیەکیش لەلایەن شەریعەتەوە پشتگیری لێ نەکرێ دوور دەکەوێتەوە.

(دەروون) خاوەنی دەروونی بەرز و باڵایە لەلایەن خاوەنی دۆخەوە.

لەلای ئەواندا پێیی دەڵێن خاوەنی کات سەرەتایە و خاوەنی دۆخەکان لەناوەڕاستی ڕێگەیە و خاوەنی دەروونەکانە کۆتاییە.

(یاداشت و پەخشان) وتارێکە باس لە ویژدان دەکرێ لەنێوەندی بەهرەمەندەکان، لەوانەیە لە دەروونێکەوە سەرچاوەی گرتبێ، کە شەیتان لەوێدا وەسوەسە دەکات، خوداش هەموو یاداشت و پەخشانێکی ڕاستیت پێ دەبەخشێ.

لێرەوە زۆرێك لەماناکانمان خستنە ڕوو، لەپاش ئەو ئەدەبیاتە و ڕێگەکانی ژیانیان ئەمانە دەبێتە دەستورێك کە ناوی نراوە دەستووری تەسەووف کە زانایان خستوویانەتە ڕوو کە لەئاکاری شێخ و ڕێگە و ئەدەبیاتەکەیان وەرگیراوە.

لەنێوەندی ئەو ڕێگەیانەش تەوبەکردن و هەوڵدان و خەڵوەت و ئیمانداری و هێمنی و ترس و نەوازش و پەرۆشی و برسیەتی و وازهێنان لە ئارەزوو و ئەرێنی بوونی هەیە لەتەك قەناعەت و سوپاسگوزاری و ڕەزامەندی و ڕاستی پەرستن و ڕاستەقینەیی و خۆ تەسلیمکردنە بۆ ئیرادە.

هەروا دە ڕێگەیان هەیە بۆ سەفەرکردن و هاوڕێیەتی.

## ناوی ناودارترین شێخەکانی تەریقەتی سۆفیگەرییە کۆنەکان

١-ئەبوئیسحاق ئیبراهیم کوڕی ئادەم کوڕی مەنسوور خەڵکی بەڵخە و ناوی خودای مەزن لەکەسێکی بیابانی فێر بووە و چووەتە مەککە و ئەو بەدەستی خۆی کاری دەکرد، لە نەوەکانی پاشایەتی بووە و لەساڵی ١٦١ك کۆچیدوایی کردووە.

٢-سۆبان کوڕی ئیبراهیم ئەبووفەیز زونونی میسری لەساڵی ٢٤٥ك کۆچیدوایی کردووە و باوکی لەنوبیا لەدایکبووە، هۆکاری تۆبەکردنی کاتێك بینی کەسێکی کوێر دەتوانێ بژێوی ژیانی خۆی دابین بکات لەنێوەندی بیاباندا بۆیە تۆبەی کرد.

٣-ئەبو عەلی فەزیڵ کوڕی عەیاز لەناوچەی مروی خوراسان لەساڵی ١٨٧ك کۆچیدوایی کردووە و ئەو لەسەرەتادا دز و جەردە بووە، بەڵام دواتر کەنیزەیەکی خۆشویستوە و کاتێك بەسەر دیواردا ویستوویەتی ئاودیو بێ گوێ لەوە بووە کە ئەوانەی بڕوایان هێناوە دڵیان بۆ خودای گەورە هەردەم دووبارە دەکەنەوە، لەدواتر تۆبەی کردووە و جگە لە ئەویندارى ئەو کەنیزەیە، ئەویندارى خوای مەزن بووە.

٤-ئەبو مەحفوز کە ناسراوە بە ئیبن فەیرووزی کەرخی لەساڵی ٢٠٠ك کۆچی دوایی کردووە، ئەو پێشتر ئیسلام نەبووە و دواتر بۆتە موسڵمان و بنەماکانی کارەکانی ملکەچبوونە بۆ خودا و خزمەتکردن بە موسڵمانان و ئامۆژگاری پێشکەش کردن.

٥-ئەبووحەسەن سری کوڕی موفلس سەقتی کە قوتابی کەرخییە و خاڵی جونەید و مامۆستای بوو و لەساڵی ٢٥٣ك کۆچیدوایی دوایی کردووە، هەردەم بە تیۆری مامۆستایەکەی پەیڕەوی دەکرد کە دڵنیاییە.

٦-ئەبوونەسر بشر کوڕی حەرس حافی لە بنەچەدا خەڵکی مرو و لەساڵە ٢٢٧ك کۆچیدوایی کردووە و گەیشتووەتە پیاوە گەورەکانی سۆفیگەری و خزمەتکردنی چاکسازان و ئامۆژگاری برایەکانی و خۆشەویستی بۆ هاوەڵانی و ئەهلی بەیت.

**٧–ئەبوویەزید تەیفوور کوڕی عیسا بستامی لەساڵی ٢٦١ك باپیرەی مەجووسی بووە و خۆشی بووەتە ئیمامی سۆفیگەری و چەندان نووسینی هەیە و هەواداری زۆرە.**

**٨–ئەبووقاسم جونەید ڕێزداری ئەو کۆمەڵەیە و ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ نهاوەند، بەڵام لە عێراق لەدایك بووە و باسی لەوە کردووە کە زانستی تەسەووف پەیوەستە بە قورئان و سووننەت.**

**باسی ئەوەشی کردووە کە لەخودی خوداوە زانستی وەرگرتووە و باسی لەوە کردووە "کە دانیشتووە لەنێوان دەستەکانی خودا بۆ ماوەی سی ساڵ بەپێی ئەو پلەیە" و گەیشتۆتە ئەو پلەیە.**

**٩–ئەبووعوسمان حەیری لەساڵی ٢٩٨ك کۆچیدوایی کردووە ئەو خەڵکی ڕەیی و لەنیساپۆر ژیاوە و نیشتەجێ بووە.**

**١٠–ئەبووعەبدوڵڵا ئەحمەدی کوڕی یەحیای جەلا و باوکی یەکێك بووە لە گەورە پیاوانی شێخایەتی و بەڵام خودا سزایدا، چونکە قورئانی لەبیر چوو بووەوە، کاتێك کەسێکی جوانی بینیوە ئایا خودا سزای دەدا ئەو گوتویەتی یان بینیووتە؟ غەیبە دەزانێ! واتە بەرهەڵستی کردووە.**

**١١–ئەبووسەعید حەسەن کوڕی ئەبووحەسەنی یەسار میسانی بەسری و باس لەوە دەکەن کە لەمەدینە لەدایکبووە لەساڵی ٢١ك و باوکی ناوی متسوق وید سابت و دایکی ئوم سەلامەیە و لەبەسرا پەروەردە بووە و لەمەدینە ژیاوە و پۆستی قەزای لەبەسرا وەرگرتووە و لەساڵی ١١٠ك کۆچیدوایی کردووە ئەو کات تەمەنی نەوەت ساڵ بووە.**

**١٢–ئەبو عەبدوڵڵای حسێن کوڕی مەنسوور حەلاج کە ناوی نراوە ئەبووموعیس و لەتوری بەیزا لەدایکبووە لەساڵی ٢٤٤ك و لەواست پەروەردە بووە و دواتر**

چووەتە مەککە و هیند و ترکستان و دوو جار زیندانکراوە و دواتر لەخاچدراوە و لە٣٠٩ك شەهید بووە.

## هەندێك لەو بلیمەتانەی کە کتێبیان نووسیووە

١-تاجەدین کوڕی عەتاللا ئەسکەندەری شازلی کە لەساڵی ٧٠٩ك کۆچیدوایی کردووە و گۆڕەکەی لەقاهیرەیە لەسەر چیای موقەتەم.

## نووسین و دانانەکانی

١-الحکم العطائیة لە میسر چاپکراوە، لەگەڵ شیکردنەوەکانی لەساڵی ١٢٨٤ و ساڵی ١٣٠٦ك

٢-تاج العروس و قمع النفوس فی الوصایا چەندان جار چاپ کراوە.

٣-لطائف المتن في مناقب شێخ ئەبووعەباس مرسی و شێخ ئەبووحەسەنی شازلی کە ٦٠٨ لاپەڕەیە لە میسر چاپکراوە

٢-جەمالەدین عەبدولرەزاق کلشانی لەساڵی ٧٣٠ك کۆچیدوایی کردووە

## نووسینەکانی

١-زارەوەکانی سۆفیگەری لە کەلکەتا لەساڵی ١٨٤٥ز چاپ کراوە

٢-رسالة فی القضاء والقدر لەساڵی ١٨٧٥ز چاپ کراوە.

زۆربەی زاراوەکانی بۆ زمانە ئەورووپییەکان وەرگێڕدراون و چاپکراون و ئێستاش گۆڕەکەی لەقاهیرەیە لە شەقامی نادار (تحت الرابع)

٣-عەفیفەدین عەبدوللا کوڕی ئەسعەد یافعی و لەساڵی ٧٦٨ك کۆچیدوایی کردووە

**نووسینەکانی**

١-روض الرياحين لەساڵی ١٣٠١ك چاپ کراوە.

٢-اسنى المفاخر فى مناقب، شێخ عەبدولقادر (دەستنووسە لەبەرلین پارێزراوە)

٣-مراة الجنان و عبرة اليقظان فيى المعرفة حوداث الزمان و تقلب احوال الانسان

بە دەستنووس لە ئەورووپا پارێزراوە.

قوتبەدین عەبدولکەریم کوڕی ئیبراهیم کوڕی سەبت عەبدولقادر جەبەلی لەساڵی ٨٢٦ك کۆچیدوایی کردووە.

**نووسینەکانی**

١-الناموس الاعظم و الناموس الاقدم چل بەرگە (بەدەستنووس لە ئەورووپا پارێزراوە)

٢-الانسان الكامل فى معرفه الاوائل و الاواخر (لەمیسر چاپ کراوە)

٥-عەبدولڕەحمان بستامی حەنەفی حەرووفی لەساڵی ٨٥٨ك کۆچیدوایی کردووە لە (بروسە)

**نووسینەکانی**

١-الفوائح المسكيه فى الفوائح المكيه

٢-الدور في الحوادث والسير

٣-مناهج التوسل فى مباهج الترسل

٦-ئیبن ئەبووبەکر جزولی سملالی، لەکۆتایی سەدەی نۆیەم کۆچیدوایی کردووە.

**نووسینەکانی:**

١-دلائل الخيرات و شوارق و الانوار فى ذكر الصلاة على المختار) کە کتێبێکی ناودارە و لەلایەن موسڵمان بەکاردەهێندرێ .

٧-محەممەد کوڕی سلێمان کەفهی لەساڵی ٨٧٩ك لە وڵاتی رۆم کۆچیدوایی کردووە لەقاهیرە و تەبریز خوێندویەتی.

**نووسینەکانی:**

١-التيسير فى علم التفسير

٢-تفسير ايات متشابهات

٨-ئەبووعەبدوڵڵا محەمەد کوڕی یوسف حوسنی سنوسی سۆفی لەساڵی ٨٩٢ك کۆچیدوایی کردووە

**نووسینەکانی:**

١-كتاب عقيدة اهل التوحيد المخرجة من ظلمات الجهل وربقة التقليد

٢-عقیدە اهل التوحید الصغری ناوی نراوە (ام البراهین) بۆ ئەڵمانی و فەرەنسی وەرگێڕدراوە و لە لیبزج لەساڵی ١٨٤٨ز چاپ کراوە و لەگەڵ ئەوەی لەساڵی ١٨٩٦ز لە جەزائیر چاپ کراوە.

٩-شەهابەدین ئەحمەد کوڕی زروق بەرنومی بەرلسی فاسی لەساڵی ٨٩٨ك کۆچیدوایی کردووە و چەندان کتێبی سەبارەت بە تەسەووف نووسیون.

## شوێنی سۆفیگەری و گەشەکردنی

سۆفیگەری و تەسەووف لە خوێندنەوەی قورئاندا هاتووە و بەردەوامیش خوێندنەوەی بەشێوەیەکی گشتی لە کۆبوونەوە دیایکراوەکاندا نەك ئەو کۆبوونەوانەی کە زکری خودا دەکەن بەدەنگی بەرز، ئەمەو کۆبوونەوە تەسەووفەکانی سەرەتا گوێگری متەوسەووفە دێرینەکان دەبوون وەك زی نون میسری و جونەید و حەلاج دەبووە گوێگرتنی وەجد -تا بگەنە مەبەست.

بەڵام کۆمەڵەی (ملامیە-گلەیی لەخۆ کردن) ئەو سۆفیانەن کە دۆخێکی تایبەتیان هەیە وەك سەهرووردی لە کتێبە "عوارف المعارف" باسی دەکات کە رەخنەیان لە دەنگ و بیستن گرتووە، هەروا رەخنەیان لە حەلاج گرتووە، بەڵام نیمچە زکرکردنەکانە وەك گەوهەرێکی بەنرخە بۆ بەندا بەرامبەر خودا، بەڵام کۆمەڵەیەکی دیکە باس لەوو دەکاتن کە دەنگ و گوێگرتن مەبەستی خودی خۆی نییەن بەڵکوو مەبەستی خودایە و خۆشیان هیچ جۆرە هەستێکیان لەلا نامێنێ، کارەکە بەو شێوەیە بوو لەسەدەی چوارەمی کۆچی.

بەڵام لەسەدەی حەوتەمی کۆچی چەندان متەسەووف چوونە عێراق و رۆژهەڵاتی عەرەبی ئەو سۆفیانەش زۆربەیان هیندی بوون و لە ساحیر دەچوون، بۆ ئەمەش لەکاتی هەلقەبەستنیان شتی بێ هۆشیان دەخوارد و ناویان نابوو بەنجی نهێنییەکان.

دواتر چەندان رێگەی سەیر و سەمەرە هاتە نێو سۆفیگەریدا وەك سەماکردن بەبیانوی ئەوەی وەك گەردوون دەسورێنەوە، ئەمەش لە شێوەی میرەکان دەچێت کاتێك گوێیان لەگۆرانی دەبوو، بۆ ئەمەش چەندان رێگە و شێوەی سۆفیگەری هەیە وەك رفاعیە لەبەسرا و بیومیە لە قاهیرە و عیساویە لە مەکناسی مەغریبی خوارو، لەلایەکی دیکەوە لەهەندێك شوێندا شێوازەکانیان

گۆڕی و جلوبەرگی خۆیان دەدڕاند و ناویان نابوو (دڕاندن) لەهەندێك شوێنی دیکەش مار و ئاگر و شووشەیان دەهێنا و هەروا لەشیان بەئاسنێکی سوورکراوە دادەهێنا.

سۆفیگەرەکان هەموو هێما و ئاماژەکانی نێو قورئانیان هێناوە و بەکاری دەهێنن وەك تیشك و رووناکی و ئاگر و درەخت و خواردنەوە و کاس و ئاشتی لەتەم زۆرێك لەو باسانەی ئیسلام بە گرنگی دەزانێ ئەوانیش بەشێوەی خۆیان بەکاریان هێناوە.

دیارە هەموو ئەمانە وەك رووکەشیەك دادپەروەری و رەزامەندی نیشان دەدەن، بەڵام لەلای ئەهلی سوننەدا زۆرێك لەکارەکان قەدەغە کراوە، بەڵام سۆفیەکان باس لەوە دەکەن کە ئەو شێوە کارانە وایان لێدەکات خۆشی ببینن، لەلایەکی دیکەوە سوونە زۆرێك لەو سۆفیانەیان چەوساندۆتەوە ئەمەو بڕیار لەسەر بەستامی و خەزار و تستری درا تا دوور بخرێنەوە.

هەروا حەلاج و ئیبن عەتا لە خاچ دران و نیشانی خەڵکە دران.

ئەوەی پەیوەستە بە حەلاجەوە کتێبەکەی لویز ماسنیۆن لەدوو بەشدا باسی لێوە دەکات و ناوی ناوە ئەشکەنجەی حسێنی کوڕی مەنسووری حەلاج کە شەهیدی سۆفیگەرییە لەنێو ئیسلامدا کە لە٢٦ مارسی ٩٢٢ز لە بەغدا بڕیاری کوشتنی درا، ئەم بابەتە لەپاریس لەساڵی ١٩٢٢ز لەپاریس چاپکراوە واتە دوای شەهید بوونی بەهەزار ساڵ.

کاتێك لەلایەن ئەهلی سوونەوە ئاگادار کرانەوە تا کەسانی سۆفیگەر ئەو کارانە نەکەن، ئەمەش لەکتێبی "اللمع" هاتووە و هەموو پەیڕەوکاران ئاگادارکراونەتەوە کە نابێ خۆیان والێ بکەن کە بوونیان نییە و چونکە ئەمە

دەبێتە هۆیەك بۆ ملکەچبوونی مرۆڤ بەرامبەر سەرۆکەیان کە شێخە، بەلام لەکتێبی (الغلطات)ی سەلما و (الاحیاء)ی غەزالی پشتگیری لێکراوە.
بێگومان سووننە زۆر ترساون لە سۆفیگەرەکان چونکە هەندێك قسەیان دژایەتی ئایینی ئیسلامە وەك قسەی ئیبن تامیری مەقدیسی کە گوتوویەتی خزمەتکردن باشترە لەپەرستن، ئەمەش تیۆرێکی شازە، لەتەك ئەوەی هەندێك قسەیان مانایەکی وا ناگەیەنێ وەك قسەکانی شبلی و حەلاج و لەتەك کارە خراپەکانی روفاعی و ئیبن عەرەبی، چونکە خوێنەر نازانێ مانای چییە، ئەمەو مامۆستا محەمەد کوڕی شاکر کوڕی ئەحمەد کتبی دەڵێت: "ئەو قسانەی لێی تێدەگەین "واتە قسەی ئیبن عەرەبی"باشە بەلام ئێمە دەیخەینە بەردەم خودای گەورە، لەتەك ئەوەی داوامان لە هەوادار و موریدەکانیان نەکردووە واز بهێنن".
ئێمە قسەکانیان دەکەینە دوو بەش:
بەشی یەکەم سەبارەت بە قسەکانیان بو ناو و دۆخ و مقامەکانیان، کە چەندان وشەی بێ مانایان داناوە وەك فقە و نیەت و دووروویی و رەزامەندی و فتوا، ئەمەش لەلای ئەوان بەرزترین پلەیە وەك چۆن لەکتێبی هراوی باسکراوە کە ناوی (منازل السائرین)ە.
بەشی دووەم باس لەتیۆری شاز دەکات کە پێشتر باسمان کردووە کە دیاردەیەکی دەروونییە کە وشەی سەیر و سەمەرە دەڵێت و سوونە رەخنەی لێ دەگرن کاتێك باس لەوە دەکەن پێم لەسەر ملی وەلییەکان دادەنێم.

## فەرمووده پیرۆزەکان (الاحادیث القدسیة)

متەسەووفەکان چەندان قسەیان سەبارەت بەمە هەیە، بۆیە لەنێوەندی بەهرە و سروش و کرانەوەی خودایی کە خۆیان بۆ خۆیان دروستکردووە لەنێوەندی دۆخەکانیان ناویان ناوە فەرمووده نێردراوەکان (الاحادیث المرسلة) و (الاحادیث القدسیة)، بۆ ئەمەیش سۆفیگەرەکان چەندان زاراوەی نوێیان داناوە، کە لەنێوەندی فەرمووده پیرۆزەکاندا بەهەند وەردەگیرێن و لەرووی زانستیەوەش پشتگیری لێ دەکرێن.

بەچەندان فەرموودەی پیرۆز کە چەند گێڕەوەیەك دەیخاتە روو وەك ئەبووزەری غەفاری کە فەموودەیەکی هەیە (من تقرب الی شبرا...)

کعب فەرموودەیەکی هەیە (ید الله مع الجماعه)

ئیبن مسعود فەرموودەیەکی هەیە تیایدا دەڵێت :(طوبی لمن لم یشتغل قلبه بما تری عیناء)

حەسەن بەسری فەرموودەیەکی هەیە تیایدا دەڵێت: (من عشقنی عشقته)

یزید رقاشی فەرموودەیەکی هەیە تیادا دەڵێت: (غبطة المتحابین)

ئیبن ئەدهەم فەرموودەیەکی هەیە تیایدا دەڵێت: (کنت سمعه و بصره....هتد)

یەحیا کوڕی معاز رازی فەرموودەیەکی هەیە تیایدا دەڵێت: (من عرف نفسه فقد عرف ربه)

زۆربەی ئەو شێخانە لەرووی سەرچاوەی ئەو فەرموودانە بۆچوونی جیاجیان هەیە سەبارەت بەوە ئەو فەرموودانە دەگەڕێنەوە بۆ پەیامبەرەکانی پێشتر، وەك چۆن ئیبن ئەدهەم ئەو فەرموودەی گەڕاندۆتەوە بۆ پەیامبەر یەحیای کوڕی زەکرەیا، هەروا حەلاج باس لەوە دەکات کە ئەمە بەرهەمی

بەهرەمەندییە، هەروا لەکتێبی (ئەحیا) چەندان فەرموودەی دیکە بەرچاو دەکەون کە هیچ پشتگیری و بەڵگەیەکی نییە وەك چۆن غەزالی باسی دەکات چونکە کتێبەکەی سەبارەت بە ئاکار و رەوشتی ئایینیە، بەڵام دەقێکی ئایینی و فەرموودە نییە.

## زنجیرەی رێگە و پەیڕەوەکە

لەسەدەی پێنجەمی کۆچییەوە هەوادارانی رێگەکانی سۆفیگەری بەدوای پشتگیرییەك وێڵن بۆ ئەو زنجیرە وتانەی کە خستوویانەتە روو، بەڵام زانایان ئەوەیان رەتکردووەتەوە، چونکە لەسەردەمی هاوەڵەکانی پەیامبەری مەزن دروودی خوای لەسەر بێت ئەوانیان تەنها بە پۆشاکەکانیان دەناسیەوە.

لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا جەعفەر خەلدی دەگێڕێتەوە کە یەکەم پشتگیری و بەڵگە بە مامۆستا و شێخەکەی دەستی پێ کرد:

٦-جونەید لەساڵی ٢٩٨ك کۆچیدوایی کردووە.

٥-سری لەساڵی ٢٥٣ك کۆچی دوایی کردووە.

٤-مەعرووف لەساڵی ٢٠٠ك کۆچی دوایی کردووە.

٣-فەرقەد سنجی لەساڵی ١٣١ك کۆچی دوایی کردووە.

٢-حەسەن بەسری لەساڵی ١١٠ك کۆچی دوایی کردووە.

١-ئەنس کوڕی مالیك لەساڵی ٩١ك کۆچی دوایی کردووە.

هاوکات چەندان جار ئەو زنجیرەیە هەموار کراوەتەوە، بەڵام بەتەواوی نەسەلمێندراوە تەنها ئیمام عەلی و داوود تائیی و چەند کەسێکی دیکەیان بۆ زیاد کردووە.

دیارە زانستی راسەقینەش ئەم زنجیرەیە پەراوێز ناکات لەرووی شێوەوە، لەلایەکی دیکەوە سۆفیگەری ناچاربوونە باسی لێوە بکەن و پشتگیرییەك وەربگرن، بەڵام لەلای زانایان جێگەی گومانە، لەلایەکی دیکەوە سوفییەکان زۆربەی ئەو فەرموودانە دەگەڕێننەوە بۆ (خزر) سڵاوی خوای لەسەر بێ کە هەردەم بەسەر زەویدا دەسوڕێتەوە، بەمەش نەوەستاون سەمنانی ناوی تەواوی گوتووە کە ئەبووعەباسی بلیانی کوڕی قلیان کوڕی فالج خزرە. سوفییەکان پێیانوایە بەبێ تەسەووف هەموو زەوی بەرەو هەڵدێر دەڕوات، هەموو ئەو سۆفیانەش ژمارەیان چل سۆفییە، کە لەتەکیان سێ سەد نەقیب و حەفتا نەجیبیان لەتەکدایە کە کۆڵەگەی سۆفیگەرین لەسەرووی هەمووشیانەوە جەمسەری غوس لەتەکیاندایە و لەراست و چەپیشی دوو ئیمامی لەتەکدایە. مەغریبی باس لەوە دەکات کە سەرۆك دەزانی هەوادارانی کێن و پێچەوانەکەش راستە.

لەلایەکی دیکەوە باس لەوە دەکرێ کە لەزۆربەی ئایینەکانی دیکە سۆفیگەری بوونی هەیە وەك نەسرانی و بوزی، بەڵام سۆفیگەری ئیسلام بەپێی سیستەمی ئایینی ئیسلامە، چونکە لە فەرموودەیەکیان دەڵێن (لا رهبانیه فی الاسلام) دیارە ئەمەش فەرموودەیەکی راست نییە، هیچ کام لە زانایان راستی ئەو فەرموودەیان بەدەرنەخستووە.

لەلایەکی دیکەوە ژیانی پەیامبەری مەزن و هاوەڵانی خۆشی و شادی نەبووە بەڵکوو تاڵی و ئازارێکی زۆریان چەشتووە، ئەمەش راستییەکە لەتەك ئەوەی واقدی و ئیبن سەعد قسەی دیکەیان هەیە، بەڵام ئەوانە و چەندانی دیکە هاتوو فەرموودە لاوازەکتانیان وەرگرتووە، کە پاساو بۆ ژیانێکی خۆش و پاشایەتی دەهێننەوە.

لەتەك ئەوەی ژیانی تەسەووف بریتییە لە پاکی و ناخۆشییەکان، بەڵام سۆفیگەرەکان زیادە ڕەویان کردووە لەهەندێك بابەت بەوەی لەهەموو ئارەزووەکان دوورکەوتونەتەوە، بەشێوەیەك وای دادەنێن خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ ژیانی پەیامبەری مەزن و هاوەڵانی.

ئەوەی جێگەی ئاماژەکردنە زۆربەی زانایان وشەی سۆفی دەگەڕێننەوە بۆ –سووف –خوری ئەم تیۆرەش لەلایەن ئیبن خەلدوونەوە خراوەتەڕوو بۆ ڕاستیش لەوانەیە سۆفییەکان خوری و سوفیان پۆشیوە، دیارە ئەمەش وەك دیاربوونیان بووە لەنێوەندی خەڵکدا خۆیان وەك شۆڕشگێڕ نیشانداوە، جارێکیش یەکێك بە ئیمامەکانیان ئاوریشمی لەبن خوریەوە پۆشیوە بۆیە ئەمە بووەتە جێگەی ڕەخنەی سۆفییەکان، مەبەستیش لەمە لەوانەیە لاسایی حەزرەتی مەسیح بکەنەوە یان یەکێك لەحەواری و ڕەهبانەکانی نەسرانی.

هاوکات زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن گەورە پیاوانی سۆفییەکان ئەمانەن: مالیك کوڕی دینار، بوناتی، سختیانی ، وەهیب کوڕی وەردی کوڕی ئەسیات، موسلمی خەواس، بەستامی، تستری.

## دانایی و بەهرەی خودایی محیێدین ئیبن عەرەبی

محەمەد کوڕی عەلی کوڕی محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵا شێخ محیێدین ئەبوو بەکری تائی حاتەمی ئەندەلووسی کە ناسراوە بە ئیبن عەرەبی لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی پێنجسەد و شەستی لە مەرسیەی ئەندەلووس کۆچی لەدایك بووە، هیچ شتێك سەبارەت بەمنداڵی ئەو نازانین، بەڵام زانست و زانیاری لەوڵاتی خۆی وەرگرتووە و بنەماکانی لە ئیبن بشکوال وەرگرتوون، دواتر چووەتە میسر و دیمەشق و مەککە و بەغداد و لە وڵاتی ڕۆمدا نیشتەجێ بووە تا زانست وەربگرێ و گەشتەکانی خۆی بەردەوام بێ.

کاتێك لەوڵاتی ڕۆم بوو دەسەڵاتدارەکە گوێی لەناوی ئەو بوو بوو، بۆیە کاتێك چووە لای فەرمانڕەوا و کە محێدینی بینی فەرمانڕەوا گوتی "ئەو پیاوە ڕەشە کە دەیبینی ترس لەدڵتا دەڕوێ!".

کاتێك پرسیاری ئەوەی لێکرا کە مانای قسەی فەرمانڕەوا چییە ئەویش لەوەڵامدا گوتی "کاتێکە لە مەککە بووم خزمەتی شێخێکی چاکەکارم کردووە زۆر بە دڵسۆزی بۆیە داوای کردووە و سەبارەت بەقسەکەشی گوتی "خودا خۆشەویسترین کەسی خۆی بەهیلاك دەبا"، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی پاشا ئەوی خۆشبوێ.

باسیش لەوە دەکرێ ڕۆژێك یەکێك داوای لەمحێدین کردووە و ئەویش لەوەڵامدا گوتوویەتی تەنها ئەو خانووەم هەیە، ئەمەش بۆ تۆ و یەکسەر لەخانووەکەی چووەتە دەرەوە. هەروا زانستی لە ئیبن بشکوال و چەندان زانای دیکە وەرگرتووە بەتایبەتی ئەو پایتەختانەی کە سەردانی کردووە، لەنێو ئەوانیشدا ئەو سەلەفیەی کە مۆڵەتی داوەتە محێدین و ئەویش بەو شێوەیە باسی لێوە دەکات، لەلایەکی دیکەوە ئیبن عەرەبی لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەچوو تا زانایان بناسێت و ڕاستیەکان بزانێت، ئەمەو شێخ شەمسەدین سەبارەت بە نووسینەکانی محێدین دەڵێت "ئەو کەسێك بوو لەنێوەندی قسەکانیدا بەشێوەیەکی فراوان دەیخستە ڕوو و لەتەك هێزی وردبینی لەتەسەووفدا، هەموو نووسینەکانی سەبارەت بەعیرفان بووە و شەمسەدین دەڵێت "کاتێك قسەی دەکرد وات هەست دەکرد لەدۆخی سەرخۆشی و بێ ئاگایدایە".

هەروا شێخ قوتبەدین بوینی سەبارەت بە کتێبەکە دەڵێت "محێدین هەردەم دەیگوت من ناوی مەزنی خودا دەزانم و کیمیاش دەزانم".

محیێدین لەرۆژی بیست و هەشتی مانگی ربیعی ئاخری ساڵی شەشسەد و سی و هەشت کۆچی دوایی کردووە واتە لەتەمەنی هەشتاو و حەوت ساڵیدا، ئەمەو لەماڵی قازی محیێدینی کورشی زەکی کۆچیدوایی کردووە و لەلایەن قازی و جەمالەدین کوڕی عەبدولخالق شۆردراوە، ئەمەو عیمادەدین کوڕی نوحاس ئاوی پێدا دەکرد، دواتر هەڵیان گرت بۆ قاسیۆن و لەگۆڕستانی زەکی ناشتیان، گۆڕەکەی لە قاسیۆنی شامە لەمزگەوتێکدا بەناوی خۆیەتی و لەتەك گۆڕەکەشی گۆڕە شێخ عەبدولقادری جەزائیری لێیە.

ئەمەمەو شێخ جەمالەدینی کورشی زەمەلکانی لە باسکردنی ئیبن عەرەبیدا ئەوە دەخاتە روو کە ئیبن عەرەبە دەریایەك بووە لەزانیاری و هەندێك لە داهێنانەکانی جێگەی لێ ورد بوونەوەن، لەلایەکی دیکەوە چەندان پارچە شیعری هەیە کە لەسۆفیگەریەوە نزیکە وەك :

| | |
|---|---|
| نفسي الفداء لبيض خرد عرب | لعبن بي عند لثم الركن والحجر |
| ما أستدل إذا ما تهت خلفهم | إلا بريحهم من طيب الأثر |
| غازلت من غزلي فيهن واحدة | حسناء ليس لها أخت من البشر |
| ان أسفرت عن محياها ارتك سنى | مثل الغزالة إشراقاً بلا غِيَر |
| للشمس غرتها، لليل طرتها | شمس وليل معاً من أحسن الصور |

ئیبن عەرەبی لەتەمەنی چل ساڵیدا فەریزەی حەج بەجێدەهێنێ، هەر لەو ساڵەدا کە لەحەجدا بەنامەیەك سڵاوی خۆی بۆ زۆرێك لەوانە رەوانە کرد کە لەرێگە و پەیڕەوکارانی سۆفیگەری دابوون، هاوکات نامەکەش تەنها سڵاو کردنە نەبووە، بەڵکوو روونکردنەوەی چەندان بابەت بووە وەك هاتنە کایەوە تیشك و روناکییەکی نوێی سۆفیگەری بووە و ناوی لەو نامەیەش ناوە (رسالە الروح القدس) کە دوو بەشە:

بەشی یەکەم نزاکانی محێدینە لەتەك دەروونیدا ئەمەش وەك دانپیانانێکە، بەشی دووەمیش ناوی زۆرێك لەپیاوان و شێخەکان بوو تا لەنزیکەوە لەدۆخی برایە شێخەکانی بپرسێ لەرووی کار و هێما و ئامارەکانی سۆفیگەری، بۆ ئەمەش مەبەستی سەرەکی خۆی دەربڕیوە.

## پەیڕەوکارانی شێخ محێدین

یەکەمیان ئەبوجەعفەری عەرینی گەیشتە ئەشبیلییە ئەو کاتەی شێخ محێدین بوو بە پەیڕەوکار، دووەمیان ئەبوویەعقووب یووسفی کوڕی یەخلەف کۆمی عیسا کە لەهاوەڵانی ئەبوومدینە، ئەوگوتوویەتی "هەر کاتێك شێخێك دەستی موریدی گرت ئەوا بەرەو بەرزیی بردوویەتی لەیەك چرکەساتدا" و سێیەمیان ساڵح عەدوییە و چوارەمیان ئەبووعەبدوڵڵای محەمەد سەرقی، پێنجەمیش ئەبوویەحیای سناهجی، شەشەم ئەبووحەجاجی یووسف سیرینی (ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی لەرۆژهەڵات، کە دوو فەرسەخ لە ئشبیلییە دوورە) محێدین باس لە شێخ یوسف دەکات، کە کاری پزیشکی رووحانیی کردووە، لەلایەکی دیکەوە چەندان چیرۆکی سەیر و سەمەرە لە ئیبن عەرەبی دەگێڕنەوە.

هەشتەمیش ئەبووعومران مووسا کوڕی عومران مارتلی کە لەنێو ماڵی خۆیدا شەست ساڵ خۆی بەند کردووە و لەپەیڕەوکارانی محاسبی بووە، کە هیچ شتێکی لەکەس داوا نەکردووە نە بۆ خۆی، نە بۆ کەسانی دیکە.

نۆیەم و دەیەم: هەردوو برا ئەبووعەبدوڵڵا محەمەد خەیات و ئەبو عەباسی ئەحمەد ئەشبیلینی، یەکەمیان کەسێکی ئیماندار بووە و زۆر خزمەتی دایکی

کردووە تا ئەو کاتەی مردووە، دووەمیشان لەپشت پەردەکانەوە قسەی دەکرد.

یانزدەهەم: ئەبووعەبدوڵڵای محەممەد کوڕی جمهوور زۆر ڕقی لە شیعر بوو و بەدرێژایی ژیانی شیعری نەگوتووە، کاتێکیش گوتوویانە پەنجەکانی خستووەتە ناو گوێی.

دوانزدەهەم: ئەبووعەلی شکاز کە پیشەکەی جۆرێك بووە لە دەباغی.

سێزدەهەم: ئەبوو محەممەد عەبدوڵڵا کوڕی محەمەدی کوڕی عەرەبی تائی بوو، کە خودی محێدینە.

چواردەهەم: ئەبوومحەمەد کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوستاز مروزی و یەکێکە لەخزمەتکارانی ئەبوو مدین.

پانزدەهەم: ئەبوومحەمەد عەبدوڵڵای قەتان هەردەم خۆی دەپاراست لە گلەیی خودایی و چەند جارێك ویستی خۆی بکوژێ، کاتێکیش سوڵتان پێی گوت لەدانیشتنەکانم ئامادە بە، ئەویش لەوەڵامدا گوتی: نەخێر کۆبوونەوە و دانیشتنەکانی تۆ چونکە بەزۆرییە نابێ، قسەی هەقی تیادا ناکرێ، من ناچار بووم بۆیە هاتمە ئێرە ئەمەش ئەو دۆخەیە کە خوا دەزانی چ لەنێوان من تۆدا هەیە، باسیش لەوە دەکرێ قسەکانی ئەو شێخە زیادەڕەویی تیا بووە.

شانزدەهەم: ئەبووعەبدوڵڵای محەممەد کوڕی ئەشرەف ڕەندی و نەهاتە نێو ئاوەدانی بۆ ماوەی سی ساڵ.

حەڤدەهەم: مووسا ئەبوو عیمران سەیدرانی شتی سەیر و سەمەرەی لێ دەگێڕنەوە.

**ناودارترین نووسینەکانی:**

**نووسینەکانی ئیبن عەرەبی زیاتر لە ٢٠٠ کتێبە کە هەندێکیان لەلایەن برکلمنی ئەڵمانییەوە باسی لێوە کردووە و بەڵام لەپێرستی کتێبە عەرەبییەکان ١٥٦ کتێبی هەبووە و زیاتریش باسی کتێبەکانی لەمەڕ تەسەووفە و هەندێکیشیان سەبارەت بە ئاماژە و پیتەکانە:**

**١-الفتوحات المکیه، فی معرفه الاسرار الملکیه**

**٢-التدبیرات الالهیه**

**٣- التنزلات الموصلیه**

**٤-فصوص الحکم فی خصوص الکلم، لەتەك شیکردنەوەکەی کە ناوی ناوی "نقش الفصوص"**

**٥- الاسرا الی المقام الاسری -شیعر و پەخشانە.**

**٦- شرح خلع النعلین**

**٧- الاجوبە المسکتە سەبارەت بە پرسیارەکانی تەرمەزی دانا.**

**٨- تاج الرسائل و منهاج الوسائل جیایە لە تاج تراجم**

٩- كتاب العظمة

١٠- كتاب السبعة

١١- التجليات

١٢- مفاتيح الغيب

١٣- كتاب الحق

١٤- مراتب علوم الوهب

١٥- الاعلام باشارات اهل الالهام

١٦- العبادة والخلوة

١٧- المدخل الى معرفة الاسماء

١٨- حيلة الابدال

١٩- الشروط

٢٠- المقنع فی ایصاح السهل المتنع
٢١- عنقاء مغرب و ختم الاولیاء و شمس المغرب
٢٢- مشكاة الانوار
٢٣- شرح الالفاظ
٢٤- محاضرات الابرار ومسامرات الاخبار
٢٥- دیوان محي الدین، هەموو ئەو شیعرانەیە کە هۆنیوەتیەوە.

**پوختەی کتێبی (الفتوحات المكية فی معرفة الاسرار الملكية)**

ئەو کتێبە کە لەلایەن محێدین ئیبن عەرەبییەوە نووسراوە خۆی لەچوار بەشدا دەبینێتەوە کە زیاتر لە سێ هەزار لاپەڕەیە، کاتێك سەیری دێڕ و ڕستەکانی دەکەی دەریایەك لەزانیاری دەدۆزیتەوە، لەتەك ئەوەی چەندان پەخشـان و شیعری تیایە کە ناتواندرێ شیکردنەوەی بۆ بکرێ لەلایەکی دیکەوە هەندێکی بە هێما و ئاماژە نووسراوە، لەسەرەتای ئەو کتێبەشدا بەدوو بەیت دەستی پێ کردووە کە تیایدا دەڵێت:

الرب حق ، والعبد حق     يا ليت شعرى من المكلّف ؟
إن قلت عبد ، فذاك ميت     أو قلت رب انّى يكلف !

بەو واتایەی خودا لەسەر هەقە و بەندەش هەقە، خۆزگە شیعرەکەم دەگەیشتە ئامانج ئەگەر گوتم بەندە ئەوا مردووم، یان دەڵێم خودا منی ڕاسپاردووە.

ئەو بەشە گرنکانەی کە لەنێو ئەو کتێبەدا هەیە سەبارەت بە زانستی هەق و ڕەوایی و زانستی دۆخەکان و زانستی نهێنیەکانە، بەشێکی سەبارەت بە خەڵکی پسپۆڕە و لەتەك ئەو بەشەی کە زانیاری لەسەر رووحە، محێدین ئیبن عەرەبی باس لەوە دەکات، کەلەلایەن یەکێکی باڵا داوای لێ کراوە کە ئەم کتێبە

بنووسێ، زۆرێك باسیشی وەك خۆی هێشتۆتەوە نەوەك داناییەکەی لەشوێنی خۆی نەبێ.

لەتەك ئەو بەشانەی کە نهێنی و ئامازەکان بەخۆیەوە دەگرێ، لەبەشی دووەمدا باس لە شوێنی ئەولیاکان دەکات لەتەك باس و خواست و ئومێدەکانیان، لەم بەشەدا باس شەریعەت و پەیامبەری رەها دەکا، لەکاتێکدا ئەولیاکان ئەگەر ئەولیاکان پەیامبەریش نەبن لەپلەی سێیەمدان، پەیامبەریش خۆی لەپاش خودا لەپلەی دووەمدایە، هەر خودی خوداشە رێگەی بە ئەولیاکانداوە تا سەرکەوتن بەدەست بێنن لەڕووی ئایینییەوە، هەردەم دژایەتی چوار ئارەزووەکە بکەن، کە ئارەزوو و دەروون و دونیا و شەیتانە.

دیارە لەنێوەندی ئەو کتێبەدا باسی زۆر لایەن دەکات وەك خەڵوەت و سەرخۆشبوون و تۆبە و ئیمانداری و ترس و نەوازش و پاڕانەوە لە خودا و جیاوازی لەنێوان ئارەزوو و ئیرادە و ئارەزووی دونیا و ئارەزووی بەهەست و جیاوازیی لەنێوان چێژ و ئارەزوو و مەقامی خشووع و قەناعەت و یەقین و نهێنی و زکرکردن و هزر و نهێنییەکان.

هەروا باسی لەناوەکانی خودا کردووە ئەوە گەوهەرییە لەتەك ئەوانەی رووکەشە و لەنێوەندی ناوە گشتیەکاندا و هەروا باسی لە ئامادەیی دڵ کردووە لەروانگەی بەڵگەوە و چوونە نێو نهێنییەکانی مەقامی محەممەدی.

لەبەشی سێیەمدا نووسەر دێ باس لە حەزرەتی مووسەوی و حەزرەتی محەممەدی دەکات و باس لە پلەی ئیمام دەکات لەلای چەپی قوتب و ئەمەش پلەی ئەبوومدینە کە یەکێکە لە ئیمامەکانی سۆفیگەری لەبنچاپەی ئەندەلووس لەتەك ئەوەی محێدین ئیبن عەرەبی چاوی پێنەکەوتووە.

## وتەی محیدینی ئیبن عەرەبی سەبارەت بە مەهدی چاوەڕوانکراو (مەهدی مونتەزەر)

باسی لە مەهدی چاوەڕوانکراو کردووە، هەروا زانیاری لەسەر هاتنە خوارەوەی ئەمەشی لەبەرگی ٣ لا ٣٦٤دا باس کردووە :"دەزانم خەلیفە دێتەوە، لەکاتێکدا سەر زەوی هەموو ئەشکەنجەدان و زوڵمە، ئەو بەشێك لەدادپەروەری دێنێتە ئارا، تەنها لە دونیا ڕۆژێك نەماوە، تا ئەو کاتە ناوی وەك پەیامبەری خودا دەبێ، هەموو لایەك بەڵێنی بۆ دەدەن، بەختەوەرترین کەسیش خەڵکی کووفە دەبێ و هەموو دارایەك دابەشدەکرێ بەیەکسانی، دادپەروەری دێتە ئارا، هەموو ئەوانەی ترسنۆکن باشترین کەسن و هانی خەڵکی دەدا و سەرکەوتن لەسەر دەستی ئەودا هەنگاو دەنێ، پێنج یان حەوت یان نۆ، خودا لەیەك شەودا هەمووان بەرەو چاکە دەبا بە واڵاکردنی شارێکی ڕۆمی، بە حەفتا هەزار کەسی نەوەی ئیسحاق، داستانێکی مەزن دێتە کایەوە، داوەتی خودا عەکا دەگرێتەوە و هیچ زوڵمێك لەسەریان نامێنێ، هیچ زوڵمێك لەسەر دانیشتووانی سەر زەوی نامێنێ، هەموو خەڵك دڵخۆش دەبن. هەموو لایەك لەو داوەتە ئامادەدەبن، عیسای کوڕی مریەم دێتە خوارەوە بە جلێکی سپییەوە لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشق لەنێوان مهردوتین، زۆر خاوێنە و دڵۆپەئاو لەسەر سەری دێتە خوارەوە و مەهدیش زۆر خاوێنە، لەو سەردەمە سوفیانی دەکوژرێ لەلای درختێکی غوتەی دیمەشق و سووپاکی هەنگاو دەنێ لەبەیداوە کە دەکەوێتە نێوان مەدینە و مەککە".

هەروا نووسەر باسی لە تەخت و هەوا و گەردوون و بەرزەخ دەکات، لەتەم زانیاری لەسەر نەتەوەی بەهیمیە، بەڵام لە بەشی چوارەم و کۆتاییدا لەنێوەندی ئەو کتێبەدا، باس لە شوێنی زیندوو و مردووەکان دەکات، زۆربەی

ئەو بەشەش باس لە فەرموودەقودسییەکان دەکات یان ئەو ئایەتانەی دەیگەڕێنەوە وەك:

١-ئەوەی بانگی کردم بەندایەتی خۆی سەلماندووە، ئەوەی ڕاست بوو ئەوا لەگەڵمدا ڕاستە.

٢-هەرکەسێك پرسیاری دادوەری کرد، ئەوەی پرسیاریشی نەکرد ئەوا لەدادپەروەری من نەچووەتە دەرەوە

٣-ناوەکانم لەپشت پەردەیە، ئەگەر پەردەکەت لادا ئەوا گەیشتوویە من.

٤-دەمەوێ لەگەڵمدا بمێنیەوە یان دەتەوێ بگەڕێتەوە لای کەسانی خۆت.

باسیش لەوە دەکات کە سەید محەممەد عەبدوسەلام خوا لێی ڕازی بێت چووتە بەرزەخ بۆ ئەمەش شیکردنەوەیەکی زۆری ئەم فەرموودەیە کراوە.

بەشی چوارەم وەك بەشەکانی دیکە دەریایەکە لە زانیاری لە دانایی خودایی، فەلسەفەی شەرعی و لەتەك ئەوەی هۆ و ئەنجام و نهێنییەکانی خستووەتە ڕوو و هێما باڵاکانیشی ڕوونکردووەتەوە لە گەردوون و شەریعەت و سروشت و ئیلهام.

ناکرێ هیچ زانا و ئەدەبیێك و مەتەسەووفێك ئەو کتێبەی نەخوێندبێتەوە، کە دەگمەنە لەنێوەندی زمانەکانەدا.

لەلایەکی دیکەوە گۆڕی ئەو شێخە گەورەیە لەشامە و لەلایەن سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانیەوە دۆزرایەوە و باسیش لەوە دەکەن کە چەند دەربڕین و ئاماژە و هێمایەك لەسەر گۆڕەکەی هەبووە دەقەکەشی بەمشێوەیەیە "کاتێك چوویە ژوورەوە سین و شین گۆڕەکەی محیدین دەدۆزێتەوە"، مەبەستی لەمەش کاتێك سوڵتان سەلیم دەچێتە وڵاتی شام ئەوا گۆڕی ئەو دانایە دەدۆزرێتەوە.

## دانپیانانی محیێدین ئیبن عەرەبی و نزاکانی لەنێوان خوێی و خود و دەروونی

مەبەست لەدەروون و خودی ئەو هێزەیە کە لەنێوەندی مرۆڤدایە ودەروون پەروەردەی دەکات ئایا خراپەکار بێ یان چاکەکار، واتە چۆن پەروەردەی بکات وا دەردەچێ.

محیێدین دەڵێ "لە خەونمدا بینیم چوومە بەهەشت و هیچ ئاگر و حەشرێکم نەبینی و هیچ حسێبێکم نەبینی لە هۆکارەکانی قیامەت، هەستم بە پشوویەکی مەزن کرد، کاتێك کە هەڵسامەوە هەستم کرد کەمێك تێکچووەمە، ئەمەش زانیاریەك بوو لەلایەن خوداوە پێشکەشم کرا، کاتێك چێژی بەهەشتی پێ بەخشم، ویستم بیانوی یەکلاکەرەوە بێنم، تا دابەشی بکەم بۆ راستی مرۆڤایەتی و پلە بەندییەکانی، بەلام کەس گوێی لێ نەگرتم بۆیە لەنێوان خۆم و خود و دەروونی خۆم ئەم گفتوگۆیە و حیسابە دروست بوو:

ئیبن عەرەبی: ئەی دەروون و خود وازت لێ ناهێنم تا هەموو دۆخەکانت نەخەمە سەر کتێبی خودا و سوونەتی پەیامبەری مەزن دروودی خوای لێ بێت، ئەگەر رازی بیت ئەوا خۆم بەدەستەوەدا، من کەسێکم سۆزدارم و تا لەسەر دۆخی هاوەڵان هەنگاو بنێم، ئەگەر کەموکووڕیم هەبوو ئەوا ئاگر بۆ تۆ باشە.

خود و دەروون: بەلام سەبارەت بە پەیامبەری مەزن ئەوا دۆخی خۆم ریز ناکەم لەگەڵ ئەودا یان قورئانی پیرۆز چونکە دەریایەکی مەزنە، بەلام حسێبی تۆ لەنێوان قورئان و پەیامبەری نییە، بەڵکوو من کەسێکی ملکەچم.

ئیبن عەرەبی: هەر شتێکت هەیە بڵێ، چونکە من ئەو دۆخە دەخەمە ڕوو بۆ ئەوانەی هەمان سیفەتیان هەیە.

خود و دەروون : بڵێ.

ئیبن عەرەبی: هەفتا لەوانەی هەمان سیفەتیان هەیە بەهەمان پۆشاك نوێژ دەکەن، تا دەگەنە سەر چۆکیان و هەندێکی دیکە نزمتر، خودا دوو پۆشاکی کۆنەکردۆتەوە، هەروا دووخواردنی بۆیان دانەناوە، بانگت دەکەم ئەی دەروون تۆ لەوان کەمتری؟

دەروون و خود: نەخێر

ئیبن عەرەبی: تۆ لەوان نیت، شەرم لەخودا بکە و قسەی زیاد مەکە لەسەر کەسانێك تۆ هیچ نیت بەرامبەر بەوان.

دەروون و خود: من ناتوانم هەنگاو لەگەڵ ئەوان بهاوێم.

لەلایەکی دیکەوە ئیبن عەرەبی و خود و دەروونی خۆی چەندان وتار و قسە و گفتوگۆ لەنێوانیان دێتە ئارا، لەوێدا باس لە پەیامبەری مەزن (دروودی خوای لێ بێت) دەکات و لەهەندێك شوێندا باس لە ئیمامی عومەر دەکات، بەڵام دەروونەکە لەوەڵامدا باس لەوە دەکات، کە بەهیچ شێوەیەك ناگاتە ئەو ئاستە، بۆیە ئیبن عەرەبی بەدەروون و خودی خۆی دەڵێت بگەڕێوە، بەڵام دەروونەکەی پێی دەڵێت شتی دیکە بهێنە ئاراوە.

لەوێدا دەڵێت کە عوسمانی کوڕی عەفان هەموو خەڵکی ئیمارەتەکەی خواردنیان پێشکەش کرا لەلایەن ئەوەوە، هاوکات ئیبن عەرەبی رازییە لەدەروونی خۆی و پێی دەڵێت تۆ راست بووی بۆیە خودا لەپەنات بێ.

ئیبن عەرەبی:عوسمانی کوڕی عەفان خواردنی دەدا بە خەڵکی ئیمارەتەکەی، خۆشی لەنێو ماڵدا رۆن و نانی دەخوارد، ئایا تۆ لەتەك هاوەڵانت وات کردووە، هەروا خۆشیت خستۆتە دڵی هەمووان و خۆشت نانە رەقەت خواردووە و بەناخۆشییەکان رازی بووی.

دەروون و خود: نەخێر بەخوا بەڵکوو لەتەك هەموویاندا بوومە بەهەردوو روو، خواردنێکم لەلا نەبووە ئەگەر هەمبوایە بەشداریم پێ دەکردن، هەر شیرینەکم لەلا بوایە دەمدا بەوان، هەروا دەڵێم ئەو خواردنە و پۆشاکە بۆ من شتێکی وا نەبووە، هەروا بە هەمووان دەڵێم: هەر ئارەزوویەك لەدڵدا هەبووایە ئەوا دەمدا بەوانیش، شوێنی منیش بەو ئارەزووەخراپەکان کاریگەر نابێت، زۆر جاریش کوێربوومە بۆ داواکاری هەق و رەوایی، من بەشدار نابم لە ناخۆشیەکانیان، بەشێوەیەك کاریگەریم نییە بۆ راستییەکان، بێگومان عوسمان ئەوەی کردی سەرەتا وای نەکرد، بەڵکوو ئەو کاتە ئەو کارانەی کرد کە ماڵ و ژیانی هەبوو.

ئیبن عەرەبی: خودا لەپەنات بێ، ئەگەر لەگەڵمدا راست بی.

دەروون و خود: هەق هەر هەقە ئەگەر شتی دیکە هەیە بیڵێ.

ئیبن عەرەبی: ئیمام عەلی بەردەوام لە بەرامبەر میحرابەکە فرمێسك لەچاوانی دەهاتە خوار و دەیگوت ئەی خوایە، لەپاشاندا لەتەك دونیادا قسەی دەکرد، تەمەن کورتە و دانیشتنەکان زۆر خراپن و ترسناکیەکان زۆرن، ئایا تۆی دەروون(نفس) لەتەك ئەو ئیمامە دابووی؟

دەروون و خود: نا بەخوا دەمویست بزانم، منیش دەمەوێ هەڵوەستە بکەم بەرامبەر کارەکانی ئەو سەیدە و هەردەم دەمگوت با ڕانەکەم لە وتارەکانی.

ئیبن عەرەبی: لەلایەکی دیکەوە لەتەك دەروونی خۆیدا باس لە مەقامی ئیمام ئەبووبەکری سەدیق دەکات (خوا لێی رازی بێت) کەچی دەروونی خۆی لەوەڵامدا باس لەوە دەکات کە دەروون لەنێوان مانەوە و لەناوچوون و پەرت وبڵاوبوونەوە و ژیانەوە و گەڕانەوە بۆ وڵات و گەڕانەوە و رۆیشتن، ئەمەش پشتی شکاندم.

ئیبن عەرەبی: پەیامبەری مەزن لەژیانێکی ناخۆشدا بووە تا ئەو کاتەی عومەر پێیگوت بیرم لەکیسرا و قەیسر کردەوە، لەوەڵامدا پەیامبەری مەزن گوتی بەوە رازی نابیت ئەوان دونیایان هەبێ و ئێمەش رۆژی کۆتایی؟ تۆ لەکوێی ئەی دەروون کاتێك سەلمان فارسی قسە دەکات، کاتێك گوتی خودای گەورە گەنجینەی بۆ موسڵمانان واڵا کرد کە لەلای کیسرا بوو و گوتی: ئەوە خودایە ئەو واڵاکردنەی بۆتان خستووەتە ڕوو کە گەنجینەیەکە و محەممەد (دروودی خوای لێ بێت) زیندووە ئەی دەروون تۆ لەکوێی بەرامبەر بەهەموو ئەو شتانە، ئایا ئەی خود و دەروون تۆ هەنگاو دەنێیت لەگەڵ ئەو چاکەکارانە، بەڵام تۆ لەتەك کێدا هەنگاوت نا و بەکێ کارێگەر بووی؟

ئیبن عەرەبی: کاتێك عومەری کوڕی خەتابە بوو بە موسڵمان هاوکات پەیامبەری مەزن پێی گوت ئەی عومەر خودا سەبر بکە، عومەر رەزای خوای لەسەر بێت فەرمووی "ئەوەی بەهەق و ڕەوایی تۆی ناردووە من دلنی پیادەنێم و رایدەگەینم، وەك چۆن شرك راگەیەندراوە". من ئەی دەروون و خود بانگت دەکەم تۆ توانیوتە ببیتە پارێزگاری وڵات بەبێ ئەوەی پرسە بۆ دەروونت دابنێیت، ئایا سەرکەوتن بەسەر گومانەکانت سەرکەوتووە کە تۆ تیایدایی؟

دەروون و خود: نا بە خوا، بەڵام گەیشتوومەتە ئەو شوێنە، ب بەسیاسەتی دوژمنەکانی جوڵاومەتەوە، کاتێك گومانەکانم بەسەرمدا زاڵ ببێت، دەبێ خوێنم پارێزراو بێ.

ئیبن عەرەبی بگەڕێوە

دەروون و خود: بەڵی شتێکی دیکە بێنە.

دەروون و خود: بە ئارەزووی خۆم هەنگاون نا، کاریگەر بووم بەشەیتان و دوور کەوتمەوە لە بانگەوازی هەق و رەوایی، بەلام من تۆبە دەکەم بەرامبەر خودا چونکە خاوەنی تەرازووی هەق و رەوایی و دادپەروەرییە.

ئیبن عەرەبی: ئەی دەروون ئەمە مێژووە کە خودات خۆشویستوە، ئەگەر زوو نەگەڕایتەوە نەوەك زیادڕەویی بکەیت، دەبێ تۆ لەتەك هەوادارەکاندا هەنگاو بنێیت، بەلام تۆ رازی بووی بەو چارەنووسە، بۆیە بگەڕێوە و ملکەچی خودا بە و ملکەچی پەیامبەری مەزن دروودی خوای لەسەر بێ ببە.

محێدین ئیبن عەرەبی دەڵێت "لێرەدا کەسێکی دیکەم کردە موسڵمان، مەبەستی خود و دەروونی خۆیەتی، خودا لەدڵیدا بیچەسپێنێ، هەروا بەڵێنەکانی پەیامبەری مەزنم لێ وەرگرت، لەسەر هەموو ئافرەتە باوەڕدارەکان، هەروا پابەند بووم بە هەموو وەفادارییەکان و هیچ گەڕانەوەیەك نییە".

"هەموو ئەمانەش لەتەك هاوڕێیەکەی عەبدولعەزیز مەهدیەوی گوتووە—خودا بهێڵێ تۆ لەگەڵم کۆك نەبووی لەتەك مەککەی شەریف".

## ١٢-ئیبن مەسکویە

ئەبووعەلی خازن ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی یەعقووب کە نازناوەکەی مەسکەوییە و لە ٩ی مانگی سەفەری ٤٢١ك کۆچی دوایی کردووە، ئەو ئاگرپەرست بووە و بووەتە موسڵمان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ لەو کەسە فارسانەیە کە لەنێوەندی عەرەبەکاندا ژیاوە، کە پۆستیان هەبووە لەسەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامدا، وەك ئەبوو محەممەد عەبدوڵلا ئیبن موقەففەع کە لەساڵی ١٤٢ك کوژرا، ئەو خەڵکەی ئەوێ لەزیرەکایەتی نموونەیان نەبوو، بەتایبەتی لەرووی زانستی زمان و دانایی و مێژوودا.

مەسکەویە یەکێك بوو لە هزرمەندانەی کە لەنێو نەتەوەکاندا جێگەی دیار بوو، هەروا زانیاریەکی زۆری هەبوو سەبارەت بە زانستی دێرینەکان و لەو بارەیەوە چەندانە کتێبی نووسیوە.

هاوڕێیاتی لەگەڵ ئیبن عەمید هەبوو و لە کتێبخانەکەی خزمەتی دەکرد، بەڵام بەهۆی زیرەکی و کارکردنی لەسەر فەلسەفە و لۆژیك و فیقە و ئەدەب و مێژوو لەتەك زیرەکی لەکیمیادا، بەو مانایانەی کە زانایانی ئیسلام زانیوویانە تا زێڕ بەدەست بێنن بەهۆی ئەو پیشەیەوە، ئەمەش جۆرێك بوو لە شێتی، بە تایبەتی

کاتێك هەرچی پارەی هەبوو بۆ ئەو کارە و هیچی دەست نەکەوت، بەو شێوەیە ڕۆژگار دەروازەی بۆ کردەوە تا ئەو کاتەی لەخزمەت بەنی عیباد دابوو، تەنهاش ئەوی دەبینی.

مەسکەویە وەك شاعیرێکی مەدح و سەنای ئیبن عەمیدی و عەمیدی پاشای کردووە و چەندان نامە لەو بارەیەوە لەو سەردەمەدا بۆی ناردووە.

ئەبووحەیان لەکتێبی (الامتاع) کاتێك سەبارەت بە کۆمەڵەی موتەکەلیمەکان دەکات لەو ڕۆژگارەدا دەبێژێت " ئیبن مەسکەویە هەژارە لەنێو دەوڵەمەندەکان و دەوڵەمەندە لەنێوەندی پەیامبەرەکاندا، چونکە کەسێکی دیارە بەتایبەتی کاتێك شیکردنەوەی بۆ یساگۆجی و کاتیگۆریاس کردووە، کە لەلایەن هاوڕێیەکەمان لەرەیی پۆلین کراوە، وەزیر گوتی ئەمە کێیە؟ منیش لە وەڵامدا گوتم ئەبووقاسم نووسەری غولام ئەبووحەسەن عامرییە، بەڵام ئێستا لەتەك ئیبن غەمارە لەوانەیە چاوی کەوتبێ بە ئەبووسلێمان لۆژیکی، ئێستایش کەمێك بۆشایی هەیە، چونکە بەهۆی ئەو کردەوە خراپەی کەبەسەریدا ڕوویداوە، ئەویش لەوەڵامدا گوتی "سەیرە ئەو هاوڕێی ئیبن عەمید و ئەبووفەزڵە، بەڵام بەهۆی ئەوەی کاری لەسەر کیمیا کردووە لەتەك ئەبووتەیبی کیمیایی رازی، لەتەك کتێبەکانی ئەبوو زەکەریا و جابری کوڕی حەیانەدایە".

ئیبن مەسکەویە کاتێك بینی داواکردنی کیمیا و فێربوونی بڕێکی زۆری دەوێ، بۆیە چوو بۆ خزمەتی سوڵتان، لەتەك ئەوەی زۆر شارەزا بوو لە (دەنق و قیرات و شکاندن و هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیی بە زێڕەوە هەبوو".

ئەبومەنسووری سەعالیبی لە باسی ئیبن مەسکەویە دەڵێت "دەستێکی باڵای هەبوو لە ئەدەب و ڕەوانبێژی و شیعر، ئەمەش لەبەر ئەوەی لە گەنجایەتیدا

پەیوەندی هەبوو بە ئیبن عەمیدەوە دواتر بەهۆی دۆخەکانەوە لەخزمەت بەنی بۆیەدا بوو، لەوێشدا زیاتر بەشکۆداری دەرکەوت".
هەروا شیعرێکی هەیە سەبارەت بە عەمیدی پاشا و زۆر بەجوانی لەنێوەندی شیعرەکەیدا باسی لێوە دەکات و هەروا گلەیی لەخۆی دەکات بەهۆی بەسالاچوونی.

## وەسیەتی ئەبووعەلی ئیبن مەسکەویە:

بە ناوی خودای گەورە و میهرەبان، ئەم بەڵێنە لەلایەن ئەحمەد کوڕی محەمەد لەو کاتەی کە لەوپەڕی لەشساغیدا بووە، کە نانی رۆژانەی هەبووە، ئەمە بەڵێنەش بۆ ئەوە نییە تا سوودێك بەخۆم بگەیەنم و هەروا دوورکەوتنەوەی زیانێك نییە، بەلام مرۆڤ دەبێ خودی خۆی شتەکانی بخاتە روو و هانی خۆی بدا، تا بە هیچ شێوەیەك لەشی تووشی خراپەکاری نەبێ، بەهیچ شێوەیەك ئارەزووەکانی دەستی بەسەردا نەگرێ لەتەك هەڵچوونەکان کە لەشوێنی خۆیدا نییە، دەبێ دانایەکەی لەتەك باوەڕەکەیدا بێ بۆ زانستی چاکەکاری، تا سەرەتا خۆی چاك بکاتەوە و بەمەش دادپەروەری بهێنێتە ئارا، بەو شێوەیەش لەکاردا بێ کە خۆی لەپانزدە دەروازەدا خۆی دەبینێتەوە و وەك خستنە رووی رەوایی و هەق لەسەر پووچی، راستی گوتن نەك درۆکردن، خێر بەسەر شەڕدا بهێنێتە ئارا لەکردەوەکانیدا، هەروا جیهاد بکات بۆ جەنگ لەنێوان خۆی و خودی خۆیدا، پابەندبوون بەشەریعەت، هەروا لەکاتی خۆیدا کارەکان بکات و یەکەم شتیش لەنێوان خۆی و خودای گەورەدا، کاتێکیش متمانەی کەمی بەخەڵك هەبێ ئەوا خۆشەویستیان لەدەست دەدات، هێمنی لەهەندێك کاتدا بەبێ جووڵەی دەروونی قسەکردن تا عەقڵ راوێژی بۆ دەکات، هەروا کارەکان وەك

خۆی بهێڵێتەوە نەوەك خراپی بكات، هەموو كارە باشەكان بكات و دوور كەوتنەوە لە ترس و مردن و دووركەوتنەوە لەهەموو قسەیەكی پووچ و دووركەوتنەوە لە حەسوودی و شەڕ تا هەڵچوونەكان بۆ ئەوان جێبهێڵێ، هەروا ئەوە دابنێ كە دەوڵەمەند دەبێ دواتریش هەژار ، بەڵام كەرامەتی خۆی بپارێزێ، هەروا باسكردن لەنەخۆشی لەكاتی لەشساغی و كاتە خۆشەكاندا، لەكاتی تووڕەبووندا رەزامەندی خۆی دەربڕێ تا دوور بكەوێتەوە لە خراپەكاری، هەروا لەهێزدا هیوا بەدەست بێنێ و نزا بكات و متمانەی بەخودای گەورە بێ و هەموو شتەكان بەوە بنێ".

## نووسینەكانی

١-كتاب الفوز الاكبر

٢-كتاب الفوز الاصغر

٣-كتاب تجارب الامم في التاريخ ابتدائه من بعد الطوفان و انتهانه الى سنة ٣٩٦

٤-كتاب انس الفريد

٥-كتاب ترتيب السعادات

٦-كتاب المستوفى (وهو) اشعار مختارة

٧-كتاب الجامع

٨-كتاب جاوزان خرد

٩-كتاب السير

١٠- كتاب تهذي الاخلاق و تطهير الاعراق

## كورتەی كتێبی (ترتيب السعادات)

هەر یەك لە ئێمە بەجۆرێك و بەهەوڵەكانی دەیەوێ بگات بە خۆشگوزەرانی هەروەك چۆن هەوڵ دەدرێ بۆ چێژ و سامان یان تەندروستی و سەركەوتن، بەڵام لەنێوەندی هەمواندا كامڵبوونیان باس نەكردووە بۆ خۆشگوزەرانییەكی

تەواو، ئەگەر شتێکی سەبارەت بزانن ئەوا واز لەهەموو شتێك دەهێنن و هەوڵ بۆ کامڵبوون دەدەن، ئەگەر کامڵبوونی تەواو بزانن وەك ئەوەیە پیشەیی تەخت و تاراجیان بەدەست کەوتوو و بەرەو لەشێکی زیاتر تەندروست هەنگاو دەنێن.
ئەگەر شتەکان بە گشتی وەربگرین ئەوا خۆشگوزەرانی بۆ مرۆڤ ئاژەڵ نییە، چونکە ئەمە مەبەستمان نییە و کامڵبوونیشمان لەنێوەندی خەڵکدا بەدەردەکەوێ، ئەگەریش شتەکە تایبەت بکەین بۆ مرۆڤ دەکرێ بڵێین مرۆڤ گەیشتووەتە خۆشگوزەرانی، چونکە مانایەکە بۆ هەموو خەڵکی، ئەم خۆشییەش بۆ هەموو خەڵکییە و هەمووان تیایدا بەشدارن هەروا لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە دەگۆڕێ، وەك هەندێك کاتێك خۆشی لەشتێك دەبینن دەگەنە مەبەستی کۆتایی کە کامڵبوونە.
هەروا کاری گشتی خۆشی بۆ هەمووان و بۆ هەموو ئاژەڵەکان خواردن و خواردنەوە و پشوودان، بەڵام ئەمە خۆشی نییە بۆ کامڵبوونی مرۆڤ و بۆ ئەمەش نەهاتۆتە کایەوە.
بەڵام خۆشی گشتی بەهۆی کردەکانیانە بەپێی جیاکاریەکان و هەندێك پلەی مرۆڤایەتی پێ دەبەخشرێ، ئەمەش مانایەکی بەهرەدارە بۆ خەڵك و زۆریش بەکار دێ.
لەتەك خۆشی تایبەتدا لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە دەگۆڕێ وەك خاوەن پیشەیەك یان خاوەن زانستێکە ئەمەش بەپێی ریزبەندی زانستی پیشەیی و بەپێی ئەو دۆخەیە کە تیایەتی ئەمەش بەپێی بۆچوون و جیاکاریەکان.
بەڵام ناخۆشیەکانی بەرامبەر خۆشگوزەرانی ئەوا جێمان هێشتووە، چونکە دەبێ بە پێی لۆژیك پۆلینی بکەین، بۆیە مرۆڤ دەبێ بەپێی چینەکەی و پلەی خۆشگوزەرانیەکی مامەڵەی لەتەکدا بکرێ لەکاتێکدا لەنێوەندی هەموو

بەشـەکانی فەلسـەفەدایە، چـونکە بـوونی خـەڵکی رەمەکییـە و مەبەسـتیان کامڵبوون نییە.

دانایان ویستوویانە جیاوازیی بکـەن لـەنێوان خەڵکیـدا، چـونکە هەنـدێکیان مەبەستیان چێژە بۆیە هەموو کردەکانی بۆ ئەوەیە، کاتێك تێر بوو لە چێژە لەپاش ئەوە ئەگەر زیاتری کرد ناوی دەنێن حۆشگوزەرانی، بەڵام دەبێتە ئازار و خراپەکاریەکی زۆر دژ بەخۆی و لەمەوەش ناویان ناوە خۆشییەکی پـڕ لـە ئازار.

کاتێك خاوەن سامان نەخۆش دەکەوێ، ئەوا خۆشگوزەرانی بە تەندروسـتی دەچوێنێ، کەسێکی لەشساغیش کاتێك شتێك بەرامبەری دەبێتەوە ناو لـەو خۆشییەکە دەنێ کەرامەت، لەتەك ئەوەی خۆشی شتێکی چەسپاوە بە ئازار نایەتە کایەوە، واتە خاوەنەکـەی بـەئازار بـۆی ناگوازرێتـەوە تـا دڵخـۆش و خۆشبەخت بێ.

ئەمەو ئەرستۆتالیس ریزبەندی بۆ رەگەزەکانی خۆشگوزەرانی کـردووە وەك خۆشگوزەرانی دەروون و خۆشگوزەرانی لەش و خۆشی دەرەوەی لەش.

خۆشی و خۆشگوزەرانی دەروون: بەزانستی و زانیاری و دانایی دێتە کایەوە

خۆشی و خۆشگوزەرانی لەش : وەك جوانی و سەلیقەیەکی تەندروستە

خۆشـی و خۆشـگوزەرانی دەرەوەی لـەش : وەك نـەوەی بـاش و هـاوڕێ و رەچەڵەك.

بەڵام خۆشی و خۆشگوزەرانی تەواو بۆ ئەو کەسانەیە کە داوای ناکەن، ئەوانەی خۆشی و خۆشگوزەرانی تەواویان دەست دەکەوێ کەسانی کاران و هیوایـان هەیە و بەهێز و هێمنن، بە بوارەکانی دونیا ناکەونە پشێوییەوە، ئەمەش لەتەك خەڵکیدا و بە ڕووکەشیش هـەردەم لەتەکیانـە، بـەڵام لەناوەڕۆکـدا کەسـێکە

خۆشی دەبینێ لەخۆی نەك لەوانی دیکە، ئەم دۆخەش لەتەکیدا دەمێنێتەوە و ناگۆڕێ.

## فەلسەفەی ئیبن مەسکەویە سەبارەت بەدەروون و ئاکار

لەنێوەندی پوختـەی کتێبی خۆشـگوزەرانی مەسـکەویەی ئـیبن مەسـکەویە ئەوەمان خستە ڕووکە ڕێبازە فەلسەفیەکەی ئەرتسۆییە، ئەویش وەك ئەوانی دیکە و پێشتریش لە فەیلەسووفەکانی ئیسلام شکۆداری بۆ فەلسەفەی یۆنانی دەخەنە ڕوو و شکۆداری بـۆ مامۆسـتای یەکـەم دەهێننـە کایـەوە، زۆربـەی نووسـینەکانی خۆشـگوزەرانی ئـیبن مەسـکەویە لەنێوەنـدی نووسـینەکانی ئەرستۆدا دەسوڕێتەوە، بەڵام بەپێی بۆچوونی خۆی پۆلینی کردووە و لەسەر شێوازی ئیبن هەیسەمە، چونکە ئەرستۆ نموونەی باڵا بووە بۆ فەیلەسووفەکانی ئیسلام، هەروا دوژمنی سەرسەختی متەسەووفەکان بووە وەك غەزالی و خاوەنی فەلسەفەی کردەیی وەك ئیبن خەلدوون.

ئەوەی سەیری فەلسەفەی ئیبن مەسکویە بکات دەبینی زۆر کاریگەری پێوە دیـارە لەنێوەنـدی فەلسـەفەی ئەرسـتۆدا و هەڵوەسـتەی کـردووە لەسـەر سیستەمی فەلسەفی بەشێوەیەکی گشتی و زیاتریش گرنگی بە دەروونناسی داوە ئەمەش بۆ ئەوەی لەهەموو ڕوویەکەوە لەدەروون بزانێ لەڕێگەی دۆخ و خوێندنەوەکانی، تا کار گەیشتۆتە ئەوەی ئیبن مەسکەویە ڕێگەیەکی فێرکردنی فەلسەفی دابنێ بەبێ ئەوەی پەیڕەوکار لەڕێگەی لۆژیك و ئەرگۆمێنت و پێوەر بخاتە ڕوو، بەشێوەیەك ئامرازەکانی تێگەیشتن و کەرەستەی درکپێکردن بخاتە ڕوو، چونکە ئیبن مەسکەویە کارەکە بەشێوەیەکی دیکە دەبینی وەك لەلاپەڕە ٢٦ی کتێبی خۆشی و خۆشگوزەرانی دەڵێت:

"هەندێك لەهاوەڵانی ئەرستۆتالیس پێیان وایە پێشتر کەسی زانیار بە کتێبەکانی رەوشت و ئاکار دەست پێ بکات تا خۆی چاك بکات و دوور بکەوێتەوە لە فریوی ئارەزووەکان، بەمەش دەتوانێ دانایی لە دەروونیدا پەسەند بکات و دانیپانان بە دوورکەوتنەوە لە ئارەزوو و چێژی لەش، بەمەش وزۆر شت فێر دەبێ و دەزانێ رێگەکانی ئەرگۆمێنت چۆنە و ئاشنای دەبێ، بەمەش هەموو کارەکانی دیکە بۆ کاتێکی دیکە بەجێ دەهێڵێ".

## نموونەی باڵا لەلای ئیبن مەسکەویە

ئیبن مەسکەویە مرۆڤی کردووەتە نموونەی باڵای ، ئەمەش بەو بۆچوونانەی ئیبن باجە دەچێت بەتایبەتی لە نامە و وتاری (تدبیر الموحد) و وتارەکەی ئیبن توفەیل لە وتار و کتێبی (حەی کوڕی یەقزان) بەڵام ئیبن مەسکەویە باس لەوە دەکات کە گەیشتووەتە خۆشی و خۆشگوزەرانیەکی تەواو و ئەو بەختیاری و خۆشییە پەیوەستە بەخودی خۆیەوە و ناکرێ بگۆڕدرێ، چونکە هیچ خراپەکاریەك و مەحاڵێك ناتوانێ بیگۆڕێ (مەبەستی ژیانی دونیاییە) تا ئەو کاتەی مرۆڤ دەمرێ، ئەمەش تەواوکاری ژیانە، بە شێوەیەك رێگە و پەیڕەوێکی گرتۆتەبەر تا بگاتە کەسە نزیکەکانی لە نیشتمانەکەی.

دواتر ئیبن مەسکەویە دێ باس لە خەسڵەت و وەسفەکان دەکات سەبارەت بە باوەڕە سۆفیگەرەکان، هەر کاتێکیش هەنگاوێکی بڕی بەرەو چالاکی دڵنیایی هەنگاو دەنێ، ئەم دۆخەش پەیوەستە بە متمانە و یەقین، بۆیە ئەمە بە گێڕانەوەی مێژوو و چیرۆك نایەتە دی، بەبێ ئەوەی بینین و هێمنی دەروونی لەگەڵدا نەبێ، چونکە چاو کاتێك شتێك دەبینێ لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیایە، هەندێك هەیە هەر لەنزیکەوەش نایبینن، کەچی هەندێك هەیە شتەکان

لەپشت پەردەوە دەبینن، ئەمەش چاوی هەستیارە، کە ڕێخۆشکەرە بۆ کارە هەستیارەکانی دیکە، هەرکاتێکیش لاواز بوو ئەوا چاوەکان زیاتر دەیانەوێ شتەکان ببینن، بۆ ئەمەش بەخێرایی درك بەشتەکان دەکرێ، بە شێوەیەك وایدەبینێ کە درکپێکراوەکان ماقووڵ نین.

## جیاوازی لەنێوان دانایی و فەلسەفە

ئیبن مەسکەویە جیاکاری لەنێوان دانایی و فەلسەفە دەکا، پێی وایە کە دانایی چاکەکاری دەروونی قسەکەری جیایە کە ئەمانەن: زانیاری لەسەر بوونەکان هەیە بەو پێیەی بوونی هەیە و دەشکرێ بڵێ لەبوارەکانی ئیلاهیش دەزانێ، لەتەك بوارە مرۆڤایەتییەکان و بەرهەمی کارەکەشی زانینی ماقووڵەکانە، بەوەی کامە کار بکات کە پێویستە ئەو کارە بکات.

بەڵام فەلسەفە لەلایەن ئیبن مەسکویە هیچ پێناسەیەکی بۆ دانەنراوە، بەڵام دەیکاتە دوو بەش.

١-بەشی تیۆری

٢-بەشی کردەیی

ئەگەر لە مرۆڤدا دەرکەوت ئەوا خۆشگوزەرانی کامڵبوو بەدەست دەهێنێ.

بەشی تیۆری پەیوەستە بە کامڵبوونی مرۆڤ کە پەیوەندیدارە بە هێز لە زانستدا تا بۆچوونەکانی بەراست وەربگیرێ و بەهیچ شێوەیەك گومان لەراستییەکەی نەکرێ، لەزانستەوە بۆ زانست ئیلاهی دەچێ و جێگەی متمانەش دەبێ.

کامڵبوونی دووەمی مرۆڤ بەهێزی کردەیی کامڵبوو پەیوەستە کە لەسەر بنەمای هێز و کردەوەکانیەتی کە لەنێوەندی کردەوەکانەوە دەردەچێ بە شێوەیەك هێزێکی ڕێکخراوە کە بە مەدەنیەت لەنێو خەڵکیدا کۆتایی دێ، ئەو کاتەی خۆیان ڕێك دەخەن زیاتر خۆشگوزەرانتر دەبن بە بەشداری هەموان

(Bonheur commum) و مەبەستی کامڵبوونی مرۆڤایەتییە لەنێوەندی فەلسـەفەی ئـیبن مەسـکەویە، بەشـێوەیەك بوونـەکان هـەمووی بزانـێ، بـە شێوەیەك سنوور و ڕێگەکانیشی بزانێ، بەشێوەی مەبەست و خەسڵەتەکانی کە کۆتایی بۆ نییە.

ئیبن مەسکەویە پێی وایە ئەوەی بگاتە ئەو پلەیە دەبێتە زانا واتە زانایەکی بچووك، چونکە هەموو وێنای بوونەکان لەخودی خۆیەوە هاتووەتـە ئـاراوە، کاتێکیش لەنێوەندی هەموو ئەوانە دەرنەچـوو واتـە بـەپێی هـەموو وتـەی و فەرموودەکانی خودا و دروستکەر جووڵایەوە ئەوا دەبێتـە زانایـەکی تـەواو، هـەردەم لەنێوەنـدی باسـەکاندا بـوونی دەبـێ، بـەم شـێوەیەش بـە هـۆیێ زانستەکەی لەخودا نزیك دەبێتەوە.

لەوانەیە کەسێك لەنێوەندی ئەو خەڵکە بتوانێ ئەو پایەیە بەدەست بێنێ، بەڵام ئەو وەك هەموو ئاژەڵ و ڕووەکێك چارەنووسەکەی لەناوچوونە.

هەروا ئەوەی ئەم دۆخە لەلای وێنا نابێ تـەنها کارێـك دەکـات لەناوەڕاسـتی زانسـتدایە ئـەوا ئەمـەیان هـەردەم لەنێوەنـدی گومـان و ژیانـەوە و نەمریـدا دەمێنێتەوە بە مردنی ژیانی مرۆڤیش ئەو کۆتایی پێ دێت، بەمەش ناوی دەنێن گومڕا لە سیفەتەکانی دانایی و سوونەتی شەریعەت.

فەلسەفە لەلای ئیبن مەسکەویە مەبەستی ژیـانی مرۆڤایەتییـە کـە ئاوێتـەی زانست و کار دەبێ تا بەرەو هەڵکشانی بەردەوام بـڕوات، مەبەسـتیش لەمـە گەیاندنی عەقڵە بـۆ ئامـادەگی هـەموو کردەکـانی خـودا، دیـارە ئـەم پلـە و پایەیەش پەیامبەری و دانایی و زانایانن کە زانای تەواون و خەلیفەی خودان لەسەر زەوی.

## پاشاکان لەفەلسەفەی ئیبن مەسکەویە

ئیبن مەسکەویە دەڵێت "بڕیارماندا کە پاشاکان لەهەموو کەسانی دیکە هەژارترن چونکە پێویستیان بە زۆر شتە" هەروا ئاماژە بە وتەیەکی ئەبووبەکری سدیق لە وتارێکدا دەفەرمووێ :

"ئازارترین کەس لە دونیادا پاشاکانن"، ئیبن مەسکەویە لەو سەرچاوەیە وەریگرتووە و دەڵێت :

"پاشا ئەگەر لەگەڵ خودا پاك بێ و دەستی بۆ خەڵك درێژ کرد ئەوا دڵی پڕ لەسۆز دەبێت بەو شێوەیە ئاوەدانی وڵاتەکەی دەگرێتەوە، کاتێکیش چێژی لێ بڕا ئەوا جێگەی متمانە نابێ وەك درهەمێکی قەڵپ و سەرابێکی فریودراوە، کەسێکی دڵتەنگ دەبێ و لێبوردەیی کەم دەبێ، چونکە پاشاکان هەردەم پاشایەکی دیکەی لەدوا دێ".

ئیبن مەسکەویە باس لەوە دەکات کە وەسفەکەی ئەبووبەکری سدیق لەشوێنی خۆیدایە، هەروا باس لەدڵ و دەروون و هەموو شتێکیان دەکات، چونکە بە ڕووکەشی دەبینیت خانەوادە و ڕازاندنەوە و کەژاوەکانیان زۆرن و هەرچی بەندە و خزمەتکار هەیە لەخزمەت ئەوان دان، ئەوان وا هەست دەکەن بەختیارن، بەڵام هەردەم لەنێوەندی چەندان بیرۆکەدان و ڕقیان لە هەموو پێویستییەکانیان دەبێتەوە.

## قسەکردن لەسەر دەروون

ئیبن مەسکویە باس لەوە دەکات، کە هێزی دەروون سێ بەشە:

١-دەروونی ئاژەڵ کە لە خوارەوەیە.

٢-دەروونی حەوتەم (دەگەڕێتەوە بۆ حەوت بەتاك) کە لەناوەڕاستدایە.

٣-دەروونی قسەکەر کە لە هەمووان بەرزترە.

ئەم سێ هێزە کە ئیبن مەسکەویە باسی لێوە دەکات ئەگەر پەیوەندیان بەیەکەوە کرد دەبنە یەك و لەنێوەندی خودی خۆیدا گۆڕانکاری بەسەردا دێ وەك ئەوەی بەیەکتر نەگەیشتوون، لەپاشاندا باسی لە دەروونی عەقڵی کردووە لەهەمووانیش گرنگتر وازهێنان لە سوڵتانی ئارەزووەکان و زاڵ بەسەریدا وەك ئەوەی بەسەر ئاگرێك دامرکێنیەوە.

هەروا باسی لە بۆچوونی ئەرستۆ کردووە کە ئاماژەکانی لە کتێبی ئاکار وەرگرتووە، لەتەك ئەوەی ئیبن مەسکەویە لە ئەرستۆی وەرگرتووە ناچێتە نێو قسەکردنی دووبارە.

لەنێوەندی ئەم قسانەشدا چووەتە نێوەندی چارەسەری دەروون و باسیش لەوە دەکات کە باسکردن لە نەخۆشییەکان لە بنەڕەتدا دەروونمانە لەنێو خودی خۆی وەك هزر و کارە خراپەکان و بۆچوون و ئاگادار بوون لە ترس و ترس لەهەموو ئەو بوارانەی کە بەرهەڵستی دەکەن.

ئەگەر بنەماکەی مەبەستی لە سەلیقە بێ وەك بنەمای گەرمی دڵ لەتەك بێ وزەیی و خۆشگوزەرانی و عیشق ئەم بنەمایە لەبێ کاری و بۆشاییەوە سەرچاوە دەگرێ، مەبەستمان چارەسەرکردنیەتی.

هەروا باسی لە پاراستنی تەندروستی خودی کردووە و زانینی هەموو ناشیرینەکانی و چۆنیەتیی چارەسەرکردنی تەندروستی خۆی.

لەپاشاندا ئیبن مەسکویە باسی لە دادپەروەری و چاکەکاری کردووە لەژێر رۆشنایی ئازایەتی و سەخیبوون و دادپەروەری و پلەکانی چاکەکاری مرۆڤایەتی.

لەباسی خۆشی و خۆشگوزەرانیدا هەمان بۆچوونی ئەرستۆتاڵیسی وەرگراتووە کە خۆشی و خۆشگوزەرانی لە چێژی خۆشی و خێری خۆشی و زۆرێك

لەچاکەکاریەکان دێتە کایەوە، هەموو ئەمانەش ئاوێتەیەکە لە زانستی ئاکار و ڕەوشتە تایبەتی و گشتییەکان و دەروونناسی و دانایی مرۆڤایەتی.
باسیشی لە هەرەوەزی و هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و ڕەگەزەکانی کردووە و هەریەك بەپێی هۆکارەکانی تا هیچ خراپەکاریەك بەخۆیەوە نەگرێ، هەروا باسی لەجۆرەکانی چاکەکاری کردووە لەتەك هۆکارەکانی ترس و سەرسووڕمان و شانازی و سەلیقە و ئاگادار بوون و غەدرکردن و هۆکارەکانی توڕەبوون و ترس و هەموو هۆکارەکانی دیکە و چارەسەری ترس لەمردن و چارەسەری خەمۆکی.
جوانترین شتیش لەنێوەندی کتێبی ئیبن مەسکەویە باسکردنە لەچاککردنی ڕەوشت و ئاکار لەکاتێکدا باسی لەچارەسەری ترس لەمردن کردووە ئەمەش وەك ئەو دەروازەیە کە کە جێژیی فەیلەسووفی فەرەنسی لە کتێبی باوەڕی داهاتوو کۆتایی پێهێناوە، ئیبن مەسکەویە باس لەوە دەکات کە:
"ترس لەمردن لەکاتێکدا دێ کە هیچ کاتێك نازانی تۆ لەکوێ دەمریت و هەست بەوە دەکات کە لەشی کۆتایی پێهاتووە و هەموو پێکهاتەکانی بەرەو کۆتایی هەنگاو دەنێ، واش دەزانێ کە مردن ئازارێکی گەورەیە و وەك ئازاری نەخۆشیەکانی دیکە نییە، هەروا هەستیش بەوە دەکات کە سزاکان لەپاش مردنی دەست پێ دەکات، هەروا داخ لەوە دەخوا، کە لەپاش خۆی پارە و ماڵێکی زۆر بەجێ دەهێڵێ، بەڵام هەموو ئەو گومانە پووچن و هیچ ڕاستییەك بەخۆیەوە ناگرێ".
لەلایەکی دیکەوە ئیبن مەسکەویە لە بەشێکی تایبەتدا باس لە شەریعەت دەکات و هەموو ئەو هۆکارانەش دەخاتە ڕوو کە دەبێتە هۆی واز هێنان لەخوا، لەتەك ئەوەی شەریعەت فەرمان بە دادپەروەری دەکات و داوا دەکات

کە خۆشەویستی و پابەند بوون بەشەریعەت بێتە ئاراوە، بەتایبەتی ئەو فەرمانڕەوایەی بەرامبەر بە هاوولاتیان.

ئیبن مەسکەویە هەموو ئەو زانستانەی وەرگرتووە کە لەلایەن ئەرستۆتالیس و فەلسەفەی یۆنانی هاتووەتە کایەوە بەتایبەتی کاتێك ئەرستۆ باس لە دەروونناسی دەکات، کە پەیوەستە بە تەسەووف و عەقڵی ئایینی لەنێوەندی دانایی و ژیان و ڕێنوێنی گشتی و تایبەتی.

ئێمە ئیبن مەسکەویە بە فەیلەسووف دەزانین بە ئارەزووی خۆی باس لە چاکەکاری و رەوشت و ئاکار نەکردووە بەڵکوو وەك خاوەنی ڕێڕەوەکەی هاتووە، باسی کردووە و زۆر گرنگی بە ئەرستۆ داوە، ئەویش وەك ئاسۆر شۆپنهاور لە کتێبی la sagesse باس لە دانایی لە ژیاندا دەکات و بەپێویستی دەزانێ تاك هەوڵی بۆ بدات تا بیگاتێ، تا دەگاتە تەواوی کامڵبوون، بیرۆکەی سەرەکی ئیبن مەسکەویەش لە فەلسەفەکەیدا چاکەکاری رەوشت و ئاکارە، کە بیرۆکەیەکی کردەییە و سوودی راستەوخۆی دەبێ بۆ مرۆڤ کە بەرەو دانایی هەنگاو دەنێ.

## فەلسەفەی ئیبن مەسکەویە سەبارەت بە بوون و سەلماندنی دروستکەر ( خودا ) و دەروون و پەیامبەریەتی

لە سەلماندنی دروستکەر و دەروون و پەیامبەرایەتی، بەشێکی تایبەتە بە ئەو دیوسروشتەوە کە لەسەر بنەمای فەیلەسووفە ئیلاهیەکان دانراوە، ئەمەو ڕێبازی ئیبن مەسکەویە سەرکەوتنی باوەڕە ئایینیەکانە.

ئیبن مەسکەویە فەلسەفەی میتافیزیکی دابەش کردووە بۆ سێ بابەت، ئەمەش لەنێوەندی سی دەروازەدا و هەر بەشێکیشی دە دەروازەیە، بابەتی یەکەمی باس لە سەلماندنی دروستکەر دەکات لێرەوە دەیەوێ بەڵگەیەك بهێنێتەوە بۆ

بوونی خودای گەورە و مەزن، فەیلەسووف بە پێشەکیەکی پوخت دەستی پێ کردووە و باس لەهەموو بوارەکانی رەوایی و هەق کردووە و سەبارەت بەتارمایەکانیش پاساو دەهێنێتەوە بۆ هەموو لاوازیەکانی عەقڵ، هەروا باسیش لەوە دەکات کە پێویستە خۆمان بەمەزن بزانین لەبەرامبەر خەیاڵەکان و لێ نەگەڕێین خەیاڵەکان بەسەرماندا زاڵ بن، لێرەوەش باس لەهەندێك دەربڕینی ئەدیبەکان دەکات و کە وایانداناوە کە ئیبن مەسکەویە باس لە تیۆری گەشەپێدان و هەڵکشان دەکات و دەڵێت :

"مرۆڤ دوا بوونە و پێکهاتەکەی بە هەموو شێوەیەك زیادی کردووە، بەڵام لەسەر بنەمای عەقڵ، ئەگەر مرۆڤ دوا بوونیش بێ هەموو شتەکانی دیکەش لەپێش ئەوەوە لەبووندا بوونە".

لەدەروازەی دووەمدا باس لەبابەتی یەکەم دەکات بۆ سەلماندنی دروستکەر، لەتەك ئەوەی دانایان باسیان لەیەکتاپەرستی کردووە تا بەهەموو شێوەیەك دادپەروەری بێتە ئاراوە و دانانی سیاسەت و بەستنەوەی دۆخەکان بە جووڵە و جووڵەی گەردوون وخراپەکاری و گەشە و کەموکورتی و مەحاڵ بوون و گواستنەوە.

لەپاشاندا باسی لەهەموو جوولەکان کردووە و بەوەی داینەمووی جوولەکان خودی خۆی جوولە ناکات، هەروا باس لەیەك دروستکەر دەکات و جەخت لەوەش دەکاتەوە کە خودای گەورە ئەزلییە، لەبەشی هەشتەمیشدا باس لەوە دەکات کە هەموو شتەکانی لەبەر چاوە.

لە دەروازەی نۆیەم باس لەوە دەکات کە شت و بوونەکان هەمووی بەدەست خودای گەورەیە، لەم دەروازەیەدا باس لە ناوەڕۆك و خستنە رووەکان دەکات

و لەپاشاندا باس لەوە دەکات کە خودا داهێنەرە بۆ داهێنانی شتەکان و شتەکانیش تەنها بەوێنە دەگۆڕێن.

لەبابەتی دووەمدا ئیبن مەسکەوییە باس لە دەروون و دۆخەکانی دەکات کە تەن و لەشێك نییە، بەڵام هەموو بوونەکان درك پێ دەکات ئەوەی گۆنە و پان ماقووڵ و داهاتوو و هەستیارە ئەمەش بابەتێکی ئاڵۆزی درکپێکردنی دەروونە و چەندان بەش لێی جیا دەبێتەوە، لەتەك ئەوەی درك پێکراوەکان ناوێتە بوون.

هەر لەم بەشەدا هەڵەیەکی گەردوونی کردووە، باسی لەوە کردووە، کە خۆر گەورەترە لەزەوی، بە بڕی سەد و شەست جار، چونکە بەپێی زانستی جوگرافیا و کوزموگرافیا و گەردوون کە خۆر ملیۆنێك و سێ سەد جار لەزەوی گەورەترە.

هەروا باسی لەهەموو ئەو لایەنانە کردووە، کە هەست بە شتەکان دەکەین لەڕووی عەقڵ و دەروونەوە بەشێوەیەك هاوبەشیەك هەیە لەنێوانیاندا.

لەلایەکی دیکەوە باس لە نەمری دەروون دەکات و بەشێوەیەك لەناوناچێ، بەڵام ئەو ژیانە نییە کە ئێمە سەیری دەکەین، هاوکات چەندان پاساوی هێناوەتەوە لە مانەوەی دەروون، کە دەروون شێوەیەك لە کامڵبوون و ناونراوە بە خۆشی ئەوەی کەموکورتی هەبێ ئازارە، کاتێکیش دەروون لەلەش جیا بۆوە ئەو شتە دێتە ئاراوە مردنی مرۆڤە.

لەم بەشەدا باسی لەچۆنیەتی بەدەستگەیشتنی خۆشی و خۆشگوزەرانی کردووە بەشێوەیەك لەکتێبی خۆشگوزەرانی هەموو لایەنەکانی باس کردووە.

لەباسی سێیەمدا باسی لە پەیامبەریەتی کردووە

هەورا باس لە پایەی بوونەکان دەکات و پەیوەندی بە یەکتریەوە، لەتەك ئەوەی مرۆڤ جیهانێکی بچووکە و هێزی پەیوەندیدارە بە بەرزبوونەوەی پێنج هەستەکە مە هێزی هاوبەشن هەموو ئەمانەش بەهۆی خودای مەزنەوە.

لەپاشاندا باسی لە سروش و چۆنیەتی عەقڵ کردووە کە خەونە راستەقینەکان لە کاتی خەوتندا بەشێکن لە پشێشبینی، هەروا جیاوازی هەیە لەنێوان گومان پێشبینیدا، چونکە پەیامبەر هەیە لەلایەن خوداوە ناردراوە و هەشیانە نەناردراوە وەك جیاوازی نێوان (النبی و المتنبی).

بەلام کتێبی (الفوز الاصغر)، کە چەندان توێژینەوەی تیایدا کە شێخ تاهیر ئەفەندی جەزائیری نووسیویەتی لەدیمەشق کۆچیدوایی کردووە ئەمەش لەکاتی جەنگە گەورەکەدا، باس لەوە دەکات ئەم کتێبە لەو کتێبانەیە کە لەلای سەیرە، کە ئیبن مەسکەویە لەسەر بنەمای فەیلەسووفە ئیلاهییەکان دیناوە، تیایدا ئایین سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، لەتەك ئەوەی چەندان بەشی تیایە کە ئامـاژەی داهێنەرن وەك ئەو ئاماژانەی لەنێوەندی کتێبی ئاکار و پاکردنەوەی رەچەڵەکەکان.

## کتێبی ( تجارب الامم ) ئەزموونی نەتەوەکان

هەروا کتێبی ئەزموونی نەتەوەکان کەبەشی کۆتایی بەدەستمان گەیشتووە لە دووبەشی چاپکراودا و لەچاپخانەی (کامپ هۆل)ی ئەکسفۆرد و لە میسر چاپکراوە لە سالانی ١٩١٤ و ١٩١٥ کە لەلایەن مامۆستا ئامدرۆزی پارێزەری ئینگلیزی هەڵچنی بۆ کراوە، هەروا مامۆستا مرغلیوس هاوکاری کردووە، ئەوەی زانیومانە هەردووکیان

بەشداربوونە لە شیکردنەوە و وەرگێڕانی بە زمانی ئینگلیزی لە ساڵی ١٩٢٠ز.

بەشی یەکەمی باس لە ڕووداوەکانی سیوپێنج ساڵ دەکات لە ساڵی ٢٩٥ك تا ٣٢٩ك و بەشی دووەمی باس لە ڕووداوەکانی چل ساڵ دەکات لە ساڵی ٣٢٩ك تا ساڵی ٣٦٩ك.

هاوکات جەختیش لەوە دەکرێتەوە کە مێژوو هیچ پەیوەندیەکی بەفەلسەفەوە نییە، بەلام ئەم کتێبەی ئیبن مەسکەویە بە مێژوویەکی پوخت دانانرێ، بەلام کتێبێکە باس لەچەندان ڕووداو دەکات بەهەموو هۆکار و ئەنجامەکانی دەکات، بەلام کتێبێکە بە شێوەی فەلسەفی نووسراوە و سەیریش نییە مێژوو و فەلسەفە لە یەکتر نزیك بێتەوە وەك مێژووی ئەدەب، بۆیە ئیبن مەسکەویە ئەوەی بۆ سەلماندووین کە مێژوونووس و ئەدیب و فەیلەسووف بووە وەك (جۆیتە) فەیلەسووف و زانا و مێژوونووس و ئەدیب بووە.

ئیبن مەسکەویە لەم کتێبەدا باس لە ڕووداوە گرنگەکان دەکات وەك باسی خەلافەتی موقتەدیر باللە دەکات کە لەو ماوەیە چی هاتووەتە کایەوە، هەنێکجاریش باس لەو ساڵانە دەکات کە ساڵ و نەوەدودوو سەدە بەو شێوەیە.

لەتەك ئەوەی ئیبن مەسکەویە لایەنگریی هیچ لایەنێکی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەی باس لەزۆربەی قەلاکانی نێو ولات.

لەلایەکی دیکەوە باس لەنەخۆشی وڕێنە دەکات، کە مێشکی هەر خولەکێك بە شتێکەوە خەریکە و ناویان ناوە بلیترگوس (مەبەستی ئیبن مەسکەویەش نەخۆشی خەوتنە کە پزیشکانی ئەم سەردەمە

ناویان ناوە لیترجیا، باسیش لەوە دەکرێ کە عەزدی دەوڵەت ئەو نەخۆشییەی لەخۆی شاردبووەوە و بەکەسیشی نەگوتووە کە نەخۆشە و لەو کاتەوەش تووشی بووە ،٥ لە مووسڵ بووە.

ئەمەش دوای کاری ئیبن مەسکەوییە خودا لێی رازی بێ.

بەڵام بەشی سێیەمی کە لەئۆکسفۆرد و میسر چاپ بووە کە پاشکۆی کتێبی ئەزموونی نەتەوەکانە، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی بە ئیبن مەسکەویە نییە، چونکە ئەو کتێبە لە دووبەش پێکهاتووە لە ساڵی ٣٦٩ك تا ساڵی ٣٨٩ك، کە لەنووسینی وەزیر ئەبووشوجاعی محەمەد حسێنە کە ناسراوە بە زەهیری دین روازراوی لەپاشاندا بەشێك لەو مێژوو دەگاتە ساڵی ٣٩٣ك کە بژاردەی رووداو و مێژووەکانە بە بابەتە دیاریکراوەکان.

### کۆتایی

لیۆن–فەرەنسا نۆڤەمبەری ١٩٠٩–قاهیرە مایۆ ١٩٢٧

## پێڕست